عەلی باپیر

# خواناسی
# ئایین
# ئیمان



دەروشاوەی ئیسلام و بڕوچەلیی ڕێچکان

1441 ك - 2020 ز






چاپی سێیەم

خواناسی، ئایین، ئیمان

نووسینی: عەلی باپیـــــر

مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر

چاپی دووەم ٢٠٢٠ز- ١٤٤١ك



**نوسینگەی تەفسیر**

بـۆ بڵاوکـردنـەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

خواناسی، ئایین، ئیمان ،

عەلـــی باپـیــــر (نووسەر)،

٥٩٦ لاپـــەڕە ،

١٧* ٢٤ ســم ،

بابــەت ، ئـــاییـنی

تیراژ ، ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (  ) ی ساڵی ٢٠١٨ز پێدراوە.

ISBN:

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خــەتی بــەرگ : نـــەوزاد کۆیـــی**

**دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی**

www.alibapir.com

# خواناسی

# ئایین

# ئیمان

## درەوشاوەی ئیسلام و پووچەڵیی ڕێچکان


عەلی باپیر

نووسینی

چاپکردنی پێشووی کتێبەکانم بەنسبە گوێرەی

توانا و هەلومەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو.

وە ئێستە بۆ هیوام وا بوو شێوەی چاپکردنێکی

واباشە بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەران بێ. جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم کە ئۆفسێتی تەفسیر بەو کارە هەڵدەستێ.

خوا بەرەکەت بخاتە ئیش و کاریانەوە و لە کۆمەکیان

بێت، منیش سوپاسیان دەکەم.

علی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وصحبه وآله

بەندە (د. عەلی باپیر) بەڕێز مامۆستا مخلص و

نووسینگەی تەفسیرم تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و پیتی زیاتر

بخاتە ئیش و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچ کەسێکی تر مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

عەلی باپیر

11 ربيع الثاني 1426

2005/5/19

هەولێر

# پێشکەش بێ

١) بەگیانی بەرزو پاکی هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خوا لێیان ڕازی بێت و، شوێنکەوتووە ڕەسەنەکانیان، کە ئەوەندە ئیمان و خواناسییان بەهێز بوو، هەموو دەمێ پێیان وابوو خوا دەبینن و دەیانبینێ و (تەنیا بۆ خوا ژیان) و (لەڕێی خوادا تێکۆشان) گەورەترین و دیارترین نیشانەو دروشمیان بوون.

٢) بەهەموو ئەو دۆست و براو خوشکە دڵسۆزانەی کە لە درێژەی ژیانی کۆچ و کۆچباری چەندجارەی ئاوارەبونمدا هاوکارییان کردووم و، مەردانە دەستباریان بۆ گرتووم و، بەهەڵوێستی جوامێرانەیان دڵیان خۆش کردووم.

٣) بەو کەسانەی کە ئامادەن بۆ دۆزینەوەی هەق، ورد ببنەوەو تێبفکرن و، بۆ تێگەیشتن لە ڕاستیی (الحقیقة) گوێ بگرن و، پاش دیتنەوەو بیستنیشی، بێ سڵکردنەوەو سێودوو، بەسوپاسەوە وەریدەگرن.

# پێشەکی چاپی سێیەم

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ آل عمران

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ النساء

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ الأحزاب

أَمَا بَعـــد:

فَإِنّ أَصْدقَ الَحديث كَلامُ الله، وَخَيرَ الهَدْي هَديُ مُحَمّد صَلّى اللّه عَليهِ وَسلَم، وَشَرّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلّ ضَلالةٍ فِي النّار.

**خوێنەری بەڕێزو خۆشەویستم!**

لەسۆنگەی ئەوەوە کە لە هەرکام لە: (پێشەکی چاپی دووەم) و (ئەم کتێبەو ئاوڕێک لەڕابردوو و سەرنجدانێکی ئەمڕۆ)و (سێ ڕوونکردنەوەی گرنگ)و (ڕێخۆشکردنێکی گشتیی)دا، شتی زۆر لەبارەی ئەم کتێبەوە گوتوە، لەم پێشەکی چاپی سێیەمەدا، تەنیا ئاماژە بە گۆڕانکاریی و

دەستکارییانە دەکەین، کە لەم چاپەدا ئەنجاممان داون، بە مەبەستی خزمەتکردنی ئەم کتێبە، کە خۆشەویستییەکی تایبەتی لە دڵمدا هەیە، گۆڕانکاریی و دەستکارییەکانیش ئەمانەن:

**یەک:** خوێندنەوەی وردی وشە بە وشەو پیت بەپیتی و، ڕاستکردنەوەی هەر هەڵەو کەم و کورپییەکی وشەیی و واتایی، کە پێشتر بەسەرماندا تێپەڕیون، یان ئێستا بەپێویستم زانیوە بیانگۆڕم.

**دوو:** بەوردیی و لەسەرچاوە ئەسڵییەکان (المصادر الأساسیة)ەوە (تخریج) کردنی دەقەکانی سوننەت، کە برایەکی دڵسۆز پێی هەڵساوە، خوا پاداشتی بداتەوە.

**سێ:** گواستنەوەی زۆربەی پەراوێزەکان (الهوامش) بۆ نێو دەق (متن)ی کتێبەکە، چونکە زۆربەیان ئایەت و دەقی سوننەت بوون، وەک بەڵگە هێنرابوونەوە.

**چوار:** گۆڕینی دیزاین (تصمیم)ی کتێبەکە بەگشتیی و، ڕێک و پێکردنی و، گەورەکردنی قەبارەی لاپەڕەکانی و، درشتترکردنی فۆنتەکەی، بەتایبەت هی پەراوێزەکانی.

**پێنج:** گۆڕینی ناو و نیشانەکەی بۆ: (خواناسیی، ئایین، ئیمان: درەوشاوەیی ئیسلام و پووچەڵیی ڕێچکان).

**شەش:** هیواداریشم لەڕووی چاپکران (طَبْع)یشەوە، ئەم چاپی سێیەمە لەچاپەکانی پێشوو باشتربێ لەڕووی: بەرگ و کاغەزو...هتدەوە.

شایانی باسیشە لەڕووی نێوەڕۆکەوە، چەند وشەو تەعبیرێکی کەم نەبێ، دەستکارییەکی ئەوتۆی ئەم کتێبەمان نەکردوە، جگە لەڕوونکردنەوەی چەمک و واتای چەند وشەیەکی نامۆ، یان کەمتر بیستراو، لەپەراوێزەکاندا.

لەخوای بەخشەریش داواکارم ئەم کتێبە -کە کتێبێکی زۆر خۆشەویست و قووڵ و گشتگیرو کۆکەرەوەمی- پیت و پێزی زیاتری تێبخات و، بیکاتە مایەی زیاتر بەرچاو ڕوونبوونەوەی خوێنەرانی «بەتایبەت گەنج و لاوەکانمان لەکوڕان و کچان» لەهەرسێک بواری گەورەو گرنگی: {خواناسیی و ئایین و ئیمان}دا.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين،

والحمدلله رب العالمين

٧/صفر/١٤٤١ک

٢٠١٩/٠١/٦ز

هـــــــــــــەولێر

# پێشـەکی چاپی دووەم

الحمدلله حق حمده والصلاة والسلام على عبده محمد والسّائرين على دَرْبِهِ

خوێنەری بەڕێز!

لـە پێشـەکی چاپـی دووەمـی ئـەم کتێبـەدا، بـە پێویسـتی دەزانم ئامـاژە بـە چەنـد مەسـەلەیەک بکـەم:

**یەکـەم:** ئـەم کتێبـە بەرهەمـی هـەوڵ و ماندووبونێکـی زۆری بەندەیـە چ لە ڕووی بیرکردنـەوەو ڕامانـەوەو، چ لـە ڕووی سـەرنج دان و موتـاڵای سـەرچاوانەوەو، چ لـە ڕووی داڕشتن و ڕەوانبێژیی و خۆ خەریـک کـردن، بـە هەڵبژاردنـی تەعبیـر و وشـەی دڵگیـرو جوانـەوەو، لـە هەمـوو ئـەم ڕووانـەوە، ئـەم کتێبـەم لەسـەری سـەرەوەو ڕیـزی پێشـەوەی بەرهەمەکانـم دا دەبینـم، پـاش لەبەرچاوگرتنـی ئـەو ڕاستییەش، کـە لـە تافـی لاوییـدا نووسـیومە!

**دووەم:** هەرچەنـدە ئـەو کـەش و هـەوا فیکرییـەی، کـە کاتـی خۆمـی ئـەم کتێبـەی تێدا نووسـراوە، کـە لـە لایەکـەوە: ڕژێمـی بەعسـی عارەبیـی سۆشیالیسـتی سیکۆلاریسـت تـەواو پشـووی بـە خەڵـک هەڵچنیبـوو و، لـە لایەکی دیکەشـەوە: ڕەوتی مارکسیزم لە کوردستـاندا لە هەڕەتی گەشەسـەندن و لەخۆبایی بوون و دڵگەرم بوونیدا بـوو، ئێستـاکە زۆر گۆڕاوەو، هـەرکام لـە ڕژێمـی بەعسـی شـۆڤێنی دیکتاتـۆرو، بیرۆکـەی مارکسـیزم - لیینلیـزم، نـاو و باویـان نەمـاوە، بـەڵام دوای چاوپێداگێڕانـەوەو بگـرە بـە وردیـی خوێندنـەوەی ئـەم کتێبـە، بـە مەبەسـتی هەڵەگیریـی کۆتایـی و ئامادەکردنـەوەی بـۆ چاپـی تـازە، بـۆم دەرکـەوت کـە ئـەم کتێبـە گەلێـک ڕاستیی گـەورەو گرنگـی وای

گرتوونـە خـۆی، کـە گـەنـج و خوێندەوارانـی کوردسـتان زۆریـان بـۆ ئاتاجـن، وێـڕای کردنـەوەی گەلێـک گرێکوێرەو ئیشـکالی فیکریـی و، ڕەواندنـەوەی تـەم ومـژی زۆر تۆمەتـی نـاڕەوا، کـە لـە لایـەن ناحەزانـی ئیسـلامەوە ئاڕاسـتەی عەقیـدەو شـەریعەتی ئیسـلامیی دەکرێـن.

**سێیەم:** هەرکەسێک لـە کاتـی خوێندنـەوەی ئـەم کتێبـەدا، هەسـتی بـە زبریـی و توندیـی هەندێـک وشـەو تەعبیـر کـرد، بـا بـەوە عـوزر بـۆ نووسـەر بێنێتـەوە، کـە ئـەو کـەش و هـەوا فیکریـی و نەفسیی و سیاسییەی ئەوسـاکە (سـەرەتای هەشـتایەکانی سـەدەی ڕابـردوو) وای خواسـتوەو، هەرکەسـێکیش بـە وردیـی سـەرنج بـدات دەزانـێ، کـە قسـە ڕەق و زبـرەکان مەگـەر چـۆن، دەنـا هـەر ئاڕاسـتەی ڕژێمـی دیکتاتۆریـی بەعـس و وابەسـتەو دابەسـتەکانی کـراون و، زبریی و توندیـی هەندێـک وشـەو تەعبیریـش، کـە لـە کاتـی موناقەشـەکردنی هەڵگرانـی بیـری مارکسـیزمدا، بەکارهێنـراون، هۆکارەکـەی ئەوەیـە کـە ئـەو کاتـە ڕەوتـی مارکسـایەتیی تاڕاددەیەکـی زۆر عاتیفـە و توندوتیژیـی بەسـەردا زاڵ بـوو، چونکـە لـە گەرمـەی خەیاڵپڵێـوی (دیکتاتۆریەتـی پڕۆلیتاریـا) دابـوون و، پێشـینانیش جوانیـان گوتـوە: (کـەس لـە شـەڕدا شـەکری نەبەخشـیوەتەوە)، دیـارە هەمیشـەش وەڵام لەقـەدەر پرسـیار دەبـێ و، زۆرجـاران تـەرەفـی بەرانبەریـش شێوازێکی دیارییکراوی قسـەو نووسـینت، بەسـەردا دەسـەپێنێ، وەک (علي بن أبي طالب) (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، بـە خەڵکـی شـاری کووفـەی گوتـوە: (لقـد استخرجتم مِنّـي خُلُقاً مـا كان لـي بِخُلُقٍ)، واتـە: ئێـوە ڕەفتارێکتـان تێـدا پەیـدا کـردووم و، بـۆ ئاکارێکتـان ناچـار کـردووم، کـە هـی مـن نەبـوو!

**چـوارەم:** وەک یادکـردن و باسـکردنی نیعمەتـی خـوا (التحـدث بنعمـة اللـه) دەڵێـم: سـتایش و سوپاسـی بێپایـان بـۆ خـوا (سـبحانه وتعالـى) کـە پـاش سـەرنجدانەوەی ئـەو بەرهەمانـەم، کـە لـە سـەرەتای تەمـەن و، دەسـتبەکاربوونم لـە مەیـدان کاری ئیسـلامییدا نووسـیومن، بـۆم دەردەکـەوێ و دەبینـم: کـە خـوای بـە بەزەیـی هـەر لـە سـەرەتاوە، لوتـف و کـەرەمـی لەگـەڵ نوانـدووم

و، لـه ناسـینی ئیسـلامدا بـه هـەردوو بابەتـی سـەرەکی عەقیـدەو شـەریعەتەوە بـه شـێوەیەکی بنەڕەتیـی و وەک هێڵـه گشـتییەکان، نیشـانم پێـکاوەو، پێـم بەمـلاولادا نەخلیسـکاوە، بـەڵام بێگومـان لـه وردە بابەتانـدا، کـەم وکـووڕیـی و کـرچ وکاڵیـی هەربـووەو هەردەشـبێ.

ئاشـکراو ڕوونیشـه کـه چاکـەو نیعمەتـەکان، هەموویـان سـەرچاوەکەیان بـەس خوایـه، وەک فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ...﴾ (النحـل- ٥٣).

کـەم وکووڕیـی و هەڵـەو پەڵەکانیشـمان لـه خۆمانـەوەن، وەک خـوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿..وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ...﴾ (النساء- ٧٩).

**پێنجـەم:** هێنـدەی هەمـوو دنیـا دڵخۆش دەبـم، کاتێـک گوێبیسـتی برایـەک یـان خوشـکێک دەبـم، کـه کتێب و نامیلکەیـەک یـان وتـارو دەرسـێک بەنـدە، بۆتـه مایـەی بەرچاوڕوونبوونـەوەو، لـه خـوا نزیـک بوونـەوەی و، لـه خـوای بـه بەزەییـش داواکارم، کـه ئـەم کتێبـەو کتێـب و بەرهەمەکانـی دیکەشـم، هێزوپێزی ئەوەیان تێدابێ کـه بەردەوام مایەی هیدایـەت و بەرچاوڕوونیـی بـراو خوشـکانم بـن، بەتایبـەت گەنـج و لاوە خوێـن گـەرم و خۆشەویستەکانمان، کـه زۆر داخ و مەخابـن، تەوژمـی سیکۆلاریسـت بـه هەمـوو وزەو توانایەکییـەوە، شـەو و ڕۆژ سـەرگەرمی لـه خوا دوورخسـتنەوەو، ئیسـلام تێدا کاڵکردنەوەیانە!

لـه کۆتاییشـدا لەبەر ڕۆشـنایی فەرمـوودەی پێغەمبـەری خـوا (صلـى اللـه عليـه وسـلم) دا کـه فەرموویەتـی: {مَـنْ لَـمْ يَشْـكُرِ النَّـاسَ لَـمْ يَشْـكُرِ اللَّـهَ} (أخرجـه أحمـد برقـم: ١١٢٩٨، والترمـذي برقـم: ١٩٥٥، وقـال: حسـن صحيـح، وأبـو يعلـى برقـم: ١١٢٢، والطـبراني برقـم: ٢٥٠١، قـال الهيثمـي (١٨١/٨): رجالـه رجـال الصحيـح)، واتـه: هـەر کـەس سوپاسـی خەڵکـی نـەکات، سوپاسـی خـواش نـاکات، دەڵێـم: پـڕ بـەدڵ سوپاسـی هەمـوو ئـەو بـرا بەڕێـزو دڵسـۆزانە دەکـەم، کـه بـه شێوەیەک لـه شێوەکان، دەستیان لـه بـه چاپ گەیاندنی ئەم کتێبـەو کتێب

و بەرهەمەکانی دیکەی بەندەدا هەبووەو هەیە، بەتایبەت هەردوو برای بەڕێزو دڵسۆزم (مامۆستا حەسەن بابەکر)و کاک (نەوزاد کۆیی) کە وێڕای سەرقاڵیی زۆریشیان، هەڵەگیرییەکی وردی ئەم کتێبەو هەر شەش بەرگی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) و چەند کتێب و بەرهەمێکی دیکەشیان بۆ کردووم و، کاتێکی زۆریان بۆ گێڕاومەوە، خوا بە چاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوەو، سەربەرزی دنیاو سەرفرازی ئەولاشیان بکات.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ . وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ

وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

نووسەر

شەممە (٨)ی ڕەبیعی دووەمی (١٤٢٩)ی کۆچی

(١٤)ی نیسانی (٢٠٠٨)ی زایینی

هـــــــــــــــــــــــــــــــەولێر

## ئەم کتێبەو ئاوڕێك لە ڕابردوو و سەرنجدانێکی ئەمڕۆ

الحمدلله، والصلاة والسلام على رسول الله محمد، وێله المهتدين بهداه من الصّحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم إلى لقاء الله.

خوێنەری بەڕێز !

ئەم کتێبەی بەردەستت سەرگوزشتەیەکی تەمەن پازدەساڵەیی هەیە، کە من دەمەوێ لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا، بۆت پوخت و کورت بکەمەوە:

سەرەتای نووسینی ئەم کتێبە لە ساڵی (١٩٨٥)ی زایین دا بوو لە گوندی (سەرسیان)ی ناوچەی (بەری مەرگە)ی سەر بە ناحیەی (بنگرد) کە ئەوکاتە بەندە تازە ماڵ و خێزانم پێکەوە نابوو و، لەبەر چەند هۆیەک بۆ حەوانەوە شاری (ڕانیە)م بەجێهێشتبوو و، ڕووم کردبووە ئەو دێیە، بەهۆی هەبوونی چەند دۆست و برایەکی دڵسۆزو خۆشەویست لەناوچەکەدا بەگشتی و، لەدێی (سەرسیان) بەتایبەت، بۆ وێنە؛ (مامۆستا مەلا سەید عبدالرحمن) لۆتەری ئیمام و خەتیبی گوند و کاک (عبدالرحمن شێخ محمود) کە ئەمیش هەر لە سەیدەکانی لۆتەر بوو و سەرقافڵەی چوار شەهیدەکانی قەڵاتووکان و سەرگردی (ڕەمکان)یشە[1]، خوا بە شەهیدی وەرگرتبن و پلەو پایەیان بەرز بکاتەوە، کۆتایی پێهێنانی نووسینیشی لە

---

(١) ئەو چوار شەهیدە «إن شاء الله» بریتی بوون لە: ١- مامۆستا عبدالرحمن حاجی شێخ محمود لۆتەریی. ٢- کاک أحمد شاسوار حاجی حەمەدەمین سکتانیی. ٣- کاک عمر بۆسکێنیی. ٤- کاک طاهر مەمەنداوەیی، کە لە (١٩٨٨/٧/٢١ز)دا، شەهیدبوون.

ساڵی ١٩٨٦ی زایینیدا بوو، له‌ گوندی (گه‌ڵووی ماخۆبزنان)ی ناوچه‌ی (پشده‌ره‌ ڕه‌قه‌)ی سه‌ر به‌ ناحیه‌ی (سه‌نگه‌سه‌ر)، که‌ پاش ماڵ و حاڵ لێ تێکچون و ئاواره‌بوونم له‌ سه‌رسیان، تێیدا سه‌قامگیر بووبووم.

ئنجا لێره‌دا حه‌ز ده‌که‌م: هه‌م وه‌ک تۆمارکردنی که‌مێک له‌ بیره‌وه‌رییه‌ تاڵه‌کانم و، هه‌م وه‌ک تیشک خستنه‌ سه‌ر بارودۆخی تێدا نووسرانی ئه‌م کتێبه‌، چه‌ند شتێک له‌وباره‌وه‌ بنووسم:

له‌و سه‌روحه‌ده‌دا رژێمی عه‌لمانی ڕه‌گه‌زپه‌رستی به‌عس، له‌ گه‌رمه‌ی شه‌ڕی شووم و هه‌شت ساڵه‌ی خۆیدا بوو، دژ به‌ کۆماری ئیسلامیی ئێران، به‌ نه‌خشه‌کێشان و ده‌ست له‌پشت دان و هاوکارییکردنی ژماره‌یه‌ک له‌ وڵاتانی ڕۆژئاوا، خه‌ڵک و جه‌ماوه‌ری کوردستانیش که‌ ماوه‌ی چه‌ند ساڵێک بوو، زۆربه‌ی هه‌ره‌زۆری دێهاته‌ سنورییه‌کان خزێنرابوونه‌ ئۆردوگا زۆره‌ملێیه‌کانه‌وه‌، بۆ ئه‌وه‌ی هه‌م خه‌ڵکی له‌ ئه‌نجامی بێ کارو که‌سابه‌تیی و بێده‌رامه‌تییدا، ناچاری سیخوڕیی و جاشایه‌تیی بن بۆ رژێم و، هه‌م به‌پێی سیاسه‌تی زه‌وی سووتاو (الأرض المحروقة)ش، شۆڕشی چه‌کداریی و ڕاپه‌ڕینی رزگاریخوازیی خه‌ڵک و جه‌ماوه‌ر، په‌کی بخرێو، له‌ ڕیشه‌ بهێنرێته‌ ده‌ر، به‌هۆی نه‌مانی په‌ناگه‌و حه‌شارگه‌ی دێهات و چیاوچۆڵه‌کان، که‌ هه‌میشه‌ کانگاو سه‌رچاوه‌ی به‌هێزوپێزی شۆڕش و ڕاپه‌ڕینه‌کانی کورد بوون.

جا له‌ ئاوا بارودۆخێکدا، که‌ زۆربه‌ی خه‌ڵک و جه‌ماوه‌ر له‌ سۆنگه‌ی[1] ئیمان کزیی و نه‌شاره‌زایی له‌ ئیسلام و، فشارو تۆقاندنی ڕژێم و، نه‌داریی و نه‌بوونیی کاروکاسبیی و، ته‌ماع و پاره‌وپوول خڕکردنه‌وه‌و خۆشگوزه‌رانییه‌وه‌، ڕژێمی دیکتاتۆری به‌عس، چه‌نگاڵی پیسی خۆی له‌ قوڕقوڕاگه‌ی میلله‌ت گیرکردبوو و ته‌واو ته‌واو فززه‌ی لێبڕیبوو، خه‌ڵکێک که‌ چه‌واشه‌کاریی و

---

(١) بێگومان ئیمان کزیی و نه‌شاره‌زایی له‌ ئیسلام خاڵی هاوبه‌شیان بوو، هۆکاره‌کانی دیکه‌ش که‌م و زۆر له‌ هه‌موویاندا هه‌بوون و، هه‌شبووه‌ یه‌کێکیانی تێدا زاڵتر بووه‌و زه‌قتر بۆته‌وه‌.

تـرس و تەماعـی بەعـس نەیتوانیبوو بیانکاتـە دیـل و کۆیلەو، بیانخاتـە ژێـر ڕکێفـی خۆیـەوەو، دووچـاری بەزیـن و تێکشـکانی دەروونـی و تەسـلیم بوونـی ئەمـری واقیـع نەبووبـوون، خواخوایـان بـوو ئەگـەر بـە خەونیـش بێـت، هەواڵـی جموجۆڵ و چالاکی شۆڕش و بەرخۆدان و بەرەنگاریی ببیستن و، بە بیستنی نـاوی شـۆڕش و پێشـمەرگە، شاگەشـکە دەبـوون!

بەڵـێ لـە هەلومەرجی ناوبـراودا، بەهـۆی کەمتەرخەمیـی و هیـچ لەدەست نەهاتـن و لەبارانـدا نەبوویـی ئەوانـەوە، کـە بـە چاوسـاغ و پێشـەواو مشـوورخۆری ئیسلام و مسوڵمانان ناسرابوون، چ لە بەرگی مەلاو شێخەکان و، چ لە بەرگی ئیسـلامییەکاندا[1]، چ لـە ڕووی تیۆریـی (نظري)یـەوە، وەک ڕوونکردنـەوەی ڕاستییەکان (حقائق)ی ئیسـلام و، پووچاندنـەوەی بۆچوونـە هەڵـەکان (أباطیـل) ی نەیارو ناحەزەکانیـەوە، چ لـە ڕووی کردەیی و مەیدانییـەوە، وەک بەرگریـی کـردن لـە ستەمدیدەیی و چەوساوەیی و بێقەوارەیـی کـورد[2]، بەڵـێ لە سۆنگەی ئـەوەوە ئەوکاتـە بـازاڕ هـەر بـازاڕی ڕێچکـەو کوێـرەڕێ و بیـردۆزەو میـردۆزەکان

---

(١) دیـارە کـەم و زۆر هـەم لـە نێو مـەلاو شێخەکانداو، هـەم لـە ڕیـزی ڕۆشـنبیرە ئیسـلامییەکاندا، کەسـانی هەڤبێژو چالاک هەبـوون، بـەڵام لـەوە کەمتـر بـوون، تـەوژم (تیّار)ێـک دروسـت بکـەن و، دیـارە بـە گوڵێکیـش بەهـار نایـەت و تاقەسـواریش تـۆزێ نـاکات!

(٢) دیـارە کەسـانێک هەبـوون لـەم بوارەشـدا قسـەو کـاری خێریـان بـووە، بـەڵام نـە لـە ئاسـتی پێویسـتدا بـووەو نـە بـەو ئەندازەیـەش بـووە کـە تەوژمێـک پێـک بێنـێ، ئنجـا ئـەوە کـە «جگـە لـەم دوادواییانـە» سـەرجەم سـەرکردەو سـەرقافڵەکانی شـۆڕش و ڕاپەڕینەکانـی خەباتـی ڕزگاریخوازیـی کـورد کەسـایەتیی مسـوڵمان و دینـدار بـوو ون، هەروەهـا ئـەو خەڵکـەش کـە بوونەتـە سـووتەمەنی شۆڕشـەکان، لەگـەڵ ئـەوەی ئێمـە مەبەسـتمانە دژ نیـە، چونکـە مسـوڵمان بوونـی تـاک تـاکی خەڵکـی شـتێکەو، ئیسـلامیی بوونـی شـۆڕش و خەبـات و کیـان و قـەوارەو سیسـتمی ژیـان و گوزەرانیشـیان، شـتێکی دیکەیـە. هەرچەنـدە مسـوڵمانەتی ڕەسـەن و ڕاسـتەقینە هەمیشـە، ئیسـلامیبوونی هەڵسـوکەوت و هەڵوێسـت و کـارو چالاکییـەکان پەلکێـش دەکات و، هـەر ناتەواوییـەک لـە ئیسـلامیی بووندا دەگەڕێتـەوە بـۆ کـەم وکوڕیـی لـە مسـوڵمانەتییدا، کـە دیـارە مەبەسـتمان لـە مسـوڵمانەتیی حاڵەتـی دینداریـی شەخسـییەو، مەبەسـتیشمان لـە ئیسـلامیی بـوون، حاڵەتـی دینداریـی کۆمەڵایەتییـە.

بـوو، بەتایبـەت چەپیەکانی وەک: مارکسـیزم و ماویـزم، کـە بـە شـێوەیەک ڕمێـن و ڕەواجیـان کەوتبـووە سـەرو بازاڕیـان قەڵەباڵـغ و گـەرم بووبـوو، هـەر دەستەو تاقمێکی سیاسی ئەگـەر لـە بنەڕەتدا حیزبێکی بـە ڕواڵـەت نەتەوەیی یـان بنەماڵەیی و خێڵەکییش بووایـە، بـەڵام هـەر چۆن بـووە، هەوڵی دەدا کـە بەشـی لـەو مۆدێلە تازەیـەدا ببووایـەو، لـە پەیڕەووپڕۆگرامی خۆیـدا دەینووسی: کـە ئێمـەش پشـک و بەشـمان لـە مارکسـیزم و لینینزمـدا هەیـەو، مێشـکی کادیرەکانـی خۆمانـی پـێ ئـاو دەدەیـن!!)[١] لـە ڕاسـتیدا ئەوکاتـە هێنـدە بانگەشەو چاوڕاوی بێڕەزاو بێبناغـە بۆ بلۆکی ڕۆژهـەڵات دەکرا، کـە ئەوسا لـە یەکێتی سۆڤیەت و چیندا خۆی دەنواند، کـە خەڵکی کـورد و جەمـاوەری تاسـاوو چەواشـەکراو، لـە سەداسـەد قەناعەتـی وابـوو، کـە کوردەکانـی بەشـە کوردسـتانی یەکێتـی سۆڤیەت، هـەر بەڕاستیی لـە بەهەشتی سۆسیالیزم دان و، هەمـوو مافـە سروشتیی و ڕەوایەکانیـان، زۆریش بەزیـادەوە دابیـن کراون[٢]! جـا بۆیـە ئـەو کاتـە هـەر کەسـێک پشـک و بەشـی لـەو مۆدیلـە نوێیـە (مارکسـیزم، سوسـیالیزم)دا نەبووایـە، بـە دواکەوتـوو و کۆنەپەرسـت و سـەر بـە بلووکـی سـەرمایەداریی و (کاپیتالیـزم) نـاوزەد دەکـراو، بەجارێـک لێـی لـە هەراوهۆریـا دەدرا!! تەنانـەت ئەگـەر بابایەکی عەلمانییش هـەر گوتبـای: ڕەنگـە شـیوعییایەتی و مارکسـایەتیش هەندێـک شـتی هەڵەیـان تێـدا بـێ، هـەر ئەوەنـدە قسـەیە بـەس بـوو، بـۆ بـە کۆنەپەرسـت (رجعي) لەقەڵەمدانـی و ناوزڕێنرانی و، جەنـگ لـەدژ بەرپاکرانی و، هەوڵدان بۆ دەرکردنی لەنێو ڕیزی

---

(٣) پارتی دیموکراتی کوردستان، لەڕاپۆرتی کۆنگرەی نۆیەمیدا، وای نووسیبوو.

(٢) بـەڵام پاش لەیـەک هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت و، نەمانی شـوورەو دیـواری ئاسـنینی دەوری کۆمەڵگاو میللەتەکانـی ژێـر ڕکێفـی ڕژێمـی مارکسـیزم و سیسـتمی سۆسـیالیزمیی، لێفـە لەسـەر هەتیـوان هەڵدرایـەوەو، هـی بـن بـەڕێ هاتـە سـەر بەڕێـو، ئاشکرابوو کـە هەرچی برادەرانـی شـیوعی و کۆمۆنیسـت و مارکسیسـت، دەربـارەی سۆسـیالیزم گوتوویانـە، نـەک هـەر درۆو دەلەسـە، بگـرە ڕاسـت بـەراوەژوو و پێچەوانـەش بـووە!! پێشـینانیش گوتوویانـە: مەیدانـی درۆیـە کورتـە!

نەک هەر رۆشنبیران و نووسەرانی کورد، بگرە هەر لێستاندنەوەی ناسنامەی کوردایەتییشی[1]!

بە کورتیی و بە کوردیی:

لەو سەروحەدو هەلومەرجەدا، زۆربەی هەرەزۆری خەڵک و میللەت بە ڕووباری ستەم و کوفرو فەسادی رژێمی بەعسدا چووبوون و، بۆ خۆگرتنەوەش دەستیان بۆ چڵەپووشەکانی ڕێچکەو بیردۆزەکان بەتایبەت مارکسیزم بردبوو، پێشیان وابوو یان ڕاستتر بڵێین: واشیان لەگوێ چکێنرابوو، کە جگە لە تەسلیم بوون بە ئیرادەی بەعس و سیخوڕیی و کرێگرتەیی بۆ کردنی، یان ڕووکردنە بیردۆزە چەپیەکان و پشت لە خواو ئیسلام کردن، ڕێیەکی سێیەمیان لەبەردەمدا نیەو، هیچ چارەو دەرەتانێکی دیکەیان نیە.

---

(١) لێرەدا پێویست ناکات نموونە بە مامۆستا مەلا محمدی شارەزووریی بێنمەوە، کە بابایەکی مەلاو ئیسلامیی بوو، خوا لێی خۆش بێو پاداشتی بەرزی بداتەوە، کە چەندان نووسین و بەرهەمی چاکی هەبوون بۆ بەرپەرچدانەوەی چەپییەکانی کوردستان، وەک: (ڕێکەوت لە تەرازووی ژیریدا)، (سروشت لە تەرازووی ژیریدا)، (داروین لە تەرازووی ژیریدا)، (فرۆید لە تەرازووی ژیریدا)، بەڵکو بابایەکی وەک مامۆستا (مسعود محمد) کە کوڕی مەلای گەورەی کۆیە (مامۆستا مەلا محمدی جەلی زادە)یەو، وێڕای خۆ بە مسوڵمان زانینی، هەر خۆی بە عەلمانیی دەزانیێ، کەچی لەبەرئەوەی لە چەند کتێب و نووسراوێکی وەک (حاجی قادری کۆیی) و، (مرۆڤ و دەوروبەر)دا هێرشی بەڵگەداری کردبووە سەر کۆمۆنیزم و مارکسیزم، برادەرانی مارکسیست و کۆمۆنیستی، هێندیان لەسەر گوت و نووسی، هەتا کڕکڕەیان شین بوو و، قەڵەمەکانیان سووان و وەخت بوو بڵێن: نەک هەر خوێندەوار، بەڵکو کوردیش نیە!

بۆیەش نموونەم بە مامۆستا شارەزووریی ڕەحمەتی نەهێنایەوە، چونکە بابایەکی ئیسلامیی بووە، ئەگەرنا ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەوسایان لەویش پڕ کردن و هەراو گاڵەی زۆریان لەگەڵ کرد، جا ئەگەر ئەوەی مامۆستا شارەزووریی پاساوی جیاوازی ئیدۆلۆژیی هەبوو، خۆ ئەوەی مامۆستا (مسعود محمد) ئەو پاساوو بیانووەشی نەبوو، بەڵکو تەنیا بە بەرزو پیرۆزو بێهەڵەو پەڵە زانینی مارکسیزم و کۆمۆنیزم بوو، کە ئەو هەڵوێست و حەساسیەتە بێمانایەی تێدا هێنابوونە دی و، دڵگەرمییان بۆ کۆمۆنیزم و مارکسیزم، نەک هەر کوردایەتیی، بگرە عەلمانییەت (سیکۆلاریزم) کە جادەی گشتی و خاڵی هاوبەشیان بوو و، تەنانەت مرۆڤایەتیی و مافی مرۆڤیشی، لەبیر بردبوونەوەو، وەک لاوکبێژیی کارامە ئەوەی دەیانگوت، نەیاندەگوتەوە.

**بەڵێ خوێنەری خۆشەویست !**

بارودۆخ و کەشی سیاسیی و فیکریی کوردستان بەوشێوەیە بوو، کە بەندە زنجیرە باس و بابەتێکم نووسین بۆ بەرگریی کردن لە ئیسلام و پووچەڵکردنەوەی ڕێچکەو بیردۆزەکان و، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە لە نێوان ڕووباری ستەم و زۆری بەعسی فاشیست و، دڕندەو چڵەپووشی ڕێچکاندا، شتێکی دیکە و بەدیلێکی دیکە هەیە، ئەویش پردی ئیمان و، هەوارگەو مەنزڵی ئیسلام و، سایەو سێبەری شەریعەتی خوای دادگەرو بەخشەرو میهرەبانە.

بەڵێ هەرکام لە: (پوختەیەک دەربارەی ئیسلام) کە لە ساڵی ١٩٨٤ز دا چاپ کراو، (دەبەرێک ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان) کە لە ساڵی ١٩٨٥ز دا چاپ کراو، (یادی خودا؛ گرنگیی یادی خودا لە ژیانی مرۆڤدا) کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٧زدا چاپ کرا، هەرکامێکیان یەکی (٥٠٠٠) دانە، هەروەها (سۆزی نەتەوایەتی) کە دواتر لە شاخ چاپ کراو، زنجیرەی: (با چاکتر ئیسلام بناسین) و (کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟!) کە دیسان دواتر لە شاخ چاپ کران و، (دادگەری کۆمەڵایەتیی) کە ئێستاش هەر دەستنووسە، تێکڕا لەو هەلومەرجەدا نووسراون کە باسم کرد.

ئێستاش پاش ئەم ئاوڕدانەوەیە بۆ ڕابردوو، با سەرنجێکی ئێستاشمان بدەین، تاکو حیکمەت و هۆی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە لەم قۆناغەدا بخەینە ڕوو:

پاش هەرەسهێنان و، لەبەریەک هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەتی، بە زەبری ئاگرو ئاسن و هێرش و پەلاماری دەبابەو دابەزاندنی چەتربازان (مظلات) پێکەوە نووسێنراو، زۆربەی هەرەزۆری - ئەگەر نەڵێین تێکڕای- پێڕو تاقمە کۆمۆنیست و مارکسییەکان لە کوردستان و جیهانی ئیسلامدا بە گشتیی، لە سۆنگەی ئەوەوە کە زیاتر لەسەر بناغەی وەهم و لاسایی

کردنـەوەو عاتیفـە بنیـات نرابـوون، نـەک وەک ئیددیعایـان دەکـرد (عیلـم و فەلسـەفە)!! وەک داوەڵـی چەقێنـراو، کـە گێژەڵووکـەو بایەکـی بەهێـز لێـی دەدات و، سـەرەوبن دەبـێ، یـەک لـەدوای یـەک ڕووخـان و شـوێنکەوتووانیان پـرژو بـڵاو بـوون!

بگـرە هەندێـک لـە سـەرانی ئـەو پێـڕو تاقمانـە، کـە هەتـا دوێنـێ دەیانگـوت: مارکسـیزم حەقیقەتـی موتڵـەق و نەگـۆڕی تێدایـە[١]! بـە ڕاشـکاویی دانیـان پێدا هێنـاو گوتیـان: بەڵـێ هەتـا دوێنـێ شـوێنی بیـردۆزەی مارکسـیزم کەوتبوویـن، بـەڵام (ئەمـڕۆ عەقڵمـان پەیـدا بـووە)!!

ئیـدی ئێمـەو مانانـی ئیسـلامیی، کـە پێشـتر بـە پێویسـتمان دەزانـی بـۆ بەرپەرچدانـەوەی قسـەوقاڵ و پڕوپاگەنـدە ژەهراوییەکانـی کۆمۆنیسـت و مارکسیسـتەکان، بابەتـی وەک: (سـەلماندنی بوونـی خـوا) و (ئیسـلام وریاکەرەوەیـە نـەک تلیـاک) و (ئیسـلام ئیسـلامە، نـە ئایدیالیزمـە نـە ماتریالیـزم)[٢] بنووسـین، برادەرانـی چـەپ گـەرا (الیسـاریون) هـەر بـۆ خۆیـان لـەو خەمەیـان ڕەخسـاندین و، ئـەو گرفتەیـان لـە کـۆڵ کردینـەوە، پێشـتر چەنـد بەگـوڕو تیـن و دڵگەرمیـی، وەک دێوانـەی تـازە تەریقـەت وەرگرتـووی جەزبـە لێهاتـوو، بەرگرییـان لـە ڕێچکـەی کۆمۆنیزم و مارکسـیزم دەکـرد و، نەفرەتیـان لـە جیهانـی سـەرمایەداریی و بلووکـی ڕۆژئـاواو فەلسـەفەی کاپیتالیـزم دەکـرد، ئەمجـارەش هێنـدە بەگـوڕو تیـن، بـەڵام بـە پێچەوانـەوە، کەوتنـە ڕەخنەلێگرتـن و توانـج و پـلار تێگرتنـی کۆمۆنیـزم و سۆسـیالیزم و مارکسـیزم و، مـەدح و

---

(١) لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە بناغـەو بڕبـڕەی پشـتی مارکسـیزم (ماتریالیزمـی مێژوویـی)و (ماتریالیزمـی دیالیکتیکی)یـن، کـە دەڵێـن: هیـچ حەقیقەتێکـی موتڵـەق بوونـی نیـەو، هەمـوو شـتێک لـە گـۆڕان (تطور)دایـە!!

(٢) ناوونیشـانی وتوێژەکانـی: یەکـەم و سـێیەم و دووەمـی زنجیرەی: (ئیسـلام و ڕێچکان)ن، کـە لـە سـاڵی ١٩٨٥ز لـە بەغـداو، پاشـان بـۆ جاری دووەم لـە (سـەقز) ١٩٨٨ز چـاپ کـراوە، جاری سـێیەمیش نووسـینگەی تەفسـیر لـە هەولێـر لـە ٢٠٠٥ چاپـی کـردەوە.

پێهەڵاگوتنی جیهانی ڕۆژئاواو، ڕێچکەو بیردۆزەکانی وەک؛ کاپیتالیزم و لیبرالیزم و سیکۆلاریزم و سۆسیال دیمۆکراسیی!!

ئیدی لەوکاتەوە، بەندە کە پێشتر دوو ئامانج (هدف)م لە نووسینەکانمدا لە بەرچاو گرتبوون:

أ/ ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانی ئیسلام و، هۆشیارکردنەوەی خەڵک و تێگەیاندنیان.

ب/ پووچەڵکردنەوەی ناهەقییەکانی ڕێچکەو بیردۆزەکان و، پەردە لەسەر هەڵماڵینی ئەفسانەکانیان.

ڕووی قەڵەمم لە ئامانجی دووەم وەرچەرخاند و، وزەو توانایم بۆ ئامانجی یەکەم تەرخان کرد و چەند بەرهەمێکی وەک: (ڕێگای صالح بوون و بەرەوخوا چوون)[1] و (ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کامەیە؟!)[2] و (چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پارلەماندا)[3] و (پرۆژەی

---

(١) کە جاری یەکەم لەساڵی (١٩٩٠) و، جاری دووەم لە هەولێر لە ساڵی (١٩٩٦) چاپ کرایەوەو، جاری سێیەمیش لە ساڵی (٢٠٠٠) و، جاری چوارەمیشی لە (٢٠٠٥) لە هەولێر کراوەو ئێستاش خەریکی چاپی شەشەمینیشی.

(٢) کە لە ساڵی (١٩٨٩) لە (خدراوا) چاپ کرا.

(٣) کە لە ساڵی (١٩٩٢) و لە گەرمەی هەڵبژاردنی پارلەماندا، نووسراو چاپ کرا، کە لە یەکێک لە پێشبینییەکانی ئەو کتێبەدا گوتوومانە: (... دەجا پارلەمان و بابی پارلەمانیش، توانای گۆڕینی ئەو واقیعە دەروونیی و زاتییەی ئێمەی نیە، بگرە بە پێچەوانەوە، وەک تەجرەبەی سەرنەکەوتووی (بەرە: الجبهة) سەلماندی، ڕەنگەو زۆریش نێزیکە کە پارلەمانیش دیسان ببێتە هۆی زیادبوون و گەشەکردنی ئەو خەسڵەتە بەدو هۆکارە دەروونیی و زاتییانەی، کە گەورەترین هۆی بێئاکام بوون و بەئەنجام نەگەیشتنی هەوڵ و کۆششی جووڵانەوەی ڕزگارییخوازیمان بوون، بەتایبەتی لە ئاستی سەرکردایەتییدا، چونکە کەموکوڕیی و عەیبەکانی سەرکردایەتی ڕاستەوخۆ، کاردەکەنە سەر هەموو بەشەکانی دیکەی گەل و شۆڕش، وەک ئێستا بە زەقیی دەبینرێ) بڕوانە لاپەڕە (٦١) چاپی یەکەم/ ١٩٩٢ز.

بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی)[1] و (مسوڵمانی کامڵ)[2] و (چەند ڕێڕوونییەک بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان)[3]..م نووسین.

کەچی وەک پێشینان گوتوویانە: (ماڵان باریان دەکرد، گولە تازە کەپری دەکرد!) پاش لێک هەڵوەشانی یەکیەتی سۆڤیەت و، هەرەسهێنانی ئەفسانەی بەناو فەلسەفەی سۆسیالیزم و مارکسیزم لەسەر زەوی واقیع - کە پێشتر لە عەقڵ و هۆشی عاقڵ مەندانداا هەرەسی هێنابوو- و کەوتنی داوەڵە داکوتراوە خۆماڵییەکانی کوردستان و غەیری کوردستانیش، لێرەو لەوێ چەند کەسێکی تاک و تەرا کەوتنە قاڵەقاڵ و دروستکردنی جەنجاڵ و هەرا، بەناوی کۆمۆنیزم و مارکسیزمەوە، ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەستیان کردوەو دڵنیان، ئەو ڕێچکەو بیردۆزەی هەراو بانگەشەی بۆ دەکەن، لەمێژە وەک قوماشی ناجسن سپات بۆتەوەو ڕەنگەکەی چۆتەوەو ئیفلاسی کردوەو، ڕووی نابووت و بیچمی دزێوو ناشیرینی بە جۆرێک بۆ خەڵک و جەماوەر دەرکەوتوەو، دەمامکی لەسەر وەلا کەوتوە، کە هیچ کەس پوولێکی قەڵبیشی پێ نادات، بەڵێ لەو سۆنگەیەوە، وەک پوور مەنیج[4]، خۆیان بەناچار بینی، کە بۆ دەوری خۆ قەڵەباڵغ کردن و، بازاڕی بێرمێنی خۆ گەرم کردن، ئەگەر بە مەدح کردن و پێهەڵاگوتنی

---

(١) کە لە ساڵی (١٩٩٦) لە هەولێر چاپ کرا.

(٢) کە لە ساڵی (١٩٩٧) لە هەولێر چاپ کرا.

(٣) ئەمیش هەر لە ساڵی (١٩٩٧) لە هەولێر چاپ کرا.

(٤) لەگوندێکی کوردستان ژنێک هەبووە بەناوی پوور مەنیج، ئەو ژنە زۆر نالەبارو بەدئاکار بووەو، هیچ شتێکی چاکەی لێ باس نەکراوە، جا ئەو ژنە هەموو بەیانییەک زوو چۆتە سەر کانی و سەرچاوەی ئاوایی لێڵ و شلوێ کردوە! ئنجاکە لێیان پرسیوە: بۆچی وا دەکەی؟! لە وەڵامدا گوتوویەتی: ئاخر کەسی پووری، هەموو کەس چاکەو خێرێکی هەیە کە پێیەوە بناسرێو باسی بکرێ، منیش کە هیچ چاکەو خێرێک شک نابەم، خۆ دەبێ شەڕو خراپەیەکی وام هەبێ پێوەی بناسرێم و باسم بکرێ!!

بیردۆزەو ڕێچکەکەی خۆیان، ناگونجێ هیچ بەهیچ بکەن، با بەلای کەمەوە بەهۆی: (کانیی و سەرچاوەی ئاوایی لێڵ کردن)ەوە ئەو مەدارە ساز بکەن و، بەوجۆرە کەوتنە جنێودان و قسەی ناشیرین و سووکایەتییکردن بە ئیسلامەتیی و مسوڵمانەتیی و، لەخواو پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) پێداهاتن، هەتا مەلا!!

ئنجا وەک پێشتر گوتم: هەرچەندە ستایش بۆ خوا پانتایی کارو چالاکییەکانی هۆشیاریی و بێداریی و هەڵسانەوەی ئیسلامیی، هێندە پان و پۆڕو هەمەلایەنەیە سەرگەرم بوون بە ڕێڕوونیی کردن و مشوور لێخواردن، تەواو سەرقاڵی کردووین و نامان پەرژێتە سەر وەڵامدانەوەی دەمکوتکردنی دەنگ و سەدای ناسازو جاڕزکەری ئەو تاک و تووکانەی کە پەندی: (بۆتە ڕبە شرە، هیچ کەس پێی نەدەپێوا، لە خۆڕا دەیگوت: ئەوە شازدەو نیو) پڕ بەپێستیانە، بەڵام لەم ڕۆژانەدا چاوێکم بە کتێبخانەکەمدا گێڕاو دەستنووسی: (گەورەترین ڕاستیی - بەرگی یەکەم)م کەوتە بەرچاو و، پاش تێوەڕامانێکی ئەم و، سەرنجدانێکی واقیعی ئێستامان، دڵنیابووم کە وەڵامی پڕ بەپێست و دەمکوتکەری ژاوەژاوی ئەو جۆرە کەسانەی، لەزۆر ڕووەوە گرتۆتە خۆ، وێڕای ڕوونکردنەوەی چەندان ڕاستیی بەرزو مەزن، دەربارەی بەرنامەی بێهەڵەو پەڵەی خوای بێوێنەو هاوەڵ.

بەڵێ وەک چۆن مامۆستای پایەبەرز (بدیع الزمان) مەلا سەعیدی نۆڕسیی[1] گەلێک جار بۆ وەڵامدانەوەی نەیارو ناحەزەکانی لە قۆناغی

---

(١) مامۆستای ناودارو پایەبەرز مەلا سەعیدی نۆڕسی بە یەکێک لە زاناو پێشەوا هەڵکەوتووەکانی سەدەی بیستەم دادەنرێ و، من پێم وایە لە ریزی (حسن البنا) و (أبو الأعلى المودودي)یە، خوا لێیان خۆش بێ، هەرچەندە وەک پێویست نەناسراوەو، بەهەردو سوود لە بەرهەمەکانی وەرنەگیراوە لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامیی، لەڕاستیدا (رسائل النور)ی ئەو پێشەوا بەڕێزە کە سەرجەم (١٣٠)ی کتێب و نامیلکەن و بەزۆری لە سووڕگەی ئیمان و عەقیدەدا دەسووڕێن، هەرچەندە کەم و زۆر گەلێک جۆرە باس و بابەتی دیکەشیان لەبواری خواپەرستیی و ئەخلاق و تەزکیە تێدا هەن، بە بەرهەمێکی زۆر بەنرخ و شاکارێکی

سەعیدی نوێ (السعید الجدید)دا خۆی دەگێڕێتەوە بۆ قۆناغی سەعیدی کۆن (السعید القدیم)و، بە زمانی وی دەدوێ، منیش لەم کتێبەمدا وام کردووە، بە کەسایەتیی و زمان و شێوازی ئەو ڕۆژگارو هەلومەرجە، ناحەزو نەیارەکانی ئیسلام دەدوێنم و، خوا پشتیوان بێ ئەوانەیان کە بە ویژدانەوەو بۆ دۆزینەوەی هەق و ڕاستی گوێ بگرن، لە زەلکاویی بێدینیی و ماددەو ئارەزووپەرستیی دەردێن و، بەرەو ڕاستەشەقامی دینداریی ڕاست و دروست و بەندایەتیی بۆ خوا کردن، هیدایەت دەدرێن و، ئەوانەش کە قەناعەت هێنانی پێش بیرکردنەوە ڕێی لێگرتوون گوێ بگرن و، هەق و ڕاستییەک کە دێتە بەرچاویان، وەری بگرن، پشتیان لە مەیدانی وتوێژی ژیرانەو زانستییانەدا لە زەوی دەدرێ و، زەبوونانەو دەستەپاچانە لە خۆڵێدا دەگەوزێن و، لەولاش بێنرخانەو ڕیسوابووانە بەرەو دۆزەخ و تۆڵەو جەزرەبەی خوا پاڵەستۆو ڕاپێچەک دەدرێن و، لە سجنی هەتاهەتایی جەهەننەمدا دادەکرێن!

خواش بەکەرەم و بەخششی خۆی، هێزو پێز بخاتە ئەم بەرهەمەوەو بیکاتە مایەی چاوپێچک لاچوونی سەرچاوی زۆر کەس و، دڵ ڕۆشن بوونەوەو بێداربوونەوەو بەرچاوڕوونییان و، بیکاتە مایەی ئیمان گەشەکردن و، چاکتر دڵ دامەزرانی براو خوشکانی مسوڵمان و خاوەن ئیمان و، دەست گیرکردنیان

---

ئیمانیی بەرز دادەنرێن و، ئامۆژگاریی براو خوشکانی ئیسلامییم دەکەم، کە بۆ بەهێزبوون و قووڵبوونەوەی ئیمان و عەقیدەیان و، لە خوا نزیک کەوتنەوەو تەزکیەی نەفسیان و، جوانبوونی ئەخلاقیان و، توندوتۆڵ و تۆکمە بوونی برایەتییان، بە وردو قووڵیی و بایەخ پێدانەوە (کلیّات رسائل النور)ی نۆڕسی بە هەر (٩) بەرگەکانیانەوە بخوێننەوە، کە بریتین لە: (الکلمات، المکتوبات، اللمعات، الشعاعات، الملاحق، سیرة ذاتیة، إشارات الإعجاز في مظان الإیجاز، المثنوي العربي النورسي، الصیقل الإسلامي ورسائل أخرى).

شایانی باسیشە کە مەلا سەعیدی نۆڕسی کوردەو خەڵکی دێی (نورس)ە کە سەر بە پارێزگای (بەتلیس)ە لە کوردستانی تورکیاو لە ساڵی (١٢٩٤)ی کۆچی (١٨٧٦)ی زایینی لەدایک بووە، لەساڵی (١٩٦٠)ی زایینی کۆچی دوایی کردوە.

سوپاس بۆ خوا ئێستا سەرجەم نامەکانی نوور بۆ زمانی کوردیی تەرجەمە کراون. ٢٠١٩/٩/٢٢ز-٢٣ محرم١٤٤١ک.

لە گەلێک بەڵگەی بەهێزو بێ قسەکەر، بۆ وتوێژکردن لەگەڵ کەسانی لاڕێ و سەرگەرداندا.

١١ ربيع الأول ١٤٢١ كۆچی

٢٠٠٠/٦/١٣ زایینی

هەڵەبجە

## سێ ڕوونکردنه‌وه‌ی گرنگ

**یه‌که‌م:** ئیمان و عه‌قیده له‌ ئیسلامدا ده‌وری بناغه‌ (أساس) ده‌بینێو، بێگومان به‌بێ بناغه‌ش دیوار دانانرێ و، ئه‌گه‌ر داشبنرێ بێهێزو له‌رزۆک ده‌بێ و به‌زوویی ده‌ڕووخێ و هه‌ره‌س دێنێ، هه‌روه‌ها هه‌تا بناغه‌ مه‌حکه‌متر و دامه‌زراوتر بێت، ئه‌و دیواره‌ش که‌ له‌سه‌ری هه‌ڵده‌چنرێ، قایمترو نه‌له‌خشاوتر ده‌بێ.

هه‌ر بۆیه‌شه‌ که‌ پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) سێزده‌ (١٣) ساڵی ڕه‌به‌قی له‌ ته‌مه‌نی بیست و سێ (٢٣) ساڵی ته‌مه‌نی موباره‌کی پێغه‌مبه‌رایه‌تیی خۆیدا، بۆ ڕوونکردنه‌وه‌و چه‌سپاندنی ئیمان و پایه‌کانی له‌ عه‌قڵ و دڵی هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزو دڵسۆزه‌کانیدا ته‌رخان کردبوو و، سووره‌ته‌ مه‌ککه‌ییه‌کانی که‌ هه‌شتاوشه‌ش (٨٦) سوره‌تن، له‌ کۆی سه‌دو چوارده‌ (١١٤) سوره‌تی قورئان و، نزیکه‌ی (٢/٣)ی پانتایی قه‌باره‌ی قورئانی به‌ڕێزیان گرتۆته‌وه‌، مه‌به‌ستی ئه‌سڵییان و ئه‌و سوورگه‌یه‌ی که‌ تێیدا ده‌سووڕێن، بریتیه‌ له‌ خستنه‌ ڕووی بووناسیی و ئیمان و عه‌قیده‌ به‌ هه‌رسێک ته‌وه‌ری سه‌ره‌کیی؛ {خوا به‌یه‌ککگرتن (التوحيد) و، وه‌حیی و پێغه‌مبه‌رایه‌تیی (الوحي والنبوة)و سزاو پاداشتی دواڕۆژ (المعاد ويوم الجزاء)}، ئاشکراشه‌ که‌ گرنگیی و بایه‌خ پێدان و داکۆکیی و جه‌خت له‌سه‌رکردنی قورئان، که‌ به‌ پێی زانیاری بێسنووری خواو، ته‌رازووی دادگه‌رانه‌ی هاتۆته‌خوار، بۆ هه‌ر مه‌سه‌له‌و بابه‌تێک، به‌ڵگه‌و نیشانه‌ی ئه‌میه‌ت و زێده‌بایه‌خدار بوونیه‌تی:

﴿ اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ ﴾ (الشورى- ١٧).

**دووه‌م:** هه‌رچه‌نده‌ هه‌تا ئێستا له‌ چه‌ند کتێب و به‌رهه‌مێکمدا باسی چه‌ند لایه‌نێکی ئیمان و عه‌قیده‌م کردوه‌، وێڕای شه‌رح و لێکدانه‌وه‌ی (متن

العقیدة الطحاویة)ی (أبو جعفر الطحاوي)[١] و (سُلّم الوصول) کە (متن)ی (معـــارج القبول)ە،[٢] و هەردووکیان هی (الحافظ الحَکَمي)ن، بەڵام هەر بە ئاواتەوە بووم کە لە دەرفەتێکدا، سەرجەم باس و بابەتەکانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، لە زنجیرە دەرسێکدا بە تێروتەسەلیی بخەمە ڕوو، هەتا ستایش و شوکرانە بۆ خوا، ئەو هەل و دەرفەتە ڕەخساو، خوا ئاسانی کردو، زنجیرە دەرسێک کە سەرجەم پەنجا (٥٠) دەرسی یەک سەعاتیی بوون، لەژێر ناوونیشانی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتدا)دا، پێشکەش کران[٣] و، وێڕای تۆمارکردنی بیستراویی و بینراویی، بە یارمەتی خوا لە شەش بەرگدا چاپیان دەکەین، هیوادارم ئەو کەلێن و بۆشاییە زلەی کە لەو بوارەدا لە کتێبخانەی کوردییدا هەیە، بتوانێ بیگرێ و پڕی بکاتەوەو، ئاواتە لەمێژینەکەی بەندەش بێتە دی[٤].

**سێیەم:** هەرچەندە ئەم کتێبە - خوا یاربێ - بۆ زۆر کەس مایەی بەهرەو سوود وەرگرتن دەبێ، بەڵام ئومێدم وایە کە خەڵکێکیش کە بە هەر هۆیەکەوە بووبێ هەتا ئێستا لە ئایین و پەیام و بەرنامەی خوا دووربوون و، ڕوویان کردۆتە ڕێچکەو بیردۆزەکان بە گشتی و عەلمانییەت (سیکۆلاریزم) بەتایبەت - کە مۆدێلی بازاڕ گەرمی ئێستایە-، ئەم کتێبە بتوانێ دەستیان بگرێ و ببێتە مایەی هیدایەت و بەرچاو ڕوونکردنەوەیان و، گێڕانەوەیان بۆ ژێر سایەی لوتف و بەزەیی خوای دادگەرو بەخشەرو، باوەشی گەرم و

---

(١) کە لە بیست و دوو (٢٢) دەرسی نیوسەعاتییدا لە یازدە کاسێتی (فیتة ٦خمف)دا تۆمارکراون، لە ساڵی (١٩٩٣)دا، دواتر لەلایەن نووسیگەی تەفسیرەوە چاپ کرا بەناو و نیشانی: (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی).

(٢) کە لە ساڵی (١٩٩٩)دا لە بیست (٢٠) کاسێتی یەک سەعاتیدا تۆمار کراون.

(٣) کە لە (٤/صفر/١٤٢١) تا (٦/ربیع الاول/١٤٢١) بەرامبەر بە (٢٠٠٠/٥/٨) تا (٢٠٠٠/٦/٨) لە پەنجا (٥٠) کاسێتی یەک سەعاتیدا تۆمار کراون.

(٤) سوپاس بۆ خوا ئێستا ئەو پەنجا دەرسە لە شەش بەرگ دا چاپ کراون.

پڕ سۆزو پەرۆشی ئایین و بەرنامەکەی و، قوتاربوونیان لە گێژی دەریای بێڕەزایی و دوور لە خوایی.

دڵنیاشم کە ئەم کتێبە دەتوانێ ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات - ئەگەر خوا بیەوێ - بەڵام بە مەرجێک بە هێمنیی و شێنەیی و، بەبێ داوەرییکردنی پێشوەخت بخوێنرێتەوەو بە وردیی سەرنج بدرێ و، بە چاکیی فام بکرێ و هەزم بکرێ.

# ڕێخۆشکردنێکی گشتیی

**خوێنەری سەنگین!**

ئەم کتێبە کە وەک لە سەرگوزشتەکەیدا ئاماژەم پێکرد بەرگی یەکەمی کتێبی (گەورەترین ڕاستیی)یە کە کاتی خۆی زۆربەی نووسرابوو، یان سازو ئامادە کرابوو، بەڵام بەرگەکانی دیکەی لە شەڕو گێچەڵی لابەلای ساڵی (١٩٩٣)دا وەک گەلێک دەستنووسی دیکەدا، وەبەر لێشاوی تاڵان و بڕۆی ئەوساکە کەوتن و، ئێستاشی لەگەڵبێ هەر بزرو بێ سەروشوێنن.

ئنجا من ئەم کتێبەم هەروەک خۆی هێشتۆتەوە، مەگەر چۆنەکایی لە چەند شوێنێک دەستکاریی وشەیەک یان ڕستەو تەعبیرێکم کردبێ، ئەگەرنا دەستم لێنەداوە، کەواتە بەر لە هەر شتێک پێویستە ڕەچاوی ئەم ڕاستییە بکرێ.

ئەم کتێبە دوای ئەوەی بۆ دواجار بڕیارمدا چیدی چاوەڕێی دۆزرانەوەی بەرگەکانی دیکەی نەکەم و چاپی بکەم، ناوەکەیم لە (گەورەترین ڕاستیی)یەوە گۆڕی بۆ (خواناسیی.. ئایین.. ئیمان: ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) کە پێم وایە ناوو نێوەرۆکی پڕ بە پێستی یەکدین.

**باس و بابەتەکانی ئەم کتێبەش ئەمانەن:**

**بەشی یەکەم:** خواناسیی (پاڵنەری ڕاستەقینەی مرۆڤ بۆ خوا ناسین).

کە لە دوو بەند پێک هاتوە:

بەندی یەکەم: فیترەت یەکەمین پاڵنەری مرۆڤە بەرەو خواناسیی.

کە لەبەر تیشکی دەروونناسیی و کۆمەڵناسییدا، مەسەلەی خوارِسک بوونی دینداریی و خواناسیی توێژراوەتەوەو، پاشان لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتیشدا، کورتە سەرنجێکی لێ دراوە.

بەندی دووەم: عەقڵ دووەمین پاڵنەری مرۆڤە بەرەو خواناسیی.

لەم بەندەشدا بەدرێژیی باسی هەر کام لە یاسای هۆکاریی (قانون السببية) کە دەڵێ: (هیچ پەیداکراوێک بەبێ پەیداکەر نابێ - لا يُوجَد حادثٌ بلا مُحدِثٍ-)و، یاسای ڕێک وپێکیی (قانون النظام) کە دەڵێ: (بەبێ ڕێکخەر ڕێک وپێکیی پەیدا نابێ - لا نظام بلا منظِّم-) لێکۆڵینەوەی خەست و خۆڵیان لەبارەوە کراوەو، ڕوون کراوەتەوە: کە هەرکام لەم دوو یاسایە، هەموو خاوەن عەقڵێک - کە ملکەچی عەقڵەکەی بێت - ناچار دەکەن دان بە بوونی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاردا بهێنێ.

**بەشی دووەم:** ئایین (ئایین چییەو، چۆن پەیدا بووەو، بۆچی هاتوە؟!)

ئەمیش لە سێ بەند پێکهاتوە:

بەندی یەکەم: کە بۆ وەڵامی پرسیاری (ئایین چییە؟!) تەرخان کراوە، لە سێ باسان پێکهاتوە؛

باسی یەکەم: پێناسەی ئایین، کە تێیدا هەر کام لە وشەی (دین) و (إسلام) هەم لە ڕوانگەی زمان و، هەم لە ڕوانگەی شەرعەوە توێژراونەوە.

باسی دووەم: نیشانەو دروشمە سەرەکییەکانی ئایین، کە لە حەوت خاڵاندا، حەوت دروشم و نیشانەی گرنگ و بنەڕەتیی ئایین - کە ئیسلامە- خراونە ڕوو.

باسی سێیەم: ئەمیش بریتیە لە پێنج ڕاستیی گەورەو گرنگ کۆتاییان پێ بەو بەندی یەکەمە هێنراوە.

بەندی دووەم: کە بۆ وەڵامی پرسیاری: (ئایین چۆن پەیدا بووە؟!) تەرخان کراوە، ئەمیش لە دوو باسان پێکهاتوە:

باسی یەکەم: وەڵامی ئایین خۆی، کە دیارە مەبەست ئیسلامە.

باسی دووەم: وەڵامی ڕێچکەو بیردۆزەکان، لەم باسەشدا، پێنج بیردۆزەی پووچی نەیارو ناحەزانی ئایینی خوا، خراونە ڕوو، کە بە حیساب چۆنیەتی پەیدابوون و سەرهەڵدانی دیاردەی دینداریی و خواپەرستییان پێ تەفسیر و پاساودار (تبریر) کردوون و، هەر پێنجیشیان بە نشتەری بەڵگەگەلی پتەو، دوومەڵی بە بەز حیساب کراویان تەقێنراوە.

بەندی سێیەم: کە بۆ وەڵامی پرسیاری (ئایین بۆچی هاتوە؟!) تایبەت کراوە، وەڵامێکی تێروتەسەل لە بیست و یەک خاڵدا خراوەتە ڕوو، واتە حیکمەت و ئامانجی نێررانی ئایین و پەیامی خوا، کە هەم هیدایەتە بۆ ئینسان و، هەم بەرنامەو شەریعەتە بۆ ژیان و گوزەران، لە (٢١) خاڵدا خراوەتە ڕوو.

**بەشی سێیەم:** ئیمان (ئیمان چییەو چۆنەو، بەچی گەشەو زیاد دەکات و، شوێنەوارو بەرهەمەکانی ئیمان بەخوا هێنان، لە ژیانی تاک و کۆمەڵدا چیین؟!).

ئەم بەشەش لەم چەند بەندە پێکهاتوە:

بەندی یەکەم: پێناسەی ئیمان.

بەندی دووەم: پلەو پایەی ئیمان بەگشتی و بڕوا بە خوا بوون بەتایبەت.

بەندی سێیەم: ڕێگای پەیدابوون و فراژووبوونی بڕوا بەخوا بوون.

بەندی چوارەم: چاکترین ڕێی بەرەوخوا چوون و بەخوا گەیشتن

بەندی پێنجەم: کردنەوەی چەند گرێکوێرەیەک و لابردنی چەند تەمێک، دەربارەی خواناسین و بڕوا بە خوا بوون.

ئه‌م به‌نده‌ش له‌م پێنج باسه پێکهاتوه:

یه‌ک: هاوبه‌ش بۆ خوا دانان (الشرک) کۆسپی ڕێی ئیمانه، نه‌ک بێبڕوایی (الإلحاد).

دوو: ئیمان دژی سته‌مه، به‌ڵام کوفرو سته‌م، دوو کاڵه‌کی بڕ کێکن.

سێ: ئیمان و زانیاریی و، کوفر و نه‌زانیی، پێکه‌وه جۆشدراون، نه‌ک به پێچه‌وانه‌وه!

چوار: بڕوا به‌خوا نه‌هێنان له‌به‌ر به‌رهه‌ست (محسوس) نه‌بوونی، به‌رهه‌می زانست نیه.

پێنج: به‌رهه‌ست نه‌بوونی خوا له ژیانی دنیادا، گه‌وره‌ترین حیکمه‌تی تێدایه.

به‌ندی شه‌شه‌م: چۆنیه‌تی پاک ڕاگرتنی دڵ و ده‌روون و پاراستنی ئیمان.

به‌ندی حه‌وته‌م: هه‌رکه‌سێک به‌ڕاستیی به‌ره‌و خواناسیی و ئیمان هه‌نگاو بنێ، خوا نائومێدی ناکات.

به‌ندی هه‌شته‌م: گرنگیی و به‌رهه‌می بڕوا به خوا بوون، له ژیانی تاک و کۆمه‌ڵدا.

ئه‌میش له شه‌ش باسان پێکهاتوه:

یه‌ک: گرنگیی و به‌رهه‌می بڕوابه‌خوا بوون، له ڕووی ده‌روونییه‌وه.
دوو: گرنگیی و به‌رهه‌می بڕوابه‌خوا بوون، له ڕووی خووڕه‌وشته‌وه.
سێ: گرنگیی و به‌رهه‌می بڕوابه‌خوا بوون، له ڕووی کۆمه‌ڵایه‌تییه‌وه.
چوار: گرنگیی و به‌رهه‌می بڕوابه‌خوا بوون، له ڕووی سیاسییه‌وه.
پێنج: گرنگیی و به‌رهه‌می بڕوابه‌خوا بوون، له ڕووی ژیرییه‌وه.
شه‌ش: گرنگیی و به‌رهه‌می بڕوابه‌خوا بوون، له ڕووی زانستییه‌وه.

له‌ کۆتایی ئه‌م ڕێخۆشکردنه‌دا ده‌ڵێم:

هه‌رچه‌نده‌ ئه‌م کتێبه‌ به‌ هه‌رسێک به‌شه‌کانییه‌وه‌، زیاتر به‌ مه‌به‌ستی ده‌رخستنی ڕووی گه‌ش و دره‌وشاوه‌ی ئیسلام له‌ڕووی بیرو بڕواوه‌و به‌رپه‌رچدانه‌وه‌ی بیروبۆچوونی نه‌یارو ناحه‌زانی، نووسراوه‌، به‌ڵام وه‌ک پێشتریش ئاماژه‌مان پێکرد: گه‌لێک باس و بابه‌تی دیکه‌شی گرتوونه‌ خۆی، بۆ وێنه‌: له‌ به‌شی دووه‌مدا، چه‌ند لێکۆڵینه‌وه‌یه‌کی وردو به‌هێزو پێز له‌مه‌ڕ سروشتی شه‌ریعه‌ت و به‌رنامه‌ی خواوه‌ خراونه‌ڕوو و، گه‌لێک بیروبۆچوونی هه‌ڵه‌وپه‌ڵه‌ ڕاست کراونه‌وه‌و، په‌نجه‌یان خراوه‌ته‌ سه‌ر.

هه‌روه‌ها له‌ به‌شی سێیه‌مدا، هه‌ندێک باس و بابه‌تی گرنگ له‌مه‌ڕ ته‌زکیه‌ی نه‌فس و ده‌روون و په‌یوه‌ندیی به‌ ئیمان و عه‌قیده‌وه‌ خراونه‌ڕوو، که‌ پێم وایه‌ مشورخۆرانی مه‌یدانی کارو چالاکی ئیسلامیی به‌ر له‌ هه‌موو که‌س پێویستییان پێیان هه‌یه‌.. دیسان هه‌ر له‌ به‌شی سێیه‌م له‌ به‌ندی هه‌شته‌مدا، که‌ ته‌رخان کراوه‌ بۆ توێژینه‌وه‌ له‌باره‌ی زاده‌و به‌رهه‌م و شوێنه‌واره‌کانی ئیمانه‌وه‌، له‌ شه‌ش باسان دا باسی به‌رهه‌مه‌کانی ئیمانمان کردوه‌، تاکو ببنه‌ ئاوێنه‌و ته‌رازوویه‌ک، بۆ هه‌ر که‌سێک که‌ بیه‌وێ له‌خۆی و ئیمان عه‌قیده‌که‌ی حاڵی بێت، داخۆ تا چ ڕاددیه‌ک ئیمانه‌که‌ی له‌ واقیعی ژیان و گوزه‌رانیدا، کاریگه‌ریی هه‌یه‌و ڕه‌نگی داوه‌ته‌وه‌!

هۆی ڕیزکردنی سێبه‌شه‌کانی ئه‌م کتێبه‌ش، به‌م شێوه‌یه‌ که‌ ده‌بینرێ، ئه‌وه‌یه‌ که‌ به‌ردی بناغه‌و کاکڵ و جه‌وهه‌ری ئیمان و عه‌قیده‌ی ئیسلامیی، بریتیه‌ له‌ خواناسین (معرفة الله) که‌ وه‌ک ڕوونمان کردۆته‌وه‌و سه‌لماندووشمانه‌، هه‌م فیتره‌تی ساغ و هه‌م عه‌قڵی سه‌لیم، هانده‌رو پاڵنه‌ری ئینسانن، بۆ خواناسین و بڕوا پێهێنانی و به‌ندایه‌تیی بۆ کردنی و په‌رستنی.

ئنجا پاش ناسینی خوای به‌دیهێنه‌رو په‌روه‌ردگار (تبارک و تعالى)، ئینسان ڕاسته‌وخۆ ده‌که‌وێته‌ هه‌وڵ و ته‌قه‌لالای ئه‌وه‌: ڕێگای به‌ره‌و خوا

چوون و بەندایەتیی بۆ کردنی بدۆزێتەوە، بۆیە لە بەشی دووەمدا، باسی ئایینی خوا (دین الله)مان کردوە کە بێگومان مەبەست پێی ئیسلامە، ئەو ئیسلامەی کە لە قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوادا (صلی الله علیه وسلم) خۆی دەنوێنێ..

ئنجا سەرەنجام: وەک ئەنجامێکی سروشتیی، پاش خواناسین و، ئاشنابوون بە ئایین و بەرنامەکەی، قۆناغی ئیمان و پابەندیی (الإیمان والإلتزام) دێتە پێشێ، چونکە گەورەیی و پایەبەرزیی هەق و ناسین و پێئاشنابوونی، لە بڕوا پێهێنانی و پێوە پابەندبوونی دایە، ئەگەر نا زانیاریی و شارەزایی ڕووت و بێکردەوەو پابەندیی، نەک هەر چاکە (فضیلة) نیە، بگرە مایەی سزاو تۆڵەو جەزرەبەی خواشە!!

بەڵێ، بۆیە ئێمە سەرەتا لە بەشی یەکەمدا، باسی خواناسیی و، پاشان لەبەشی دووەمدا، باسی ئایین و دینداریی و، لە کۆتاییشدا باسی ئیمان و پابەندییمان کردوە.

# ڕێخۆشـكردن

خوێنه‌ری به‌ڕێز!

وه‌ك لـه‌ به‌شـی دووه‌مـی ئـه‌م كتێبـه‌دا: (ئایـین چییـه‌و چۆن پـه‌یـدا بـووه‌و بۆچـی هاتـوه‌؟!) ده‌یخه‌ینـه‌ڕوو، سـه‌رجه‌م نه‌یـارو ناحه‌زانـی دینداریـی و خواپه‌رستیی، به‌ ڕۆژئاوایی و ڕۆژهه‌ڵاتیی و ئه‌وروپایی و ئاسیاییانه‌وه‌، لـه‌ سۆنگه‌ی ئه‌وه‌وه‌ كه‌ له‌ سه‌رچاوه‌یه‌كی ڕوون و بێچه‌ند و چوون و جێی متمانه‌و دڵنیاییـه‌وه‌ - كـه‌ وه‌حیی بێهه‌ڵـه‌و په‌ڵـه‌و پارێزراوی خوایـه‌و، لـه‌م ڕۆژگاره‌دا ته‌نیا لـه‌ قورئـان و سوننه‌تدا خۆی ده‌نوێنـێ - ئاییـن و به‌رنامـه‌ی خوایـان نه‌ناسیوه‌، بـه‌ حوكمـی یاسـای (النـاس أعـداء ماجهلوا) بۆ ته‌فسیرو پاسـاودان (تبریـر)ی په‌یدابوون و سـه‌رهه‌ڵدانی، لـه‌ هه‌گبـه‌ی خه‌یـاڵ و مێشـكی سنووردارو بێئـاگاو له‌خۆبایـی بـوو (مغـرور)ی خۆیانـدا، چه‌نـدان بیـردۆزه‌ی ئه‌فسـانه‌ییان هه‌ڵتاشـیوه‌، وه‌ك بیردۆزه‌كانـی (نه‌زانیـی، ترسـان، ئابووریـی، جینـس، داخوازییـه‌ ده‌روونیـی و كۆمه‌ڵایه‌تییـه‌كان)!!

ئنجـا ئێمـه‌ خسـتنه‌ڕووی ئـه‌و بیـردۆزه‌ ئه‌فسـانه‌ییانه‌و، به‌رپـه‌رچ دانـه‌وه‌و هه‌ڵوه‌شـاندنه‌وه‌یانمان، خسـتۆته‌ به‌شـی دووه‌مـه‌وه‌، بـه‌ڵام لـه‌م به‌شـه‌دا هـه‌وڵ ده‌ده‌یـن بـه‌ تایبـه‌ت له‌بـاره‌ی هانده‌رو پاڵنـه‌ری ئینسـان بـه‌ره‌و خواناسـین و بـڕوا به‌خـوا هێنانـه‌وه‌ بدوێیـن و، بیسـه‌لمێنین كـه‌ ئـه‌وه‌ی هـه‌ر لـه‌ ڕۆژی[1] به‌رێـوه‌، ئینسـانه‌كانی بـه‌ره‌و خواناسـین هانداوه‌و پاڵداوه‌، وادارو ناچـاری كـردوون، كـه‌ خـوای پـه‌روه‌ردگار و خـاوه‌ن و میهره‌بـان و به‌خشـه‌ریان بناسـن و، بـڕوای پـێ بێنـن و،

---

(١) ڕۆژی به‌رێ: یه‌كه‌مین ڕۆژ، سه‌ره‌تاو ده‌ستپێك.

لێی بپاڕێنەوەو هانای[١] وەبەربێنن، هەر خودی فیتڕەت و عەقڵی خۆیانە، نەک هۆکارێکی دەرەکیی و جیاو بێگانە بە کەسایەتییان!

بە واتایەکی دیکە: ئەوەی کە وای لە ئینسان کردوە بەرەو خواناسیی بە تایبەتیی و، دینداریی و بەندایەتیی بۆ خوا کردن بە گشتیی، هەنگاو بنێ، خود (ذات)ی ئینسان خۆیەتی، نەک شتێکی دیکە، وەک نەزانەکان گومان دەبەن، بەڵێ ئەم بەشە بۆ ئیسپاتکردنی ئەسڵی دینداریی، کە خواناسییە، تەرخانکراوەو، خوا پشتیوان بێ زۆر بە ڕوونیی دەیسەلمێنین، کە خەسڵەتی ئایین دۆستیی و بەرەو خواچوون لە مرۆڤدا، خاوەنی پاڵنەرو سەرچاوەیەکی یەکجار قووڵ و بنەڕەتیی و ڕەسەنە لە دەروون و سروشتی مرۆڤدا، واتە کە لە بەشی دووەمدا بوونی (ئایین) وەک بەرنامەو پەیڕەوێکی خوایی دەسەلمێنین، لەم بەشەدا، بوونی ئایین پەروەریی و خواناسیی، وەک خەسڵەتێکی زگماک (فطري) و پێکهێنەرێکی بنچینەیی کەسایەتیی مرۆڤ دەسەلمێنین.

ئنجا بۆ سەلماندنی ڕەسەنایەتیی خەسڵەتی دینداریی و خواناسیی لە دەروون و سروشتی مرۆڤدا، دوو ڕێیان دەگرینەبەر؛ یەکیان ڕێگای دڵ و دەروون، یاخود زگماک، ئەوی دیکەشیان ڕێگەی عەقڵ.

هەڵبەتە ئەم بەشەو بەشی داهاتووش، پەیوەندییەکی بەتین و کاریگەریان پێکەوە هەیە، چونکە کە لە بەشی دووەمدا دەسەلمێنرێ: ئایین دەستکردو بەرهەمی مرۆڤ نیەو، ڕێڕوونی و بەرنامەی خوایە بۆ مرۆڤی ناردوە، مانای وایە ڕەسەنایەتیی و زگماک بوونی خەسڵەتی خواپەرستیی و دینداریش سەلمێنراوە، ئاخر خوای زانای کاربەجێ، کاری بێ ڕێوجێ و بێحیکمەتی لێ ناوەشێتەوە، مادام وابێ، کە دەبینین خوا ئایین و بەرنامەی بۆ مرۆڤ ناردوەو بەرەو دینداریی و خواپەرستیی ڕێڕوونیی کردوە، بۆیە ئەم کارەی کردوە، چونکە زانیویەتی مرۆڤ بە زگماک حەوجێی ئایینە و، تینووی

---

(١) هانای وەبەربێنن: پەنای بۆ بەرن.

ئاوی سازگاری خواناسییە، خۆ ئەگەر مرۆڤ لە دەروونەوە شەیدای خواناسیی نەبووایەو، بە سروشت بۆی تینوو نەبووایە، مەحاڵ بوو خوا بەرنامەو پەیڕەوی خواناسیی بۆ ڕەوانە بکات.

دیسان کە لەم بەشەشدا زگماک بوون و، ماقووڵیی خەسڵەتی دینداریی خواناسیی دەسەلمێنرێ، لەهەمان کاتدا خوایی بوونی سەرچاوەی ئایین و، پووچەڵیی ئەو تێڕوانین و بیردۆزانەش دەسەلمێنرێ، کە پێیان وایە دینداریی و خواپەرستیی زادەو بەرهەمی مێشکی مرۆڤەو، بنچینەو ڕەگ و ڕیشەیەکی ڕەسەنی نیە لە سروشت و کەسایەتیی مرۆڤدا، چونکە مادام خەسڵەتی ئایین پەروەریی و خواناسیی شتێکی سروشتیی و ڕەسەن بێ، کەواتە ئەو بیردۆزانەی کە ئەم خەسڵەتە وەک دیاردەیەکی لاوەکیی و ڕیزپەڕو بێبنەچە لەقەڵەم دەدەن، پووچەڵ و بێکاکڵن.

کەواتە، ئەم بەشەو بەشی داهاتوو، هەرکامێکیان پشتیگیریی یەکدی دەکەن و تەواوکەری یەکدین.

ئێستاش دوای ئەم ڕێخۆشکردنە، دەتوانین بچینە سەر ئەسڵی مەبەست و یەکەمین پاڵنەری مرۆڤ بەرەو خواناسیی، بخەینە ڕوو.

تێبینی:

ئێمە چ کە پاڵنەری یەکەمی خواناسیی (فیطرەت) دەتوێژینەوەو، چ کە پاڵنەری دووەمی خواناسیی (عەقڵ) دەتوێژینەوە، مەبەستمان ئەوە نیە، کە لەو ڕێیەوە، بوونی خوای پەروەردگار ئیسپات بکەین، هەرچەندە لەپاڵ ئەوەدا بەهێزترین بەڵگەی سەلماندنی بوونی خواش دەخرێتە روو، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە لە هەموان ڕوون بێ: (بڕوا بەخوا بوون و خواناسیی، خەسڵەتێکی ڕەسەن و بنچینەییە لە ژیانی مرۆڤداو، یەکێکە لە پێکهێنەرە بنچینەییەکانی سروشت و کەسایەتیی ئینسان و، خەسڵەتێکی فیطریی و خوارسکەو، سروشتی پاک و عەقڵی ساغ داخوازیی دەکەن).




## زگماك (الفطرة) یەكەمین پاڵنەری مرۆڤە بەرەو خواناسیی

### دەستپێك

خوێنەری بەڕێز!

بەهێزترین و كاریگەرترین هاندەری بەرەو خوا چوونی مرۆڤ، بریتیە لەو هەست و نەست و سۆزە بەتینە دەروونییەی كە لە دڵ و گیانی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێو مرۆڤ بەرەو خوا تاو دەدا، بەبێ هیچ جۆرە بەڵگەهێنانەوە (إستدلال)ێک، چونكە مرۆڤ - هەموو مرۆڤێک- بە خوارسک خواناسەو هەستی خوا دۆستیی و خواناسیی یەكێكە لە خەسڵەتە بنچینەیی و پێكهێنەرە بنەڕەتییەكانی كەسایەتیی ئینسان.

ئەم پاڵنەرەش بە پاڵنەری خوارسک (فطري) ناسراوە.

جا بۆ سەلماندنی ڕەسەنایەتیی و خوارسک بوونی هەستی خواویستیی لە كەسایەتیی ئینساندا، حەوجێی ئەو زانیاریی و شارەزاییانەین كە لەڕێی دەرونزانیی و كۆمەڵزانیی (علم النفس وعلم الإجتماع)ەوە دەستگیر بوون، شایانی باسیشە كە: ئێمە لێرەو لە هەر جێیەكی دیكەدا، بۆ خستنەڕووی ڕاستییەكانی بەرنامەی خواو، بەرگریی لێكردنی، پەنا دەبەینە بەر ئەو زانیارییە نوێیانە، چەند شتێكمان لەبەرچاو گرتوون:

**یەکەم:** چونکە لەم سەردەمەدا خەڵکێکی زۆر قەناعەتی وایە کە هەر قسەیەک مۆری زانیاریی پێوە نەبێ، وەری ناگرن و بڕوای پێ ناکەن.

**دووەم:** بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی کە بە هەڵە لە ئایین گەیشتوون و، پێیان وایە لەگەڵ زانیارییدا دانووی ناکوڵن، بۆیان ئاشکرا بێ، کە هەمیشە هەموو لقەکانی زانیاریی ڕاست، لە خزمەتی ئایین دان و پشتگیریی دەکەن.

**سێیەم:** زانیاریی موڵکی تایبەتی هیچ کەسێک و هیچ گەل و نەتەوەیەک نیەو، کەس لە کەس زیاتری بەش پێوە نیە، چونکە زادەو بەرهەمی بیروهۆشی هەموو مرۆڤایەتییەو، پەزمەندەو کەڵەکەبووی شارەزایی و ئەزمونگەلی سەردەم و چاخ و قۆناغەکانی مێژووی ئینسانە.

کەواتە بەر لە هەموو شتێک پێویستە بزانین: داخۆ خواناسیی و دینداریی، داخوازییەکی ڕەسەنی سروشتی مرۆڤە یان نا!!

## هەستی خواناسیی
## لە تەرازووی زانیارییدا

بەپێچەوانەی تێڕوانینی دەروونناس و کۆمەڵناسانی یەک لایەنەیی، وەک فرۆید و هاوەڵانی؛ کە لە هەموو کەسایەتیی مرۆڤ، بەس یەک تاقە لایەنی دەگرن و، دوایی دەیانەوێ هەموو لایەنەکانی دیکەی لە هەگبەی ئەو تاقە لایەنە بئاخنن، بەڵێ بە پێچەوانەی ئەوانەوە، کۆمەڵێکی زۆر لە توێژەرەوەو پسپۆڕانی دەروونزانیی و کۆمەڵزانیی نوێ، بڕوایان وایەو بە بەڵگەی پتەویش سەلماندوویانە، کە ئینسان هەروەک چۆن لە لایەنی جەستەییدا چوار مەودایییە (ذو أربعة أبعاد)، لە لایەنی گیانیی و دەرونیشدا، لانی کەم چوار مەودای هەن، کە مەودای چوارەمی وەک مەودای چوارەمی ماددە لەمێژ نیە هاتۆتە بەر چراو شەداوی زانیاریی و دۆزراوەتەوە.

دیسان هەروەک چۆن پەیدابوونی بیردۆزی ڕێژەیی (النظرية النسبية) لەسەر دەستی (ئاینشتاین) بیردۆزەی سێمەودایی تەنەکانی وەدرۆ خستەوەو، سەلماندی کە تەنەکان بێجگە لە سێ مەودای: درێژیی و پانیی و بەرزیی، مەودایەکی دیکەشیان هەیە بەناوی کات (الزمن)و، ئەم مەودایەش وەک مەودایەکانی دیکە لەگەڵ چیەت (ماهية)ی ماددەدا ئاوێتەیەو، هیچ تەنێک لە بوونەوەردا نیە کە لە کات خاڵی بێ، هەڵبەتە کاتیش بوونێکی زاتیی و سەربەخۆی نیەو زادەو بەرهەمی ئەو جووڵان (حركة)یە کە لە ماددەدا هەیە[1].

---

(١) بۆ شارەزایی زیاتر دەربارەی بیردۆزەی ڕێژەیی و چەمکی چوارلایەنیی تەنەکان، واباشە سەرنجی (ألف باء النسبية) بدرێ، نووسینی (برتراند راسل) وەرگێڕانی (فؤاد كامل). بەتایبەتی ل(٤١-٤٧)، چاپی ١٩٦٥ز.

هەر بەو جۆرەش بە پەی پێبران و دۆزرانەوەی هەستی خواناسیی و دینداریی لە ئینسانداو، سەلمێنرانی ئەوە کە هەستی ئایینیی و خوادۆستیی لە مرۆڤدا، یەکێکە لە بنچینەو بنەما ڕەسەن و چەسپاوەکانی گیان و سروشتیی، دیواری شوورەی سێ مەودایی گیانی مرۆڤ ڕووخاو تێک شکێنراو، ڕوون بۆوە، کە لە سروشتی مرۆڤدا وێڕای سێ هەستە ناسراوەکان: (هەستی لێکۆڵینەوەو پشکنین، هەستی خێرخوازیی و چاکەویستیی، هەستی جوانیی دۆستیی) هەستێکی دیکەی چوارەمین هەیە کە لە ڕەسەنایەتیی (أصالة)دا ئەگەر لەوان لەپێشتر نەبێ لەدواتر نیە، ئەو هەستەش بریتیە لە هەستی خواناسیی و ئایین دۆستیی.

ئێستاش پێناسەیەکی کورتی هەر کام لەو چوار هەستە بەرزە گیانییە دەکەین:

## ١- هەستی لێکۆڵینەوە و بەدوای ڕاستییدا گەڕان، یان (ڕاستیی خوازیی):

ئەم هەستە سەرچاوەی هەموو جۆرە زانیاریی و شارەزاییەکەو پاڵنەری لێکۆڵینەوەو سەرنجدان و وردبوونەوەی مرۆڤە، بۆ ناسینی بوونەوەرو دیاردە جۆربەجۆرەکانی.

ئەم هەستە هەستێکی سەربەخۆیەو، هیچ پەیوەندییەکی بە جینس یان ئابووریی یان هەر شتێکی دیکەوە نیە، وەک فرۆید و مارکسیەکان و هەموو ئەو کەسانە گومان دەبەن، کە مرۆڤ بە گیاندارێکی یەک مەودایی سەیر دەکەن، چونکە ئێمە لە دەروونمانەوە هەست بە شەیدایی و تێنووایەتیی دەکەین بۆ ناسینی دەوروبەرمان و شارەزابوون، نەک هەر لە مانگ و مەریخ کە ڕەنگە پەیوەندییەکی لاوازی ئابوورییان بە ئێمەوە هەبێ لە داهاتوودا، بەڵکو لەو ئەستێرەو کەهکەشانانەی کە ملیۆنان ساڵی تیشکیی (سنة ضوئية)[1] لە ئێمەوە دوورن!

---

(١) ساڵی تیشکیی، یانی: ئەو ماوەیەی کە تیشک لە ساڵێکدا دەیبڕێ، کە نیزیکەی ($10 \times 6^{12}$) شەش تریلیۆن میلە. بڕوانە پوختەیەک دەربارەی ئیسلام ... ل٦٤.

ده‌مانه‌وێ بزانین چ باسه؟! ئایا ژیانله‌به‌ری زیندوویان تێدایه؟!

ئایا شارستانه‌تییه‌كی له‌ هی ئێمه‌ پێشكه‌وتووتریان تێدایه؟!

ده‌مانه‌وێ بزانین داخۆ ملیاران ساڵ پێش ئێستا، خڕۆكه‌ی زه‌وی له‌ چ بارودۆخێكدا بووه؟!

چۆن له‌ خۆر جیابۆته‌وه؟

یان ساڵی دوو هه‌زارو سه‌د یان سێ هه‌زاری زایینی كه‌ ئێمه‌ هه‌ر نابین و، هیچ په‌یوه‌ندییه‌كی ئابووریی له‌ گۆڕێدا نیه‌، جۆری ژیانی مرۆڤایه‌تیی چۆن ده‌بێ؟!

ئنجا ئه‌م تێنوایه‌تییه‌ ده‌روونییه‌، هه‌ر له‌ ده‌می له‌دایك بوونه‌وه‌ تا دوایین هه‌ناسه‌ی ژیان، له‌ مرۆڤدا هه‌یه‌و كڵپه‌یه‌كی هه‌میشه‌ییه‌و كوژانه‌وه‌ی نیه‌و بێ سنووره‌، ئه‌مه‌ش خۆی پته‌وترین به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ كه‌ ئه‌م هه‌سته‌ هانده‌ره‌ له‌ قووڵایی سروشت و كه‌سایه‌تیی مرۆڤدا هه‌یه‌و خه‌سڵه‌تێكی خوارِسكه‌.

### ٢- هه‌ستی شه‌یدابوونی جوانیی یان (جوانی خوازیی):

ئه‌م هه‌سته‌ سه‌رچاوه‌ی په‌یدابوونی هه‌موو هونه‌ره‌ جوانه‌كانه‌ له‌ شیعرو په‌خشان و مۆسیقاو نه‌خش و نیگارو بیناسازییه‌وه‌ بگره‌...هتد.

له‌ڕاستیدا بێجگه‌ له‌ خۆشویستنی جوانیی، هیچ پاڵنه‌رێكی دیكه‌ نیه‌ كه‌ وا له‌ مرۆڤ بكات، له‌كاتی بیستنی پارچه‌ شیعرێك، یان ده‌نگ و ئاوازێكی به‌جۆشدا، یان دیتنی وێنه‌یه‌كی دڵگیر، یان دیمه‌نێكی دڵبزوێندا، هه‌ست به‌ دڵخۆشیی و تام و چێژوه‌رگرتنێكی مه‌عنه‌ویی بكات، چونكه‌ له‌و حاڵانه‌دا، هیچ به‌رژه‌وه‌ندییه‌كی ئابووریی، یان جینسیی له‌ گۆڕێدا نیه‌، به‌ڵكو به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ زۆر جاران به‌رهه‌مه‌ ئابوورییه‌كان ده‌كه‌ونه‌ ژێر تاووتین و كاریگه‌ریی ئه‌م هه‌سته‌وه‌، ڕه‌واج پێدانی شمه‌ك و كه‌لوپه‌له‌

بازرگانییه‌كانیش، به‌هۆی وێنه‌و دیمه‌نه‌ جوان و سه‌رنج ڕاكێشه‌كانه‌وه‌ شایه‌دی ڕاستیی ئه‌م قسه‌یه‌ن[1]!!

مرۆڤێكی ساغ و سه‌لیمیش له‌ هه‌موو جۆره‌ بارودۆخێكدا، كه‌م یان زۆر هه‌ست به‌م هانده‌ره‌ سروشتیه‌ ده‌كات.

به‌ڵێ مرۆڤ جوانیی خوازه‌و، به‌ شتی جوان و دڵگیر كه‌یفی ده‌بزوێ و شادی بۆ دێ و، به‌ شتی دزێوو ناشیرین، ده‌روونی ده‌شێوێو دڵی ده‌گوشرێ و، ئه‌م ڕاستییه‌ش هێنده‌ ڕوونه‌، پێویستیی به‌ به‌ڵگه‌ له‌سه‌ر هێنانه‌وه‌ نیه‌.

### ٣- هه‌ستی چاكه‌دۆستیی، یان (چاكه‌خوازیی):

ئه‌م هه‌سته‌ سه‌رچاوه‌ی ڕه‌وشت به‌رزیی و ئاكارپه‌سندیی و چاكه‌كاریی و خێرخوازییه‌و، پاڵنه‌ری مرۆڤه‌ بۆ به‌رزبوونه‌وه‌و به‌ره‌و ته‌واوه‌تی چوون و كامڵ بوون.

جا بێگومانم له‌وه‌ كه‌ هیچ كه‌سێك نیه‌، كه‌م یان زۆر له‌ ده‌روون و ویژدانی خۆیدا هه‌ست به‌ هه‌وڵدان و كۆشش نه‌كات به‌ره‌و چاكه‌كاریی و ڕه‌وشت په‌سندیی، وه‌ك فیداكاریی و خۆڕاگریی و دادگه‌ریی و به‌خشنده‌یی و ئازایه‌تی و..هتد، ته‌نانه‌ت مرۆڤ زۆر جاران هه‌ست به‌ سۆزو ڕێزو خۆشه‌ویستی ده‌كات به‌رانبه‌ر به‌ بابایه‌كی ڕه‌وشت به‌رزو چاكه‌كارو ئاكارجوان، ئه‌گه‌ر هه‌زاران ساڵ پێش خۆشی ژیابێ!!

هه‌ڵبه‌ته‌ ئه‌م هه‌سته‌ش یه‌كی دیكه‌یه‌ له‌ داخوازییه‌ ڕه‌سه‌نه‌كانی سروشتی مرۆڤ و، لایه‌نێكی سه‌ربه‌خۆیه‌و هه‌ڵقوڵاوی هیچ سه‌رچاوه‌یه‌كی وه‌ك ئابووریی و جینس و كۆمه‌ڵگا نیه‌و شتێكی فیطرییه‌.

---

(١) كه‌ له‌ژێر سایه‌ی به‌ناو شارستانێتی ئه‌م ڕۆژگاره‌دا، ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌ زۆر بێتام بووه‌.

## ٤- هەستی خواویستیی، یان (ئایین خوازیی):

ئەم هەستەش یەكێكە لە چوار مەودایەكانی گیانی مرۆڤ - بەڵكو لە هەموانیان گرنگترو ڕەسەنترە-، ئەم هەستە نەك هەر زادەی لایەنە ماددییەكانی مرۆڤ نیە، بگرە زۆرجاران دیتراوەو دەبینرێ كە ژیانی ماددیی بە هەموو لایەنەكانییەوە، بەقوربانی دەكات، هەروەك چۆن خودی خۆی بە قوربانی هەستی ڕاستیی دۆزینەوەو چاكەدۆستیی و شەیدایی جوانیی دەكات و، زۆرجار خۆی دەكاتە بەلاگێڕەوەیان!

بەڵێ لەراستیدا بڕوابوون بە زاتێكی بەرزو بێهاوتاو پەرستنی و لەبەر پاڕانەوەی، داخوازییەكی گیانییەو ڕەگ و ڕیشەكانی بە قووڵایی دڵ و دەروونی ئینساندا چوونە خوارو، خواپەرستیی لە دەروونی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێ و لە ژیانیدا ڕەنگ دەداتەوە، نەك لە ژیانی ئابووریی و كۆمەلایەتیی و جینسیی مرۆڤ پەیدا بێ و، دوایی بچێتە نێو دڵ و دەروونی مرۆڤەوە! وەك بیردۆزە ئەفسانەییەكان گومان دەبەن.

دیارە ئەم هەستە لەمێژ نیە هاتۆتە بەر نیگای شارەزاو پسپۆڕانی دەروونناس و كۆمەڵناس و، وەك لایەنێكی سەربەخۆو بنەڕەتیی پەی پێبراوەو لە شوێنی شیاوی خۆیدا دانراوە، زانای ناوداری دەروونناس (تانەگی دووكەنەتن) لەمبارەوە دەڵێ:

(لە سەردەمی ئێستادا بەرەوپێش چوونی زانیاریی و لێكۆڵینەوە دەربارەی ئایین بۆتە هۆی دۆزینەوە (إكتشاف)یەكی گرنگ، كە بەهۆی ئەوەوە دەتوانرێ ئەنجامێكی زۆر چاك وەربگیرێ، زانایانی كۆمەڵناس و ڕابردووناس و مرۆڤناس، ئێستا ئاوا پێناسەی هەستی خواناسیی و ئایینی دەكەن:

هەستی ئایینی یەكێكە لە بنەڕەتە سەرەتاییە سروشتی و چەسپاوەكانی گیانی ئینسان و، بە ڕەسەنترین و سروشتیترین پێكهێنەری كەسایەتیی

مرۆڤ دادەنرێو، ناگونجێ بگوترێ: لەهیچ کام لە هەستەکانی دیکەوە هەڵقوڵیوە، بەڵکو شێوەیەکە لە پەیبردنی زگماک (الإدراك الفطري)ی ئەو دیوی هۆش و، یەکێک[1] لە سەرچاوەکانی لە قووڵایی ئەودیو هۆشەوە هەڵدەقوڵێ و، وەک هەرکام لە هەستی جوانیی - پەیوەست بە هونەرەوە-و، هەستی چاکیی - پەیوەست بە ڕەوشتەوە-و، هەستی ڕاستیی —پەیوەست بە زانیارییەوە-، هەستی ئایینیش مەودایەکی چوارەمەو خاوەنی هەمان ڕەسەنایەتیی و سەربەخۆی سێ مەودایەکەی دیکەیە)[2].

دیسان دەروونناسی زانا (کوونتایم) لە یەکێک لە قسە ڕاپازنەراوەکانی دەڵێت:

(دەروونزانیی بەهۆی لێکۆڵینەوەو پشکنینی لە جیهانی ئەودیو هۆشی مرۆڤدا، کە بەهۆی (فرۆید)ەوە دەستی پێکردو بە یارمەتی (ئادلەر)و (یۆنگ) درێژەی پێدرا، لە قووڵایی گیانی مرۆڤدا، جیهانێکی نوێی لە هێزە پەنهانەکان و هەستە پەی بەشت بەرەکانی ئەودیوی هۆش دۆزیوەتەوە، کە دەگونجێ یەکێک لە کلیلەکانی هەڵهێنانی مەتەڵی هەستی ئایینی بێ)[3].

ئێستاش دوای ئەوەی پێناسەیەکی سەربەخۆی هەرکام لە چوار هەستە بەرزە گیانیەکانمان کرد، با لە چەند خاڵێکدا خەسڵەتە تایبەتی و جوێکەرەوەکانیان بخەینەڕوو، دوایی لەگەڵ هەستی خواناسیی و، ئایین دۆستیدا بەراوردیان بکەین، بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە هەستی خواناسیی هەستێکی بەرزو داخوازییەکی ڕەسەنی سروشتی مرۆڤە.

---

(١) ڕەنگە مەبەستی ئەوەبێ کە یەکێک لە سەرچاوەکانی هەستی خواناسیی، جیهانی ئەودیو هۆشە، کە لە زاراوەی ئاییندا بە (فطرة) خوارسک ناسراوە، سەرچاوەکەی دیکەش ژیریی و هۆشە.

(٢) (حس مذهبي يا بعد چهارم روح إنسان)، ل٤-١٢، لە: (خدا در أنديشهء بشر)، تأليف عبدالله نصري، ل٢٢٢.

(٣) سەرچاوەی پێشوو، لە: (أنگيزهء پيدايش مذاهب) ناصر مكارم شيرازي، ل٢٧٣.

## خەسڵەتە تایبەتیی و جوێکەرەوەکانی هەستە بەرزەکان

**یەکەم:** داخوازییە گیانییەکان، یان هەستە بەرزەکان، شتێکی زاتیی مرۆڤن و ئینسان بەس لەزاتی خۆیدا هەستیان پێ دەکات و، ناتوانێ لە دەرەوەی خودی خۆیدا هەستیان پێ بکات، بە واتایەکی دی: ئەو هەستە بەرزانە لە هەر مرۆڤێکدا شتێکی کەسی (شخصي)ین و کەسێک کە بۆخۆی لەزاتی خۆیدا هەستیان پێ نەکات، ناتوانێ لە ڕێی ئەزموون (تجربة)ەوە لە غەیری خۆیدا هەستیان پێ بکات، بۆ وێنە: ئەو چێژوەرگرتن (تذوّق) ەی کە من لە وەڵامدانەوەی پرسیارێکدا، یان تێوەڕامانی دیمەنێک، یان نواندنی ڕەفتارێکی پەسند، یان بەجێهێنانی نوێژێکدا هەستی پێ دەکەم، شتێک نیە بتوانم بە غەیری خۆمی بچێژم، یان وەک بۆخۆم هەستی پێ دەکەم بۆی وەسف بکەم.

**دووەم:** داخوازییە گیانییەکان بەرهەست نین و خاوەنی شوێن و ئەندازەو چەندایەتی (کمیّة) نین، بەڵکو بەس خاوەنی چۆنایەتیی (کیفیة)ن، هەر بۆیەش ئەو هەستانە، ڕاستەوخۆ هەستیان پێ ناکرێو، لە ڕێی شوێنەوارەکانیانەوە نەبێ ناناسرێن، بۆ وێنە: ئێمە ناتوانین هەست بە هەستی (جوانیی خوازیی) لە غەیری خۆماندا بکەین، بەڵام لەڕێی ڕەفتارو هەڵسوکەوتەوە دەتوانین هەست بە هەبوون و نەبوونی بکەین، دیسان ئێمە هەتا شوێنەوارێکی وەک؛ نوێژ، پاڕانەوە، ڕۆژوو...هتد. لە یەکێک نەبینین، ناتوانین هەست بە ئایین پەروەریی و خواناسیی بکەین.

**سێیەم:** هەستەبەرزەکان چەند دیاردەیەکی گشتی و هەمەلایەنەن و، لەنێو هەموو مرۆڤایەتیدا هەن.

**چوارەم:** ئەو هەستانە سەرەتا بەس وەک ئامادەییەک هەن، ڕوونتر بڵێم: بەهێزەکیی (بالقوة) هەن، بەڵام دوایی لەگەڵ فراژوو بوون و گەشەکردنی مرۆڤ و ڕەخساندنی هەلومەرجی گونجاودا، دێنە قۆناغی کردەوەییەوە، یانی بەکردەیی (بالفعل) پەیدا دەبن.

**پێنجەم:** ئەو داخوازییە سروشتییانە شیاوی کارتێکرانن لەلایەن چەند هۆیەکەوە، بۆ وێنە: ویستی مرۆڤ، هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی، پەروەردەو فێرکردن، کۆسپ و تەگەرە گیانییەکان، واتە هەرکاتێک ئەو داخوازییانە کەوتنەبەر تین وتەوژمی یەکێک یان زیاتر لەو هۆیانە، دەگونجێ لە گەشەکردن و هەراش بوونیان کەم بێتەوەو، تەنانەت کپیش بکرێن، یان بەپێچەوانەوە زیاتر گەشەبکەن و فراژوو ببن.

**شەشەم:** ئەو داخوازییە گیانییانە وەک داخوازییە جەستەییەکان، هەرکاتێک هەلومەرجی لەباریان بۆ نەڕەخساو تێر نەکران، کپ دەبن و دوایی کاردانەوە (ردّ فعل)ی خۆیان لە ژیانی دەروونیی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤدا پێشان دەدەن.

**حەوتەم:** هەستە بەرزە گیانییەکان، بەبێ فێرکردن و ڕێنماییکردنی هیچ کەسێک لە دەروونی مرۆڤدا پەیدا دەبن، هەروەک چۆن لە خۆوە بێ فێرکەر لە چەند قۆناغێکی تایبەتی تەمەندا چەند مەسەلەیەکی وەک یارییکردن، پارەکۆکردنەوە، پلەوپایە، جینس، سەرهەڵدەدەن و مرۆڤ پێیانەوە سەرگەرم دەبێ[1].

**خوێنەری بەڕێزم!**

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە کە بە مەبەستی سەلماندنی بوونی هەستی خواناسیی لە سروشتی مرۆڤدا، وەک داخوازییەکی خوارسکی ڕەسەن، هەستی خواناسیی بە هەرکام لەم حەوت سیفەتە تایبەتییەی داخوازییە سروشتیەکان بگرین و، بەراوردیان پێ بکەین، تاکو بزانین بەپێی ئەو حەوت نیشانەیە کە پێوەرو تەرازووی هەستە بەرزەکان و داخوازییە خوارسکەکانن، چۆن دەردەچێ؟

---

(١) بۆ نووسینی ئەم حەوت خاڵە، سوودم لە چەند سەرچاوەیەک وەرگرتوە بەتایبەتی دوو سەرچاوە پێشووەکە.

## سەلماندنی بوونی هەستی خواناسیی، وەك داخوازییەكی خوارِسكی ڕەسەن

١) زاتیی بوونی هەستی خواناسیی:

زاتیی بوونی هەستی خوادۆستی و ئایین ویستی، شتێکی بەڵگەنەویستەو حەوجێی بەڵگە لەسەر هێنانەوە و ئیسپات کردنێ نیەو، واقیعی خواناسان و دینداران شایەدە.

٢) دیسان بەرهەست نەبوونیشی شتێکە، دم بەدمەو وتوێژ هەڵناگرێو پێویست ناکات بەبێ هۆ لەسەر شتی ئاشکرا بڕۆین.

٣) گشتیی بوونی هەستی خوادۆستیی لەنێو مرۆڤایەتیدا:

مێژوو شایەدیی دەدات کە خەسڵەتی خواناسیی و دینداریی لەسەرەتای دروستبوونی مرۆڤەوە هەیەو، هێندە لەگەڵ ژیانیدا ئاوێتە بووە ناتوانین سەرەتاو دەستپێکردنی بۆ بڕیار بدەین، مەگەر بڵێین سەرەتای پەیدابوونی بریتیە لە سەرەتای ژیانی مرۆڤ.

زانایانی شوێنەوارناس و دێریںناس، دەڵێن:

بەدرێژایی مێژوو هیچ گەل و تیرەیەک چەنگ ناکەوێ کە هەستی خواناسیی و دینداریی لە شوێنەوارەکانیاندا ڕەنگ نەداتەوەو نەبینرێ.

(ویلیام جیمس) مامۆستای دەروونناسان دەڵێت:

(ئەگەر مێژوو ڕێڕوونییمان بکات بۆ ڕابردوو و مێژووی مرۆڤ، دەتوانین بڵێین مرۆڤ هەمیشە گەردنکەچیی و کڕنووش بردن و بەندایەتی تێدا هەبووە بۆ هێزێکی لەخۆی بە پشتەوەتر)[1].

---

(١) (مذهب آزمایشهاو رویدادهای زندگی) لە: (خدا در اندیشهء بشر) ل٢٢٧.

دیسان دەڵێت:

(هیچ کلتوورو ژیارێک لەنێو هیچ گەلێکدا وەدەست ناکەوێ، کە لەنێو ئەو کلتوور (ثقافة) و ژیار (حضارة)ەدا، شێوەیەک لە شێوەکانی خواپەرستیی و ئایین دۆستیی بەدی نەکرێ و، ڕەگ و ریشەی ئایین لە قوڵاییی مێژووەوە تا تاریکی قووڵایی ئەو مێژووەی کە نەنووسراوەتەوەو نەگەیشتۆتە دەستی مرۆڤ درێژ دەبێتەوە)[1].

(دکتۆر ئەلکسیس کاریل) دەڵێت:

(هەستی خواناسیی لە قووڵاییەکانی سروشتمانەوە هەڵدەقوڵێو، لەڕاستیدا یەک داخوازی ڕەسەنی ئینسانییە، هەروەک چۆن مرۆڤ پێویستی بە ئاوو ئۆکسجین هەیە، پێویستی بە بڕوابەخوابوونیش هەیە... کزیی هەستی خواناسیی هێندەی کزیی هێزی مێشکی بەزەرە)[2].

(کارل یۆنگ ) دەڵێت:

(ناتوانین نکووڵیی لەوە بکەین کە ئایین کۆنترین و گشتیترین دیاردەی گیانیی ئینسانە)[3].

دیسان دەڵێت:

(مرۆڤی دەوارنشین (الإنسان البدوي) بە ئەندازەی خەریکبوونی بە کێڵان و چاندنی زەوی و، ڕاوو ماسی گرتن و تێرکردنی داخوازییە بنچینەییەکانی خۆیەوە، سەرگەرمی ئایین و خواناسیی بووە، ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا کە پەروەردەو فێرکردنی نوێ لەسەر بنچینەی لابردنی ئایین ڕۆنراوە، دەبینین پیاوو ئافرەتانی ئێستا هێندەی خەڵکی پێشوو دیندارن)[4].

---

(١) سەرچاوەی پێشوو لە: (خدا در اندیشەء بشر) ل٢٢٧.

(٢) (نیایش) - الدعاء- الکسیس کاریل، ترجمة دکتر علي شریعتي، ل ١٦،٢٤)، و ل (٢).

(٣) (روانشناسی ودین) ل١، کارل یۆنگ، لە: (خدا در اندیشەء بشر) ل٢٢.

(٤) (مقدمەء بر روانشناسی یۆنگ) ل٧-١٢٦ لە: (خدا در اندیشەء بشر) ل٢٢٨.

هەروەها دەڵێت:

(لەدڵ و دەروونی هەریەک لە مرۆڤەکاندا، کەم یان زۆر بیروبڕوایەکی مەیلەو پەنهان دەربارەی پەروەردگاری بوونەوەر هەیەو، هەموو کەسێک بە سروشت مەیلی ناسینی ئەو زاتەی هەیە، جا هەستی ئایینی بریتیە لەو مەیلەو، هەرچەندە سەرلەبەری مرۆڤەکان تێیدا بەشدارن، بەڵام دیاردەو ڕواڵەتەکانی بەهۆی جیاوازیی ژینگەو بارودۆخەوە جیاوازن)[1].

ئێستاش وەک دەبینین هەستی خواناسیی لەنێو هەموو گەلانی دنیادا وەک دیاردەیەکی سروشتی، شوێنەوارەکانی دەدرەوشێنەوە، بەڵێ لەم سەردەمەدا لە دەوڵەمەندترین و پێشکەوتووترین دەوڵەتانی دنیاو، نەدارترین و بەجێماوترینیاندا دیاردەی ئایین و خواناسیی، وەک مانگی شەوی چواردە دەدرەوشێتەوە.

جا ئایا بڵاوبوونەوەی هەستی خواناسیی وا بەگشتی و بەرفراوانی لە هەموو چاخ و سەردەمێکداو لەنێو گشت گەلاندا، بەڵگەی زگماک بوون و ڕەسەنایەتیی ئەو هەستە نیە؟!

## ٤) چۆنیەتی پەیدابوونی هەستی خواناسیی:

وەک گوتمان داخوازییە گیانییەکان سەرەتا بەشێوەی ئامادەیی، واتە (بالقوة) هەن و لە سروشتی ئینساندا حەشاردراون، دوایی بەهۆی گەشەکردنی گیانیی و جەستەییەوە، هەراش دەبن و دەچنە قۆناغی کردەوەیی (بالفعل) یەوە، ڕاست وەک پەیدابوونی میوەیەکی وەک (سێو)، کە لە سەرەتاوە بە شێوەی دەنکێکەو سێو نیە، بەڵام ئامادەیی بوونە سێوی تێدایە، کە ئەگەر بێت و هەلومەرجێکی لەباری بۆ بڕەخسێ بە تێپەڕبوونی کات دەپشکوێو دوای بڕینی چەند قۆناغێکی دیاریکراو، دەبێتە درەختێک کە سێوی تەواو دەگرێ.

---

(١) (روانشناسی پرورشی)، ل٢٣١، لە: (خدا در اندیشهء بشر)، ل٢٢٨.

کەواتە مرۆڤ لە سەرەتای لەدایکبوونیەوە، وەک ژیانداریک نیە کە هیچ جۆرە مەیل و ئارەزوویکی گیانیی تیدا نەبێو، بەس بەپێی غەریزە بەڕێوە بچێ و، وەک مرۆڤیکی تەواوو پیگەیشتووش نیە، کە خەسڵەتە بەرزە گیانییەکانی وەک دیاردەیەکی زەق و بەرهەست تیدا بەدی بکرێن، جا بەم ڕوونکردنەوەیە وەڵامی پرسیاری ئەوانە دەدرێتەوە کە دەڵێن: ئەگەر ڕاستە ئینسان هەستی خواناسیی لە سروشتیدا هەیە، دەبوو هەر لە سەرەتای لەدایکبوونیەوە تێیدا دەرکەوتبایە، هەروەک چۆن لە سەرەتاوە غەریزەی خواردن و خواردنەوەو پۆشاک و هەبوون، دەردەکەون!! چونکە ئێمە گوتمان هەستە بەرزەگیانییەکان هەر لە سەرەتاوە لە سروشتی ئادەمیزاددا هەن، بەڵام وەک ئامادەیی (استعداد)یەک نەک وەک شتێکی حازر بەدەست، یان وەک تۆو دەنک، نەک وەک درەخت و میوە!

### ٥) کارتێکراویی هەستی خواناسیی:

وەک گوتمان داخوازییە گیانییەکان لەلایەن چەند هۆیەکەوە کاریان تێ دەکرێو لە گەشەکردن دەوەستن، بەڵکو تەنانەت جاری وا هەیە نەڕەخسانی هەل ومەرجی گونجاو، دەبێتە هۆی کپبوون، یان پووکانەوەیان.

ئنجاهەستی خواپەرستیی و دینداریش کە یەکێکە لە داخوازییە سروشتیەکان، وەک چۆن نێوکە بادەمێک بۆ ئەوەی ببێتە بادەمێکی تەواو، پێویستە لە ژینگەو بارودۆخێکی گونجاودا جێگیر بێ، دەنا بە کرچ و کاڵیی سەر دەنێتەوە، بەهەمان شێوە هەستی خواپەرستییش، ئەگەر لە ژینگە (بیئة)و نێوەند (وسط)ێکی پێویستدا سەقامگیر نەبێ، پێناگات و ناچێتە قۆناغی کردەوەییەوە.

بۆیە کە دەبینین پڕوپاڵانتەی چەواشە (الدعایة المضادة) لەنێو زۆربەی کۆمەڵگاکانی ئەم سەردەمەدا دژی ئایین و خواناسیی بەکاردەهێنرێ و، لە

گەشەکردنی کەم دەکاتەوە، نابێ ئەو کارتێکرانەی ئایین بکەینە بەڵگەی زگماک نەبوونی، چونکە وەک گوتمان مانای خوارسک بوونی هەستە بەرزە گیانییەکان ئەوە نیە کە لە هەموو هەلومەرجێکی لەبارو نالەباردا گەشە بکەن.

## ٦) کپکرانی هەستی خواناسیی:

وەک گوتمان یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی داخوازییە گیانییەکان ئەوەیە کە هەرکاتێک تێر نەکران، یان تووشی کۆسپ و بەربەستێک بوون، کپ دەکرێن و دوایی لە ڕێیەکی دیکەوە سەر هەڵدەدەنەوە.

بۆ وێنە: یەکێک لە داخوازییە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە حەز دەکات ڕێزی لێ بگیرێ، جا ئەگەر هاتوو ئەو مەیل و داخوازییە تووشی بەربەستێک بوو، واتە بە سووک سەیرکرانێک تووشی مرۆڤ بوو، لە هەلومەرجێکی وادا کە نەتوانێ بەرگری لە خۆی بکات، ئەوە ئەو ئارەزووەی سەرشکێن دەکرێ و لەودیو هۆشیدا جێگیر دەبێ، ئنجا دەروونی ئەو مرۆڤە بەردەوام بەدوای هەلێکدا دەگەڕێ کە بۆ ئەو مەیل و داخوازییە سەرشکێنکراوەی تێ هەڵبێنێتەوە.

کەواتە: کە دەبینین لە هەندێک کەسدا هەستی خواپەرستیی نایەتە بەر نیگاو بەڕواڵەت خوانەناس و بێبڕوا دێنە بەرچاو، بەهیچ کلۆجێک بۆمان نیە ئەو دیاردەیە بکەینە بەڵگەی زگماک نەبوونی هەستی خواناسیی، چونکە ئەمیش وەک هەرکام لە هەستە گیانییەکان لە دەمی سەرشکاندنەوەیدا، لە ئەودیو هۆشدا پەنهان دەبێو کپ دەکرێو، دوایی لە هەل و دەرفەتێکی ڕەخساودا بەشێوەی جۆراوجۆر کاردانەوەی خۆی پێشان دەدات.

شیوعی و مارکسییەکانیش[1] زەقترین بەڵگەن لەم بارەوە:

---

(١) هەروەها تێکڕای بێدینەکانیش هەروان، چ بتپەرست بن، چ عەلمانیی، چ هاوبەشدانەر...هتد.

هەرچەندە بەڕواڵەت شیوعی و مارکسییەکان لە بنەڕەتەوە ئایینیان وێڵ کردوەو بە شتێکی کۆن و کات بەسەرچووی دەزانن، ئەمما هەر ئەوانیش کە ڕێچکەی کۆمۆنیزم و مارکسایەتییان لێ بۆتە جۆرە ئایینێک و، لە کاردانەوەی واز لە خواپەرستیی هێناندا، دووچاری بتپەرستیی بوون لە شێوەی پەرستنی مرۆڤدا و، لە ئەنجامی وێڵکردنی ئاییندا دووچاری ئەوە بوون کە بنچینەکانی کۆمۆنیزم وەک ئایینێکی بێ هەڵەو لە ناتەواویی بەدوور لە قەڵەم بدەن و نەتەوەپەرست و ڕەگەزپەرست و سامان پەرست و ئارەزووپەرستەکانیش بەهەمان شێوە، هەرکامێکیان هەرچەندە بەڕواڵەت خواناناسێو، کڕنووشی بۆ نابات، بەڵام بتێکی دیکەی لێ بۆتە خواو، کردوویەتە لووتکەی ئاوات و ئامانجی هەرەبەرزی ژیانی و خۆی کردۆتە کۆیلەو پەرستەری!

## ٧) هەستی خواناسیی حەوجێی فێرکەر نیە:

وەک لەپێشەوە گوتمان پەیدابوونی هەستەبەرزەکان لە دڵ و دەروونی ئینساندا پەکیان لەسەر فێرکەرو ڕێنماییکەرێک نەکەوتوەو هەر لەخۆوە سەرهەڵدەدەن.

جا هەڵبەتە ئەم خەسڵەتەی لەخۆوە پەیدابوون و سەرهەڵدان لە هەستی خواناسییدا، لە هەموو هەستەکانی دیکە پتر دیارو ئاشکرایە، بەتایبەتی لەکاتێکدا ئینسان دەگاتە قۆناغی باڵغ بوون و هەرزەکاریی، دەبینین لەو قۆناغەی تەمەندا کوڕان و کچان بە شەوق و گەرمییەکی بێوێنەوە ڕوو دەکەنە ئایین و خواناسیی، بەڵام زیاتر لەسەر بنچینەیەکی عاتیفیی نەک ژیری، هەر بۆیەش دەبینرێ پاش بەسەرچوونی ئەم قۆناغەی تەمەن، کوڕان و کچانێک کە لەسەر بنچینەیەکی ژیرییانەو زانیارییانە پەروەردە ناکرێن و ئایینیان تێ ناگەیەنرێ، وردەوردە پاشەکشە لە ئایین دەکەن و سەریان لێدەشێوێ، جا بێگومان هۆی ئەم دیاردەی پاشەکشەکردنە ئەوە

نیە کە ئایین لەسەر بنەڕەتێکی قووڵی ژیرییانەو عیلمییانە دانەنراوە، بۆیە دوای خاوبوونەوەی هاندەری عاتیفییانەی تەمەنی هەرزەکاریی، گەنج و تازەپێگەیشتووان لە ئایین سارد دەبنەوە! وەک بڕێک مرۆڤی کورتبین و بێئەزموون دەڵێن، بەڵکو ئەم دیاردەیە هۆیەکی قووڵتری هەیە کە پەتی بیرکردنەوەی عەقڵی ئەوان لەبەر کورتیی، نەیتوانیوە دۆلکەی هەڵهێنجان و ئەنجامگیریی خۆی بگەیەنێتێ.

هۆیەکەش ئەمەیە:

لە سۆنگەی ئەوەوە کە لەم سەردەمەدا گەرای چەندان بیروبۆچوون و بیردۆزەی سەیرو سەمەرەی بێبڕوایی دنیای تەنیوەتەوەو، هیچ ناوچە نین لێی دەرباز بووبن، بابایەکی گەنجی دڵسافی بێئەزموونی خۆشباوەڕی دڵ پڕ لە گوڕو تین، لەکاتێکدا کە هیچی ناخرێتە بەرچاوو ناکەوێتە بەر گوێ و، سەربارەی ئەمەش واقیعێکی بەناو ئایینییانەی پڕ لە ئەفسانەی دزێوو ناقۆڵای دەکەوێتە بەرچاو، خەڵکێک لەبن ئاڵای ئاییندا دەبینێ، کە دووچاری هەزارو یەک دەردی جەرگبڕ و کوشندە بووە، چۆن لە ئایین و خواپەرستیی ڕاناکات و ناکەوێتە تەڵەو داوی ئەو بیردۆزەو ڕێچکە شەیتانییانەوە، کە سەدان ساڵە کادیرو مشورخۆری لێبڕواوو فیداکارو زەبردەستیان هەن و، لە ماوەیەکی کەمدا حەوت ڕەنگان دەگۆڕن و، هەردەمە بە ئاوازێکی سەرنج ڕاکێش و فریودەر دەخوێنن؟!!

کەواتە: هەرچەندە هەستی خواناسیی لە سەرەتاوە پێویستی بە ڕێنماییکەرو هاندەر نیە، بەڵام دواتر بۆ ئەوەی لە ڕێی ڕاست لاڕێ نەبێو تووشی سەرگەردانیی نەبێ، ئەو هەست و سۆزە نەرم و ناسکە سادەیە، حەوجێی ڕێڕوونیی و ئاڕاستەکردنێکی ڕێک و ڕاستە، بە شێوازێکی ژیرانەو، لەبەر ڕۆشنایی و بە ئاڕاستەکردنی دەقە بێهەڵەوپەڵەکانی وەحییدا، هەر بۆیەش خوای پەروەردگاری بە بەزەیی هەر بەوەندە وازی نەهێناوە کە لە سروشتی

مرۆڤدا بیـری خواناسـیی و بـڕواداری چەسـپاندوە، بەڵکـو بەرنامـەو پەیـڕەوی تێروتـەواوی خۆیشی بە پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) ڕەوانە کردوە، بۆ ئـەوەی مرۆڤ ڕێی خواپەرستیی لێ ون نەبێو، تووشی گێژاوی بتپەرستیی و خۆپەرستی نەبێو، بە تۆڕو داوی طاغووتانـەوە نەبێ.

ئنجا گومانی تێدا نیە کە ئەم خەسڵەتەی هەستی خواناسیی - یانی خواڕسک بوونی - بەهێزترین بەڵگەی ئیسپاتی زگماک بوون و ڕیشەداربوونیەتی.

خوێنەری بەڕێز!

پێم وایـە هەرکەسێک بە وردیی و بە ویژدانـەوە ئەوەی خوێندبێتـەوە کە ڕابـرد، بـێ سـێودوو دەڵێـت: بـڕوام هەیـە بـە بوونـی هەسـتی خواناسـیی لـە سروشـتی ئینسـاندا، وەک داخوازییەکـی خواڕسـکی ڕەسـەن.

ئنجـا بـا بچینـە سـەر باسـێکی دیکـە، کـە زیاتـر تیشـک داوێتـە سـەر زگمـاک بـوون و ڕەسـەنایەتی هەسـتی خواناسـیی و، پشـتگیرییەکی چاکـی لـێ دەکات، ئەویش بریتیە لە باسی: پەیوەندیی هەستی ئایینی و خواناسیی بـە هەسـتەکانی دیکـەوە.

## هەستی ئایینی (الشعور الديني)
## سەرچاوەی هەموو هەستە بەرزەکانە

دوای ئەوەی زاناو شارەزایان بەهۆی دۆزینەوەی چوارەمین مەودای گیانیی مرۆڤ (واتە هەستی ئایینی)، شوورەی سێ مەودابوونی مرۆڤیان تێک شکاند، نەک هەر بیردۆزەکانی (مارکس) و (فرۆید) و (لینین) و (ڕاسل)، لەبارەی پەیدابوونی ئایینەوە وەدرۆ کەوتنەوە، بەڵکو لێکۆڵینەوەو پشکنینی نەپساوەی دەروونناس و کۆمەڵناسان ئیسپاتی کرد، کە هەستی ئایینی سەرچاوەی هەڵقوڵینی زانیاری و ڕەوشت و هونەرەو هەستی خواناسییە کە تۆوی زانیارییەکان لە دڵاندا بڵاودەکاتەوەو، نەمامی ڕەوشت و ئاکار هەراش دەکات و دەهێنێتە بەرو، خەسڵەتە بەرزو پەسندەکانی مرۆڤ گەشە پێ دەدات و، غەریزەکان هاوسەنگ دەکات و، وزە و تین بە هونەرمەندان و دەست ڕەنگینان و هەست ناسکان دەبەخشێو، وا دەکات کە ژیان ببێتە ئاوێنەی عەکسکەرەوەی؛ هونەری جوان و دڵگیرو، ئاوازی شادی هێن و، هەست و سۆزی ناسک و خەمڕەوێن.

با بزانین چۆن!

ئەگەر بەوردیی و قووڵیی سەرنجی ئەو چوار هەستە گیانییانە بدەین، دەبینین کە هەموویان لە خاڵێکدا بەشدارن، کە بریتیە لە عەوداڵیی و عیشق بەرانبەر بە ڕێکوپێکیی (نظام)، چونکە: ئەو زانیاریی و شارەزاییانەی کە بەهۆی هەستی ڕاستیخوازییەوە پەیدا دەبن، لە ڕاستیدا بریتین لەو یاساو دەستوورو وردەکارییانەی کە خوا لە جیهاندا دایناون، کەواتە ڕاستی خوازیی، بریتیە لە عیشقی ئینسان دەربارەی یاساو دەستوورو ڕێکوپێکیی و وردەکارییەکانی بوونەوەری خواکرد.

ڕەفتارە جوان و پەسندەکان و خووڕەوشتە دڵگیرو چاکەکانیش، کە لە سەرچاوەی هەستی چاکەخوازییەوە سەرچاوە دەگرن، لە ڕاستیدا جۆرە عیشق و شەیدابیەکن، بەرانبەر بە ڕەوشت ڕێکیی (النظام الأخلاقي) چونکە ئێمە دەزانین کە سەرجەمی بەدکاریی و ڕەوشتە نالەبارەکان، یان لە تێپەڕاندن (افراط) یان بەزایەدان (تفریط)ەوە پەیدا دەبن، بە واتایەکی دی؛ سەرجەمی ئاکارە خراپەکان بەهۆی چاودێری نەکران و ڕێک و پێک نەکرانی غەریزەو مەیل و ئارەزووەکانەوە دێنە کایەوە.

هونەرەجوانەکانیش کە سەرلەبەریان لە چاوگی جوانیخوازیی پەیدادەبن، هیچ شتێک نین جگە لە ڕێک و پێکییە بیستراوو بینراوەکان (المسموعات والمرئیات) و، ئاوازە ڕێک و پێکەکان و دەنگە بەجۆش و خرۆشەکان و تابلۆو دیمەنە دڵبزوێنەکان، کە گوێ و چاوی مرۆڤ دەخەنە تاوو تینی خۆیانەوەو کاریان تێدەکەن، واتە: بریتین لەو یاساو وردەکارییانەی کە هەستی جوانیی خوازیی لە مرۆڤدا لە جیهانی دەنگ و ڕەنگدا شەیدایانە.

ئنجا هەستی خواناسیی و ئایینخوازییش بریتیە لە عەوداڵیی و شەیدایی مرۆڤ دەربارەی ئەو خوا پەروەردگارەی، کە بەدیهێنەرو سەرچاوەی هەموو ئەو جۆرە ڕێک و پێکیی و وردەکارییانەیە!!

بە واتایەکی دیکە:

١- زانیاری؛ کە بەرهەمی هەستی ڕاستیی خوازییە، بریتیە لە پەی بردن بە ڕێک و پێکیی و وردەکاریی بوونەوەر.

٢- ڕەوشت؛ کە بەرهەمی هەستی چاکەخوازییە، بریتیە لە پەی بردن بە ڕێک و پێکیی و هاوسەنگیی غەریزەو مەیل و ئارەزووەکان.

٣- جوانیی؛ کە بەرهەمی هەستی جوانیی خوازییە، بریتیە لە پەی بردن بە بەدیهێنەری ئەو ڕێک و پێکیی و وردەکارییانە.

ئنجا ئێستا به‌ ئاسانیی ده‌توانین وه‌ڵامی ئه‌و پرسیاره‌ بده‌ینه‌وه‌ كه‌ ده‌ڵێ: بۆچی هه‌ستی خواناسیی به‌ سه‌رچاوه‌ی هه‌سته‌كانی دیكه‌ داده‌نرێ؟

چونكه‌: خواناسیی بریتیه‌ له‌ خۆشه‌ویستیی و ڕێز به‌رانبه‌ر به‌ خوای به‌دیهێنه‌ری یاساو ڕێك و پێكییه‌كانی بوونه‌وه‌ر، به‌ڵام سێ هه‌سته‌كانی دیكه‌، بریتین له‌ شه‌یدایی و عه‌وداڵیی ده‌رباره‌ی خودی ئه‌و یاساو ڕێك و پێكییانه‌.

ئنجا بێگومان مرۆڤ له‌ ئه‌نجامی ناسینی خواو، په‌ی بردن به‌وه‌ كه‌ سه‌رچاوه‌ی هه‌موو ڕاستیی و چاكیی و جوانییه‌كه‌، كه‌ڵكه‌ڵه‌ی ڕاستیخوازیی و چاكه‌خوازیی و جوانییخوازیی ده‌چێته‌ دڵ و ده‌روونه‌وه‌، ڕوونتر بڵێم: مرۆڤی بڕوادار له‌ سۆنگه‌ی خواناسییه‌وه‌، دڵنیا ده‌بێ له‌وه‌ی كه‌ بوونه‌وه‌ر له‌سه‌ر بنچینه‌ی ڕاستیی و چاكیی و جوانیی ڕۆنراوه‌، ئنجا ئه‌و بڕواهه‌بوون و دڵنیاییه‌ی پاڵی پێوه‌ده‌نێ، كه‌ له‌ باغی ڕازاوه‌ی بوونه‌وه‌ردا، بكه‌وێته‌ گه‌ڕان و سووڕان و پشكنین، بۆ دۆزینه‌وه‌ی ڕاستیی و چاكیی و جوانیی، چ له‌ زاتی خۆیداو چ له‌ ده‌وروبه‌ریدا.

خوێنه‌ری خۆشه‌ویستم!

ئێستاش با قسه‌ی چه‌ند شاره‌زایه‌ك له‌وباره‌وه‌ بخه‌ینه‌ڕوو، چونكه‌ له‌ ڕاستیدا هه‌ر قسه‌ی ئه‌و زاناو شاره‌زایانه‌شه‌، كه‌ من ده‌یكه‌مه‌ هه‌وێنی بیروبۆچوونه‌كانم، ئه‌گه‌ر نا من - وه‌ك لێتان ڕوونه‌ - له‌ ده‌رونزانیی و كۆمه‌ڵزانییدا شاره‌زاو پسپۆڕ نیم و، بۆشم نیه‌ به‌ شێوه‌یه‌كی خۆبه‌سه‌رانه‌ به‌ناوی جۆرێك له‌ جۆره‌كانی زانیارییه‌وه‌ - كه‌ تێیدا پسپۆڕو شاره‌زا نیم- بدوێم و مافی حوكم ده‌ركردن به‌خۆم بده‌م، چونكه‌ ڕه‌فتارێكی وا —خوا به‌دوورمان بكات- نه‌زانیی ده‌گه‌یه‌نێ.[1]

---

(١) به‌ڵام ئه‌م جۆره‌ ڕه‌فتارانه‌ بنچینه‌ی گشتی (القاعدة العامة) هه‌ڵوێستی دژ ئایین و لاڕێ بووانه‌ له‌ ئاقار به‌رنامه‌ی خوادا، ده‌بینی مرۆڤێكی سه‌رگه‌ردان، خۆی به‌ ڕۆشنبیر ده‌زانێو،

(تانەگی - دوو - کەنەتن) دەڵێت:

(هەروەک چۆن یەکێک لە ئیمتیازەکانی ئەم ڕۆژگارە ئەوەیە کە لە جیهانی ماددەدا مەودا (بعد)ێکی چوارەم بەناوی کات (زمن) دۆزراوەتەوە، کە لە سێ لایەنەکەی دیکەی ماددە -درێژیی، پانیی، بەرزیی- (الطول، العرض، الإرتفاع) جوێیەو لە هەمان کاتیشدا هەرسێکیان لەنێوخۆی دەگرێ، بەهەمان شێوە لەم سەردەمەدا لە بەرانبەری هەستی (جوانیی) و (چاکیی) و (ڕاستیی)دا، هەستی چوارەمی (پیرۆزیی) یان (خوایی) کە لە ڕاستیدا لایەنی چوارەمی مرۆڤە، دیسان دۆزاوەتەوە، جا لێرەدا ئەو لایەنە چوارەمە گیانییە، هەرچەندە لە سێ لایەنەکەی دیکە جودایە، بەڵام دەگونجێ سەرچاوەی پەیدابوونی سێ هەستەکەی دیکە بووبێ)[1].

(ئاینشتاین) دەڵێت:

(جوانترین هەست کە بگونجێ وەدەستی بێنین هەستی خواناسییە، هەر ئەویشە کە تۆوی هەموو زانیارییە سروشتییەکان لە زەوی دڵاندا دەچێنێ، کەسێک کە لەم هەستە بێ هەواڵە، کەسێکە کە ئیدی ناتوانێ سەرسامیی دەرببڕێ، یان تووشی سەرسوڕمان بێت[2] (لە ئاقار ڕێک و پێکیی و وردەکاریی دیاردە سروشتییەکاندا هەر دەڵێی مردوویە) - وەرگێڕ-.

(ویل دیورانت) مێژووزانی جیهانی ناودار دەڵێت:

(بەبڕوای (هربرت سپنسر) کە پسپۆڕییەکی گەورەی هەبووە لە کۆکردنەوەی بەڵگاندا بۆ گەیشتنە ئەنجام، کاهینەکان (پێشبینی گۆیان و مشورخۆرانی پەرستگاکان -وەرگێڕ-) هەروەک چۆن یەکەمین ئەدیب بوون، بە یەکەمین

---

ڕەخنە لە ئایین دەگرێ و سەد تۆمەتی دەداتە پاڵ، بەڵام لە (٦٢٣٦) ئایەتی قورئان، ئایەتێکی لەبەر نیە!!

(١) (حس مذهبي) ترجمهء مهندس بیاتی، چاپی دوم، ل٣٩ لە: (أنگیزه پیدایش مذاهب)، ل٢٨٥.

(٢) (حس مذهبي) ترجمهء مهندس بیاتی، ل٨، لە: (راه خدا شناسی)، ل٥٢، جعفر سبحانی.

زانـاش لەقەڵـەم دەدرێـن، چونکـە لـە تیۆەرامانـی مانـگ و ڕۆژو ئەستێرەکاندا، سـەرەتای زانیارییـان دەستپێکرد، ئـەو تیۆەرامانـەی کـە بەمەبەسـتی دیارییکردنی کاتێکـی وردی جەژنـە ئایینیـەکان ئەنجـام دەدرا، ئنجائـەم جـۆرە زانیاریـی و شـارەزاییانە لـە پەرسـتگاکاندا دەپارێـزران و بەنـاوی میراتـی ئایینـەوە، لـە پشتێکەوە بـۆ پشـتێکی دیکـە دەگوێزرانـەوە)[1].

دیسان دەڵێت:

کاهینەکانـی میـزو پۆتامیـا (نێـوان دوو ڕووبارەکـە) (بیـن النهریـن)[2] بەهـۆی بەڕێوەبردنـی چەنـد ئەرکێکـی وەک؛ دادوەریـی و جێبەجێکردنـی کاروباری خەڵکـی، جوتیاریـی، پیشەسـازیی، فاڵچیەتیـی، ئەسـتێرەگەریی، گیانەوەرزانیـی، کـە وە ئەسـتۆیان گرتبـوون، بێئـەوەی بەخۆیـان بزانـن، بناغـەی چەنـد زانیارییەکیان دارشـت، کـە دواتـر بەدەسـتی یۆنانییـەکان گەیشـت و، یۆنانییەکانیـش تـا ماوەیـەک بەهـۆی ئـەو زانیارییانـەوە، ئایینیـان لـە پێشـەوایەتی و فەرمانڕەوایەتیـی کاروبـاری دنیـا هێنایـە خـوار)[3].

(ویـل دیورانـت) بـڕوای وایـە کـە هەسـتی ئایینـی نـەک هـەر لـە بەرەوپێش بردنـی زانیاریـی و پیشەسـازییەکاندا شـوێنەوارێکی زەقـی هەیـە، بەڵکـو لـە گەشـەپێدانی ئەدەب و پێگەیاندنی هەستی ئەدەبیی و سـەلیقەی شاعیرایەتییشدا، شـوێنەوارێکی شـایانی باسـی هەیـە، لـەو بـارەوە دەڵێـت:

(ئـەدەب و شـیعر لـە ئـاوازو سـروودە ئایینیـی و تەلیسـمە جادووییەکانـەوە سـەرچاوەی گرتـوە، چونکـە کاهینـەکان ئـەو سـروودو تەلیسـمانەیان[4] دەخوێنـدەوەو لـە دێیەکـەوە بـۆ دێیەکـی دی دەچـوون).

---

(١) (تأريخ الحضارة) ب١ ل١٢١، ویل دیورانت، لە: (راه خداشناسی) ل ٥٤.

(٢) مەبەست لە (بين النهرين) ئەو ناوچەیەیە کە دەکەوێتە نێوان دوو ڕووباری دیجلەو فوراتەوە.

(٣) (تأريخ الحضارة) ب١ ل٣٨٣، ویل دیورانت، لە: (راه خداشناسی) ل ٥٤.

(٤) (طِلَسْم و طِلَّسْم ج طلاسِم) وشـەیەکی یۆنانییە، بـەو نووسـینە دەگوترێ کـە جادووگـەر دەینووسـێو بـڕوای وایـە پێشـگریی هەمـوو خراپەیەکـی پـێ دەکات. المنجد ض٢٧ ل٤٦٩.

ئنجا دوای ئەوەی چەند بەڵگەیەکی دیکە لەوبارەوە دێنێتەوە دەڵێ:

(یۆنانییەکان یەکەمین شیعرێک کە گوتراوە، پاڵی دەدەنە لای کاهینەکانی پەرستگای (دلف)، ئنجا دوایی ئەو شاعیرو دواندەرو مێژووناسانەی کە هەموویان لە بنەڕەتی کاهینی و ئاییندا یەک بوون، هێدی هێدی لەیەک جیابوونەوتەوە)[1].

دیسان دەڵێت:

(کۆنترین شت کە لە ئەدەبی میسریی بەجێماوە، بریتیە لە (دەقەکانی ئەهرامی میسر) کە چەند بابەتێکی ئایینین لەسەر دیواری پێنج هەرەم لە هەرەمەکانی زنجیرەی پێنجەم و شەشەم نووسراونەوە)[2].

(گلبرت) دەڵێ:

(ئایین بە یەکێک لە بنچینەییترین سەرچاوەکانی هەستی هونەرو داهێنان دادەنرێ، هەروەک چۆن هونەریش دیسان یەکێکە لە چاکترین شێوازەکانی دەربڕینی بیری ئایینی و، لە سەرانسەری دنیادا - هەر لە پەرستگاکانی چینەوە بگرە هەتا پەیکەرەکانی مەکسیک- دەبینی هونەرمەندان بەرزترین و باشترین نموونەی هونەرییان بۆ ڕێزلێنان و بەگەورەگرتنی پەرستراوەکان[3]، هێناوەتە دی)[4].

تەنانەت ئەهرامەکانی میسریش کە سەرنج ڕاکێشترین شاکاری بیناسازیین، بەرهەمی هەمان هەستی خواپەرستیی و ئایین پەروەریین، (ویل دیورانت) لەوبارەوە دەڵێت:

---

(١) (تأريخ الحضارة)، ب١، ل١١٩-١٢٠، ویل دیورانت، لە: (راه خداشناسی)، ل٥٥.

(٢) (تأريخ الحضارة)، ب١، ل٢٦٢، ویل دیورانت، لە: (راه خداشناسی)، ل٥٥.

(٣) گەلێک جار گەلە رابردووەکان بەهۆی دوورکەوتنەوەیانەوە لە سەرچاوەی ڕوونی پەیامی خودا، دووچاری ڕێچکەی چەند پەرستراویی (تعدد الآلهة) دەبوون.

(٤) (هجرة الأفكار) گلبرت، ترجمة: شفيق أسعد، ل٣٩-٦٩، لە: (أنگیزه پیدایش مذاهب)، ل٢٨٦ چاپ دوم.

(گومانی تێدا نیە خەڵکی ئەو سەردەمە، مەبەستیان دروستکردنی یەک شوێنەواری گەورەی بیناسازیی نەبووەو، ئەم کارە (دروستکردنی ئەهرامەکان) بەس بە مەبەستی خزمەتکردنی بیری ئایینی هاتۆتە دی)[١].

خوێنەری ئازیز!

ئێستاش کە هەتا ئەندازەیەکی باش مەسەلەی پەیوەندیی نێوان هەستی خواناسیی و هەستەبەرزەکانی دیکە، ڕوون بۆوەو، سەلمێنرا کە هەستی ئایینی سەرچاوەی هەموو هەستەکانی دیکەیە، وای بەچاک دەزانم بۆ زیاتر دڵنیابوون لە خاوڕسک بوونی هەستی خواناسیی، هەڵوێستی چەند زاناو شارەزایەکی ناودار لەوبارەوە بخەینە ڕوو.



---

(١) بڕوانە: (تأريخ الحضارة)، ب١ ل١١٩-١٢٠، ويل ديورانت، لە: (راه خداشناسی)، ل٥٥.

## هەڵوێستی زاناو شارەزایان دەربارەی ڕەسەنایەتیی هەستی خواناسیی

**١)** (دکتۆر ئەلکسیس کاریل) دەڵێت:

(بیری ئایینی لە بیرکردنەوەی فەلسەفیی زیاتر کاری کردۆتە سەر مرۆڤایەتی، ئاخر ئایین بنچینەی خێزان و ژیانی کۆمەڵایەتی بوو لە شارستانەتی کۆندا)[1].

دیسان دەڵێت:

(پێشگیریی کردن لە گەشەکردنی لایەنەکانی چالاکی سۆزو هەست و نەست (النشاط العاطفي) یان چالاکی جوانیی، یاخود ئایینی، چەند کەسێکی بیرتەسک و ناتەواو لە پلەی خوارێدا دێنێتە کایەوە) [2].

دیسان دەڵێت:

(لە ڕاستیدا وا دێتە بەرچاو کە هەستی خواناسیی، چالاکییەکە لە قووڵایی سروشتمانەوە سەرچاوە دەگرێ و یەک داخوازیی سروشتییە)[3].

هەروەها دەڵێت:

(هەستی خواناسیی لە قووڵاییەکانی سروشتمانەوە هەڵدەقوڵێو لە ڕاستیدا داخوازییەکی ڕەسەنی ئینسانییە، هەروەک چۆن مرۆڤ پێویستی بە ئاوو ئۆکسجین هەیە، پێویستی بە بڕوابەخوا بوونیش هەیە)[4].

---

(١) (الإنسان ذلك المجهول) الكسيس كاريل، ل١١٠، ترجمة: عادل شفيق.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ل١١٢.

(٣) (نیایش) (الدعاء) الكسيس كاريل، ترجمة: دكتر علي شريعتي، ل١٦.

(٤) سەرچاوەی پێشوو، ل١٦-٢٤، و (عصر بازگشت به إيمان)، ل٣١ جعفر سبحانی.

دیسان دەڵێت:

(کزیی هەستی خواناسیی هێندەی کزیی هێزی مێشکی بەزەرە)[1].

٢) (لیکونت دی نوی) دەڵێت:

(ئایین ئەو شتەیە کە مرۆڤ وا لێ دەکات بتوانێ هێزی جیهانگیریی خۆی (واتە عەقڵ - وەرگێڕ-) کە هەندێک جار رێ تاریککەرو هەندێک جار سەرگێژکەرە، بەڵام لە ئاژەڵ جیای کردۆتەوەو لە بەدیهێنەری خۆی وەنزیکی دەخات؛ لەنێوخۆیدا[2] گەشە پێبدات.

چاوپۆشیی لە هەر ئایین و پەرستگایەک بکە، هەمیشە لە دنیادا هەستی ئایینی، ئارەزووی بڕواداریی، ئارەزووی پەرستنی ڕووت، ئارەزووی گەردنکەچیی لە خواپەرستییەکی تەواودا، ئارەزووی بەرزکردنەوەی گیان بۆ وەنزیک کەوتن لەو کامڵ بوونە پێویستەی کە شیاوی دەرک کران و پەی پێ برانە، بەڵام شیاوی پێگەیشتن (وصال) نیە؛ هەر هەبووە، ئەم مەیل و ئارەزووەشە کە سەرچاوەیەکی خوایی هەیە، چونکە هەستێکی جیهانییەو هەموو مرۆڤەکان تێیدا یەکسانن[3].

... ئایینی ئێمە هەرچی بێ، ئێمە هەموومان وەک کەسانێک واین کە لە دەرووێک دان و، دەیانەوێ بچنە سەر نووکی لووتکەیەکی بەفراویی کە لە سەرووی هەموو لووتکەکانەوەیە، هەموو چاومان لەیەک ئامانجەو لەسەر ئەوە ڕێک کەوتووین کە بگەینە یەک لووتکە، بەڵام ڕێیەکانمان جودان)[4].

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل٢.

(٢) واتە ئایین دەبێتە هۆی پێهەڵابردنی ئاستی بیروهۆش و گەشەپێدانی.

(٣) (مصير البشرية) ليكونت دى نوى، ترجمة عبدالله انتظام، ل٢٠٧،٢٠٨، چاپ ٢.

(٤) سەرچاوەی پێشوو.

**٣)** (ئیریک فرۆم) دەروونناس و کۆمەڵناسی ناودار دەڵێت:

(لەراستیدا هیچ کلتوورو فەرهەنگ (ثقافة)یکی ڕابردوو دەست ناکەوێ کە ئایین بە چەمکە فراوانەکەی پێناسەی ئێمە، لەو کلتوورەدا جێگەیەکی نەبووبێ و، لە داهاتووشدا چاوەڕوان ناکرێ کلتوورێکی وا - کە لە ئایین خاڵی بێ- وەدی بێ.. لێکۆڵینەوەی سروشتی ئینسان، تێگەیشتن[١] لەو مەسەلەیە کە: پێویستیی هەبوون بە بەرنامەیەکی یەک ئامانج و سەرچاوەیەکی بڕواداریی، خاوەنی ڕەگ و ڕیشەیەکی قووڵە لە سروشتی مرۆڤدا، بۆ ئێمە ئاسان دەکات)[٢].

ئنجا دەڵێت:

(لەبەر ئەوەی کە پێویستیی هەبوون بە رووکردنە یەک ئامانج و بڕواهێنان پێکهێنەرێکە لە سروشت و کەسایەتیی مرۆڤدا، دەتوانین پەی بە گرنگیی و بایەخیی ئەو پێویستیی هەبوونە بەرین، بەراستی هیچ سەرچاوەیەکی وزەو توانا لەو سەرچاوەیە بەهێزتر، لە مرۆڤدا نیە)[٣].

دوایی دەڵێت:

(وا دێتە بەر نیگا کە ئەو بیردۆزەیەی ڕەگ و ڕیشەی پێویستی هەبوونی مرۆڤ بە ڕووکردنە یەک چاوگی ئامانج و بڕوا، دەگێڕێتەوە بۆ زات و سروشتی ئینسان، مەسەلەی پەیدابوونی ئایین لە مێژوودا وەک دیاردەیەکی جیهانیی، بەتەواوی پشتگیریی لێ دەکات)[٤].

---

(١) (تێگەیشتن لەو مەسەلەیە) (نیهاد)ەو (بۆ ئێمە ئاسان دەکات) گوزارە (خبر)یەتی.

(٢) (روانکاوی و دین) أریک فروم، ترجمه آرسن نظریان، ل٣٢ چاپ سوم.

(٣) سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥.

(٤) (روانکاوی و دین)، ل٣٧.

٤) (دکتۆر کارل یۆنگ) دەروونناسی سەدەی بیست دەڵێ:

(خوا بەهێزترین و کاریگەرترین پاڵنەرە لە گیانی مرۆڤدا)[1].

دیسان دەڵێت:

[ئەو ڕاستییە دەروونناسییەی کە لە بوونی مرۆڤدا گەورەترین هێز دەخاتە گەڕ، بەناوی (خوا) دەردەکەوێ، چونکە هەمیشە بەهێزترین هاندەری سروشتی مرۆڤ ئەوەیە کە پێی دەگوترێ (هەستی خواناسیی)][2].

دیسان دەڵێت:

(لە ڕێگای موتاڵای بەسەرهاتە کۆنەکانی گەلانەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە مرۆڤ خاوەنی یەک هەستی ئایینییەو، ئەو هەستەش هێندەی غەریزەی جینسیی و غەریزەی جەنگ کردن، لەویدا کاریگەرە)[3].

(دکتۆر صبور أوردوبادی) کە لەگەڵ یۆنگدا لەوبارەوە گفتوگۆی کردوە، دەڵێت:

(بڕوابوونی (یۆنگ) بە خواو سووربوونی لەسەر ئەوە کە ئایین یەکێکە لە داخوازییە سەرەتایی و بنەڕەتییەکانی مرۆڤ، ئەمی لە دوو کەسی دیکە جیاکردۆتەوە، کە لەگەڵ وی زانیاریی دەرونزانییان بناغەڕێژ کرد، یانی زیگموند فرۆید و ئالفەر ئادلەر)[4].

---

(١) (روانشناسی ودین)، ل١٧٤، لە: (خدا در أندیشەء بشر)، ل٢٤١.

(٢) (مقدمەء بر روانشناسی یونگ)، ل١٢٦ لە (خدا در أندیشەء بشر)، ل٢٤١.

(٣) (روانشناسی ودین)، ل١٦٣، لە: (خدا در أندیشەء بشر)، ل٢٤١.

(٤) (مکتب روانشناسی تحلیلی)، ل١١٣، لە: (خدا....)، ل٢٤.

٥) (ئۆگست کونت) فەیلەسوفی ناودار دەڵێ:

(ئێمە دەتوانین یاسای گەشەکردنی عەقڵ لە هەستی ئایینیدا بدۆزینەوە، چونکە ئایین لە یەک داخوازیی زگماکیی بەرەی مرۆڤ پەیدا بووە و، لەو دەمەوە کە مرۆڤ پەیدا بووە، ئایینیش سەری هەڵداوە).

٦) (منتسیکو) هۆشمەند و کۆمەڵناسی فەڕەنسیی، کە خاوەنی کتێبی (روح الشرائع)ە و ئێستاش پاش چەند[1] سەدە پلەو پایەی خۆی پاراستوە، بڕوا بەخوابوون بە یەکەمین یاسای فیطرِیی دادەنێ، وەک دەڵێ:

(ئەو یاسایەی کە بڕواهێنان بەیەک بەدیهێنەر لە مێشکی ئێمەدا پەیدا دەکاو، ئێمە بەرەو ئەو بەدیهێنەرە ڕادەکێشێ، لە گرنگیی و بایەخدا بە یەکەمین یاسای خوارِسک دادەنرێ)[2].

٧) (کانت) فەیلەسوفی ئەڵمانیی سەدەی (١٨) دەڵێت:

(بیری مرۆڤ بڕوای بە ڕاستییەکی بێسنوور هەیە، کە بە بەدیهێنەرو دروستکەری بوونەوەرو بەپاک و تاک و زاناو تواناو کاربەجێو میهرەبانی دەزانێ، بە واتایەکی دیکە؛ خوایەک کە رابەرانی ئایین و فەیلەسوفانی خواناس دەیلێن و، دڵی ئێمە هەمووومان شایەدیی بوونی دەدات)[3].

٨) (پاسکاڵ) زانای بەناوبانگی فەڕەنسیی سەدەی (١٧) دەڵێت:
(دڵ شایەدیی بوونی خوا دەدات)[4].

---

(١) لە ساڵی ١٧٢٨ز دا دایناوە. المنجد/ قسم الاعلام، ل٣١١، ض٢٧.

(٢) (روح الشرائع) ل٨٧، لە (راهی أزدرون) ل٤٩ حاج بنی صادقی.

(٣) (سَیر حِکمَت در أوروپا) محمد علی فروغی، ب١، ل٥٤.

(٤) سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل١٩٢.

٩) (مالبرانش) فەیلەسوفی ناودار دەڵێت:

(بوونی خوا بەڵگەنەویست (بديهي)ەو، زانیاری مرۆڤ دەربارەی بوونی خوا پێویستییەکی ژیرییەو، گیانی مرۆڤ ڕاستەوخۆ بەبێ هۆ، پەی بە بوونی خوا دەبات)[١].

خوێنەری بەڕێز!

کورد دەڵێن: (لوێچێک نموونەی تەغارێکە)، ئێمەش لە چەندان تەغاری دان پێداهێنانی زاناو شارەزایان، لە بابەت سروشتیی بوون و خوارِسکیی هەستی ئایینی و خواناسیی، لوێچێکی گچکەمان ڕانواند، هیوادارم بایی حاڵیکردنی گەلێکانی کردبێ.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە بە خستنەڕووی سێ تێبینی گرنگ، کۆتایی بە توێژینەوەی یەکەمین پاڵنەری بڕوا بەخوا بوون بێنین و، بچینە سەروکاری پاڵنەری دووەم.



---

(١) هەمان سەرچاوە، ب١، ل١٩٦.

## سێ تێبینی گرنگ

یه‌کـــــه‌م:

ئێمه که ده‌ڵێین؛ هه‌ستی خواناسیی داخوازییه‌کی زگماک و گیانیی مرۆڤه، هیچ که‌س بۆی نیه بێبڕوایی و بێدینیی هه‌ندێک که‌س بکاته به‌ڵگه‌ی سروشتیی نه‌بوونی، چونکه وه‌ک پێشتر گوتمان، سروشتیی بوونی هه‌ستی ئایینی، ئه‌وه ناگه‌یه‌نێ که له هه‌موو هه‌ل ومه‌رجێکی گونجاو و نه‌گونجاودا گه‌شه بکات و بخه‌ملێ و، هیچ شتێک کاری تێ نه‌کات و، هیچ به‌ربه‌ستێک ڕێڕه‌وی پێخوار نه‌کات.

چونکه هیچ کام له داخوازییه گیانییه‌کانی دیکه‌ش به‌و جۆره نین و، ته‌نانه‌ت غه‌ریزه‌و داخوازییه جه‌سته‌ییه‌کانیش ئه‌وه‌یان له وزه‌دا نیه، به‌ڵکو له بارودۆخێکی نائاسایی و نه‌گونجاودا بێجگه له خۆ په‌نهان کردن و کپ بوون، هیچ چاره‌ی دیکه‌یان نین!

بۆ وێنه: ئێمه ده‌بینین له ده‌می برسیه‌تیی و تینووه‌تییدا، مرۆڤ بیری ناچێته سه‌ر غه‌ریزه‌ی جینسیی و هه‌ر ئاگای لێ نامێنێ، دیسان ئه‌و هیندیی و مه‌سیحییانه‌ی ده‌یانه‌وێ به‌سه‌ر ئاره‌زووه‌کانیاندا زاڵ بن، ده‌بینی ئه‌وه‌ی که بیری لێ ناکه‌نه‌وه مه‌سه‌له‌ی جینسه، به‌ڵام خۆ وه‌نه‌بێ نه بابای برسیی و تینوو و، نه دیان و هینده‌کان یه‌کجاریی غه‌ریزه‌ی جینسییان تێدا نه‌مابێو بنه‌بڕ کرابێ! به‌ڵکو هه‌رکاتێک له هه‌لومه‌رجێکی گونجاودا، خۆی ببینێته‌وه، سه‌رله‌نوێ وه‌ک ژیله‌مۆی بن خۆڵه‌مێش بوونی خۆی ئیسپات ده‌کاته‌وه‌و سه‌ر هه‌ڵده‌داته‌وه.

بەڵێ هەستی خواناسییش وەک داخوازیی و غەریزە سروشتییەکانی دیکە، شیاوی لە گەشەکەوتن و لاوازبوون و کپکرانە، ئەمما ئەوەندە هەیە قەت یەکجاریی نافەوتێ و ڕیشەکێش ناکرێ.

بۆ وێنە؛ ڕۆچوون بە ڕابواردنی ماددیی و خۆشگوزەرانییداو، زۆر سەرگەرم بوون بە ئارەزووە ماددییەکانەوە، دەبێتە هۆی کزبوون و بێهێزبوونی هەستی خواناسیی، ئنجا ئەگەر بێت و تای ئارەزووپەرستیی و دنیاویستیی هێندە گران ببێ کە هەموو ڕووبەری کەسایەتیی مرۆڤ دابگرێ، ئەوە مەودای مەیل و هەستە گیانییەکان نامێنێ.

ئنجا خۆ وەنەبێ بەس غەریزەو داخوازییە سروشتییەکان لە هەل ومەرج و بارودۆخی نائاسایی و نەگونجاودا بوەستن و لەکار بکەون و مەحتەل بن، بەڵکو ئەوە بنچینەی گشتی (القاعدة العامة)ی هەموو یاسا فیزیایی و کیمیایی و زیندەوەرییەکانە بە تێکڕایی.

بۆ وێنە: بە پێی یاسای (ئەرخەمیدس) هەر تەنێک کە دەخرێتە نێو ئاوێ، بارتەقای قەبارەی خۆی ئاو لادەدات، یاسایەکی فیزیایی دیکەش هەیە دەڵێت: هەر تەن (جسم)ێک کێشی (١سم$^{٣}$)ی لە گرامێک کەمتر بێ، -واتە چڕی (کثافة)یەکەی لە چڕی ئاوێ (١گم= ١سم$^{٣}$) کەمتر نەبێ- ئەوە سەر ئاو دەبێ، بەڵام بە پێچەوانەوە: ئەو تەنانەی کێشی (١سم$^{٣}$)یان لە گرامێک پتر بێ، نوقم دەبن، بۆ وێنە:

(زێڕ) کە کێشی(١سم$^{٣}$)ی (٣١,٩ گرامە)و، (پلاتین) ٢١,٥ و، (ئاسن) ٧,٨٨ و (مس) ٨,٩٣ یە، لە ئاودا نقووم دەبن[١].

ئنجا هەرچەندە لەشی مرۆڤیش بەتێکڕایی لەو تەنانەیە، کە (١سم$^{٣}$) یان کێشی لە گرامێک زیاترە، واتە هەر مرۆڤێک بکەوێتە نێو ئاوێکی

---

(١) (فیزیك برای همه)، ل١٧، لا.لانداو، آکیتا یگارو دسکی، بنگاه نشریات میر - موسکو.

قووڵەوە بـە نقووم بـوو و خنـکاو دەژمێردرێ، بـەڵام کەسانێک کـە مەلەوانـن ئـەم یاسـایە نایانگرێتـەوە! بـەڵام نـەک لەبـەر وەدرۆ گەڕانـی، یـان نەمانـی یاسایەکە، بەڵکو لەبەر هاتنـە پێشی پەردەو بەربەستێک، کـە دەبێتـە قەڵغان و تیـری کارتێکردنـی یاسایەکە بەرپـەرچ دەداتـەوە.

مەسـەلەی هەسـتی خواناسـییش بەهەمـان شـێوە، یاسـایەکی گشـتییە لـە سروشـتی تێکـڕای مرۆڤایەتیدا، بـەڵام بەهـۆی بارودۆخـی سیاسـیی و ئابووریـی و کۆمەڵایەتیـی و گەلێـک هـەل ومەرجـی دیکـەی جۆراوجـۆرەوە، هەندێـک کـەس ئـەو هەسـتەیان کـز دەبێـت یـان کـپ دەبـێ و، پەردەیەکـی ڕەشـیان بەسـەر دڵ و دەروون هەڵدەکشێو، لـە گێژاوی گومـان و ئەفسانەسازییدا مـات و حەیـران و سەرسـام دەبـن.

ئێسـتا ڕەنگـە یەکێـک لەوانـەی دەردی: (سـەرودڵ نەخۆشـیی) فـزەی لـێ بڕیـون، بڵـێ: جا هـەروەک چـۆن ئێـوە هەسـتی خواپەرسـتیی بـە داخوازییەکـی سروشـتیی ڕەسـەن دادەنێـن و، لەخـوا یاخیبـوون بەڕیزپـەڕ (الشـاذ)، ئێمـەش دەڵێیـن: نەخێر بەڵکـو بـە بەراوەژووەوە: بێبڕوایـی و بێدینیـی شتێکی خوارسـک و ڕەسـەنەو، خواپەرسـتیی و ئاییـن دۆسـتیی لـە یاسـا دەرچـوون و ڕیزپەڕییـە!

بەڵام لە وەڵامدا دەڵێیـن:

١- ئـەم قسـەیە هـەر نەسـەلمێنراویی و بێپشـت و پەناییەکـی شایەدی پووچەڵیـی و بێکاکڵییەتـی، چونکـە هەرچـی قسـەی کـردو بەبـێ شـایەدی بەڵگـە لێـی وەربگیـرێ، دنیـا دەبێتـە شـێتخانەو، هیـچ شـتێک لـە جێـی خـۆی نامێنـێ.

٢- هەرکەسێک لەوەی کە ڕابرد - لەبارەی زگماکبوونی هەستی خواناسییەوە- حاڵـی بووبـێ، مەگـەر بـە ئانقەسـت دەنا مەحاڵـە شتـی وای بەبیردا بێت.

٣- هەمیشـە شـتی ڕیزپـەڕ و دەگمـەن لـە شـتی سروشـتیی و ئاسـایی کەمتـرو دەگمەنتـرە، دە جـا فەرمـوو سـەرنج بـدەو تێفکـرە! چ لـە مێـژووی ڕابـردووی

گەلان، کە مێژوونووسان و شوێنەوارناسان دەڵێن: هیچ چاخ و سەردەمێک نەبووە کە مرۆڤایەتیی بە گشتی، بە شێوەیەک لە شێوەکانی پەرستن - ڕاستبێ یان هەڵە - خوای نەپەرستبێ، چ لە بارودۆخی ئێستای جیهان، کە لەگەڵ ئەو هەموو هاتوهووت و گەڕان و سووڕان و هەوڵ و کۆششەی ڕابەرانی بیری بێبڕواییدا، بۆ پەرەپێدانی و کزکردنی هەستی خواناسیی و، ڕیشەکێشکردنی بیری ئایینی، دەبینی هەر وڵاتێک بیگری -تەنانەت وڵاتە کۆمۆنیست و مارکسیستەکانیش- ڕێژە (نسبة)ی خواپەرست و ئایین دۆستانی چەند قاتی بێبڕواو بێدینانە!

جا مەگەر بەگوێرەی بیرکردنەوەی ئەو سەرو دڵ نەخۆشە بێهۆشە، شتی سروشتیی و یاسایی دەگمەن بێو، شتی ڕیزپەڕ زۆرتر بێ!!

لە ڕاستیدا ڕاچڵەکین و هەڵلەرزین و پەشۆکانی مرۆڤ و هاوارکردن و لە خوا پاڕانەوەی لە دەمی ڕوبەڕووبوونیدا، لەگەڵ ڕووداوو کارەساتێکی ترسناکدا، چاکترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خواناسیی یاسایەکی سروشتییەو لەخوا یاخیبوون لادان و ڕیزپەڕییە، بۆیە لەگەڵ تەقەی چەکوچی گیروگرفت و کارەساتێکدا، پەردەو ژەنگی سەر دڵی بابای یاخی لادەچێ و، لە ڕاستیدا من مرۆڤی بێبڕوام وەک ئەو منداڵە نەفامە دێتە بەرچاو، کە لەبەر یارییکردن ئاگای لەو دایکە میهرەبانەی نامێنێ کە بەخێوی دەکات، بەڵام هەر لەگەڵ مەترسییەکی دێتە ڕێ، وە هەڵپە دەکەوێ، یارییەکەی بەجێدێڵێ و خۆی داوێتەوە نێو باوەشی گەرم و پڕ سۆزو بەزەیی دایکی!!

دووەم:

هەندێک کەس وا بیر دەکەنەوە کە هەستی خواناسیی لە زگماک و دەروونی مرۆڤەوە هەڵنەقوڵیوە، بەڵکو سەرچاوەی ئایین بریتییە لە نەریت (العادة).

بەڵام ئەو کەسانەی کە ئاوا بیردەکەنەوە، ئەگەر هاتباو شارەزاییان بە سیفەتە تایبەتییەکانی نەریت هەبوایەو، جیاوازیی نێوان زگماک (فطرة)و نەریتیان زانیبوایە، حەتمەن قسەی وایان بەسەر زاریدا نەدەهات.

جیاوازییەکانی نێوان نەریت و زگماکیش ئەمانەن:

١) نەریت شتێکە مرۆڤ بۆخۆی وەدەستی دێنێ، واتە (اکتسابي)یە، بەڵام زگماک لە زاتی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ، کەواتە عادەت دەشێ بگۆڕێ، بەڵام زگماک گۆڕانی بەسەردا نایەت.

٢) عادەت پەیوەندیی بە هەل ومەرجی سیاسیی و جوگرافیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە هەیە، بەڵام هەستە سروشتییەکان پەیوەندییان بە زات و سروشتی مرۆڤەوە هەیەو، هیچ شتێک نابێتە هۆی پەیدابوون و لەنێوچوونیان.

٣) دەگونجێ نەریت و خوو، شتێکی ماقووڵ و لواو نەبێ، ئەگەر سەرنجێکی داب و دەستوورو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان بدەین، گەلێک دیاردەی نەگونجاوو هەڵە دەبینین، هۆی ئەمەش ئەوەیە، کە عادەت و نەریتەکان بەزۆری بەهۆی لاساکردنەوەو شوێن پێ هەڵگرتنی پێشینانەوە پەیدا دەبن، بەڵام هەستە گیانییەکان بنچینەو شێوازێکی ژیرانەیان هەیە.

٤) عادەت شتێکی گشتی نیە، دەبینین گەل و تیرەکان، تەنانەت لە یەک نەریتیشدا یەک ناگرنەوەو هەر گەل و تیرە داب و دەستورێکی تایبەتی و سەربەخۆی هەیە، لە هەموو کاروبارێکی ژیانیدا، بەڵام هەستە بەرزەکان - بە تایبەتی هەستی خواناسیی- هەموو مرۆڤایەتی وەک یەک تێیاندا بەشدارە بە گشتی.

هەڵبەتە بە وردبوونەوەو سەرنجدانێکی بەویژدانەوە دەردەکەوێ، کە بیردۆزەی بەعادەت دروستبوونی هەستی خواناسیی و دیاردەی ئایین، زیاتر وەک قسەی منداڵ وپاڵ و بابای خەواڵوو دەچێ، تا مرۆڤی ژیرو تێگەیشتوو

و ئەو جیاوازییانەی نێوان نەریتەکان و هەستە خوارِسک و زگماکەکانیش بەسە بۆ پووچاندنەوەی ئەفسانەی[1] بیردۆزەی ناوبراو.

سێیەم:

بڕوا بەخوابوون و ئایین پەروەریی لە ڕوانگەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) شتێکی خوارِسک (فطري)و سروشتییە، هەر بۆیەش قورئانی قسە لەجێ بۆ سەلماندنی بوونی خوا، زۆر کەم شێوازی بەلْگەهێنانەوە (إستدلال)ی بەکارهێناوە، زیاتر پەنای بردۆتە بەر شێوازی بێدارکردنەوەو ووریاکردنەوە، جا بێگومان توێژینەوەی باسی خۆڕسکیی بڕوابەخوا بوون و هەستی ئایینی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، باسێکی بەربڵاوەو، جێیەکی تەرخانکراوی پێویستە، بەڵام عارەب گوتەنی: (ما لا يُدرك كُلُه لايُترك كُلُّهُ)، کەواتە با بەپێی دەرفەت و مەودایەک کە سروشتی ئەم کتێبە دەیخوازێ شتێکی هەر لێ باس بکەین:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَاۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (الروم-٣٠).

واتە: جا ڕووی خۆت بەرانبەر بە ئایینی بێگەردو[2] ساف ڕاگرە، ئەو فیطرەتەی کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە، دروستکراوی خوا گۆڕان

---

(١) لە ڕاستیدا هەموو ئەفسانەیەک لە زاتی خۆیدا پووچ و بۆشە، بەلام بەداخەوە لە ئەنجامی چەواشەکاریی ناحەزانی خواو ئاییندا، گەلێک ئەفسانە لە بەرگی زانست و فەلسەفەو ناوی زریق و بریقدا دەخرێنە ڕوو!

(٢) بەپێی ئەو مانایەی ئێمە لێکمان داوەتەوە (حنيفاً) (حال)ە بۆ (الدين)، بەڵام دەشگونجێ (حنيفاً) (حال) بێ بۆ (مخاطب) دوێنراو، ئەوکاتەش ماناکەی ئاوای لێدێ: ڕووی خۆت بکە ئایین لە حاڵێکدا کە وازت لە هەموو شتێکی دیکە هێنابێ، بڕوانە: تفسير ابن كثير ب٣، ل٤٣٢، وتفسير المدارك ب٣، ل٤٦٣، وتفسير البيضاوي ب٢، ل٢٢١، وتفسير الخازن ب٣، ل٤٦٣.

هەڵناگرێ، ئەوەیە ئایینی ڕاست و تەواو (واتە ئایینی تەواو ئەوەیە کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا دەسازێ، کە بریتیە لە ئایینی خوا) بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

زگماک بوون و خوارسک بوونی ئایین و خواناسیی لە مرۆڤدا، لەم ئایەتە بەپیت و پیزەدا وەک ڕۆژی ڕووناک دیارە، چونکە:

دوای ئەوەی خوای میهرەبان فەرمان بە مرۆڤ دەکات، کە ڕوو بکاتە ئایین و بەرنامەی خواو پابەندو گەردن کەچی بێ و، خۆی بۆ خوا یەکلا بکاتەوەو، ژیانی لە هەموو پەیڕەوو بەرنامەیەکی دیکە پاک بکاتەوەو، واز لەو ڕێچکانە بێنێ کە غەیری خوا دایناون [لەم قسانەدا چەمکی دووەمی (حنیفاً) لەبەرچاو گیراوە]، بەڵێ دوای ئەوە خوای قسەلەجێ یەکسەر دەفەرموێ: [فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا]، جا بەگوێرەی ئەو دوو واتایەی کە وشەی (فِطْرة) دەیانگەیەنێ، ئەم ڕستەیە دوو مانایان هەڵدەگرێ:

**یەکەم:** ئەو سروشتەی کە خوا خەڵکی لەسەر خوڵقاندوە.

**دووەم:** ئەو ئایینەی کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە.

جا ئەگەر بێت و مانای یەکەم هەڵبژێرین - بێگومان ئەویش ڕای زۆربەی توێژەرەوانی لەسەرەو منیش پێم گونجاوترو ڕاستترە - ئەوە وشەی سروشت (فِطْرة) دەبێتە جێگر (بَدَل)ی وشەی ئایین (الدّین)، ئەوکاتەش دەگەینە ئەم ئەنجامە:

ئایینی خوا = سروشتی ئینسان، سروشتی ئینسان = ئایینی خوا.

کەواتە: ئەو ئایینەی کە خوا فەرمانمان پێدەکات، خۆمانی بۆ یەکلا بکەینەوەو ڕووی تێبکەین، لەگەڵ ئەو سروشتەدا کە خوا مرۆڤی لەسەر خوڵقاندوە، وەک یەکن و پڕ بە پێستی یەکدین.

ئەگەر مانای دووەمیش بگرین، ئەوە دیسان دەگەینە هەمان ئەنجام کە لە هی یەکەم وەدی هات، چونکە:

وشەی (فَطَرَ) کە هەر لە چاوگی (فِطْرَة)ەوە هاتوە یانی: سروشتاندی یان دروستی کرد، چونکە (عبدالله ابن عباس) خوا لێی ڕازی بێ کە بە (ترجمان القرآن) بەناوبانگە فەرموویەتی[1]: مانای (فاطر)م نەدەزانی هەتا ڕۆژێکی دوو عارەبی دەشتەکی لەسەر بیرێک بوو بە دەمەقاڵێیان و هاتنە لام، یەکێکیان بە برادەرەکەی گوت: (أنا فَطَرْتُها) من یەکەمجار هەڵم قەندوە، کەواتە ڕستەی: [فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَا] ماناکەی ئاوای لێدێ: ئەو ئایینە خواییەی کە خەڵکی لەسەر سروشتاندوە، واتە سروشتی خەڵکی بەگوێرەی ئەو ئایینە خوڵقاندوە کە بۆی ناردوون.

مادام وابێ هەرکام لەو دوو مانایەی گوتمانن لەم ئایەتە مەزنە بگرین، خوارسکیی و زگماکیی هەستی خواناسیی لە مرۆڤدا هەر لێ دەفامرێتەوە.

دیسان هەر لەم ئایەتە دەفامرێتەوە - بەپێی (لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ) دروستکراوی خوا ناگۆڕێ - کە هەستی خواناسیی وێڕای ئەوەی کە داخوازییەکی سروشتییە، هەرگیز لە سروشتی مرۆڤیش ناسڕێتەوەو لاناچێ، بەڵکو لە ڕاستیدا سروشتی مرۆڤ و هەستی ئایینی وەک ئاردو ئاو تێک هەڵشێلراون و هەویری کەسایەتی مرۆڤیان پێکهێناوە.

هەڵبەتە لە قورئانی بەرێزدا زۆر دەقی وا هەن کە خوارسکیی و زگماکیی بیری ئایینی لە کەسایەتی مرۆڤدا دەسەلمێنن، بەڵام بەم ئایەتە واز دێنین و دەچینە خزمەت دووەمین سەرچاوەی ئیسلام:

فەرموودەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی مەسەلەی خوارسکیی هەستی خواناسیی زۆرن، بەڵام کورد گوتەنی: لە هەرباغەی گوڵێک، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {مَا مِنْ مَوْلُودٍ

---

(١) تفسير القرآن العظيم، عمادالدين ابو الفداء اسماعيل ابن كثير، ب٣ ل٥٤٦، ض١٩٦٩ بيروت.

إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ} (أخرجه البخاري برقم: ١٢٩٢، ومسلم برقم: ٢٦٥٨)، وأبو داود برقم: ٤٧١٤).

واتە: هیچ کۆرپەیەک لەسەر سروشتـی خواناسیی- نەبێ لەدایک نابێ، بەڵام دایک و بابی (مەبەست دەوروبەرە، دایک و باب و غەیری وانیش) دەیکەنە جوولەکە، یان دیان، یان مەجوسیی[1]، هەروەک چۆن ئاژەڵ بەچکەی تێرو تەواوی دەبێ، ئایا لە نێویاندا هیچی لوتبڕاو دەبینن؟

وەک دەبینین پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەڕاشکاویی ڕایدەگەیەنێ کە خوا هەر ئینسانێک کە دەیخوڵقێنێ، هەر لە سەرەتاوە لەسەر فیطرەتی خواپەرستیی دروستی دەکات، واتە تیشکی خواناسیی داوێتە دڵ و دەروونیەوەو، وای لێدەکات کە بۆخۆی سەربەخۆ، بەبێ ڕێڕوونیی هیچ کەسێک، پەی بە بوونی خوا بەرێ و بیناسێ.

ئنجا دوایی پێغەمبەری دانا (صلی الله علیه وسلم) پەنجە بۆ ئەو ڕاستییە ڕادەکێشێ کە پێشتر لەسەر زمانی دەروونناس و کۆمەڵناسان خستمانە ڕوو، ئەویش ئەوەیە کە دایک و باوک و دەوروبەر، دەتوانن کار بکەنە سەر ئەو هەستە خواناسییەو لەڕێی ڕاستی لابدەن و ڕێڕەوی پێخوار بکەن، واتە لە شێوە پەرستنی ڕاستەوە بەرەو شێوە پەرستنی هەڵەی بەرن، بەڵام مەحاڵە بتوانن ئەو هەستە یەکجاریی بفەوتێنن و بنەبڕی بکەن.

ئنجا پێغەمبەری پێشەوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست، وێنە بە ئاژەڵ و بەچکەکانی دێنێتەوەو دەفەرموێ: دەبینن ئاژەڵ هەمیشە بەچکەکانی لە ڕووی پێکهاتەی جەستەیانەوە، تێروتەواون و هیچ کامیان بێ لووت نین، چونکە لووت ئەندامێکی سەرەکییە لە پێکهاتنی

---

(١) (مەجووس: گەلێکن ڕۆژێ یان ئاگری دەپەرستن) المنجد في اللغة والأعلام، مادة مجس، ل٧٤٨، ض٢٧.

ئاژەڵدا، جا بە بڕوای من پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆیە ئەم وێنەیەمان بۆ دێنێتەوە، تاکو تێمان بگەیەنێت کە:

هەروەک چۆن خوای کاربەجێ هیچ دروستکراو (مخلوق)ێکی خۆی بە ناتەواویی و کەموکوڕییەوە دروست ناکات -بۆ وێنە ئاژەڵ-، بەهەمان شێوە مرۆڤیشی بە ناتەواویی نەخوڵقاندوە، جا مادام مرۆڤ بەبێ هەبوونی هەستی خواناسیی بە ناتەواو و ناڕێک دابنرێ، کەواتە نابێ مرۆڤ لەم هەستە بێبەش بێ، چونکە هەروەک چۆن (لووت) لە پێکهاتنی ئاژەڵدا ئەندامێکی سەرەکیی و پێویستەو بە نەبوونی ئەو ناڕێک و ناتەواو دەردەچێ، (هەستی خواناسییش) لە پێکهاتنی کەسایەتی ئینساندا بەشێکی بنەڕەتیی و گرنگەو، بە کەمبوونی لە ئینسانەتیی دەشۆرێ، بێگومان خوای کاربەجێو میهرەبانیش زۆر لەوە بەرزترە کە کاری ناڕێک و نەگونجاوی لێ بوەشێتەوە.

ئێستاش نۆرەی توێژینەوەی دووەمین پاڵنەری بڕوا بەخوا بوونە لە کەسایەتی ئینساندا.




# عەقڵ (العقل)دووەمین پاڵنەری مرۆڤە بەرەو خواناسیی

## دەستپێك

خوێنەری سەنگین!

وەک پێشتر گوتمان: بەهێزترین پاڵنەری بەرەو خوا چوونی مرۆڤ، بریتیە لەو ویژدان و سروشت (فِطرة)ەی کە خوا ئینسانی لەسەر خوڵقاندوە، گوتمان مەبەست لە ناسرانی خوا لەڕێی (دڵ)ەوە لەڕێی فیطرەتەوە، یانی ئەگەر بێت و ئینسان چاوپۆشیی لە هەرجۆرە بەڵگەهێنانەوە (استدلال)ێکی ژیریی و زانیاریی بکات، بۆخۆی سەربەخۆ لەدەروون و سروشت و ماهیەتی خۆیدا، هەست بەبوونی پەروەردگار دەکات.

بە واتایەکی دی؛ مرۆڤ بێئەوەی بیەوێ، هەست دەکات کە هێزێکی پەنهان و پاڵنەری شارراوە، پاڵی پێوەدەنێ کە بەرەو خوا بچێت و لێی نزیک بێتەوەو خۆشی بوێ و سامی لێ بکات و پەنای پێ بەرێ و داوای لێ بکات.

بەڵام بێجگە لەم پاڵنەرە، پاڵنەرێکی دیکەش هەیە کەوا لە مرۆڤ دەکات بڕوا بە خوا بێنێ، ئەویش بریتیە لە عەقڵ (العقل).

بە واتایەکی دی؛ مرۆڤ بێجگە لە ڕێگەی دڵ (ڕێگای خواناسیی سروشتیی) لە ڕێیەکی دیکەشەوە دەتوانێ بەرەو خوا بچێو بیناسێ، ئەویش ڕێی عەقڵە (ڕێگای خواناسیی بەڵگەیی).

لە نێوان ڕێی یەکەم (دڵ) و ڕێی دووەم (ژیریی)یشدا سێ جیاوازیی سەرەکیی هەن:

**یەکەم:** ڕێی یەکەم سادەترو گشتی ترەو، هەر لە سادەترین کەسەوە بیگرە هەتا گەورەترین زانای بلیمەت، هەموویان وەک یەک تێیدا بەشدارن، بۆیە دەڵێم وەک یەک چونکە شوانێکی نەخوێندەواری سادە، بۆی هەیە لە گەورەترین فەیلەسووف باشتر، بە ویژدان و سروشت، بە دڵ و دەروون هەست بە بوونی خوا بکات، بەڵام ڕێی دووەم پەیوەندییەکی ڕاستەوانەی بە ئاستی ڕۆشنبیریی و شارەزایی مرۆڤەکانەوە هەیە.

**دووەم:** ڕێی یەکەم هەتا زیاتر بەرەو ڕابردوو بگەڕێینەوە، دەبینین کاریگەرتر دێتە بەرچاوان، لە بڕوا بەخوا هێنانی مرۆڤەکاندا، بێگومان ئەم دیاردەیەش چەند هۆیەکی بنەڕەتیی هەن، کە دووانیان لە هەموان سەرەکییترن:

١- هەتا بەرەو دواوە بگەڕێینەوە، دەبینین شێوەی ژیان و گوزەران سادەتر بووەو ژینگەی مرۆڤ لە سروشت نیزیکتر بووەو، کەمتر کەوتۆتە ژێر ڕکێفی ژیانی ئامێریی، ئەو ژیانە ئامێرییەی کە بناغەکەی لەسەر زەمینەی بە ئاژەڵ یان نیمچەئاژەڵ سەیرکردنی مرۆڤ ڕۆنراوە!!

٢- بیروبۆچوون و بیردۆزە گومڕاکەرەکان، هێندە زۆر نەبوون و، ئەگەر بووبیشن دامودەزگای ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندە هێندە چالاک و خێرا نەبوون، کە بیروهۆشی خەڵکی بخەنە ژێر قەڵەمڕەوی کاریگەریی خۆیانەوەو سەر لە خەڵکی بشێوێنن.

بەڵام ڕێی دووەمیان - بە پێچەوانەوە - تا بەرەو پێشتر دەچین دەبینین کاریگەرتر خۆی دەنوێنێ، چونکە ڕۆژ بۆ ڕۆژی عەقڵ ڕێژەی ڕازو

نهێنییه دۆزراوه‌كانی بوونه‌وه‌ر به‌رز ده‌بێته‌وه‌، زیاتر په‌ی به‌ ڕێك و پێكیی و ورده‌كاریی یاساو ده‌ستووره‌كانی سروشت ده‌بات.

**سێیه‌م:** ڕێی یه‌كه‌م ڕێیه‌كی زاتیی و كه‌سیی (شخصي)یه‌و په‌یوه‌ندیی به‌ خودی مرۆڤه‌وه‌ هه‌یه‌، چونكه‌ هه‌ست و نه‌ستی ده‌روونیی و سروشتیی له‌ ڕێی قسه‌كردن و بیستنه‌وه‌، له‌ یه‌كێكه‌وه‌ بۆ یه‌كێكی دیكه‌ ناگوازرێته‌وه‌، به‌س به‌ دڵ و ده‌روون هه‌ست ده‌كرێن، به‌ڵام ڕێی دووه‌م، وێڕای ئه‌وه‌ی كه‌ بابای به‌ڵگه‌هێنه‌ره‌وه‌ بۆخۆی سوودی لێ وه‌رده‌گرێ، ده‌گونجێ ببێته‌ هۆی گۆڕینی خه‌ڵكی دیكه‌ش، چونكه‌ خواناسیی به‌ڵگه‌یی، له‌ زنجیره‌ قسه‌و به‌ڵگه‌یه‌كی ژیریی و زانیاریی پێكدێت كه‌ ده‌توانرێ پێشانی خه‌ڵكی دیكه‌ش بدرێ.

به‌كورتی: هه‌رچه‌نده‌ ڕێی دڵ (خواناسیی سروشتیی) چاكترین و ته‌واوترین و ناسكترین و به‌تامترین شێوه‌ی خواناسینه‌[1]، به‌ڵام بۆ حاڵیكردنی خه‌ڵكی و ڕاگه‌یاندنی خواناسیی، حه‌وجێی ڕێی ژیریی (خواناسیی به‌ڵگه‌یی)یش ده‌بین.

ئێمه‌ له‌ لاپه‌ڕه‌كانی پێشوودا - سوپاس بۆ خوا - باسی یه‌كه‌مین ڕێی به‌خوا گه‌یشتن و به‌هێزترین پاڵنه‌ری به‌ره‌و خوا چوونی مرۆڤمان كرد، ئێستاش دووه‌مین ڕێی به‌خوا گه‌یشتن و پاڵنه‌ری به‌ره‌و خوا چوون ده‌ده‌ینه‌ به‌ر تیشكی توێژینه‌وه‌وه‌، له‌ مه‌حه‌كی ژیریی ده‌ده‌ین و به‌ پێوه‌ری زانیاریی ده‌یپێوین.

به‌ڵام به‌رله‌وه‌ی بچینه‌ سه‌ر ئه‌سڵی مه‌به‌ست، به‌پێویستی ده‌زانم مه‌سه‌له‌یه‌كی یه‌كجار گرنگ و بایه‌خدار بتوێژینه‌وه‌، كه‌ وه‌ك ڕێخۆشكه‌رو پێشه‌كییه‌ك وایه‌ بۆ باسی خواناسیی له‌ڕێی ژیرییه‌وه‌.

ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌ش بریتیه‌ له‌ ڕوونكردنه‌وه‌ی هۆی سه‌ره‌كیی سه‌رگه‌رمبوونی مرۆڤ به‌ ناسینی خواوه‌، هه‌ڵبه‌ته‌ زیاتریش مه‌به‌ستم توێژینه‌وه‌ی ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌ له‌ لایه‌نی ژیرییه‌وه‌، چونكه‌ پێشتر له‌ لایه‌نی زگماكییه‌وه‌ توێژیمانه‌وه‌.

---

(١) بۆ زیاتر حاڵی بوون له‌ جۆرو چۆنیه‌تی ڕێی دڵ و ڕێی عه‌قڵ، سه‌رنجی باس و بابه‌ته‌كانی به‌شی سێیه‌م بده‌.

## بۆچی مرۆڤ بەدوای خوادا عەودالە؟!!

هەرچەندە پاش ڕوونکردنەوەی پاڵنەری یەکەمی خواناسیی (ڕێی سروشتیی خواناسیی) وەڵامی ئەم پرسیارە ئاشکرا بووەو ڕوون بۆتەوە، چونکە لە ئاکامی ئەو باسەدا بۆمان دەرکەوت، کە مرۆڤ بۆیە عەودالی خوایەو بەدوایدا وێڵەو لێی دەگەڕێ؛ چونکە بە دڵ و دەروون، بەویژدان و سروشت، لە ناخی ناخەوە بۆی تینوویەو، لە دووری وی دڵ بەسۆیە.

بە واتایەکی دی؛ هۆی بەرەوخوا چوونی ئینسان، خودی خۆیەتی، جۆری پێکهاتنی سروشت و کەسایەتیی و چیەت (ماهیە)یەتی.

لەڕاستیدا پرسین دەربارەی هۆی عەودال بوون و بەرەوخواچوونی مرۆڤ، وەک پرسیارکردن وایە دەربارەی هۆی تینوبوونی مرۆڤ و، عەودالبوونی بەدوای ئاودا!! بێگومان ئاو پێکهێنەرێکی بنەڕەتیی و سەرەکیی ئینسانە، بۆیە ئینسان ناچار تینوو دەبێو بەدوایدا عەودال دەبێ و، لە ئاقاریدا هەست بە ئاتاجیی دەکات و، بە کەمبوون و نەبوونی هەست بە پەیدابوونی بۆشاییەک دەکات، دەجا تینوایەتیی و عەودالیی مرۆڤیش بەرانبەر بە خوا، بە هەمان پێودان، چونکە هەروەک چۆن ئاو پێکهێنەرێکی بنەڕەتییە لە جەستەی مرۆڤدا، بڕوا بەخوا بوون و خواپەرستیش بنەڕەتییترین پێکهێنەری ڕووحیەتی.

بەڵێ دوای ڕابردنی توێژینەوەی پاڵنەری یەکەمی خواناسیی، وەڵامی ئەم پرسیارە: (بۆچی مرۆڤ بەدوای خوادا عەودالە؟) وەک مانگ لە شەوی چواردەیدا درەوشاوەیە، بەڵام لێرەدا دەمانەوێ لە گۆشەنیگایەکی دیکەوە وەڵامی بدەینەوە، کە بریتیە لە گۆشەنیگای عەقڵ.

که‌واته‌ ده‌توانین بڵێین؛ مه‌به‌ست له‌م پرسیاره‌ی سه‌رێ ئه‌وه‌یه‌، که‌ ئایا چ شتێک وا له‌ مرۆڤ ده‌كات كه‌ ژیریی و بیروهۆشی خۆی، خه‌ریكی ناسین و دۆزینه‌وه‌ی خوا بكات؟!

له‌ وه‌ڵامدا ده‌ڵێین:

ئه‌و هانده‌ره‌ی كه‌ مرۆڤی والێكردوه‌ هه‌ر له‌ سه‌ره‌تای ژیانیه‌وه‌ ده‌ست بكات به‌ سه‌رنجدان و وردبوونه‌وه‌و ڕامان و لێكۆڵینه‌وه‌ ده‌رباره‌ی دیمه‌ن و دیارده‌كانی بونه‌وه‌رو، وای لێكردوه‌ كه‌ ڕازو نهێنییه‌ پڕ ورده‌كارییه‌كانی بدۆزێته‌وه‌و مه‌ته‌ڵه‌ سه‌رسوڕهێنه‌ره‌كانی هه‌ڵبێنێ، و وای لێكردوه‌ كه‌ هه‌وڵی پەی بردن به‌ یاساو ده‌ستووره‌كانی بدات، هه‌تا ئه‌و ڕاده‌یه‌ی كه‌ هه‌ندێک له‌ شه‌یدایانی زانیاری چاوپۆشییان له‌ له‌زه‌ت و خۆشیی و ڕابواردنی ژیانی دنیا كردوه‌، ته‌مه‌نی خۆیان له‌ میحرابی سروشتدا ته‌رخانی دیتنه‌وه‌ی ڕاستییه‌كانی بوونه‌وه‌رو ژیان كردوه‌، به‌ڵێ هه‌ر ئه‌و هانده‌ره‌ی كه‌ پاڵی به‌ مرۆڤه‌وه‌ ناوه‌ ئاوا بكات، هه‌مان هانده‌ریش پاڵی پێوه‌ناوه‌ كه‌ به‌دوای دۆزینه‌وه‌ی چاوگ و سه‌رچاوه‌ی خۆی و بوونه‌وه‌ردا عه‌وداڵبێو بكه‌وێته‌ گه‌ڕان و پشكنین.

مرۆڤ هه‌ر له‌ یه‌كه‌مین ڕۆژی نیشته‌جێبوونیه‌وه‌ له‌سه‌ر گۆی زه‌وی، گه‌لێک دیارده‌ی وای هاتوونه‌ به‌رچاو، كه‌ به‌بێ بڕواهێنان به‌ یاسای هۆكاریی (قانون السببية) نه‌یتوانیوه‌ چۆنیه‌تی په‌یدابوونیان ته‌فسیر بكات، بۆ وێنه‌:

وه‌رینی گه‌ڵای دارو دره‌خت و تێكشكانی لق و پۆپیان، به‌هۆی هاتنی بایه‌كی توندوتیژه‌وه‌.

ڕووخانی خانووبه‌ره‌و خلۆربوونه‌وه‌ی گاشه‌به‌ردی زل زل، به‌هۆی ئاگرپژێن و بوومه‌له‌رزه‌كانه‌وه‌.

سووتانی پووش و گیاو دارودره‌خت، به‌هۆی ئاگر داكه‌وتنه‌وه‌.

ڕووان و شینبوونی گیاوگۆڵ و شیناوردو دارودرەخت، بەهۆی بارانبارینەوە.

پەیدابوونی شەوو ڕۆژ، بەهۆی ئاوابوون و هەڵهاتنی خۆرەوە.

نەخۆشبوون و مردن، بەهۆی گەرماو سەرماو نەخۆشییەکانەوە.

بێگومان لە هەرکام لەم دیاردانەدا، کە کەمێکن لە گەلێک و، چەند دەنکێکن لە لەگەنێک، زۆر بە ئاسانیی هەست بە پەیوەندیی نێوان هۆ (سبب) و ئەنجام (نتیجة) دەکرێ، ئیدی لەمەوە مرۆڤ گەیوەتە ئەو قەناعەتە کە یاسای هۆکاریی (هیچ پەیدابووێک بێ هۆ نیە) یاسایەکی گشتییە لە بوونەوەرداو، یاسایەکی بەڵگەنەویستی ژیرییە، ئنجا دوایی بەحوکمی یاسای هۆکاریی، توانیویەتی بە ئاسانیی پەی بە بوونی خوایەکی بەدیهێنەرو زاناو تواناو میهرەبان و کاربەجێ بەرێ، چونکە مادام هەموو پەیدابووێک پێویستیی بە پەیداکەر هەبێ، کەواتە ئەم بوونەوەرەش کە لەچەند شتێکی پەیدابوو پێکهاتوە، پێویستیی بە بەدیهێنەرو پەروەردگارێک دەکات، چونکە مادام هەریەک لەو بەشانەی کە خانووێکیان لێ پێکدێ، حەوجێی وەستایەک بن، ماقووڵ نیە بگوترێ: خانووەکە پەکی لەسەر وەستا نەکەوتوە!!

هەڵبەتە هیچ کەسیش بۆی نیە بڵێ: مرۆڤایەتی لەسەردەمی کۆنی زۆر زوودوە نەیتوانیوە پەی بە یاسای هۆکاریی بەرێ! چونکە؛ یاسای هۆکاریی سادەترین یاسای بەڵگەنەویستی ژیرییە[1]، دەبینی منداڵ لە قۆناغێکی یەکجار ساوای تەمەنیدا لە سۆنگەی بڕوا هەبوونیەوە بەم یاسای ژیرییەو، دڵنیابوونی لەوەی کە ڕاستە، دەکەوێتە پرسیارکردن و لێکۆڵینەوە، لەدایک و باوکی و هەرکەسێکی دیکە کە وەبەر پەلی بکەوێ: ئەرێ فلانەشت بۆ

---

(١) بەڵگەنەویست (بدیهی)یەتی یاسای هۆکاریی، شتێکە تێکڕای زاناو هۆشمەندانی دنیای کۆن و نوێی لەسەر ڕێککەوتوە، بەڵام ئەوەی کە جێی مشتومڕو دم بەدمەیە خوارسک بوونی ئەم یاسایەیە.

وای لێهات؟! فلانەکەس بۆچی نەهات؟! کێ ئەم ڕۆژەی دروست کردوە؟! باران لەکوێوە دێ؟! هەورەتریشقە بۆ دەگرمێنێ؟! بۆ شەوێ دنیا تاریک دەبێ؟! بە ڕۆژێ ئەستێرەکان دەچنە کوێ؟!

دەجا مرۆڤایەتیش لە قۆناغی سەرەتاییدا هەرچەندە زۆر سادەو ساکار بووبێ هێندەی منداڵێکی چوارپێنج ساڵەی ئێستا بیروهۆش و لێکدانەوەی هەر هەبووە، کە پاڵی پێوە بنێ: بپرسێ و بگەڕێ و بپشکنێ و بەدوای هۆی پەیدابوونی دیاردەو ڕووداوەکاندا بگەڕێ و، لە سەرچاوەی بوون (مصدر الوجود)ی خۆی و دەوروبەری بکۆڵێتەوە.

لە ڕاستیدا تەفسیرکردنی دیاردەی ئایین و پەیدابوونی هەستی خواناسیی و بەدوای خوادا عەوداڵ بوون، لە گۆشەنیگایەکی؛ ئابووریی، یان جینسیی، یان کۆمەڵایەتیی، یان هەر شتێکی دیکەی لەم بابەتانەوە، بەهۆی لەپێش چاو نەگرتنی فیطرەتی خواناسانەو عەقڵی پشکنەرو لێکۆڵەرەوەی ئینسانەوە، سەری هەڵداوە.

دەنا ئایا هیچ کەس داخوازییە سروشتییەکانی دیکەی وەک؛ (ڕاستیخوازیی، جوانیخوازیی، چاکەخوازیی) لەسەر بنچینەی ئەو جۆرە تێڕوانینانە تەفسیر دەکات؟! ئایا دەگونجێ بڵێین: ئەو یاساو دەستوورە سروشتییانەی مرۆڤ بەهۆی وردبوونەوەو تێڕوانین و پشکنینەوە دۆزیونیەتەوە، چەند هۆیەکی وەک ئابووریی و جینسیی و ترس و نەزانیی، بوونەتە هۆی ئەوەی کە پەییان پێ بەرێ؟! هەڵبەتە نەء، دەجا هەروەک چۆن زانیاریی و شارەزایی دەربارەی یاساو دەستوورەکانی بوونەوەر بەرهەمی (هەستی ڕاستیخوازیی) و (ژیریی و بیروهۆش)ی مرۆڤە، خواناسیی و بەدوای خوادا گەڕانیش، بەرهەمی (هەستی خواناسیی)و (ژیریی لێکۆڵەرەوە)ی مرۆڤە.

بەڵێ لەراستیدا بەس ئەوجۆرە دیاردانە دەگونجێ بەو پێودانە سەیر بکرێن، کە لە سروشتی مرۆڤ و بیروهۆشیدا خاوەنی ڕەگ و ڕیشەیەکی ڕەسەن نین

و، بەهۆی خەیاڵی پووچ و بیرکردنەوەی هەڵەوە لە ژیانی ئینساندا سەریان هەڵداوە، بۆ وێنە؛ مەسەلەی بەخت و شانس، شوومیی و نەگبەتیی هەندێک ڕۆژ، بە نەگریس و بێخێر سەیرکردنی هەندێک ژیاندار.

بەڵام ئەم جۆرە دیاردانەی کە لە زەمینی دڵ و دەروون و ژیری مرۆڤدا خاوەنی ڕەگ و ڕیشەیەکی قووڵ و ڕۆچوون، زۆر شتێکی ناماقووڵ و بێجێیە کە لەو جۆرە دەلاقانەوە بۆیان بڕوانرێ و، بەو تەرزە تەرازووانە - کە هەتا بڵێی لاسەنگ و خوارن - هەڵ بسەنگێنرێن.

جا ئێستا کە بەشێوەیەکی گشتی زانیمان چۆن و بۆچی عەقڵی مرۆڤ بەدوای خوادا عەوداڵ بووەو، هەوڵی ناسینی داوەو، دنیای لێ لە سەنگ و سووژن ناوە؟ با بچینە سەر کاکڵی مەبەست و لەڕێی دوو یاسای گەورەی بەڵگەنەویستی عەقڵییەوە، مەسەلەی چۆنیەتی ناسرانی خوا بەهۆی عەقڵەوە بتوێژینەوە.

**یەکەم:** ئەو یاسا بەڵگەنەویستەی کە دەڵێت: پەیداکراو بەبێ پەیداکەر نابێ، (لا مَعْلولَ بِلا عِلَّةٍ) یان (لا حادِثَ بلا مُحدِثٍ).

**دووەم:** ئەو یاسا بەڵگەنەویستەی کە دەڵێت: ڕێک وپێکیی بەبێ ڕێکخەر نابێ (لا نظام بلا منظِّم).

واتە یاسای هۆکاریی (قانون السببية) و یاسای ڕێک و پێکیی (قانون النظام).

## یەكەم: یاسای هۆكاریی (قانون السببية)

یەكەمین یاسای عەقڵیی كە مرۆڤ ناچار دەكات بڕوا بەخوا بێنێ، بریتیە لە یاسای هۆكاریی (قانون السببية) كە دەڵێ: هیچ پەیداكراوێك بەبێ پەیداكەر نابێ (لا حادث بلا مُحدِث)؛ لەبەرئەوەی یاسای هۆكاریی (قانون السببية) بە یەكێك لە یاسا بەڵگەنەویستەكانی عەقڵ دادەنرێو، هەندێك كەسیش لە هەبوونی بەڵگەنەویستەكانی عەقڵدا گومانیان هەیە، بەپێویستی دەزانم بەر لەوەی بێینە سەر شیكردنەوەی ئەو یاسایە، پوختەیەك لەبارەی ڕێبازو چۆنیەتی ناسین و پەی پێبردنی (بوون)ەوە بنووسین، تاكو ڕوونبێتەوە كە ئەو ڕێبازەی لەسەر بنچینەی دانهێنانی بە هەبوونی چەند یاسایەكی بەڵگەنەویست لە عەقڵی مرۆڤدا، لە (بوون)ەوە ڕادەمێنێو ورد دەبێتەوە، تاقە ڕێبازی ڕاستی تێڕوانین و بیركردنەوەیەو مرۆڤ بەهۆیەوە دەگاتە ڕاستیی و دڵنیایی، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەو ڕێبازەی كە وا بیردەكاتەوە: تاقە دەلاقەی تێڕوانین و سەرنجدان لە بوونەوەرو، تاقە تەرازووی كێشان و هەڵسەنگاندنی بوون و نەبوونی شتان، پێنج هەستەكان و ئەو ئەزموونانەن كە بەهۆی وانەوە ئەنجام دەدرێن، ڕێباز - ڕاستتر بڵێین ڕێچكە-یێكی هەڵەو ناتەواوەو، نەك هەر توانای ناسینی تەواوی بوون (وجود)ی نیە، بەڵكو لەو ڕێیەوە تەنانەت ماددەش شیاوی ناسران و پەی پێبران نیە!!

بە شێوەیەكی گشتی لەنێو ئەو زاناو فەیلەسوفانەدا كە لەبەر هەر هۆكارێك بێ بڕوایان بە ئایین و وەحیی خوایی نەبووە، دوو جۆرە ڕێباز هەن لەبارەی چۆنیەتی ناسین و پەی پێبردنی بوون (وجود)ی شتانەوە:

**یەك:** ڕێبازی ژیرییانە (المذهب العقلي).

**دوو:** ڕێبازی ئەزموونییانە (المذهب التجربي).

## یـەك: ڕێبـازی ژیریـیـانە

ئەم ڕێبازە -کە ئیسلام وەک شتێکی مەبدەئیی پشتگیریی دەکات، بەڵام ئیسلام دەڵێ: هەرکام لە عەقڵ و ئەزموون، زانیارییەکانیان سنوردارن و تەنیا وەحیی زانیاریی موتڵەقی پێیە- زانیاریی مرۆڤ دەکاتە دووبەش:

**بەشی یەکەم:** زانیارییە بەڵگەنەویستەکان (العلوم البديهية)، مەبەستیش لەو زانیارییە بەڵگەنەویستانە ئەو شتانەن کە ئینسان بێئەوەی داوای بەڵگەو ئیسپات کردن بکات، دانیان پێدا دێنێ، چونکە لە دەروونی خۆیەوە هەست بە سەلمێنراویی و ڕاستییان دەکات و، هێندە لێیان دڵنیایە، حەوجێی هیچ بەڵگە هێنانەوەیەک نیە، بۆ وێنە: هیچ پەیدابووێک بێ پەیداکەر نیە، بوون و نەبوون لە شتێکدا لە یەک کات و شوێندا کۆنابنەوە، هەموو (کلّ) لە بەش (جزء)ێک گەورەترە، یەک نیوەی دووانە.

**بەشی دووەم:** زانیارییە بەڵگەییەکان (العلوم النظرية)، مەبەستیش لە زانیارییە بەڵگەییەکان ئەو زانیارییانەن کە مرۆڤ دوای تێوەڕامان و بەڵگەهێنانەوە، دانیان پێدا دێنێ،[1] ئەو بەڵگەهێنانەوەیەی کە هەر لە بنچینە بەڵگەنەویستەکانەوە سەرچاوە دەگرێ، کەواتە بەبێ هەبوونی بنچینە بەڵگەنەویستەکان، مرۆڤ قەت ناتوانێ بگاتە ناسینی هیچ ڕاستییەک..

هەر بۆیەش لە ڕوانگەی ڕێبازی ژیرییانەوە، بەڵگەنەویستە سەرەتاییەکانی عەقڵ، کە مرۆڤ بەبێ تێوەڕامان و بەڵگەهێنانەوە، بڕوای پێیان هەیە، بە بەردی بناغەی زانیاری دادەنرێن.

بیر یان بیرکردنەوەش ئەو کارەیە کە عەقڵ پێی هەڵدەستێو، بەهۆی ئەوەوە لە زانیارییە بەڵگەنەویستەکان، زانیارییە بەڵگەییەکان هەڵدێنجێ،

---

(١) وەک: زنجیرەی بێکۆتایی مەحاڵە، زەوی هێلکەییە، مادە دەگۆڕێ بۆ وزە، کانزاکان بەهۆی گەرماوە دەکشێن، جووڵان دەبێتە هۆی گەرمیی.

بە واتایەکی دیکە: بیرکردنەوە ئەو کۆششەیە کە عەقڵ خەرجی دەکات لەپێناوی وەدەستهێنانی بڕوایەکی دیکەو زانیارییەکی نوێدا، لە زانیارییە بەڵگەنەویستەکانی پێشوو.

ئنجا لە نێوان بەشێک لە زانراوەکان (معلومات)ی مرۆڤ و، بەشێکی دیکەیدا پەیوەندییەکی هۆکاریی هەیە، چونکە زانراوێک لە زانراوێکی پێشترەوە وەدەست دێ، هەر بەو شێوەیە هەتا دەگاتە سەر زانراوە سەرەتاییە بەڵگەنەویستەکان.

ئنجا یاسا بەڵگەنەویستەکانیش دوو بەشن؛ یەکەمیان بریتیە لە یاسای نەبوونی دژیەکیی (قانون عدم التناقض)، هەڵبەتە ئەم یاسایە مەرجێکی بنەڕەتیی پێویستە لە هەر زانیارییەکدا، چونکە بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕاستیی ئەم یاسایە، ناتوانین دڵنیابین لەوەی کە فلانە قەزیە درۆنیە، هەرچەندە بەڵگەی زۆریشمان لەسەر ڕاستیی و تەواویی هێنابنەوە، چونکە مادام هەبوونی دژایەتیی دروست بێت، دەگونجێ هەر قەزیەیەک لەگەڵ ڕاست بوونیدا درۆش بێ، کەواتە بڕوا نەبوون بە بەڵگەنەویستیی یاسای (نەبوونی دژیەکیی)[1] هەموو جۆرە قەزیە عەقڵیی و عیلمییەکان دەکاتە

---

(١) لەبەرئەوەی ڕابەرانی ئەفسانەی بەناو فەلسەفەی مارکسایەتیی، بەهۆی حاڵی نەبوونیان یان خۆگێل کردنیانەوە، دەربارەی چەمکی نەبوونی دژیەکیی (عدم التناقض)، هەراو جەنجاڵێکی زۆریان لەوبارەوە بەرپا کردوەو، ئاڵای هەبوونی دژایەتییان بەرز کردۆتەوە لە هەموو وردو درشتی بوونەوەردا! بەڵێ لەبەرئەوە بەپێویستی دەزانم بڕێک چەمکی ئەو یاسایە ڕوون بکەمەوە:

یاسای نەبوونی دژیەکیی ئەو یاسا ژیرییە بەڵگەنەویستەیە کە دەڵێ: مەحاڵە بوون و نەبوون لە یەک شتدا لە کات و شوێنێکی تایبەتیدا کۆببنەوە، بێگومان ئەمە شتێکی ڕوونە، بەڵام پێویستە بزانین چ جۆرە دژایەتییەکە کە ئەو یاسایە ڕەفزی دەکات و ژیریی پێی ڕازی نابێ؟! ئایا ئەم قەزیەیە؛ (چوارگۆشە چوار لای هەن، سێگۆشە چوار لای نین.) دژایەتی تێدا هەیە؟! بێگومان نەء، چونکە بابەت (موضوع)ی رستەی یەکەم جوێیە لە بابەتی رستەی دووەم، بە واتایەکی دی؛ بوون و نەبوون لەیەک شتدا کۆ نەبوونەوە، بەڵکو لە دووشتدا کۆبوونەوە، کەوابێ دژیەکیی دروست نەبووە.

جێی گومان و متمانە پێنەکردن، ئەگەر بە هەزارویەک بەڵگەش سەلمێنرابن.

بەشی دووەمیش لە یاسا بەڵگەنەویستەکان ئەوانەن کە هەریەکێکیان هۆیە بۆ بەشێکی زانراوەکان، کە باقی بنچینە بەڵگەنەویستەکانن.

ئێستاش کە زۆر بە کورتی زانیمان ڕێبازی ژیرییانە چییەو چۆنە؟ با ئەو ئەنجامانەی کە لێیەوە وەدی دێن، لە چەند خاڵێکدا بخەینە ڕوو:

أ- بنچینە بەڵگەنەویستەکانی عەقڵ (الأسس البديهية العقلية) یەکەمین پێوەری بیرکردنەوەی مرۆڤن بەشێوەیەکی گشتی، پێوەرێکی وا کە لەهیچ بوارێکدا لێی بێ منەت نین و هەمیشە پەکمان لەسەری کەوتوە، چونکە هەر بۆچوون (فكرة)ێک لەبەر تیشکی ئەو زانیارییە سەرەتاییانەدا، ساغ نەکرێتەوەو نەسەلمێنرێ، جێی باوەڕو دڵنیایی نیە.

بێگومان بۆیەش یاسا بەڵگەنەویستەکانی ژیریی تەرازووی هەڵسەنگاندن و سەنگی مەحەکی هەموو زانیارییەکن، چونکە وەک گوتمان: هەر زانیارییەک لە زانیارییەک یان چەند زانیارییەکی پێشتر پەیدا دەبێ، ئنجاهەروا زنجیرەی زانیارییە بەڵگەییەکان درێژ دەبێتەوە، هەتا دەگاتە

---

دیسان؛ (مرۆڤ بە منداڵیی خۆشباوەڕە، مرۆڤ بە گەنجیی خۆشباوەڕ نیە) هیچ دژایەتی تێدا نیە، هەرچەند بابەت لە هەردووک ڕستەکاندا مرۆڤە، بەڵام لە دووکاتی جیادا، (منداڵیی) و (گەنجیی).

دیسان (باکوری عێراق کوردنشینە، باشووری عێراق کوردنشین نیە) هیچ جۆرە دژیەکییەکی تێدا نیە، چونکە بەڵێ بابەتی هەردووک ڕستەکان یەک شتە کە (کورد)ە، بەڵام (شوێن)ەکانیان جودان.

کەواتە ئەو بەناو دژیەکییەی کە مارکسیزم بەهەڵە لە نێوان ئاسمان و زەوی و سەرمایەدارو نەدارو ساردو گەرم و ئەمساڵ و پار و دەنکەگەنم و گوڵەگەنم و...هتددا. سازی دەکات، لە تەرازووی ژیربێژییدا بە (تناقض) دانانرێ، چونکە یان لە بابەتدا، یان لە کاتدا، یان لە شوێندا، یەک نین و لێک جودان.

سەر چاوگ و بنچینەیەک کە لەسەری ڕاوەستێ، ئەویش خوارسکە بەڵگەنەویستەکانی ژیریین.

ب- لە ئەنجامی ئەوەوە کە بنچینە سەرەتاییەکانی عەقڵ (المبادیء الأولیة للعقل) دەکرێنە سەنگی مەحەک و پێوەری بیروبۆچوون و زانیارییەکان، زانیاری و شارەزایی مرۆڤ سنووری خۆی فراوان دەکات و، لە جوغزی ئەزموون و هەستەکان دەچێتە دەرێ، چونکە عەقڵی مرۆڤ دەستمایەیەکی وای دێتە دەست کە بتوانێ بەهۆی ویەوە، سنووری قەڵەمڕەوی خۆی بگەیەنێتە ئەو دیوی ماددەو جیهانی بەرهەست، واتە بە پێچەوانەی ڕێبازی ئەزموونییانەوە کە لەبەر بێدەستمایەیی و دەستکورتیی هەرچی پەیوەندیی بە جیهانی ئەودیو سروشت (عالم ما وراء الطبیعة - میتافیزیکا)ەوە هەبێ، لە مەودای پشکنین و لێکۆڵینەوەی خۆی دەری داوێو، هەر لە بەراییدا - واتە پێش تۆژینەوەو پشکنین- حوکمی نەبوونی بەسەردا دەدات[1]!!

ج- ڕەوتی بیر لە ڕێبازی ژیرییانەدا لە قەزیە گشتییەکان (القضایا العامة)ەوە بەرەو قەزیە تایبەتییەکان دادەکشێ، واتە لە (الكلیّات)ەوە بۆ (الجزئیات)، تەنانەت لە بواری ئەزموونییشدا، کە بە ڕواڵەت بیر لە تایبەتییەوە بەرەو گشتی دەچێ، ڕەوتی بیر هەر لە گشتییەوە بەرەو تایبەتییە، بۆ وێنە، دەڵێین: هەر گۆڕاوێک پەیدابوویە، ماددەش هەر لە گۆڕاندایە، کەواتە ماددە پەیدابوویە. دەبینین لە گشتی (هەر گۆڕاوێک)ەوە بەرەو تایبەتی (ماددەش هەر لە گۆڕاندایە) چووین.

لە کۆتاییدا پێویستە بزانین کە ڕێبازی ژیرییانە، بەهیچ شێوەیەک نکووڵیی لەوە نیە کە ئەزموون (تجربة) ڕۆڵێکی یەکجار گرنگ و

---

(١) هەڵبەتە گەڕان بەدوای شتێکی نابەرهەست لەنێو جیهانێکی بەرهەستدا، هەڵوێستێکی ناماقووڵەو، لەوەش ناماقووڵتر ئەوەیە کە حوکمی نەبوون بەسەر شتێکدا بدەی، بێئەوەی لەڕێی سروشتیی و گونجاوی خۆیەوە هەوڵی دۆزینەوەیت دابێ!!

کاریگەر دەگێڕێ لە زیادکردنی ڕێژەی زانیاری و شارەزاییەکانی مرۆڤدا، و نکووڵیی لەو خزمەتە گەورەیە نیە کە پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە دەزانێ کە چەندان رازو نهێنی دۆزیونەوەو ئاشکرای کردوون، بەڵام ڕێبازی ژیرییانە سەرکێڵ و درشت بین نیەو، دەزانێ کە ئەزموون بە تەنێ ناتوانێ ئەو ڕۆڵە بگێڕێ، چونکە ئەزموون بۆ وەدەستهێنانی هەر راستییەکی زانیارییانە، پێویستیی بە (تطبیق) کردنی یاسا بەڵگەنەویستەکانی عەقڵ هەیە.

واتە هەر ئەنجامگیرییەک کە لەبەر تیشکی بنچینە بەڵگەنەویستەکاندا دەستگیر نەبێ، مەحاڵە ئەزموونی ڕووت بەتەنیا ببێتە چاوگی هەڵقوڵینی و سەرچاوەی پەیدابوونی.

کەواتە ئەزموون وەک ئەو پشکنین (فحص) وایە، کە پزیشک دەربارەی نەخۆشێک ئەنجامی دەدات، بێگومان بابای پزیشک بەهۆی ئەو پشکنینەوە دەتوانێ پەی بە نێوەڕۆکی نەساغیی نەخۆشەکە بەرێ، بەڵام پشکنینەکە هیچ سوودێکی نەدەبوو، ئەگەر پزیشکەکە پێش دەستکردن بەکارەکەی چەند شارەزاییەکی بنچینەیی نەبوونایە، دەجا پەیوەندیی نێوان ئەزموون و بنچینە بەڵگەنەویستەکانیش بەهەمان شێوەیە.

### دوو: ڕێبازی ئەزموونییانە:

ئەم ڕێبازە کە بیری بێبڕوایی و ماددەپەرستیی بە تێکڕایی و بە تایبەتی ڕێچکەی شیوعییایەتی (کۆمۆنیزم) و مارکسایەتیی (مارکسیزم) لەسەری دەڕوات و پەیڕەویی لێدەکات، دەڵێت:

ئەزموون تاقە سەرچاوەی سەرلەبەری زانیارییەکانی مرۆڤە، بۆ ئیسپاتکردنی بۆچوونەکەشیان دەڵێن: مرۆڤ لەکاتێکدا کە لە ئەزموونەکان بێبەشە، توانای ناسینی هیچ ڕاستییەکی نیە، هەرچەند یەکجار ڕوونیش

بێ، بۆیە لە دەمی لەدایکبوون و قۆناغی ساواییدا، هیچ جۆرە زانیارییەک شک نابات و، عەقڵ و هۆشی ئینسان لە جەنگەی ژیانی کردەییدا دروست دەبێ و، ڕێژەی کەمیی و زۆریی زانیاریی، بەستراوەتەوە بە ڕێژەی کەمیی و زۆریی ئەزموونەکانییەوە.

کەواتە ئەوانەی لە ڕوانگەی ڕێبازی ئەزموونییانەوە دەڕواننە دەوروبەر، بڕوایان بە بنچینە بەڵگەنەویستەکانی عەقڵ نیە و، ئەزموون و تاقیکردنەوە، بە تاقە سەرچاوەی زانیاری و پێوەری بوون دادەنێن، چونکە مرۆڤ –بە بڕوای وان- لە ڕێی ئەزموونەوە، نەبێ توانای زانینی هیچ ڕاستییەکی نیە.

ئنجا بە هۆی تێڕوانینی ئەزموونییانەوە ئەم ئەنجامانە دێنە دی:

أ- کورت هەڵێنان و تەنگ پێهەڵچنینی زانیاری و شارەزاییەکانی مرۆڤ لەنێو چوارچێوەی تەسکی قەڵەمڕەوی پێنج هەستەکان و ئەزموونندا، واتە بەپێی ئەم ڕێبازە، هەر لێکۆڵینەوەیەک کە لە ئەودیوی سروشت (میتافیزیک) دەدوێ و هەوڵی ناسینی جیهانی نامادیی دەدات، شتێکی بێبەرهەم و ئەنجامەو، ماندووبوونێکی بەخۆڕایی و بێسوودە.

ب- ڕەوتی جووڵانی بیری مرۆڤ لە ڕێبازی ئەزموونییانەدا ڕاست بەپێچەوانەی ڕێبازی ژیرییەوەیە، چونکە ئەم ڕێبازی ئەزموونییانەیە دەڵێت: پێویستە لە ناسینی شتە تایبەتییەکانەوە بەرەو شتە گشتییەکان بچین، واتە لە سنووری ئەزموونی تەسکەوە بگوازینەوە بۆ یاسا گشتییەکان.

ئێستاش با ڕێبازی ئەزموونییانە (المذهب التجريبي) کە بنچینەی هەموو بیرەکانی بێبڕواییە - بەتایبەتی مارکسایەتیی- بخەینە نێو تەرازووی عەقڵ و ژیربێژیی و هەڵی بسەنگێنین و بزانین چۆن دەردەچێ؟ بەڵام پێویستە خوێنەری بەڕێز زۆر چاک لەو هەڵسەنگاندن و پووچاندنەوەیە ورد بێتەوە، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە باسێکی وردو قووڵە، ڕاتەکاندنێکی

زۆر توندی بیری مادده‌په‌رستیی و بێبڕواییشه له‌ ڕه‌گ و ڕیشه‌وه‌، چونكه‌ ڕێبازی تێڕوانین و بیركردنه‌وه‌ی هه‌ر بیروبڕوا (ئیدۆلۆژی)ێك به‌ردی بناغه‌ی ئه‌و بیرو بڕوایه‌یه‌، كه‌واته‌: هه‌ر مه‌ترسییه‌ك ڕوو بكاته‌ ئه‌و بنچینه‌و بناغه‌یه‌، ڕووشی كردۆته‌ سه‌رله‌به‌ری به‌شه‌كانی دیكه‌ی، ئاخر ئاشكرایه‌ به‌ ڕاته‌كێنران و له‌قێنرانی بناغه‌، دیواریش ڕاده‌ته‌كێو ده‌له‌قآو، به‌ ڕووخانیشی ده‌ڕووخێ!

## پووچاندنەوەی ڕێبازی ئەزموونییانە

دەتوانین لە چەند خاڵێکدا، پووچەڵیی و بێکەڵکیی ڕێبازی ئەزموونییانە ڕوون بکەینەوە:

**١)** هەر خودی ئەم ڕێبازە دەبێتە هۆی پووچاندنەوەو هەڵوەشاندنەوەی خۆی! چونکە ئەو بنچینەیەی کە لەسەری بەندە؛ (ئەزموون تاقە ڕێی دۆزینەوەی ڕاستییەکانە)، لە دوو خاڵان بەدەر نیە:

**أ-** یان زانیارییەکی بەڵگەنەویستی ژیرییە، کە بەبێ ئەزموون پەیدا بووە.

**ب-** یان وەک هەموو زانیارییە بەڵگەییەکانی مرۆڤ، لە ڕێی هەستەکانەوەو بەهۆی ئەزموونەوە پەیدا کراوە..

ئنجا ئەگەر یەکەمیان بگرین، ئەوە دەبێتە هۆی وەدرۆخستنەوەو هەڵوەشاندنی ئەو بنچینەیەی کە دەیگوت: بەس لەڕێی جەڕباندن و ئەزموونەوە زانیاری وەدەست دێ، چونکە ئەو کاتە هەر خودی بنچینەی گۆرین، دەبێتە بەڵگەی هەڵەیی خۆی، لەبەرئەوەی ئەو بۆ خۆی کە یەکێکە لە زانیارییەکان، لەو ڕێیەوە وەدەست نەهێنراوە، کە دەڵێن مەحاڵە هەر زانیارییەک لە غەیری و یەوە وەدەست بێ!!

ڕوونتر بڵێم: هەرچەندە بنچینەی ناوبراو بە ڕواڵەت دەڵێ: لە عەقڵی مرۆڤدا هیچ بەڵگەنەویستێکی سەرەتایی نیە، بەڵام لەڕاستیدا بۆخۆی بە کردەوە ئیسپاتی هەبوونی ئەو شتە دەکات کە بەزار ئینکاریی دەکات، چونکە مادام بڵێین: یاسای گۆرین لەڕێی ئەزموونەوە دەستگیر نەبووە، دیارە بە شتێکی بەڵگەنەویستمان لەقەڵەم داوە!

ئەگەر ئیحتیمالی دووەمیش بگرین، ئەوە مانای وایە دانمان بەوەدا هێناوە کە بەر لە جەڕباندن و تاقیکردنەوە، ڕاستیی و تەواویی یاسای ناوبراومان لێ دیارنەبووە، چونکە ئەگەر لێمان دیار بایە، پەکمان لەسەر ئەوە نەدەکەوت کە بیجەڕبێنین و بیخەینە بەر تیشکی تاقیگە (مختبر)وە، جا لێرەدا بۆمان هەیە بپرسین: باشە مادام پێش ئەزموونکاریی ڕاستیی ئەو بنچینەیەمان لێ دیار نەبووە، چ شتێک وای لێکردین کە بکەوینە بیری ئەوەی بیخەینە ژێر ئەزموونکارییەوە؟!

هەڵبەتە لێرەدا پەنابەرینە بەر هەر هاندەرو پاڵنەرێک، هەمان پرسیار بەرۆکی ئەویش دەگرێ، مەگەر بڵێین: ئەو پاڵنەرەی کە وای لێکردین بکەوینە جەڕباندن و تاقیکردنەوەی ئەو یاسایە، ئەو بنچینە بەڵگەنەویستە ژێرییەیە، کە وەک شتێکی خوارسک لە سروشتی مرۆڤدا هەیەو، پەکی لەسەر ئەزموون نەکەوتوە.

ڕوونتر بڵێم: بۆمان هەیە بپرسین: ئەگەر ئەم قسەیە: (ئەزموون سەرچاوەی هەموو زانیارییەکە) بەبێ ئەزموون وەدەست نەهاتبایە، واتە پێش جەڕباندنی بڕوامان پێی نەبووایە، دەبوو ئێستا پەیدا نەبووبایە، چونکە مرۆڤ هەتا بڕوای بە بوونی شتێک نەبێ، هەوڵی دۆزینەوەی نادات و، بەدوایدا ناکەوێتە گەڕان و پشکنین، کەواتە ئەگەر بڵێین: مرۆڤ لە ڕێی ئەزموونەوە پەی بە ڕاستیی ئەو یاسایە بردوە، پێویستە بەرلەوەی ئەم قسەیە بکەین، بڵێین: بڕوابوون بە ڕاستیی ئەو یاسایە لە عەقڵی مرۆڤدا بنچینەیەکی بەڵگەنەویستە، دەنا ئەگەر وانەبا هیچ شتێک نەبوو پاڵ بەو مرۆڤەوە بنێ بکەوێتە گەڕان و پشکنین بەدوای دیتنەوەیدا.

بە واتایەکی دیکە؛[1] بنچینەی ناوبراو کە بە بڕبڕەی پشتی ڕێبازی ئەزموونییانە دادەنرێ، لە دوو حاڵان بەولاوە نیە، یان هەڵەیە، یان ڕاستە، جا

---

(١) هەندێک جاران بە دوو سێ شێوە مەسەلەیەک دەخەمە ڕوو بۆ چاکتر ڕوونکردنەوەی مەبەست.

ئەگەر هەڵەبێ - وەک ئێمە دەڵێین و دەشیسەلمێنین - ئەوە هیچ قسەمان نین، بەڵام ئەگەر ڕاست بێ - کە پێش قیرِ سپی بوون و، گا بەکونی دەرزییەوە چوونیش ڕاست نابێ - ئەوە دەپرسین: چ شتێک پاڵی بە ئەزموونییەکانەوە نا، کە بڕوای خۆیان لەسەر ڕاستیی ئەو بنچینەیە ساغ بکەنەوە؟

ئەگەر بەبێ ئەزموون بۆیان دەرکەوتبێ، مانای وایە یاسایەکی بەڵگەنەویستی ژیرییە، بۆیە حەوجێی ئەزموون نیەو، ئەگەر بە ئەزموونیش بۆیان دەرکەوتبێ، ئەوە مەحاڵی کوڕی مەحاڵە، چونکە هەرگیز شت بۆ خۆی بوونی خۆی پێ ئیسپات ناکرێ.[1]

کەواتە ئەو بنچینەیەی کە دەڵێت: ئەزموون تاقە سەرچاوەی سەرلەبەری زانیارییەکانی مرۆڤە، ئەگەر هەڵەبێ ئەوە هەڵەیەو، ئەگەر ڕاستیش بێ، ئەوە خۆی دەڕووخێنێ و سەری خۆی دەخوات!!

**٢)** مرۆڤ لەسەر ڕێبازی ئەزموونییانە ناتوانێ بوونی مادده ئیسپات بکات! چونکە مادده بە ئەزموونی ڕووت پەی پێنابرێ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەرچی هەستەکان هەستی پێدەکەن لەڕێی ئەزموونەوە، بەس چەند ڕواڵەتێکی ماددەن، بەڵام خودی مادده، واتە ئەو جەوهەرو چییەتەی کە سیفەت و دیاردە بەرهەستەکان بوونە دروشم و نیشانەی، ئەوە ناکەوێتە بەر ڕکێفی هەست و ئەزموونەکان.

بۆ وێنە؛ ئەو گوڵەی کە دەیبینین، یان بۆنی دەکەین و دەستی لێ دەکوتین، تەنانەت ئەگەر لێشی بتامێنین، ئەوە لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا نیشانەو ڕواڵەتەکانیمان هەست پێ کردوون نەک چییەت و جەوهەرەکەی، چونکە چییەت و نێوەڕۆکەکەی بەس بەهۆی ژیرییەوە دەناسرێ، ئەویش

---

(١) ئیسپاتکردنی بوونی شتێک بە خودی خۆی ئاوایە: بۆ وێنە بتەوێ بوونی خوا بسەلمێنی، ئنجا بڵێی: خوا لە قورئانێدا فەرموویەتی من هەم، کەواتە خوا هەیە، چونکە ئەگەر نەبایە نەیدەگوت من هەم!!

بەهۆی پشتبەستنی بە یاسا بەڵگەنەویستە سەرەتاییەکانەوە، جا بۆیە ژمارەیەک لە فەیلەسووفە هەستییەکان (الفلاسفة الحسیّون) کە بەس بڕوایان بە ئەزموون هەیە بۆ پەی بردن بە بوون (إدراك الوجود)، بوونی ماددەیان هەر وەدرۆ خستۆتەوە!

کەوابێ تاقە پشتیوانی بڕواپێکراو بۆ ئیسپاتی بوونی ماددە، بنچینە بەڵگەنەویستەکانی عەقڵن و، ئەگەر ئەوانە نەبوونایە هەستەکان لەڕێی دەنگ و ڕەنگ و تام و بۆن و قەبارەوە نەیاندەتوانی بوونی ماددە بسەلمێنن.

ئنجا ئاوا بەم شێوەیە بۆمان دەرکەوت کە ڕێبازی ئەزموونییانە نەک هەر توانای ناسینی سەرلەبەری بوون (وجود)ی نیە، بەڵکو زەقترین شتیش کە ماددەیە، نایەتە بەر چراوشەداوی تێڕوانینی ئەو ڕێبازە لەنگ و لاتەڵە.

**٣)** ئەزموون کە بەهۆی هەستەکانەوە ئەنجام دەدرێ، ناتوانێ دەستی خۆی بگەیەنێتە هیچ حوکمێکی گشتی (کلّي)، چونکە ئەو حوکمەی کە بەرهەمی هەر ئەزموونێکە، تایبەتە بە جوغزی تەسکی ئەو حاڵەتە جەربێنراوەوە ئەو حاڵەتانەی کە نەجەڕبێنراون، مرۆڤ بۆی نیە هیچ حوکمێکیان بەسەردا بدات، چونکە هەر حوکمێکیان دەربارە دەربکات، پێچەوانەی ئەو بنچینەیەیە کە دەڵێت: تاقە پێوەرو تەرازووی ناسینی شتان ئەزموونە..

بە واتایەکی دی؛ لەبەر ئەوەی ئەنجامی هەر ئەزموونێک تایبەتیی (خاصّ) و بەشیی (جزئي)یەو گشتی و (عام) هەموویی (کلّي) نیە، کەسێک کە بێجگە لە ئەزموون بڕوای بەهیچی دیکە نەبێ، هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیە لەسەر ئەوەی کە ئەو حوکمەی بەهۆی ئەزموونێکەوە وەدەست هاتوە، بەسەر ئەو حاڵەتانەی دیکەشدا دەچەسپێ کە وەک وی دەچن، تاکو بتوانێ یاسایەکی گشتی وەدەست بێنێ.

کەواتە ئەگەر بپرسین: فلان یاسای فیزیایی، یان کیمیایی، یان ڕووەکزانیی، یان کۆمەڵایەتی ...هتد. لەسەر چ بنچینەیەک دانراوەو کراوەتە یاسایەکی

گشتی هەموو حاڵەتەکان، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەو هەموو حاڵەتانە بێجگە لەچەند حاڵەتێکی کەم هیچی دیکەیان لێ نەجەڕبێنراوە؟! هیچ وەڵامێکی ئەزموونیی ماقووڵ نیە!

ئنجا لە ڕاستیدا وەڵامی ڕاستەقینەی ئەو پرسیارە، بەس بە بڕواهێنان بەو یاسایە دەستگیر دەبێ کە دەڵێ: (هەل ومەرجە یەکسانەکان ئەنجامی یەکسانیان هەیە). واتە ئەو دیاردانەی لە چەند خەسڵەتێکی تایبەتییدا هاوبەشن حوکمێکی گشتی دەیانگرێتەوە.

بەڵام ئایا ئەم یاسایە -کەپێی دەگوترێ (قیاس)- بۆخۆی بەرهەمی ئەزموون و تاقیکردنەوەیە، یان بنچینەیەکی بەڵگەنەویستی ژیرییە؟!

ئاشکرایە کە یاسایەکی وا هەمەلایەنەو گشتی، قەت قەت لەڕێی ئەزموونەوە ناگونجێ وەدەست بێ، چونکە دیارە بەهۆی ئەم یاسایەوە لە حوکمە تایبەتی و پچڕپچڕەکانی ئەزموونەکان، بنچینەو یاسایەکی گشتیی دادەمەزرێ، جا مادام وابێ، پێویستە پێش دەستکردن بە ئەزموونکاریی، ڕاستیی و تەواویی ئەم بنچینە گشتییەمان لەلا سەلمێنراو و ئاشکرا بێت.

با بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست نموونەیەک بێنینەوە:

ئەگەر کارتێکردنی گەرمیی لەسەر کانزاکان لە هەزار حاڵەتدا بجەڕبێنین، مادام بنچینەی گۆڕین، پێشتر عەقڵ متمانەی پێی نەبووبێو، لە ڕاستییەتیی دڵنیا نەبووبێ، هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نیە، کە بیسەلمێنین ئەو ئەنجام و حوکمەی لە هەزار حاڵەتی ڕابردوودا ڕاست دەرچوو، لەحاڵەتی هەزارو یەکیشدا ڕاست دەردەچێ، مادام ئەو حاڵەتە هەزارویەکەشمان نەجەڕباندبێ!!

کەواتە: وەک گوتمان یاسای (هەل ومەرجە یەکسانەکان ئەنجامی یەکسانیان هەیە) کە بنەماو بنچینەی دروستبوونی یاسا زانستییەکان

(القوانين العلمية)ە لەڕێی ئەزموونەوە وەدەست نەهاتوە، بەڵکو ئەزموونەکان بەهۆی وییەوە حوکم و یاسا گشتییەکانیان لێ پێک دێن، سەرچاوەی راستەقینەی ئەو یاسا بنچینەییەش عەقڵ و هۆشی مرۆڤە، چونکە یەکێکە لە بنچینە بەڵگەنەویستەکانی عەقڵ و، ئەگەر بێت و ئەو یاسا بەڵگەنەویستانە وەلا بنرێن و لە بەڵگەنەویستایەتیی بخرێن، مرۆڤ ناتوانێ هیچ حوکمێکی گشتیی و یاسایەکی زانیاریی دروست بکات.

٤) ئەگەر هاتباو دەستمایەی بیروهۆشی ئینسان لەنێو چوار دیواری تەنگ و تروسکی ئەزموون و پێنج هەستەکاندا کورت هەڵاتباو حەپس کراباو، مرۆڤ بێجگە لە بەرهەمی ئەزموونەکان هیچ زانیاریی و شارەزاییەکی دیکەی شک نەبردبایە، قەت نەیدەتوانی حوکمی مەحاڵ بوون بەسەر هیچ شتێکدا بدات، چونکە مەحاڵ بوون - نەگونجانی هەبوونی شتێک - شتێک نیە بچێتە ژێر رکێفی حوکمی ئەزموونەوە، واتە بەهۆی ئەزموونەوە مەحاڵ بوونی هیچ شتێک بە ئیسپات ناگات، ئەوپەڕی توانای ئەزموون ئەوەندەیە کە بتوانێ نەبوونی چەند شتێکی دیاریکراو بسەلمێنێ، بەڵام جیاوازیی نێوان نەبوون (عدم)ی شتێک و مەحاڵبوونی بوونی، زۆرزۆرە! (باش سەرنج بدە!).

ئەوەتا چەند دیاردەیەک هەن ئەزموون تائێستا پەی بەبوونیانی نەبردوە، بەڵکو لە جوغزی قەڵەمڕەوی دەستەڵاتیدا نەبوونیانی سەلماندوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەیدابوونیان بە مەحاڵ و چاوەڕوان نەکراو نازانین و، مومکین بوونی بوونیان لێ دانارنین، بەڵام هەر لە بەرانبەری ئەو جۆرە دیاردانەدا، جۆرێکی دیکە هەن، کە هەرچەندە لە نەبووندا ئەزموون هەرهێندەی لەدەست هاتوە، کە وەک دیاردە پێشووەکان ڕەفتاریان لەگەڵ بکات و حوکمی نەبوونیان بەسەردا بدات، بەڵام لە واقیعدا جیاوازییان زۆرە، چونکە جۆری یەکەم هەرهێندەمان لەدەست دێ بڵێین: نین، بەڵام جۆرەکەی دیکە، دەڵێین: بوونیان چاوەڕوان نەکراوو مەحاڵە، ئەمەش چەند نموونەیەک لەو دوو جۆرە دیاردانە:

**جـۆری یەکـەم:** تەقینـەوەی دەریـاکان، هەبوونـی مرۆڤ لـە غەیـری زەویـدا، وێککەوتنـی زەوی و مانـگ، چوونـە سـەر خرۆکـەی مەریـخ..

**جــۆری دووەم:** هەبوونی سێگۆشەی چوارلا، هەبوونی ڕۆژ لەدەمی نەبوونیدا، هەبوونی بەش (جزء)ێکی گەورەتر لە هەموو (کلّ)ەکەی.

وەک دەبینین هەموو ئەم دیاردە پەیدا نەبووانە لە نەبووندا وەک یەکن، واتە هیچیان پەیدا نەبوون و، بەڵام جیاوازیی نێوان چوار دیاردەی جۆری یەکەم و سێ دیاردەی جۆری دووەم، وەک ڕۆژی ڕوون دیارە، هەرچی چوار دیاردەی جۆری یەکەمن، هەرچەندە تا ئێستا لە دەریای نەبوون نەهاتوونە دەرێ، بەڵام پەیدابوونیان مەحاڵ نیەو دەشێ پەیدا ببن، بەڵام سێ دیاردەی جۆری دووەم هەروەک چۆن تا ئێستا نەهاتوونەتە دی، قەتیش ناگونجێ بێنە دی، واتە پەیدابوونیان مەحاڵە.

دە جا ئەگەر ڕاستە ئەزموون تاقە سەرچاوەی پەی بەشت بردنەو، عەقڵ بێجگە لەو زانیارییانەی کە لە جەنگەی[1] ئەزموونەکانی ژیاندا وەدەستیان دێنێ، خاوەنی هیچ دەستمایەیەکی دیکە نیە! بێزەحمەت داوا لە مام ئەزموون دەکەین، کە ئەو دوو جۆرە دیاردە پەیدانەبووانەمان بۆ لێک جوێ بکاتەوە، بێگومان مام ئەزموون لەبەردەم ئەم داواکارییەی ئێمەدا چاری ناچارە دەبێ یەکێک لەم دوو ڕێیانە هەڵبژێرێ:

أ- یان دەبێ دان بەوەدا بێنێ، کە هەرچەندە هەردوو جۆرەکە نەبوونیان ئیسپات کراوە، بەڵام جیاوازییان هەیەو، دەستەی یەکەم هەرچەندە نیشن، بەڵام پەیدابوونیان مەحاڵ نیەو دەگونجێ لە داهاتوودا پەیدا بن، بەڵام دەستەی دووەم نین و بوونیشیان مەحاڵە.

جا ئەگەر دان بەمەدا بێنێ، ئەوە ناچارە بڵێ: ئەم حوکمەم لە عەقڵ و بنچینە بەڵگەنەویستەکانی وەرگرت، چونکە ئەگەر بڵێ هی خۆمە، توند

---

(١) جەنگەی: گەرمەی.

بەرۆکی دەگرین و دەڵێین: مەگەر تاقە زانیارییەک، کە تۆ دەربارەی ئەو دوو کۆمەڵە دیاردەیە هەتە، بریتی نیە لەوەی کە؛ هەتا ئێستا هەستم پێ نەکردوون و نین!؟ دەی لە چ ڕێیەکەوە زانیت، کە جۆرێکیان نەبوونی ئیسپات بووە، بەڵام مەحاڵ بوونی بوونی نا، ئەمما جۆرەکەی دیکەیان نەبوون و مەحاڵ بوونی بوونیشی ئیسپات بووە، خۆ تۆ بۆ خۆت بەس توانای ئەوەندەت هەیە حوکم بەسەر ئێستادا بدەی و دەستمایەیەکی وات نیە خۆی پێ بگەیەنیە داهاتوو (المستقبل)؟!!

هەڵبەتە مام ئەزموون لەبەردەم ئەم پرسیارەدا، دەستەوستانیی و دۆشدامان نەبێ چیدی پێ نامێنێ.

ب- یان دەبێ بڵێ: من هیچ شتێک بە مەحاڵ نازانم، واتە بڵێ: دەگونجێ سێگۆشەی چوار لاو، هەبوونی ڕۆژ لە دەمی نەبوونیداو، هەبوونی بەشێکی گەورەتر لە هەموو (كلّ)، پەیدا ببن!!

بەڵام ئەگەر دان بەوەدا بێنێ، کە هیچ شتێک بەمەحاڵ نازانێ، مانای وایە بنچینەی: نەبوونی دژیەکیی (عدم التناقض) تێدەچێو، دژیەکیی (تناقض) دێتە کایەوەو، بڕوا هەبوونیش بە بوونی دژیەکیی دەبێتە هۆی رووخانی بنچینەی پەیدابوونی زانیاریی و، ئەزموونیش دەستەپاچە دەکەوێتە گۆڕێو مێشی پێ لەخۆی دەرناکرێو، هیچ گومانێکی پێ نارەوێتەوە، چونکە هەرچەند ئەزموونی زۆرو زەوەندەمان هەبن، لەسەر ڕاستیی قەزیەیەکی بەڵگەنەویستی وەک: یەک نیوەی دووانە، مادام بڵێین: هیچ شتێک مەحاڵ نیەو بوونی دژیەکیی دروستە، ناتوانین بڕوای تەواومان هەبێت لەسەر درۆ نەبوونی ئەو قەزیەیە!!

٥) یاسای هۆکاریی (قانون العلیّة) کە بنەماو بنچینەی هەموو جۆرە زانیاریی و شارەزاییەکانی مرۆڤە، لەڕێی تێڕوانینی ئەزموونییانەوە هەرگیز ئیسپات ناکرێ، چونکە ئەزموون بێجگە لە روونکردنەوەی پەیوەندیی نێوان

چەند هۆو ئەنجامێک چیدی پێ ناکرێ، بۆ وێنە: ئێمە لەڕێی ئەزموونەوە دەزانین کە (ئاو) هەرکاتێک هەتا پلەی (١٠٠) گەرم کرا، دەکوڵێو، لە پلەی (٤)یش دەیبەستێ، بەڵام ئەو حەتمییەتەی لە نێوانیاندا[1] هەیە، بەهیچ جۆرە ئەزموونێک پەی پێ نابرێ و نازانرێ، هەرچەندە زۆر بە وردەکاریی بەڕێوە ببرێ و زۆریش دووبارە بکرێتەوە، جا بێگومان ڕووخانی یاسای هۆکارییش، یان ڕاستتر بڵێین: ئیسپات نەکرانی، سەر دەکێشێ بۆ ڕووخانی هەموو ئەو زانیارییانەی کە ئەزموونپەرستەکان شانازییان پێوە دەکەن و، بە بەرهەمی ئەزموونی ڕووتیان لەقەڵەم دەدەن.

ئنجا بێجگە لە یاسای هۆکاریی «کە وەک گوتمان بەردی بناغەی هەموو جۆرە زانیارییەکە، بەتایبەتی زانیارییە سروشتییە ئەزموونییەکان و، لەڕێی ئەزموونیشەوە ناشێ پەی پێ ببرێ» دوو یاسای دیکەش هەن، کە لە گرنگیی و بایەخدارییدا هیچیان لە یاسای هۆکاریی کەمتر نیە، چونکە ئەوانیش وەک وی بەردی بناغەی وەدەست هێنانی هەموو جۆرە زانیارییەکن، بەتایبەتی ئەو زانیارییانەی بەهۆی تێوەڕامان و ئەزموونەوە دەستگیر دەبن، ئەو دوو یاسایەش ئەمانەن:

١- یاسای نەبوونی دژیەکیی (تناقض) لەهیچ شتێکدا، واتە کۆنەبوونەوەی بوون و نەبوون و ڕاست و درۆ لە شتێکدا، لەیەک کات و شوێندا.

٢- یاسای پێکەوەگونجانی هۆ (علّة)و ئەنجام (معلول)، واتە: ئەو یاسایەی کە دەڵێت: هەل ومەرجە یەکسانەکان ئەنجامی یەکسانیان هەیە.

کەواتە دەتوانین بڵێین: تێکڕای زانیارییە ئەزموونییەکان بەبێ پشت بەستن بە سێ یاسای بنچینەیی بەڵگەنەویست، کە هیچ پەیوەندییان بە ئەزموونکارییەوە نیە، ناگونجێ بڕەخسێن و پەیدا ببن، کە ئەمانەن:

---

(١) واتە لەنێوان ئاو و گەرمییدا.

**یەکەم:** یاسای هۆکاریی (قانون السببیة).

**دووەم:** یاسای نەبوونی دژیەکیی (قانون عدم التناقض).

**سێیەم:** یاسای پێکەوە گونجانی هۆو ئەنجام (قانون الإنسجام بين العِلّة والمعلول).

هەڵبەتە دان هێنان بە هەرکام لەم سێ یاسایانەدا، کە لە عەقڵی مرۆڤ هەڵقوڵیون و پەیوەندییان بە ئەزموونەوە نیە، مەرجێکی گرنگ و پێویستە بۆ دروست بوونی زانیارییە ئەزموونییەکان؛ چونکە:

أ- بەبێ دان هێنان بە یاسای یەکەمدا، ناتوانین بەدوای هۆی پەیدابوونی هیچ دیاردەیەکدا بگەڕێین، چونکە مادام ئینکاریی یاسای هۆکاریی بکەین، مانای وایە بڕوامان بەوە نیە کە هەر دیاردەیەک هۆیەکی دیاریکراوی هەیە و، کە بڕواشمان بەوە نەبوو، پەیدابوونی هەر دیاردەیەکی پەیدابوو پەکی لەسەر هۆیەک کەوتوە، مانای وایە ڕێی لێکۆڵینەوەو تێوەڕامان و پشکنینمان لەخۆمان گرتوە.

ب- بەبێ دان هێنانیش بە یاسای دووەمدا، قەت ناتوانین بوونی شتێک یان مەحاڵ بوونی ئیسپات بکەین، چونکە مادام ڕێگا بەخۆمان بدەین بڵێین: بوونی دژیەکیی دروستە، مانای وایە ئەگەر هەزار بەڵگەش لەسەر بوون یان نەبوونی شتێک بێنینەوە، ناتوانین بگەینە قەناعەت و دڵنیایی تەواو، چونکە لەکاتی بوونیدا ئیحتمالی نەبوون و، لەکاتی نەبوونیدا ئیحتمالی بوونی هەر چاوەڕوان دەکرێ.

جـ- بەبێ دان هێنانیش بە یاسای سێیەمدا، بەهیچ جۆرێک ناتوانین ئەو زانیارییانەی لەڕێی ئەزموونەکانەوە دەستگیر دەبن، یاساو حوکمێکی گشتییان لێ پێک بهێنین کە دوایی بتوانین بیکەینە بنچینەو پێوەری باقی ئەو دیاردانەی کە دەستی ئەزموونیان نەگەیوەتێ، واتە بەبێ ئەم یاسایە قەت ناتوانین یاسایەکی زانیاریی (قانون علمي) دابمەزرێنین.

هەڵبەتە ئێمە دووپاتی دەکەینەوە کە نکوڵییمان لە کاریگەریی ئەزموون نیە، لە وەدەست هێنانی زانیاریدا، بەڵام ئێمە دەڵێین: ئەزموون سەرچاوەی بنچینەیی و پێوەرو تەرازووی زانیاری نیە، بەڵکو سەربازێکی زەبر بەدەست و چالاکی ئەو بنچینە بەڵگەنەویستە ژیرییانەیە، کە چاوگی هەڵقوڵینی زانیارییەکانن و، تەنانەت خودی ئەزموونیش هەڵقوڵاوی ئەو چاوگەیە.

ئنجا وەک سەلمێنراش هەرکەسێک بیەوێ دم بەدمە بکات لە بارەی ڕەسەنایەتیی ئەو بنچینە بەڵگەنەویستانەوە، وەک ئەو کەسە وایە کە بیەوێ سەرەشکێنە لەگەڵ (شاخ)دا بکات و، ئەگەر گریمان لەو دم بەدمەیەشیدا سەرکەوتوو بێ، ئەوە بەر لە هەموو شتێک ئەو بنچینەیەی ڕووخاندوە کە ئەزموونی لەسەر ڕادەوەستێ!!

خوێنەری بەڕێز!

ئێستاش دەرکەوت کە ڕێبازی ئەزموونییانە تا چ ڕاددەیەک کڵۆڵ و دەستەوستانە لە ئاقار ناسینی بوون (الوجود)داو، دەرکەوت کە ئەو قسەیەی دەڵێ: ئەزموون تاقە ڕێی وەدەستهێنانی زانیارییە، چەند پووچ و بێ کاکڵە و، وێڕای ئەمەش دەرکەوت کە ڕێبازی ژیرییانە چەند ڕێیەکی ڕێک و ڕاستەو، چەند ڕوانگەیەکی متمانە پێکراوە بۆ ناسینی بوون و دەستگیرکردنی هەر جۆرە زانیارییەک لە هەموو بوارەکاندا[1]، بەڵام مەسەلەیەک ماوە نەخستنە ڕووی کەلێنێک دروست دەکات لەم باسە گرنگەدا، کە خەریکی توێژینەوەینی، ئەو مەسەلەیەش بریتییە لە ڕوونکردنەوەی:

---

(١) واتە هەموو ئەو بوارانەی کە توانای بەسەریاندا دەشکێ، نەک ئەودیو سروشت (ما وراء الطبیعة)و حەقیقەتی شتان و، جیهانی پەنهان و نادیار (عالم الغیب) کە تەنیا وەحیی تێیاندا پسپۆڕو شارەزایە.

(چۆنیەتی پەیدابوونی بنچینە بەڵگەنەویستەکانی عەقڵ)

یەکێـک بـۆی هەیـە بپرسـێ: مـادام بنچینـە بەڵگەنەویستەکان چەنـد یاسایەکی زاتیـی عـەقـڵ بـن، دەبوو لەگـەڵ پەیدابوونـی مرۆڤدا پەیـدا ببـن و سـەرهەڵبدەن، نـەک لـە دواییـدا پەیـدا ببـن، ئایـا هـۆی دواکەوتنـی پەیدابوونـی ئـەو بنچینـە بەڵگەنەویسـتە ژیرییانـە چییـە؟!!

لـە وەڵامـدا دەڵێیـن: لەڕاسـتیدا شـوێنکەوتووانی ڕێبـازی ژیرییانـە کـە دەڵێـن: بنچینـەی بەڵگەنەویستەکان چەنـد یاسایەکی خوارسـک و زاتییـن لـە عەقڵـی مرۆڤـدا، مەبەسـتیان ئەوەیـە کـە هەرکاتێـک بیـرو هۆشـی مـرۆڤ توانـی ئـەو چەمـک (مفهوم)انـە بـە بیـردا بهێنێـو تێیـان بـگات، کـە وەک کەرەسـەیەکی خـاو وان بـۆ دروسـت بوونـی یاسـا ژیرییـە بەڵگەنەویسـتەکان، عـەقـڵ بێئـەوەی حەوجێـی پەنابردنەبـەر هۆیەکـی دەرەکیـی بـێ، ئـەو بنچینـە بەڵگەنەویسـتانەی تێـدا پێـک دێـن و دەچەسـپن.

بـۆ وێنـە: یاسـای هۆکاریـی، کـە دەڵێـت: هەمـوو پەیدابووێـک حەوجێـی پەیداکەرێکـە، ئـەم یاسایە لەسـەرەتای لەدایکبوونـی مرۆڤـەوە نیـەو، ناشـگونجێ هەبـێ، چونکـە پەکـی لەسـەر ئـەوە کەوتـوە کـە عەقڵـی مرۆڤ، ئـەو کەرەسـە خـاوەی تێـدا پەیـدا بـێ کـە لێـی پێـک دێ، بەڵـێ هەتـا مرۆڤ نەتوانـێ لـە چەمکـی هـۆ (سـبب، عِلّـة) و ئەنجـام (مسـبب، معلـول) حاڵـی بێـت، مەحاڵـە یاسـای هۆکاریـی (قانـون العلّیّـة)ی لـە عـەقڵـدا دروسـت ببـێ.

چونکـە لەنێـوان بەڕاسـتدانان (تصدیـق) و بەبیرداهێنـان (تصـوّر)دا، پەیوەندییەکـی یەکجـار پتـەو هەیـەو، هیـچ کاتێـک بەراسـت دانـان، بەبـێ بەبیرداهێنـان نایەتـە کایـەوەو نارەخسـێ، ئنجـا ئاشکراشـە کـە هەمـوو شـێوەکانی بەبیرداهێنـان (تصـوّر)ی عـەقـڵ، بەهـۆی پێنـج هەسـتەکانەوە پەیـدا دەبـن،

ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، کەواتە مرۆڤ پێش گەشەکردنی ئەو هەستانەی کە سەرچاوەی ئەو بەبیرداهێنان (تصورات)ەن، کە ماددەی خاوی بنچینە بەڵگەنەویستەکانە، لێی چاوەڕوان ناکرێ کە یاسا بەڵگەنەویستەکانی عەقڵی تێدا بێنە دی.

کەواتە: پەیدانەبوونی بنچینە بەڵگەنەویستەکان لە سەرەتای پەیدابوونی مرۆڤ و قۆناغی ساوایی داو دواکەوتنیان، نابێتە بەڵگەی زاتیی نەبوونیان لە عەقڵی ئینساندا، بەڵکو لە ڕاستیدا ئەو یاسایانە چەند بنچینەیەکی زاتیی و هەڵقوڵاوی ناخی سروشتی مرۆڤن و، حەوجێی هیچ هۆیەکی دەرەکیی نین، وەک ئەزموون، بەڵام گەشەکردن و فراژوو بوونی هەستەکان و پەیدابوونی توانای بەبیرداهێنان (تصور)ی ئەو چەمکانەی وەک کەرەسەی خاو وان بۆ دروستبوونیان، مەرجێکی سەرەکیی و پێویستە، هەروەک چۆن توانای سووتاندن (الإحراق) لە ئاگردا خەسڵەتێکی زاتیی و ڕەسەنە، بەڵام پەیدابوونی ئەو کاریگەریی (تأثیر)یە، پەکی لەسەر هەبوونی چەند هەلومەرجێکی تایبەتی کەوتوە، وەک ئیشکیی سوتەمەنییەکەو، شیاویی بۆ سووتێنران و، هەبوونی ئۆکسجین.

هەر بەم شێوەیەش بنچینە بەڵگەنەویستەکان، چەند چالاکییەکی زاتیی و سەربەخۆو ڕەسەنی عەقڵن، بەڵام گەشەکردن و پشکووتنیان پەکی لەسەر ڕەخسانی چەند هەلومەرجێکی تایبەتی کەوتوە، کە لە سەرەتای لەدایکبوونی مرۆڤەوە ناگونجێ بڕەخسێن و، لە دواییدا لە ئەنجامی گەشەکردن و بەرەو کامڵی چوونی ئینساندا پەیدا دەبن، وەک خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٧٨ ﴾ (النحل- ٧٨).

کەواتە: هەرچەندە بنچینە ژیرییە بەڵگەنەویستەکان بەشێوەیەکی پلەپلەیی (التدرج) پەیدا دەبن، بەڵام ئەو پلەپلەییە ئەوە ناگەیەنێ کە بەهۆی ئەزموونەوە پەیدا بووبن، چونکە:

**یەکەم:** ئێمە سەلماندمان کە ناگونجێ ئەزموون بکرێتە سەرچاوەی ئەو بنچینە بەڵگەنەویستانەو، سەلماندیشمان کە بەبێ دانهێنان بەو یاسا ژیرییانەدا، مەحاڵە هیچ یاسایەکی زانیاریی دروست ببێ بەهۆی ئەزموونەوە.

**دووەم:** ئەو پلەپلەییەی پەیدابوونی بنچینە بەڵگەنەویستەکان، ئەنجامێکی سروشتیی گەشەکردن و پەرەستاندنی گیانیی و جەستەیی مرۆڤە.

بەڵێ ئەو فراژوو بوون و گۆڕانە جەوهەرییەی مرۆڤە، کە وا لە عەقڵ دەکات دەم بۆ دەمێ بەرەو کامڵیی بچێو، زیاتر هەست بە زانیارییە سەرەتاییە بنچینەییەکان بکات و، ئەو هێزو وزە شارراوانەی تێیدان، بپشکوێن و بێنە حاڵەتی کردەیی (عملي)یەوە[1].

ئێستاش کە لەمیانەی خستنەڕووی ڕێبازی ژیرییانەو، ڕێچکەی ئەزموونیانەو پووچاندنەوەی ڕێچکەی ئەزموونییانەوە، ڕاستیی و ڕەسەنیی بنچینە بەڵگەنەویستەکانی ژیریمان بۆ دەرکەوت،[2] با بچینە سەروکاری سەرەکییترین و گرنگترینی ئەو یاسا بەڵگەنەویستانە، کە بریتیە لە یاسای هۆکاریی و بزانین یاسای هۆکاریی چییەو، چۆن دەکرێتە پتەوترین بەڵگە لەسەر ئیسپاتی بوونی خوای بەدیهێنەر؟!!

---

(١) بۆ ئەوەی دەربارەی ڕێبازی ژیرییانەو ئەزموونییانەو پووچاندنەوەی ڕێچکەی ئەزموونییانەو چۆنیەتی پەیدابوونی بەڵگەنەویستەکان نووسیومە، تا ڕاددەیەکی زۆر سوودم لە کتێبی (فلسفتنا) وەرگرتوە، کە هی (محمد باقر الصّدر)ە.

(٢) داوا لە خوێنەری بەڕێز دەکەم کە زۆر بەقووڵیی ئەم باسانە بخوێنێتەوە، چونکە بنەماو بنچینەی باسەکانی داهاتوون و تێوەڕامانیشیان دەوێ.

یاسـای هۆکـاریی چییە؟!!

یاسـای هۆ کاریـی بـەوە دەگوتـرێ کـە دوو شـت بـە شـێوەیەک پەیوەندییـان پێکـەوە هەبـێ، کـە پەیدابوونـی یەکێکیـان پەکـی لەسـەر ئـەوی دیکەیـان کەوتبـێ.

بـە واتایەکـی دی، یاسـای هۆکاریـی ئـەو یاسـایەیە کـە دەڵـێ: هـەر پەیدابووێـک پێویسـتیی بـە پەیداکەرێـک هەیـەو، هیـچ پەیداکراوێـک بەبـێ پەیداکـەر نابـێ.

یـان دەتوانیـن بڵێیـن: یاسـای هۆکاریـی بریتییـە لـەو یاسـایەی کـە دەڵێت: بوونـی (معلـول) بەبـێ (علـة) مەحاڵـە.

ئنجا ئـەو شـتەی کـە پەیوەندیـی نێوان پەیداکـەرو پەیداکـراو (العلّة والمعلول) لـە جـۆرە پەیوەندییەکانـی دیکـە جـودا دەکاتـەوە، ئەوەیـە کـە هـەرکام لـە پەیوەندییەکانی دیکـە لەنێوان دوو شـتی لێک جودا پەیـدا دەبێو، ئەو دوو شـتە لێـک جوێیـە پێکـەوە دەبەسـتێ، بـۆ وێنـە: پەیوەندیـی نێـوان مامۆسـتاو قوتابـی، فرۆشـیارو کڕیـار، پزیشـک و نەخـۆش، لێخـورو ئوتۆمبێل..هتـد. دەبینیـن هـەرکام لـە مامۆسـتاو فرۆشـیارو پزیشـک و لێخـوڕ لەلایـەک و، قوتابـی و کڕیـارو نەخـۆش و ئوتۆمبێـل لەلایەکـی دیکـەوە، بوونێکـی زاتیـی سـەربەخۆیان هەیـەو، بـۆ پەیدابوونیـان حەوجێـی بەرانبەرەکەیـان نیـن، بـەڵام (نووسـەرو کتێـب) کـە لـە نێوانیانـدا پەیوەندییەکـی هۆکاریـی هەیـە پەیوەندییەکەیـان جۆرێکـی دیکەیـە، چونکـە لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە (نووسـەر) دروسـتکەرو پەیداکـەر (علّـة)ی (کتێـب)ەو کتێـب بەرهـەم و پەیداکـراو (معلول)یەتـی، کتێبەکـە، وەک نووسـەرەکە خاوەنـی بوونێکـی زاتیـی و سـەربەخۆ نیـە، بەڵکـو بوونـی خـۆی لـە بوونـی نووسـەرەکەوە دەسـتگیر کـردوەو، ئەگـەر ئـەو نەبووایـە چـاوی بەدنیایـە هەڵنەدەهێنـاو، لەدەریانـی نەبوونـدا سـەری دەرنەدەهێنـا.

کەواتە لە ڕاستیدا بوونی (معلول) خودی پەیوەندیی بوونیەتی لەگەڵ (عِلّة)دا، ڕوونتر بڵێم: (معلول) خودی پەیوەندییە لەگەڵ (عِلّة)دا، نەک شتێکی پەیوەندییدار لەگەڵ (عِلّة)دا، چونکە (معلول) بەر لەوەی پەیوەندیی لەگەڵ (عِلّة)دا پەیدا بێ بوونی نەبووە.

ئنجا بێگومان مادام (معلول) بۆ هاتنەدیی حەوجێی (عِلّة) بێ، حەتمەن بۆ مانەوەیشی حەوجێیەتی، کەواتە دەتوانین لە کۆتاییدا ئاوا پێناسەی یاسای هۆکاریی بکەین:

یاسای هۆکاریی (قانون السببية) ئەو یاسایەیە کە دەڵێت:

(هەرشتێک خاوەنی بوونێکی زاتیی و سەربەخۆ نەبێ، واتە پەیداکراو بێو خاوەنی بوونێکی وابەستەو خوازراو بێ، بەبێ (عِلّة)، واتە بەدیهێنەرێک کە بوونی لەخودی خۆیەوە بێو حەوجێی غەیری خۆی نەبێ، بوونی، مەحاڵ و چاوەڕوان نەکراوە.)

ئێستاش کە زانیمان یاسای هۆکاریی چییەو یانی چی؟ با بزانین چۆن ئەم یاسایە بوونی خوای پێ ئیسپات دەکرێو، بە پتەوترین بەڵگەی سەلماندنی بوونی خوای بەدیهێنەر دادەنرێ!!

بەڵام بەرلەوەی بچینە سەر درێژەی مەبەست، با بەکورتیی چۆنیەتی (تطبيق) کردنی یاسای هۆکاریی بەسەر مەسەلەی بوونی خوادا بخەینە ڕوو:

(ئەم بوونەوەرەی ئێستا دەیبینین بەم شێوەو دیمەنەی کە لەسەریەتی، خاوەنی بوونێکی زاتیی و سەربەخۆ نیە، چونکە کاتێک بووە کە نەبووەو دوایی پەیدا کراوە، ئنجا هەر شتێکیش خاوەنی بوونێکی زاتیی نەبێ، پێویستی بە بەدیهێنەر هەیەو، بەبێ بەدیهێنەر مەحاڵە بێتە دی، کەواتە ئەم بوونەوەرە نیشانەو بەڵگەی خوایەکی بەدیهێنەرە، کە خاوەنی بوونێکی زاتیی و ڕەسەن و تەواوەو، حەوجێی هیچ شتێک نیەو، هەموو شتێک حەوجێی وییە، چونکە سەرچاوەی بوونە).

## چۆن یاسای هۆکاریی بوونی خوای پێ ئیسپات دەکرێ؟!

دوای ئەوەی سەلمێنراو ڕوون بۆوە، کە یاسای هۆکاریی شتێکی خوارسك و بنچینەیەکی بەڵگەنەویستەو، مرۆڤ بەبێ دان پێداهێنان و پابەندیی بەم یاسایەوە نەیتوانیوەو ناتوانێ پەی بە هیچ یاسایەکی سروشتیی بەرێ، بابزانین چۆن ئەم یاسایە دەگونجێ بکرێتە بەڵگەی سەلماندنی بوونی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار!!

بەر لەچەند سەدە لەمەوبەر، دەگێڕنەوە کە چەند بابایەکی بێبڕوای خۆبەزانا زانی نەزانی بە نەزانیی خۆنەزان، لە دەشتێکی چۆڵ و هۆڵ و کاکی بەکاکییدا، دەگەنە شوانێکی دەشتەکیی و دەبینن گۆچانەکەی خۆی چەقاندوەو،[1] سیپاڵێکی پێداداوەو، سێبەرێکی لەو بیابانە گەرم و ئیشکەدا پێ دروست کردوەو، خۆی لەپەنا گرتوەو سەرگەرمی نوێژو پاڕانەوەو خواپەرستییە، لێی دەچنە پێش و پرسیاری لێ دەکەن: ئەوە خەریکی چی کاکی شوان؟!

ئەویش پێیان دەڵێ: خەریکی خواپەرستیی و نوێژو پاڕانەوەم!

پێی دەڵێن: ئنجا تۆ چووزانی کە خوایەک هەیە، ئایا هیچ بەڵگەت بەدەستەوەن لەسەر بوونی ئەو خوایەی کە دەیپەرستی؟!

شوانەکەش لەوەڵامیاندا ئەم یاسای هۆکارییە بەکار دێنێو، بەشێوەیەکی یەکجار سادەو سروشتیی دەیخاتە ڕوو و دەڵێت:

---

(١) سیپاڵ: پۆشاکێکی شڕی کۆن.

(البَعرةُ تَـدلُّ عـلى البعـير، والخُطـوةُ تَـدلُّ عـلى المَسـيرِ، فسـماءٌ ذات أبـراجٍ، وأرضٌ ذات فُجـاج، وبحـر ذو أمـواج، ألا تـدُلُّ عـلى العليـم القديـر؟!!!)، واتـە: قشـپل[1] بەڵگەیە لەسـەر حوشـترو، جێپـێ بەڵگەیە لەسـەر بەڕێدا ڕۆیشـتن-ی پێـڕۆ-، ئەدی ئاسمانێکی خاوەن ئەستێرەو، زەوییەکی خاوەن دۆڵ و شـێو و، دەریایەکی خاوەن شـەپۆل، بەڵگـە نیـن لەسـەر-خوایەکی- زانـای توانـا؟!!

بێگومـان ڕاسـتە قشـپل بەڵگەیـە لەسـەر بوونـی ژیانداریکـی وەک حوشـترو، جێپـێ بەڵگـەو نیشـانەی بەڕێدا ڕۆیشـتنی پێڕۆیەکـە، چونکـە بەپێـی یاسـای هۆکاریـی هیـچ شـتێک لەخۆوەو بێهۆ پەیدا نابـێ، ئنجـا هـەرکام لـە (قشـپل) و (جێپـێ)ش دیاردەیەکـی پەیدابـوون و، حەتمـەن بەبـێ پەیداکـەر نایەنـەدی، بۆئـەوەی بتوانیـن چۆنیەتـی پەیدابوونـی دوو دیـاردەی پەیدابـوو (حـادث)ی وەک: قشـپل و جێپـێ لێـک بدەینـەوە، ناچاریـن دان بـە بوونـی دوو هـۆی پەیداکـەردا بنێیـن، کـە هێنانـەدی ئـەو دوو دیاردەیەیـان لـێ بوەشـێتەوە، کەواتـە ئێمـە کـە لەکاتـی دیتنـی قشـپلدا ناچـار دەبیـن دان بـە بوونـی حوشـتردا بنێیـن، بـا بەهیـچ کام لـە پێنـج هەستەکانیشـمان هەسـتمان پێـی نەکردبـێ، کـە دان پێداهێنانـی عەقڵمـان بەڕاسـتیی یاسـای هۆکارییـدا، دووچـاری ئـەو ناچارییەمـان دەکات، دیسـان مەسـەلەی دیتنـی (جێپـێ)یەکـەش بـە هەمـان شـێوە.

ئنجـا ئێمـە لەکاتـی دیتنـی (قشـپل)دا حوشـترو، لەکاتـی دیتنـی (جێپـێ) دا پێڕۆمـان دێتـە بەرچـاو، نـەک شـتێکی دیکـە، بـۆ وێنـە: لەباتـی حوشـتر (کۆتـر) و لەباتـی پێـڕۆ (ئۆتۆمبێل)مـان نایەتـە بەرچـاو، چونکـە عەقـڵ بەپێـی یاسـای هۆکاریـی دەزانـێ کـە کۆتـر (جیقنـە) کردنـی لەبارانـدا هەیـەو، قشـپل بـە بەرهەمـی وی دانانـێ و، دەزانـێ کـە ئۆتۆمبێـل شـوێن پێـی نیـەو (جێتایـە) ی لـێ دەوەشـێتەوە.

---

(١) پاشـەڕۆکی حوشـترو مـەڕو بزن (قشـپل) و، هـی کـەرو وڵاخـی یـەک سـم تـەرس (روث)،و هـی ڕەشـەوڵاخ ریـخ (زِبْـل)و، هـی پەلـەوەر جیقنـە (ذرق)ی پـێ دەگوتـرێ.

لێرەدا دەگەینە ئەنجامێکی گرنگ:

بۆ تەفسیرکردنی پەیدابوونی دیاردەیەکی پەیدابوو، هەرهێندە بەس نیە کە هۆیەکی پەیداکەری بۆ دەست نیشان بکەین، بەڵکو دەبێ بشزانین داخۆ ئەو هۆیەی بۆی دەستنیشان دەکەین، هێنانەدی ئەو دیاردەیەی لە باراندا هەیەو، توانای بەسەریدا دەشکێ یان نا؟

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر قسەی شوانە بڕوادارەکەو، بزانین لەو دوو پێشەکییەی کە ڕابردن و شیمان کردنەوە، چ ئەنجامێک دەستگیر دەکا!

(فسماءٌ ذات أبراجٍ، وأرضٌ ذات فِجاج، وبحر ذو أمواج، ألا تدُلُّ على العليم القدير؟!!!).

ئەگەر پەیدابوونی (قشپل)ێک و (جێپێ)یەک پەکی لەسەر هەبوونی حوشترێک و پێڕۆیەک کەوتبێ -بەو هەموو سادەییەیانەوە- ئایا پەیدابوونی ئاسمانێکی ڕازاوەو درەخشان و، زەوییەکی بەپیت و پێزو بەرین و پان و، دەریایەکی زەبەلاح و بەسام و شەپۆلاوی و بێئامان، پەکی لەسەر خوایەکی بەدیهێنەر و مشورخۆر نەکەوتوە؟!

ئایا ئەگەر بە حوکمی یاسای هۆکاریی، دروست بوونی قشپلێک بەبێ بوونی حوشترێک، شتێکی مەحاڵ و چاوەڕوان نەکراوبێ، دروست بوون و پێکهاتنی بوونەوەرێک بەبێ بوونی خوایەک، مەحاڵی کوڕی مەحاڵ و چاوەڕوان نەکراوی سەدجار چاوەڕوان نەکراو نیە؟!!!

ئاخر توخوا هەر دیمەنی (قشپل)ێک و، نەک گشت بوونەوەر بەڵکو دیمەنی یەک دیاردە - بۆ وێنە ئینسان!- لە دیاردەکانی بوونەوەر لەبەرێک ڕابگرەو تێیانەوە ڕابمێنە، بزانە هەڵوێستت چۆن دەبێ!

هەیهوو هەیهوو (قشپل) لەکوێ و (ئینسان) لە کوێ!! کەواتە: ئەگەر بابایەک بۆ پەیدابوون و هاتنەدی (قشپل)ێک بڵێ: ناچارم بڕوا بە

حوشترێک بێنم، بەڵام بۆ دروست بوون و پێکهاتنی یەک (ئینسان)- کە هێندەی گەردێکە لەبوونەوەردا- بڵێ: ناچار نیم بڕوا بە بەدیهێنەرێک بێنم، دیارە هێندەی یەک (قشپل) لە عەقڵ و ویژدان یەکێکیان یان هەردووکیانی نیە!

ئێستا بابزانین بێبڕوایان لە ئاقار ئەم بەڵگە بەهێزو بڕندەیەدا، هەڵوێستیان چۆنەو چ دەڵێن!

بێگومان بابای بێبڕوا کە لەبەردەم تەوژم و تینی ئەم بەڵگەیەدا خۆی دەبینێتەوە، دەبینێ هیچ دەرەتانی نیەو لە چەنگ نووکی تیژی تیغی ئەم بەڵگەیە قوتار نابێ، وەک ئەو دەنکە گەنمەی لێهاتوە کە دەکەوێتە نێوان دوو تای دەستاڕێکەوە، بە مەرەدی ئەو کابرایە چووە کە کەوتبوە نێوان دوو تاشەبەردی زلەوە یەک بەخۆی دەیشیراند: (ئەملام تات و ئەولام تات، وەی بابە جیقم دەرهات)، بەڵێ لە حاڵێکی وادا، بابای بێبڕواش کە دەیەوێ بە سواری کەڵەکی[1] بێبڕوایی لە ڕووباری بەڵگەی هۆکاریی بپەڕێتەوە، حەتمەن لە ئەنجامی تین و تەوژمی ڕێژەوی و قەڵبەزەی ڕووباری گۆریندا، بەخۆی و کەڵەکی بێبڕواییەوە سەرەنگرێ دەبێو بەڕووباری دادەچێ، وەک گوتیشمان مرۆڤ کە بە ڕووباری داچوو، بە پێی توانا هەوڵی خۆڕزگار کردنێ دەداو، پووشیشی وەچەنگ کەوێ دەستی بۆ دەبات، جا بزانین ئەو پووش و پەڵاشەی بابای بێبڕوا پەنای دەباتە بەرێو، دەستی تێ دەگرێ چییەو چۆنە؟!

بابای بێبڕوا لەبەردەم بەڵگەی هۆکارییدا دەستەوستان دەبێو، ناچارە یەکێک لەم دوو ڕێیانە هەڵبژێرێ، کە یەک لەیەکی خراپترن:

---

(١) کەڵەک شتێکە لەچەند کوندەیەک یان چەند چووپێکی فوودراو پێکدێ و، بۆ پەڕینەوە لە چۆم و ڕووبارەکان بەکاردێ، جێی بڕوا نیەو زوو زوو بەهۆی بە پەل چوونەوە کون دەبێو، زۆریش سەرەوبن دەبێ.

**یەکەم:** یان دەبێ بڵێ یاسای هۆکاریی هەڵەیەو درۆیە، هەموو پەیدابوویێک حەوجێی بە پەیداکەر نیە!!

**دووەم:** یان دەبێ بڵێ: یاسای هۆکاریی ڕاستەو، هەموو پەیدابوویێک پێویستیی بە پەیداکەر هەیە، بەڵام ئەم بوونەوەرە وەبەر حوکمی یاسای هۆکاریی ناکەوێ چونکە هەربوو (أزلي)یەو، شتێک نیە نەبوون (عدم) پێش بوونی کەوتبێ و، کاتێک بووبێ کە نەبووبێ و دوایی پەیدابووبێ، هەڵبەتە شتێکیش کە هەربووبێ و پەیدانەبووبێ، حەوجێی بە پەیداکەرو بەدیهێنەر نیە، چونکە خاوەنی بوونێکی زاتیی و سەربەخۆو تەواوەو، چاوی لەدەستی غەیری خۆی نیە کە بوونی پێ ببەخشێ!!

بەڵێ بابای بێبڕوا لە ئاقار هەڵبژاردنی یەک لەم دوو ڕێیانەدا ناچارە، بەڵام با بزانین سەنگ و کێشی هەرکام لەم دوو ڕێیانە چەندە! ئایا بەراستی شتاقیان ڕێگان و مرۆڤ دەگەیەننە ئامانج، یان بە پێچەوانەوە ڕێچکەی سەرلێشێوێن و کوێرەڕێی بەئەنجام نەگەێنن و هیچیان لێ هەڵناوەرێ؟!!

دەبا وەک جاران تەرازووی عەقڵ بەدەستەوە بگرین و، هەرکام لەم دوو (ڕێ)یەی پێ هەڵسەنگێنین بزانین چۆن دەردەچن!

جارێ (ڕێ) هۆی یەکەمیان ئەوە هەر پێویست ناکات خۆمانی لەگەڵ ماندوو بکەین، چونکە لە لاپەڕەکانی پێشوودا سەلماندمان کە یاسای هۆکاریی یەکێکە لە یاسا بنەڕەتییە بەڵگەنەویستەکانی عەقڵ، بنچینەی هەموو جۆرە زانیارییەکەو، مرۆڤ ئەگەر لە یەکەم ڕۆژی ژیانییەوە وەک یاسایەکی سەلمێنراوی دانەنابایەو متمانەی پێ نەکردبایە، ئێستا مەحاڵ بوو هیچ ڕواڵەت و دیمەنێکی ئەو ژیارو شارستانەتی (الحضارة والمدنية)یەی کە لەسەر بنچینەی زانیارییە سروشتییەکان[1] ڕاوەستاوە، دیترابا، چونکە

---

(١) ئاشکرایە ژیارو شارستانەتیی بە چەمکی ڕاستەقینەی (بالمفهوم الحقيقي) بەتەنێ لەسەر زانیارییە سروشتییەکان ڕاناوەستێو، بەر لە هەموو شتێک حەوجێی بەرنامەیەکی خواییە، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان ئەم ژیارە بەژارە نالەبارەی ئێستایە کە لەڕاستییدا بە مەجاز نەبێ دروست نیە پێی بگوترێ ژیارو شارستانەتیی، چونکە لەسەر بنچینەی بە ئاژەڵ

مرۆڤ ئەگەر لەسەداسەد قەناعەتی لەسەر ڕاستیی یاسای هۆكاریی جەزم نەبایەو، دڵنیاو مسۆگەر نەبایە، كە بوونەوەر وردو درشتی بەپێی یاسا بەڕێوە دەچێو، هیچ شتێك لەخۆڕاو بەبێ هۆ پەیدا نابێ، مەحاڵ بوو بەدوای هۆی ڕوودانی دیاردە سروشتییەكاندا بگەڕێ، ئنجاگومانیشی تێدا نیە كە گەڕان بەدوای دۆزینەوەی هۆی پەیدابوونی دیاردە سروشتییەكاندا، تاقە پاڵنەرو سەرچاوەی وەدەستهێنانی زانیارییە سروشتییەكانە، كەواتە ئەگەر بمانەوێ پەیوەندیی نێوان یاسای هۆكاریی و هاتنەدی ژیارو شارستانەتیی- بەچەمكی تەسكی- بكەینە هاوكێشە (معادلة)یەك ئاوا دەردەچێ:

بڕوا بوون بەیاسای هۆكاریی = (گەڕان وپشكنین ← وەدەستهێنانی زانیاریی ← دروست بوونی ژیارو شارستانەتیی.

كەواتە نكوولیی كردن لە یاسای هۆكاریی نكوولیی و ئینكاریی كردنە لە بنچینەی هەموو جۆرە زانیاریی و ژیارو شارستانەتییەك، ئنجا قسەیەكیش بریتی بێ لە نكوولیی كردن لە بنچینەی زانیاریی و ژیارو شارستانەتیی، حەتمەن هەڵەیە، چونكە بوونی هەركام لە زانیاریی و ژیارو شارستانەتیی-كە قسەی گۆڕین بە زمانی حاڵ ئینكاریی لێ دەكات و دەڵێ نابێ- شتێكی واقیعیی و بەرچاوە، جا بێگومان هەر قسەیەكیش ئینكاریی شتی واقیعیی و بەرچاو بكات، دیارە هەڵەیەو، بەكردەوە سەلماندوویەتی كە ناتەواوە.

دەربارەی هی دووەمیشیان دەڵێین:

تۆ دەڵێی: بوونەوەر وەبەر حوكمی یاسای هۆكاریی ناكەوێ، چونكە پەیدابوو (حادث) نیە، تاكو حەوجێی بە پەیداكەر (مُحْدِث) بێ، بەڵكو هەربوو (أزلي)یەو قەت نەبووە كە نەبووبێ، مەبەستت چییە؟!

---

حسێب كردنی مرۆڤ و بەس بڕوا بەدنیا بوون دانراوە، ئنجا ئەم ژیارەش ڕایەڵ و تێوەدانەی كە ئەو پیشەسازیی و تەكنۆلۆجیایەیە كە بەهۆی بەرەوپێش چوونی زانیارییە سروشتییەكانەوە هاتۆتە كایەوە، بۆیە دەڵێین لەسەر بنچینەی زانیارییە سروشتییەكان ڕاوەستاوە.

بێگومان ئەو قسەیەی تۆ بەس دوو واتایان هەڵدەگرێ:

**یەکـەم: هەربوویّتی، مادده (أزلية المادّة):-**

ئەگـەر مەبەسـتت لـەو قسـەیەت هەربوویّتیی، ئەسڵی ماددەکە بـێ، ئـەوە پێت دەڵێیـن: (ئاشـەوان لـە خەیاڵێک داو ئاشگێڕ لـە خەیاڵێک)، چونکـە ئـەوەی کـە ئێمـە دەمانـەوێ بەرگـی ساختەی هەربووایەتیی لێدابڕنیـن، غەیری ئەوەیـە کـە تـۆ دەتـەوێ بەرگـی سـاختەی هەربووایەتیـی دەبەرکـەی[1]!

ئێمـە دەڵێیـن: ئـەم گەردوونـە بـەم شێوەو دیمەنـەی ئێسـتا، هەربـوو نیـەو پەیدابوویـە، کەواتـە حەوجێی بە بەدیهێنەرێکـە کـە خوای تاکـە، تۆش دەڵێی: مـاددەی بوونـەوەر هەربوویـەو پەیدابـوو نیـە، کەواتـە پێویسـتیی بەبەدیهێنـەر نـاکات، واتـە: تـۆ راسـت وەک ئـەو کابرایـەت لێهاتـوە کـە چـوار سـاڵ[2] لەمەوبـەر لـە کۆڕێکدا بەرەنگارم بـوو؛ مـن دەمگوت (شـیعە)کان بە مسـوڵمان دادەنرێـن و بەشـێکن لـە ئوممەتـی ئیسـلام، ئەویـش بـە توڕەییـەوە دەینەڕانـد و دەیگـوت: کـورە چـۆن (شـیوعی)یەکان بـە مسـوڵمان دادەنرێـن[3] و بـە بەشـێک لـە ئۆممەتـی ئیسـلام لەقەڵـەم دەدرێـن؟!!

هەڵبەتـە هەقیشـی بـوو تـووڕە بـێ؛ چونکـە وشـەی (شـیعە) و (شـیوعی) بـۆ لەیـەک جیـا نەدەکرانـەوەو هەردووکـی بـە (شـیوعی) دانابـوون، بۆیـە کـە دەمگـوت (شـیعە)کان مسـوڵمانن، وا شـێتگیر دەبـوو چـاوی دەچوونـە پشـتی سـەری، خۆ ئەگـەر زانیبـای جیاوازی ئـەو دوو وشـەیە هێنـدەی جیاوازیـی نێوان ڕەش و سپی و، هـەق و ناهەقـە، بێگومـان تـووڕە نەدەبـوو.

---

(١) دەبەرکردن: کردنەبەر/ پۆشین.

(٢) لەکاتی نووسینی ئەم کتێبەوە کە ١٩٨٥ـە کەواتە ساڵی ١٩٨١ بووە.

(٣) دیـارە ئەوکەسـانەی هـەر بەنـاو (شـیوعی)ین و خۆشـیان بـە مسـوڵمان پێشـان دەدەن حوکمیـان جیایە.

بەڵێ هەربووێتیی ماددەو هەربووێتیی بوونەوەر، دوو مەسەلەی لێک جودان و، نابێ تێکەڵ بکرێن، ئەو جیاوازییەش لەچەند خاڵێکدا دەخەینە ڕوو:

**(١)** بڕوادار و بێبڕوا لەسەر هەربوو نەبوونی بوونەوەر ڕێککەوتوون، بەڵام هەربوونەبوونی ماددە لەنێوانیاندا جێی بێنەوبەردەیە، هەرچی بڕوادارانن-مەگەر بەدەگمەن- دەنا دەڵێن: ماددەش وەک بوونەوەر پەیدابووەو دروستکراوەو، بێبڕواش سەرلەبەر لەسەر ئەوەن کە ماددە هەربوویەو کەس نەیهێناوەتە دی.

**(٢)** هەندێک لە فەیلەسووفەکانی ئیسلام[1]، بۆ وێنە (ابن سینا، ابن رشد، فارابی)

دەڵێن: دەگونجێ شتێک هەبێ لەگەڵ هەربوو بوونیشیدا، پەیداکراو (معلول)ی خوا بێت و، خاوەنی بوونێکی زاتیی و سەربەخۆو تەواو نەبێ، بەڵام هیچ زاناو فەیلەسووفێکی بڕوادار نەیتوانیوە بڵێ: دەگونجێ بوونەوەر هەربوویێو حەوجێی بە خوا (جل جلالە) نەبێ[2].

ئنجا ئێستا کە جیاوازیی نێوان هەربووێتی ماددەو هەربووێتی بوونەوەرمان ڕوون کردەوە، ڕوو دەکەینەوە بابای بێبڕوای دوێنراو (مخاطب) و دەڵێین: هەرچەندە عەقڵ و زانیاریی هەتا ئێستا تاقە بەڵگەیەکیان لەسەر ئیسپاتی هەربووێتی ماددە نەخستۆتە دەستی مرۆڤ، بەڵکو ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بەڵگەیەکی نوێ لەسەر سەلماندنی پەیدابوون و دروستبوونی دەخەنە بەرچاو، بەڵام ئەگەر گریمان ڕۆژێک لە ڕۆژان - لەو ڕۆژانەی کە لە غەیری دوازدە مانگەکاندا دێن! - هەربووێتی ماددەش سەلمێنرا، سەلماندنی هەربووێتی

---

(١) بەڵکو ژمارەیەک لە زانایانی دیکەی ئیسلامیش، بۆ وێنە (ابن أبي العزّ الحنفي) خاوەنی (شرح العقيدة الطحاوية) گوتوویەتی: (والمقصود أن الذي دلّ عليه الشرع والعقل أن كل ما سوى الله تعالى محدث كائن بعد أن لم يكن، أما كون الرب تعالى لم يزل معطلاً عن الفعل، ثم فعل، فليس في الشرع ولا في العقل ما يثبته، بل كلاهما يدل على نقيضه) تهذيب شرح العقيدة الطحاوية، ل٧٨.

(٢) بڕوانە: (حوار بين الفلاسفة والمتكلمين) د.حسام الدين الالوسی، ل١٤ چ٢.

ماددە، بە هیچ ڕەنگێک نابێتە هۆی ئەوەی کە دروستبوون و پەیدابوونی بوونەوەر لەژێر ڕکێفی حوکمی یاسای هۆکاریی دەرباز بکات، چونکە مادام ئێوەی بێبڕواش وەک بڕواداران دانتان بەوەدا هێناوە کە پەیدابوون و پێکهاتنی بوونەوەر بەم شێوەیەی ئێستای، گۆڕانێکە زۆر لەمێژ نیە -لەچاو هەربوویێتی- بەسەر ماددەدا هاتوە، مادام وابێ ماددە هەربووبێ یان نا، یەکسانە، چونکە لە هەردووک حاڵاندا یاسای هۆکاریی بەرۆکی بوونەوەر دەگرێو، هەر ناچارین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کەدەڵێت: کێ بوونەوەری پەیدا کرد؟! یان کێ وای لە ماددەی سادە کرد کە بگۆڕێ بۆ بوونەوەرێکی ڕێک وپێک و پڕ لە یاساو وردەکاریی؟!!

## دووەم: هەربوویێتی بوونەوەر (أزلیة الکون):

ئەگەر مەبەستت هەربوویێتی ئەسڵی ماددەی بوونەوەر نەبێ و، خودی بوونەوەر بێ، واتە مەبەستت ئەم بوونەوەرە بێ، کە بەم شێوەیەی ئێستای دەیبینین، ئەوە پێت دەڵێین:

وادیارە تۆ نە بڕواداری نە بێبڕوای، نە بڕوات بە عەقڵ هەیە، نە بە زانیاریی! چونکە بڕوادارو بێبڕوا لەسەر بنچینەی عەقڵ و زانیاری ڕێککەوتوون لەسەر ئەوە کە بوونەوەر بەم شێوەیەی ئێستای هەربوو نیەو، دوای نەبوون هاتۆتە دی.

بەڵێ هەربوو نەبوونی بوونەوەر لەنێو زانایانی ئێستادا چ بڕواداربن چ بێبڕوا، بۆتە شتێکی سەلمێنراوی وا دم بەدمەو وتوێژ هەڵناگرێ، هەڵبەتە هەتا سەدەی نۆزدەش بیردۆزەی هەربوویێتی بوونەوەر - چونکە زانیاری فیزیاو کیمیاو گەردونناسیی تەواو پنجیان نەگرتبوو - تۆزێک ڕووی هەبوو بێتە سەر خوانی وتوێژو تۆژینەوە، بەڵام دوای دۆزرانەوەی یاسای دووەمی دینامیکای گەرمیی (القانون الثاني للحرارة الدینامیکیة: Second Law of

T(صلى الله عليه وسلم)ermo D(جل جلاله)namics) ڕەواجی نەمـاو وەک دەیـان بیـردۆزەی دیکـەی بەنـاو زانیارییانـە کەوتـە بـەر تـەوژم و تینـی زانیاریـی و هەلاهـەلا بـوو.

چونکـە ئـەم یاسـایە دەڵـێ: (هەمیشـە گـەرمیـی لـە تەنـە گـەرمەکانـەوە بـەرەو تەنـە ساردەکان دەگوازرێتـەوە، هەتـا پلـەی گـەرمیـی هەمـوو تەنەکانـی بوونـەوەر یەکسـان دەبـێ و، قـەت پێچەوانـە ڕوونـادات -واتـە قـەت جارێکـی دی گـەرمیـی لـەو تەنانـەوە کـە گـەرمییـان وەرگرتـوە، بـۆ ئـەو تەنانـە ناچێتـەوە کـە گـەرمییـان بەخشیـوە-)[1].

بەڵـێ هـەر ئـەم یاسـایە بەتەنـێ - هەرچەنـدە بەڵگـەی دیکـەش زۆرن - بەڵگەیـە لەسـەر دروسـت بـوون و پەیدابوونـی بوونـەوەرو، هەربـوو (أزلـي) نەبوونـی، چونکـە بەپێـی ئـەم یاسـایە ئەگـەر بوونـەوەر هەربـوو بایـە، دەبـوو زۆر زۆر لەمێژبـا گـەرمیـی تەنەکانـی بوونـەوەر یەکسـان بووبایـەو، بوونـەوەر تێکچووبایـە، چونکـە (گـەرمیـی) ئەستێرەکان هەرچەندێکـی بـێ، سـنووردار (محدود)ە، شتی سنووردارش بەرگـەی تەمەنێکـی بێسـەرەتا-ئەگەر بگونجـێ هەبـێ- ناگـرێ، بـۆ وێنـەو بـۆ نیزیکخسـتنەوەی مەبەسـت لـە بیـری خوێنـەر دەڵێیـن:

ئەگەر بڵێیـن (ئەحمەد) ناوێک (١٠٠) سـاڵ پێش ئێسـتا خاوەنی (١٠٠٠) لیـرە بـووە بۆ کوڕەکانی بـە میـرات بەجێی هێشتوە، ئەوانیـش هەمـوو ساڵێ (٢) لیـرەیان لـێ خـەرج کـردوە، بـۆ ئـەوەی بزانیـن لـەو (١٠٠٠) لیـرەیە چەنـد ماوەتـەوە، پێویسـتە ژمـارەی لیـرە خەرجکـراوەکان لـە ژمـارەی تێکـڕای لیـرەکان دەربکەیـن، ئـاوا:

١٠٠ × ٢ = ٢٠٠ لیرە لە ماوەی ١٠٠ ساڵدا خەرج کراوە.

١٠٠٠ - ٢٠٠ = ٨٠٠ لیرە ماوەتەوە.

(١) ئەم پێناسەیەم لە کتێبی: (أساسيات الفيزياء)، ل٣٤٥، چ١٩٨٢وەرگرتوە.

بەڵام ئەگەر بڵێین: ئەو (ئەحمەد) ناوە (١٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا ئەو لیرانەی بەجێ هێشتوون و ڕێژەی لێ خەرج کردنیشیان هەروەک جاری پێشوو بووە، ئەوە

دەبێ بڵێین:

(١٠٠٠) لیرەکە پێنجسەد ساڵ لەمەوبەر تەواو بوون!

خۆ ئەگەر بڵێین: ئەو هەزار لیرەیە لە ئەزەلەوە بە میرات بەجێماوەو لێی خەرج کراوە، ئەوە هەر ناتوانین ئەو کاتە لەمێژە دیاریی بکەین کە لیرەکانی تێدا بڕاون!! دەجا مەسەلەی (گەرمیی) تەنەکانی بوونەوەرو (هەربوویێتی)یش بەهەمان شێوە، ئەگەر گریمان بوونەوەر هەربوو بایە، دەبوو زۆر زۆر لەمێژبا تەمەنی بوونەوەر بڕاباو هەموو شتێک کۆتایی پێ هاتبا.

بەڵێ ئێستا هەربوو نەبوونی بوونەوەر بۆتە شتێکی ڕوون و ئاشکراو سەلمێنراو لەلایەن زانایانەوەو کێشەی تێدا نەماوە، بەڵام ئەوەی کە جێی دم بەدمەو کێشەو بێنەوبەردەی زاناو شارەزایانە، بریتیە لە دیاریی کردنی ئەو دەمەی کە بەسەرەتای دەستپێکردنی بوونەوەر دادەنرێ!

١- هەندێکیان دەڵێن: ئەم بوونەوەرە لە ئاکامی تەقینەوە (انفجار)ێکی مەزندا هاتۆتە دی کە بەر لە (٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) پێنج تریلیۆن ساڵ لەمەوبەر ڕووی داوە[١].

٢- هەندێکی دیکە دەڵێن: کاتی دەستپێکردنی تەمەنی بوونەوەر دەگەڕێتەوە بۆ (٤,٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) چوار تریلیۆن و نیو ساڵ لەمەوپێش[٢].

---

(١) (الإسلام يتحدى) وحيدالدين خان، ل٥٦، چ١٩٨١،٥. و(عقيدتنا) الشيخ عبدالله نعمة، ل١٨٦، چ٢ ١٩٨٣.

(٢) (مبادئ الكونيات) الأمين محمد أحمد كعورة، ل١٨٧، ض٣، ١٩٧٩.

٣- هەندێک دەڵێن: هەتا ئێستا (١١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) یازدە تریلیۆن ساڵ بەسەر تەمەنی بوونەوەردا تێپەڕیوە[١].

٤- هەندێکیشیان (١٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) دە تریلیۆن ساڵیان بەتەمەنی ئەم بوونەوەرە مەزنە ڕەوا دیوە[٢].

٥- بەڵام زۆربەیان ڕایان وایە کە (١٣-١٥) تریلیۆن ساڵە ئەو تەقینەوە مەزنە (big bang)ە ڕوویداوەو گەردوون پەیدابووە[٣].

بەڵێ پەیدابوویی (حدوث)ی بوونەوەر شتێکی ڕوون و سەلمێنراوە، نەک هەر ئەوەندەش، بەڵکو زانایان لەبەرتیشکی یاسای دووەمی دینامیکای گەرمییدا، پیر بوون و هەرەسهێنان و لەنێوچوونی بوونەوەریشیان، لەلا بۆتە شتێکی سەلمێنراو، (ف.بوش) مامۆستای فیزیا لە زانکۆی (دایتۆن) دەڵێت: (کەواتە لە ئەنجامی نزم بوونەوەی پلەی گەرمیی تەنە گەرمەکان و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمیی تەنە ساردەکاندا، پیربوون (ئەنترۆپی)و بێیاسایی بوونەوەر بەردەوام بەرەو زیادی دەچێ و، دەتوانین چارەنووسی بوونەوەر لەوکاتەدا

---

(١) (أساسيات الفيزياء) ف.بوش. استاذ الفيزياء، بجامعة دايتون، ترجمة د.سعيد الجزيري، د.محمدأمين سليمان ل٨٦٤، ص١٩٨٢.

(٢) (از کهکشان تا أنسان) جان خضر، ل١١، ترجمة فريدون بدرەای..

(جان خضر) ئاوا باسی سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر دەکات: (... کورتەی قسان؛ دە تریلیۆن ساڵ لەمەوبەر شتێک لە بۆشایی (فضاء)دا پەیدا بوو(!) و ڕەگی داکوتاو وردەوردە گەورە بوو، هەورێک دروست بوو هەورێک کە زۆر لە هەورەکانی ئێمە جودا بوو.. لەو هەورەدا جموجووڵێک پەیدا بوو، هێدی هێدی گەردیلەکانی ماددە هەروەکو پێشتر ڕێنوێنی کرابن) بەرەو یەکدی جووڵان و لەسەریەک کەڵەکە بوون و...هتد)

ئنجا ئایا ئەم قسانەی (جان خضر) وەک تەفسیری ئەم ئایەتە ناچن؟ ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ ﴾ (فصلت-١١).!!

(٣) لەمەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد)دا ئەو بابەتەو پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی: هەبوویی (أزلية)ی ماددەو گەردوون، زۆرباش باسکراون.

کە پلەی هەمـوو تەنەکانی یەکسان دەبێ، بێنینە بەرچاو، لەوکاتـەدا هیـچ جۆرە ئاڵوگۆڕێکـی گەرمیـی ڕوونـادات و، دوایـی گێرەشـێوێنی و پیریـی بوونـەوەر دەگاتـە دواییـن پلە و، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە وزەی بنچینەیی بوونـەوەر هەتـا ئێسـتاش نەگـۆڕەو ناشـگۆڕێ، بـەڵام لـەو دەمـەدا وزە دەبێتـە شـتێکی بێبایـەخ، ئنجـا لەوکاتـەدا ڕووەک ناتوانـێ شـین بێ، چونکـە تەنێکـی گـەرم نامێنـێ کـە رووناکیـی بداتـێ و، ئامێـرەکان کارناکـەن چونکـە شـوێنێکی سـارد نامێنـێ گـەرمیی بۆ بـەڕێ بکـرێ، واتـە ژیـان بـە تـەواوی لـە هەمـوو جێبەکی بوونـەوەردا ڕادەوەسـتێ و، لـەو حاڵەتەشـدا بوونـەوەر دەگاتـە ئـەو شـتەی کـە مردنـە گـەرمـی (الموت الحراري) پـێ دەگوتـرێ[1].

ئنجـا مـادام بوونەوەریـش پەیدابووبێـو هەربـوو نەبـێ، ناچاریـن وەڵامـی پرسـیاری (بوونـەوەر چـۆن پەیدا بـووە، یـان کـێ بوونـەوەری دروسـت کـردووە؟!) بدەینـەوە، ئـەم پرسـیارەش بـەس یـەک وەڵامـی راسـتی هەیـە، وەڵامێکـی وا کـە عەقـڵ و زانیـاری پشـتگیریی بکـەن، ئەویـش ئەمەیـە:

(بوونـەوەر خـوا دروسـتی کـردووەو، دوای نەبـوون بوونـی پـێ بەخشـیوەو، بەپێـی چەنـد یاسـایەکی وردی زانیارییانـە ڕێکـی خسـتوە).

کەواتـە: نـە قسـەی (هەربووێتـی مـاددە) و نـە قسـەی (هەربووێتـی بوونـەوەر) ناتوانـن لەبـەردەم تیـن و تەوژمـی بەڵگـەی هۆکارییـدا خۆیـان ڕابگـرن و، لـە ئەنجامـدا بـە حوکمـی یاسـای هۆکاریـی هـەر ناچـار دەبیـن بڵێیـن:

مـادام هەمـوو پەیدابووێـک پەیداکەرێکـی هەبێـو، هیـچ شـتێک کـە خـاوەنی بوونێکـی زاتیـی نەبـێ، بەبـێ بەدیهێنـەر دروسـت نەبـێ، ئـەم بوونـەوەرە چونکـە هەربـوو نیـەو پەیدابوویـە، حەتمـەن دەبـێ پەیداکـەرو بەدیهێنەرێکـی هەبـێ، ئەویـش خـوای پـەروەردگارە.

---

(١) بڕوانە کتێبی: (أساسیات الفیزیاء)، ل٣٥٣ ف.بوش.

ئێستا دوای ئەوەی بە ئاگری عەقڵ و زانیاری هەموو ئەو چڵەپووش و پەڵاشانەمان سووتاندن، کە بێبڕوایان لەدەمی سەرەنگریێ بوونی کەڵەکی بیری بێبڕواییان، لەنێو ڕووباری بەڵگەی هۆکارییدا، بە ئومێدی خۆ دەربازکردن، دەستیان بۆ درێژ دەکردن و پەنایان بۆ دەبردن، سادەتر بڵێین: دوای ئەوەی هەموو ئەو ڕەخنەو تانەو تەشەرانەمان پووچ کردنەوە، کە بێبڕوایان بەنیازی خۆیان چەند تیرێکیان لێ دروست کردبوون و بەئومێدی پێکان، ئاڕاستەی بەڵگەی هۆکارییان کردبوون دەرمانخست کە بەڵگەی هۆکاریی پتەوترین بەڵگەی ژیرییە لەسەر بوونی خواو زۆریش لەوە بەرزترە، کە بەسێچوار قسەی بێسەروپێ و بێکاکڵی بێبڕوایانە، مووی لێ بلەخشێ؛ بەڵێ ئێستا با بزانین داخۆ چ چڵەپووش ماون کە یان دەستیان تێ بگرن!!

پێشەکی با بەکورتی چۆنیەتی سووتێنرانی سێ چڵەپووشی پێشوو-کە بێبڕوایان هانایان بۆ دەبردن و دەستیان تێدەگرتن، بەهیوای رزگاربوون لە خنکانی نێو ڕووباری بەڵگەی هۆکاریی- بخەینە ڕوو، ئنجا چڵەپووشی چوارەم و کۆتایی ڕادەنوێنین و، بە پشتیوانی خوا ئەویش وەک سێ هاوەڵەکەی پێشووی، بەتینی ژیریی و زانیاری دەسووتێنین:

لەسەرەتاوە گوتمان بەحوکمی یاسای هۆکاریی: مادام قشپلێک و جێپێیەک بەبێ حوشترێک و پێڕۆیەک دروست بوونیان مەحاڵ بێ، بوونەوەرێکی وا ڕێک وپێک و یاساداروپڕ وردەکارییش، مەحاڵە بەبێ خوایەکی بەدیهێنەر، بێتەدی و بڕەخسێ.

بەڵام بێبڕوایان جا لەبەر هەر هۆیەک بێ، نەیانویست گوێ بۆ ئەم بەڵگە بەهێزە بگرن و گەردنکەچی هەق بن، ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە بە ناچاریی بە سواری کەڵەکی بێبڕوایی لەگەڵ شەپۆل و قەڵبەزەی بەهێزی ڕووباری بەڵگەی هۆکارییدا ڕوبەڕوو بوون و دەستبەجێ پێداچوون، ئنجا بە مەبەستی خۆگرتنەوەو قوتار بوون، دەستیان بە یەکەمین چڵەپووش گرت و گوتیان:

نەخێر یاسای هۆکاریی ڕاست نیەو هەموو پەیدابووێک پێویستی بە پەیداکەر نیە، کەواتە ئەو قسەیە ڕاست نیە کە دەڵێ: (بوونەوەر پەیدابوویەو هەموو پەیدابووێکیش حەوجێی پەیداکەرە، کەواتە بوونەوەر حەوجێی بەدیهێنەرەو، ئەو بەدیهێنەرەش خوای بێهاوتایە).

بەڵام ئێمە بەهاوکاری عەقڵ و زانیاری ئاوا ئەو چڵەپووشەمان سووتاند:

پێشتر بەڵگەنەویستیی یاسای هۆکاریی سەلمێنراو، گوتمان مرۆڤ ئەگەر لەسەداسەد بڕوای بە ڕاستیی ئەم یاسایە نەبووایە، ئێستا هیچ دروشم و نیشانەیەکی ژیارو شارستانەتی لەسەر خڕۆکەی زەوی نەدەبینرا، چونکە مرۆڤ هیچ پاڵنەرێکی نەدەبوو کە هانی بدات لە دیاردە سروشتییەکان ورد بێتەوەو پەی بە یاساکانی بوونەوەر بەرێو، لەئەنجامی ئەوەدا زانیاری پەیدا بکات و، بە یارمەتی ئەو زانیارییە ژیارو شارستانەتی بنیات بنێ، بەڵێ ئەو کاتە ئاوا ئەو چڵەپووشەمان سووتاند، ئێستاش ئەم قسانە زیاد دەکەین و دەڵێین:

کەسێک ئینکاریی لە یاسای هۆکاریی بکات، بۆ ئەوەی خۆی لە حوکمی بەڵگەی هۆکاریی دەرباز بکات، وەک ئەو کەسەی لێدێ کە لە کۆلکی دەرەوێتەوەو بەسەر بەرازیدا دەکەوێ، چونکە هەزاران پرسیاری بێوەڵام یەخەی دەگرن، بۆ وێنە:

ئایا قشپل بێ حوشتر پەیدا دەبێ؟!

ئایا باران بەبێ هەور پەیدا دەبێ؟!

ئایا منداڵ بێ دایک و باب لەدایک دەبێ؟!

ئایا زەوی بێ تیشکی ڕۆژ شیناوردی لەسەر دەڕوێ؟!

ئایا نووسراو بەبێ نووسەر قەت دەنووسرێ؟!

هتد...هتد.. هەڵبەتە لە ئاقار ئەم جۆرە پرسیارانەدا کە لەژمارە نایەن، بابای بێبڕوا بڕستی لێ دەبڕێو دۆش دادەمێنێو سەری شۆڕ دەبێ.

ئنجا کە بێبڕوایان چڵەپووشی یەکەمیان بەتیشکی ژیریی و زانیاری لێ سووتاو دەستیان بەتاڵ ما، دەستیان بۆ چڵەپووشی دووەم و سێیەم[1] بردو گوتیان:

باشە ئەوە ئێمەش سەلماندمان، کە یاسای هۆکاریی شتێکی ڕاستەو هیچ پەیدابووێک بێ بەدیهێنەر پەیدا نابێ، بەڵام بێگومان کاتێک بوونەوەر وەبەر حوکمی یاسای هۆکاریی دەکەوێ، کە بە پەیدابوو (حادث) دابنرێ، ئەمما ئێمە بڕوامان وا نیە کە بوونەوەر پەیدابوویە، تاکو ناچار بین بەپێی حوکمی یاسای هۆکاریی بەدیهێنەرێکی بۆ بڕیار بدەین، بەڵکو دەڵێین هەر بوویە.

ئنجا کاتێک لێمان پرسین: مەبەستتان لە هەربووێتیی بوونەوەر چییە؟! ئایا مەبەستتان ئەوەیە، کە بوونەوەر بەم شێوەو دیمەنەی ئێستای؛ کە بریتییە لە چەند کەهکەشان (مَجَرّة)ێکی پێکهاتوو لە ملیۆنان ئەستێرەو خڕۆکە، هەربوو و بێ سەرەتایە؟ یان مەبەستتان ئەوەیە کە بوونەوەر بەم شێوەو دیمەنەی کە دەبینرێ هەربوو نیەو پەیدا بوویە؟ بەڵام ئەسڵی ماددەکەی هەربوویە، بەڵێ لەو کاتەدا بێبڕوایان بوونە دوو پێڕ، پێڕێکیان چڵەپووشی هەربووێتیی ماددە (أزلية المادّة)یان هەڵبژاردو، ئێمەش ئاوا ئەو چڵەمان سووتاند:

هەرچەندە هەتا ئێستا عەقڵ و زانیاری تاقە بەڵگەیەکیان لەسەر هەربووێتی ماددە نەخستۆتە دەستی مرۆڤەوە، بەڵکو ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بەڵگەی نوێترو پتەوتر دەخەنە ڕوو لەسەر دروستکراویی و پەیداکراویی، بەڵام ئەگەر گریمان

---

(١) بۆیە چڵەپووشی دووەم و سێیەممان پێکەوە گوتن، چونکە یەک بنکیان هەیە، ئەو بنکەش بریتیە لە هەربووێتیی (الأزلية).

هەربووێتی ماددەش سەلمێنرا، هەربووێتی مادده بەهیچ کلۆجێک ناکرێتە بەڵگەی ئەوەی کە دروستبوونی بوونەوەر ناکەوێتە بەرڕ کێفی حوکمی یاسای هۆکاریی و، پێویستی بە خوای بەدیهێنەر ناکات؛ چونکە مادام بڵێین: پێکهاتن و دروستبوونی بوونەوەر ڕووداوێکی، هەربوو نیەو سەرەتایەکی هەیە، ناچارین دەبێ حەتمەن بەپێی یاسای هۆکاریی، بەدیهێنەرو پەیداکەرێک بۆ ئەو گۆڕانەی ماددەو، دروست بوون و پێکهاتنی ئەو بوونەوەرە ڕێک وپێک و پڕ وردەکارییە، دیاریی بکەین، چونکە ئێمە لەکاتی دیتنی کۆشکێکی ڕێک وپێک و ڕازاوەدا، ئەگەر بشتوانین خۆمان ئیقناع بکەین بەوەی، کە کەرەسەخاو-چەوو لم و چیمەنتۆو گەچ و ئاسن و بۆیاغ و...هتد-ەکەی هیچ ئەندازیارو وەستا دەستیان لە دروست کردنیدا نەبووە، بەهیچ ڕەنگێک ناتوانین لەسەر ئەوە قەناعەت بەخۆمان بێنین، کە پێکهاتن و پەیدابوونی ئەو کۆشکە لەو کەرەسە خاوە، دەستی هیچ ئەندازیارو وەستایانی تێدا نەبووە.

پێرەکەی دیکەش کە بەتەمای چڵەپووشی هەربووێتی بوونەوەر بوون، کە لە خنکانی حەتمی نێو ڕووباری بێڕەزای بەڵگەی هۆکاری قوتاریان بکات، بێهیواو نائومێدمان کردن و، ئاوا ئەو چڵەمان لێ سووتاندن، کە جێی ئومێد و ئاواتیان بوو:

(هەربوو) بوونی بوونەوەر-ئەگەر لەکۆندا لوابێ بکرێتە حەشارگەو پەنایەک بۆ بیری بێبڕوایی- ئێستا لەنێو زانایانی بێبڕوادا لێکەوتەوە بڕەوی نەماوە[1]؛ چونکە یاسای دووەمی دینامیکای گەرمیی بەشێوەیەکی یەکجاریی، پووچەڵیی ئەو بیردۆزەیەی سەلماندو، دەریخست کە ئەگەر بوونەوەر هەربوو بوایە، دەبوو زۆر لەمێژبا ئاڵوگۆڕی گەرمیی لەنێوان تەنە گەرم و ساردەکاندا کۆتایی پێ هاتبایەو، بوونەوەر دوچاری ئەو مردنە گەرمیی (الموت الحراري)یە بووبایە، کە چاوەڕێی دەکات.

---

(١) بەڵگە لەوبارەوە زۆرن، بەڵام مستێک نموونەی تەغارێکەو، ئێرەش جێی تەرخانکراوی شیکردنەوەی ئەو باسە نیە.

جا ئێستا بابزانین بێبڕوایان دوای ئه‌وه‌ی ده‌ستیان له‌ هه‌موو پچكان بڕاو، هه‌ر چڵه‌پووشێكی ده‌ستیان بۆبرد، به‌ تیشكی خۆری عه‌قڵ و زانیاری سووتا، چ ده‌ڵێن و هه‌ڵوێستیان چۆن ده‌بێ!

پێشینان گوتوویانه‌: (ئه‌گه‌ر دز دز بێ، تاریكه‌شه‌و زۆرن!)

له‌ هه‌موانیش ڕوونه‌ كه‌ كه‌سێك له‌ڕاسته‌ڕێیاندا سه‌رڕاست و كارامه‌ بێ، حه‌وجێی ڕێچكه‌و خواره‌ڕێیان نابێ، به‌ڵام بێبڕوایانیش چونكه‌ له‌ به‌ڵگه‌هێنانه‌وه‌ی ژیرانه‌و زانیارییانه‌دا ده‌ستیان كورته‌، ناچار خۆیان به‌ قۆرت و قولاب و فیسق و گه‌وانه‌وه‌ سه‌رگه‌رم كردوه‌، له‌و مه‌یدانه‌دا هه‌تا بڵێی دزێكی كارامه‌و لێزان و، ته‌شی ڕێسێكی ده‌ست ڕه‌نگینن و، هیچ كه‌س تۆزی ڕێگه‌شیان ناشكێنێ!

ئه‌وه‌تا لێره‌دا كه‌ هه‌گبه‌ی پڕ ئه‌فسانه‌یان به‌تاڵ بووه‌، ڕووت و ڕه‌جاڵ كه‌وتوونه‌ گۆڕێ، وه‌نه‌بێ له‌ چاره‌نووسی سێ چڵه‌پووشی پێشوو په‌ند وه‌ربگرن، به‌ڵكو جارێكی دیكه‌ش به‌هیوای ڕزگاربوون، به‌ته‌مای چڵه‌پووشێكی دیكه‌ تێكه‌وتوون و ده‌ڵێن:

باشه‌ ئێمه‌ش هاتووینه‌ سه‌ر ئه‌و باوه‌ڕه‌ كه‌ یاسای هۆكاریی ڕاستییه‌كی به‌ڵگه‌نه‌ویسته‌و نكوولیی لێناكرێ و، ده‌شی سه‌لمێنین كه‌ بیردۆزه‌ی هه‌ربوێتی مادده‌-به‌ته‌نێ- ناتوانێ چۆنیه‌تی دروستبوونی بوونه‌وه‌ر ته‌فسیر بكات و بڕواشمان وایه‌ كه‌ بوونه‌وه‌ر هه‌ربوو نیه‌، به‌ڵام ئایا لێره‌دا بێجگه‌ له‌ بڕوا به‌خوا هیچ چاره‌ی دیكه‌مان نین، كه‌ بگونجێ چۆنیه‌تی په‌یدابوونی بوونه‌وه‌ریان پێ ته‌فسیر بكه‌ین؟!

ئایا ناتوانین بڵێین: ئه‌سڵی مادده‌ی بوونه‌وه‌ر هه‌ربوویه‌و، هه‌ر ئه‌و مادده‌یه‌ش بۆخۆی گۆڕانی به‌سه‌ر خۆیدا هێناوه‌، خۆی له‌ بوونه‌وه‌رێكی ڕێك وپێك و یاساداردا ڕێكخستوه‌، ئه‌وه‌ش هه‌مووی به‌هۆی ئه‌و جوولان و جموجووڵ و چالاكییه‌یه‌وه‌ كه‌ تێیدایه‌؟!!!

لە وەڵامدا دەڵێین:

نەخێر لەئاقار بەڵگەی هۆکارییدا، بێجگە لە بڕوا بەخوا هێنان، هیچ چارەو دەرەتانی دیکەتان نین و، ئەو چارەیەش کە ئێوە بە (چارە)ی تێگەیشتوون بەبڕوای ئێمە (چاڵ)ەو تێی کەوتوون، بەڵام وادیارە ئێوەش وەک ئەو نەزانەی (شیعە)و (شیوعی) لێ تێکەڵ بووبوون، ئاوێنەی زەینتان هێندەی ژەنگ و ژاری بیری چەوت و پووچیی بێبڕوایی لێنیشتوە، ناتوانێ (چار) و (چاڵ) لێک جودا بکاتەوە و وەک ئەو کابرا ڕێ لێ ونبووەتان لێهاتوە، کە لە تینووان چاوی ڕێشکەو پێشکەی دەکردو تراویلکە (سراب)ی بەئاو حسێب دەکردو پەلەکوتەی بۆ لا دەکرد!

ئێستاش با بۆ دوایین جار، تیشکی بەتین و سووتێنەری زانیاریی و عەقڵ، ئاڕاستەی چوارەمین (چڵەپووش)ی دەستی بێبڕوایان بکەین لە دوو خاڵاندا: [1]

**یەکەم: سەلماندنی هەربوو (أزلي) نەبوونی ماددە**

وەک پێشتر گوتمان بۆ پووچاندنەوەی هەربوویێتی ماددە، جێیەکی دیکەی تەرخان کراو پێویستە[2]، بەڵام لێرەشدا بەڵگەیەک دەخەینە ڕوو بۆ ئیسپات کردنی پەیدابوونی ماددە:

تێکڕای زانایانی ماددەناس دەڵێن: جووڵان (الحركة) شتێکی زاتیی ماددەیەو هیچ کاتێک ماددە بەبێ جووڵان نابێ، ئنجابێگومان یەکەمین خشتی پێکهێنەری ماددەو سادەترین شێوەی بوونی، گەردیلە (ذرّة)یە، گەردیلەش لە سێ بەشی سەرەکیی پێکدێ:

---

(١) لەخاڵی یەکەمدا دەیسەلمێنین کە ماددە (هەربوو) نیە، لەخاڵی دووەمیشدا دەیسەلمێنین کە ماددە قەت ناتوانێ بۆخۆی گۆڕان بەسەر خۆیدا بێنێ.

(٢) لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووشەڵیی ئیلحاد)دا بەدرێژیی لەوبارەوە دواوین.

١- پرۆتۆن (Proton) کە تەنۆڵکەیەکی یەکجار وردەو تەنانەت بە وردبین (المجهر)یش نابینرێو، بارگەیەکی کارەبایی موجیب (Positi(رضي الله عنهم) e) هەڵدەگرێو نێوکی گەردیلە پێک دێنێ.

٢- ئەلیکترۆن (Electron) تەنۆڵکەیەکی زۆر زۆر وردەو دەوری دوو هەزارجار لە پرۆتۆن گچکەترەو بارگەیەکی کارەباری سالیب (Negati(رضي الله عنهم) e) هەڵدەگرێو ژمارەی ئەلیکترۆنەکانی هەر گەردیلەیەکیش هێندەی ژمارەی پرۆتۆنەکانیەتی، ئەوەش دەبێتە هۆی هاوسەنگیی کارەبایی گەردیلەکان لە حاڵەتی ئاسایی و سروشتیدا و ئەلیکترۆنەکان بەدەروی نێوکی گەردیلەدا دەسووڕێنەوە، هەروەک چۆن مانگ بە دەوری زەویداو، زەوی بە دەوری ڕۆژدا دەسووڕێنەوە.

٣- نیۆترۆن (Ne (عليه السلام) tron) تەنۆلکەیەکە بارتەقای پرۆتۆنەو، لەگەڵ پرۆتۆن لە نێوکی گەردیلەدایە و، هیچ بارگەیەکی کارەبایی لەسەر نیەو هاوبارگەیە و نیۆترۆن لە نێوکی هەموو گەردیلەکاندا هەیە، بێجگە لە نێوکی گەردیلەکانی توخمی هایدرۆجین[١].

کەواتە: گەردیلە (Atom) لە دوو بەشی سەرەکیی پێک دێ؛ یەکەم نێوک (النواة) کە لە پرۆتۆن و نیۆترۆن پێک دێ، دووەم: ئەلیکترۆن، ئنجا تیرەی گەردیلە هێندەی بەشێک لە دە ملیۆن بەش (١/١٠,٠٠٠,٠٠٠) ی (ملم)ێکە[٢]،و نێوکی گەردیلە (٩٩,٩٪) واتە (٩٩٩/١٠٠٠)ی بارستایی (کتلة)ی گەردیلە پێک دێنێ، هەرچەندە تیرەی گەردیلە (١٠٠,٠٠٠) جار هێندەی تیرەی نێوکەکەیەتی!![٣]

کەواتە؛ لەوەوە دەزانین کە زۆربەی گەردیلە -نیزیکەی ٩٩٩/١٠٠٠ی- بریتیە لە بۆشایی (فراغ)، بەڵام ئەدی ئەو هەموو ڕەقیی و پتەوییەی

---

(١) (مبادئ الكونيات)، ل١٨، الأمين محمد أحمد كعورة، ض٣.

(٢) الذرّة والكون، پيار روسوّ، ترجمة عصام ميّاس-١٩٧٩، ل٣١.

(٣) (أساسيات الفيزياء) ف.بوش، ل٨١٤/ مبادئ الكونيات ل٢٠.

گەردیلە لەچییەوە پەیدا دەبێ؟!

هۆی ئەو ڕەقیی و پتەوییەی گەردیلە، ئەوەیە کە ئەو تەنۆلکانەی بەدەوری نێوکدا دەسووڕێنەوە لە ئەلیکترۆن و غەیری ئەلیکترۆن، بەخێرایی هەزاران کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا دەسووڕێنەوەو، ئەو سووڕانەوەیەی وا خێرا، بۆتە هۆی پەیدابوونی ڕەقیی و پتەویی گەردیلە، ئەگەر دەتەوێ بزانی چۆن سووڕانەوەی خێرا دەبێتە هۆی دروست بوونی ڕەقیی و پتەویی، سەرنجی پەروانە (مروحة) یەک بدە، دەبینی هەتا ڕاددەی خێرایی خولانەوەی زیاتر بێ، کەلێن و بۆشایی نێوان پەڕەکانی کەمتر دەبێتەوە، هەتا وای لێدێ بۆشایی نێوان پەڕەکانی هەر نامێنێ،[1] بگرە ئەگەر زۆر بە خێرایی بسووڕێتەوە خۆیشی نابینرێ!

کەواتە ئەگەر بێت و بۆشایی نێوان ئەلیکترۆن و نێوکی گەردیلەکان نەمێنێ دەزانی دنیا چی لێدێ! پرۆفیسۆر (جۆلیۆ) دەڵێت: ئەگەر بێت و هێندە پەستان (ضغط) بخەینە سەر جەستەی مرۆڤێک کە بۆشایی نێو گەردیلەکانی نەمێنێ، واتە ئەلیکترۆن و نێوکەکانیان پێکەوە بچەسپێن، جەستەی ئەو مرۆڤە، هێندەی گەردێکی گچکەی لێ دەمێنێتەوە، کە بە زەڕەبین نەبێ نابینرێ، بەڵام کێشەکەی ئەگەر (٧٠) کیلۆ بووبێ، یەک گرامی لێ کەم نابێتەوە[2].

ئێستا لەبەر تیشکی ئەو زانیارییانەدا کە دەربارەی گەردیلە[3] گوتران،

---

(١) مبادئ الكونيات ل٢٠.

(٢) الذرّة والكون، پيار روسوّ، ترجمة عصام ميّاس-١٩٧٩ ل٣٢.

(٣) بۆ تێگەیشتنی تەواو لە حاڵ و باڵی گەردیلە کتێبێکی چەند سەد لاپەڕەیی پێویستە، چونکە هەتا زانیاری بەرەوپێشەوەتر بچێ، نهێنییەکانی ئەو جیهانە وردو سەرسووڕهێنەرە نەبینراوە زیاتر ئاشکرا دەبن، ئەوەتا زانایان بێجگە لە سێ تەنۆلکە سەرەکییەکان، هەتا ئێستا زیاتر لە (٢٠٠) تەنۆلکەی دیکەیان لە گەردیلەدا دۆزیوەتەوە وەک زیترۆن، میزۆن، بیۆن، هیبرۆن، چاوەڕوانی کۆمەڵێکی دیکەشن. بڕوانە کتێبی (أسرار عالم الجسيمات الدقيقة) ف.تشيرنوجوروفت، ترجمة: د.ابراهيم محمود شوشة، ل٦٥، دار مير للطباعة والنشر- موسكو، و (أساسيات الفيزياء)، ل٨٤٥، و (مبادئ الكونيات)، ل١٩.

پتەوترین بەڵگەی زانیارییانە لەسەر پەیدابوونی مادده دادەڕێژین:

وەک دیتمان جووڵان خەسڵەتێکی پێکهێنەرو بنچینەیی یەکەمین خشتی ماددەیە کە گەردیلەیە، نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو زانایان دەڵێن: مادده بەبێ جووڵان هەر ناگونجێ هەبێ دەڵێن: بەبێ جووڵان کات و شوێن (الزمان والمكان) بوونیان مەحاڵەو، هۆی مانەوەی مادده جووڵان (الحركة)ە.

بەڵام ئایا چۆنیەتی ئەو جووڵانە کە لە ماددەدا هەیە چیەو چۆنە؟!

زانایان دەڵێن: هەروەک چۆن شێوەی سروشتی مادده، چ تەن (جسم)ێکی گەورە بێ، وەک ئەستێرەو کەهکەشانەکان و، چ تەنۆلکە (جُسَيم)ێکی گچکە بێ، وەک گەرد (جُزيء)و گەردیلەکان، مەیلەو خڕە، جووڵانی ماددەش چ لەبواری تەنە زلەکانداو، چ لەبواری تەنۆلکەکاندا، شێوەیەکی بازنەیی هەیەو، لە خولگە(مدار)ێکی هێلکەییدا بەڕێوە دەچێ[1].

جا ئێمە بە پشتیوانیی خوا ئێستا دەمانەوێت بیسەلمێنین کە جووڵانی مادده سەرەتاو دەستپێکردنێکی هەیەو، هەربوو (أزلي)و بێسەرەتا نیە، هەڵبەتە هەر کاتێک سەلمێنراش کە جووڵانی مادده سەرەتاو دەستپێکردنی هەیە، مانای وایە لەهەمان کاتدا ئەوەش سەلمێنراوە کە (مادده)ش هەربوو نیەو، سەرەتاو دەستپێکردنێکی هەیە، ئنجا کە سەلمێنراش مادده هەربوو نیەو، کاتێک بووە کە نەبووە، بە ناچاریی بە حوکمی یاسای هۆکاریی، دەبێ دان بە بەدیهێنەرەکەیدا بنێین.

مەسەلەی هەبوونی سەرەتاو دەستپێکردنێک بۆ جووڵانی مادده، شتێکە عەقڵ بە سێنایی هەستی پێدەکات و، هیچ کەسێک ناتوانێ جووڵان بەبیری خۆیدا بێنێ بەبێ بەبیردا هێنانی سەرەتایەک کە لەوێوە دەستی پێ کردوە، بەڵام ئێمە بۆ ئەوەی یان هیچ جۆرە بروبەهانەیان بەدەستەوە نەمێنن، ئەم بەڵگە بەهێزە دێنینەوە بۆ ئیسپات کردنی بوونی سەرەتاو دەستپێکردنی

(١) (مبادئ الكونيات)، ل٢١.

جووڵانی مادده:

هەرچەندە هەموو توخمەکان لەو جووڵانەدا کە گوتمان هاوددەمی ماددەو مەرجی بوونیەتی و لێی جوێ نابێتەوە، یەکسانن و تەنانەت ئەگەر لەپێش دروستبوونی توخمەکان[1] (العناصر)یشدا جۆرە ماددەیەکی دیکە هەبووبێ، ئەو حوکمەی کە توخمەکان دەگرێتەوە ئەویش دەگرێتەوە؛[2] چونکە ماددە بەهەر شێوەیەک بێ جووڵانی هەر تێدایە، بەڵام ئێمە لەبەر ئەوەی کە توخمی هایدرۆجین یەکەمین توخم و سادەترین توخمەو بەڕای زانایان لەپێش هەموو توخمەکانی دیکەدا دروست بووەو، (٩٠٪)ی ماددەی بوونەوەر پێک دێنێ، یەک گەردیلەی ئەو توخمە دەکەینە جێی سەرنج و تێوەڕامان، هەڵبەتە لەبەر ئەو هۆیانەی کە باسمان کردن، چ حوکمێک لە ئەنجامی ئەو سەرنج و تێوەڕامانەدا دەستگیر بێ، بەسەر هەموو ماددەی بوونەوەردا دەچەسپێ، ئێستاش بەیارمەتی خوا دەست بە تێوەڕامانمان دەکەین:

گەردیلەی هایدرۆجین وەک گوتمان سادەترین شێوەی ماددەیە، چونکە

---

(١) هەتا ئێستا پتر لە (١٠٣) توخم دۆزراونەوە، هەڵبەتە جیاوازی توخمەکان دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ژمارەی ئەلیکترۆن و پرۆتۆنەکانی ئەو گەردیلانەی کە ئەو توخمانە پێک دێنن، هایدرۆجین ((صلی الله علیه وسلم)) توخمی ژمارە یەکەو سادەترین توخمە چونکە گەردیلەکانی خاوەنی یەک پرۆتۆن و یەک ئەلیکترۆنن.. شناخت عناصر ل٦.
بەڵام ئێستا ژمارەی تۆخمەکان (عناصر) بەهەموو جۆرەکانییەوە بوونەتە: سەدو نۆ (١٠٩).

(٢) ف.بوش مامۆستای فیزیا لە زانکۆی دایتۆن، دەربارەی قۆناغی پێش دروستبوونی توخمەکان دەڵێ: (جا لێرەدا دەتوانین ماددەی بوونەوەر وەک بڵێسە ئاگرێکی ئەوپەڕی گەرم بێنینە بەرچاوو دەتوانین بڵێین بوونەوەر لەسەرەتای دروستبوونیدا وەک مەنجەڵێکی پڕ لە بارگەو وزە وابووە و، ئەگەر گریمان لەو کاتەدا تەنۆلکەکانیش هەبووبن، ئەوە خاوەنی وزەیەکی یەکجار بەرز بووون) ئنجا دەڵێت: (...ئەنجامی کۆتایی دوای بەرەو ساردبوونەوەچوونی (بڵێسە)کە، ئەوەیە کە گازێک دروست بوو کە بە شێوەیەکی بنچینەیی پرۆتۆن و نیۆترۆن و ئەلیکترۆن و تەنۆلکە خاوەن وزە بەرزەکانی دیکەی تێدا بوون و هەتا ئەو کاتەش پلەی گەرمیی ماددە هێندە بەرز بوو کە ڕێگەی دروستبوونی گەردیلەکانی هایدرۆجین نەدات.) (أساسیات الفیزیاء)، ف.بوش، ل٨٥٥-٨٥٦.

لە نێوک (پرۆتۆن)ێک و (ئەلیکترۆن)ێک پێکدێ.

جا بێگومان لەوەتی گەردیلەی هایدرۆجین هەیە، واتە لەوەتی پرۆتۆن و ئەلیکترۆنی پێکهێنەری گەردیلەی هایدرۆجین هەن، هەمیشە ئەلیکترۆن بە دەوری (پرۆتۆن)دا خەریکی سووڕانەوەو هاتن و چوونەو، یەک تاویش سرەوتی نەبووەو نیە، هەڵبەتە ئەگەر بێت و ڕووی پرسیار بکەینە ئەو (ئەلیکترۆنە)و بڵێین: لە کەنگێوە دەستت بە سووڕانەوە کردوە بە دەوری (پرۆتۆن)دا؟! پێمان دەڵێت: من لەوەتی هەم ئەمە کارو پیشەمە، هێندەش هەڵسووڕاوم نازانم لەکەیەوە دەستم بە سووڕانەوە کردوە، یان ڕاستتر بڵێم: دەستم پێ بە سووڕانەوە کراوە!

ئنجا ئەگەر شێوازی پرسیارکردنەکەمان بگۆڕین و، ئەمجارە بڵێین: باشە ئەدی نازانی لەکوێوە دەستت بە سووڕانەوە کردوە؟!

ڕەنگە ئەمجار بڵێ: ئنجا جیاوازیی (کەی) و (کوێ) چییە؟! نەخێر من ئاگاداری ئەو شتانە نیم، بەڵام ئەگەر دەتانەوێ لە سەرگوزشتەی تەمەنی من شارەزا بن، با یەک ڕاستیی هەرەگرنگتان پێڕابگەیەنم:

زۆر چاک بزانن کە ئەوکات و شوێنەی من دەستم تێدا بە جووڵان و سووڕانەوە کردوون، بریتین لە کات و شوێنی لەدایکبوون و هاتنەدی و چاو بەدنیا هەڵێنانی من، کەواتە سێ شت هەن پەیوەندییەکی یەکجار پتەویان پێکەوە هەیە، بەشێوەیەک کە دۆزینەوەی هەرکامێکیان دەبێتە هۆی دۆزینەوەی هاوەڵەکانیشی، ئەو سێ شتانەش ئەمانەن:

**یەکەم:** (کات)ی دەست بە سووڕانەوە کردنم.

**دووەم:** (شوێن)ی دەست بە سووڕانەوە کردنم.

**سێیەم:** (چۆنیەتی) بوونم.

جا ئێستا بەپێی ئەم ڕێڕوونییەی سەرێ، با هەوڵی دۆزینەوەی سەرەداوی

یەکێک لەم سێ شتانە بدەین، بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوەوە دووانەکەی دیکەش بدۆزینەوە:

مادام ئەلیکترۆنی هایدرۆجین کە بەدەوری پرۆتۆنەکەیدا دەسووڕێتەوە خولگەیەکی دیاریکراوی هەبێ، حەتمەن دەبێ لە بەشێک لە بەشەکانی ئەو خولگەیەدا دەستی بە سووڕانەوە کردبێ، ئنجا با بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست، سەرنجی ئەم وێنەیە بدەین کە وێنەی گەردیلەیەکی هایدرۆجینییە:




ئایا دەگونجێ بڵێین: ئەم ئەلیکترۆنە لە هیچ کام لەو دە (١٠) بەشەی ئەو بازنەیەی کە بە دەوری پرۆتۆنەکەیدا هاتووە، دەستی بەجووڵان نەکردووە؟!!

بێگومان مادام بڕوامان وابێ کە ماددە بێ جووڵان نابێ و، بڕوامان وابێ کە لەوەتی ئەم گەردیلە هایدرۆجینییە هەیە، ئەلیکترۆنەکەی بە دەوری پرۆتۆنەکەیدا دەسووڕێتەوە، چارمان ناچارە دەبێ لە بابەت شوێنی تێدا دەستپێکردنی جووڵان و سووڕانەوەی ئەلیکترۆنەکەوە، یەکێک لەم دوو ڕێیانە هەڵبژێرین: یان دەبێ بڵێین ئەلیکترۆن یەکسەر لە هەموو بازنەکاندا دەستی بە جووڵان کردووە، یان دەبێ یەکێک لەو بازنانە دیاریی بکەین و بڵێین لە بازنەی ژمارە فڵاندا دەستی بەسووڕانەوە کردووە.

بێگومان یەکەمیان مەحاڵ و نەگونجاوە، لەگەڵ بنچینەی بەڵگەنەویستی: (نەبوونی شتێکی دیاریکراو لەیەک کاتدا، لە چەند جێیەکی جوێجوێدا)دا تێک دەگیرێن و دەستەو یەخەی یەکدی دەبن.

بەڵێ شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە مەحاڵە شتێکی دیاریکراو لە یەک کاتدا لە چەند شوێنێکی جیاجیادا بێ، ئنجائێمە ئەگەر بڵێین ئەلیکترۆنەکە

لە یەک کاتدا لە هەموو بازنەکاندا سووڕاوەتەوە، مانای وایە گوتوومانە: هەر لەوکاتەدا کە لە بەشە بازنەی (١)دا بووە، لە بازنەی (٢) و (٣) و (٤) و (٥) و....هتدیشدا بووە! جا پێم وایە مەحاڵیی ئەم ڕێیە هێندە زەق و بەرچاوە، زۆر حەوجێی بە پێوەچوونێ ناکات، کەواتە ناچارین کە ڕێی دووەم هەڵبژێرین و بڵێین: ئەلیکترۆنی ناوبراو لە یەکێک لەو دە بازنانەدا، سەرەتای سووڕانەوەی خۆی دەست پێکردوە.

ئنجا لێرەدا دەگەینە سەر ئەسڵی مەبەست، چونکە هەر بەشێک لەو دە بەشانە هەڵبژێرین و بیکەینە شوێنی تێدا دەستپێکردنی جووڵان و سووڕانەوەی ئەلیکترۆنی گۆڕین، مانای وایە لەو دەمەدا کە لەو بازنەیەدا دەستی بە سووڕانەوە کردوە، لە بازنەکانی دیکەدا نەبووە، بە واتایەکی دی: ئەگەر یەکێک لە بازنەکان دیاریی بکەین بۆ سەرەتای دەستپێکردنی جووڵانی ئەلیکترۆنی ناوبراو- وەک گوتیشمان ناچارین دەبێ یەکێک لە بەشەکانی بازنەکەی هەر بۆ دیاری بکەین- مانای وایە دانمان پێدا هێناوە کە بەر لەوەی لەو بەشە بازنەیەدا دەست بە سووڕانەوە بکات، لە بەشەکانی دیکەدا نەسووڕاوەتەوە، چونکە کە گوتمان بەشی ژمارە (١)ی بازنەکە شوێنی تێدا دەست بە سووڕانەوەکردنی ئەلیکترۆنی گۆڕین بووە، مانای وایە دانمان پێدا هێناوە کە بەرلەوەی لە بازنەی ژمارە (١) دا دەست بە سووڕانەوە بکات، نە لە بازنە (٢) نە لە ژمارە (٣) نە لە ژمارە (٤) نە لە ژمارە (٥)...هتد دا جووڵان و سووڕانەوەی نەبووە؛ چونکە کە گوتم ئەم هاوینە گەشتێکم بە کوردستاندا کرد (١٠٠) گوندم دی، بەڵام لەپێش هەمووانذا دێی (هەڵشۆ)[1]یەم دی، مانای وایە بەرلەوەی بچمە دێی ناوبراو و بیبینم، هیچ کام لەم (٩٩) دێیەی دیکەم نەدیوە.

ئنجا کە گوتراش: ئەلیکترۆنەکە بەر لەوەی لە بەشی ژمارە (١)

---

(١) (هەڵشۆ) دێیەکی گەورەی کوردستانی عێراقە سەر بە قەزای پشدەری پارێزگای سلێمانی یە، ڕژێمی بەعسی عێراقی وەکو سەدان دێی دیکە وێرانی کرد، بەڵام دوای ڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١) ئاوەدان کرایەوە.

دا دەست بـە سـووڕانەوە بـکات، لـە هیـچ کام لـە نـۆ بەشـەکەی دیکـەدا نەسـووڕاوەتەوە، ئـەوە دەگەینـە ئەنجامێکـی یەکجـار گرنـگ، ئـەو ئەنجامـەی کـە ئامانجـی نووسـرانی ئـەم باسـەیە، ئـەو ئەنجامـەش ئەمەیـە:

لـەو شـوێنەدا کـە ئەلیکترۆنـی گەردیلـەی هایدرۆجیـن دەستی بـە جـووڵان و سـووڕانەوە کـردوە، هـەر لـەو شـوێنەدا ئـەو ئەلیکترۆنـەو پرۆتۆنەکەشـی هاتوونـە دی، بـە واتایەکـی دی: هـەر لـەو شـوێنەدا گەردیلـەی (هایدرۆجیـن)[1] هاتۆتـە دی، ئنجـا وەک گوتمـان کات و شـوێنیش قـەت لێـک جیانابنـەوە، کەواتـە هـەر لـەو کاتەشدا کـە ئەلکترۆنـی گەردیلـەی هایدرۆجیـن دەستی بـە جووڵان کـردوە، گەردیلـەی ناوبـراو سـەرەتای تەمەنـی خـۆی دەستپێکردوە، ئنجا بێگومـان (مـاددە)ش - هایدرۆجیـن یـان هـەر توخمێکـی دیکـەو هـەر شێوەیەکی دیکـەی مـاددە - قـەت لەژێـر سێبەری کات و شـوێن (الزمـان والمکان) ناچێتـە دەرێ، بـە واتایەکـی دی؛ بوونـی مـاددە هەمیشـە لـە جوغـزی کات و شـوێندا خـۆی دەبینێتـەوەو، ئەگـەر بـە قووڵیـی ورد بینـەوە دەزانیـن کـە لـە ڕاسـتیدا کات و شـوێن وەکـو سێبەری مـاددە وان و، بەبێ مـاددە بوونیـان مەحاڵـەو، مـاددەش هـەر هەبێ، ئـەم دووانـە (کات و شـوێن)ی لێـوە ئەنجـام دێـن.

کەواتـە مـادام سـەلمێنرا گەردیلـەی هایدرۆجین-کـە بـە نموونـە بـۆ هەمـوو گەردیلەکانـی مـاددە هێناومانەتـەوە - ئەلیکترۆنەکـەی لـە کات و جێیەکـی دیاریکراودا دەستی بە سووڕانەوە کردوە و، گوتیشمان ماددە قەت بێ جووڵان نابێ، مانـای وایـە سەلمێنراویشـە کـە کاتێـک[2] بـووە، مـاددە بوونـی نەبـووە، بـە واتایەکـی دی مـادام سـەرەتای پەیدابـوون و دەستپێکردنی جووڵان (الحرکة) مـان لـە مـاددەدا سـەلماند، مانـای وایـە سـەرەتای پەیدابـوون و دروسـتبوونی

---

(١) چونکە پرۆتۆن بەبێ ئەلیکترۆن نابێ و هایدرۆجینیش لە هەردووکیان دروست دەبێ.

(٢) مەبەست لـە وشـەی (کات) لێرەدا کاتـی ڕووت و ڕەهایـە (الزمـن المجـرّد والمطلـق) نـەک ئەوکاتـەی کـە لـە ئەنجامـی جووڵانـی مـاددەوە پەیـدا دەبێ.

خودی (مادده)شمان ئیسپات کردوە، چونکە مادام ماددەو جووڵان لێک جیا نەبنەوەو، شتاقیان بێ شتاقیان نەبن و، هەرکامێکیان مەرجی بوونی ئەوی دیکە بێ، مانای وایە ئیسپاتکردنی بوون یان نەبوونی هەر کامێکیان، ئیسپات بوون و نەبوونی هاوەڵەکەشیەتی، کەواتە ئێمە لێرەدا پەیدابوویێتی (حدوث)ی ماددەمان سەلماند، لەڕێی سەلماندنی پەیدابوویێتی جووڵانەوە[1].

جا ئێستا بابزانین بێبڕوایان لە ئاقار ئەم بەڵگە بەهێزەدا، کە بۆ سەلماندنی پەیدابوونی ماددەو پووچاندنەوەی بیردۆزەی هەربوویێتی مادده خستمانە ڕوو، هەڵوێستیان چ دەبێ!!

بێبڕوایان لێرەدا ناچارن دەبێ یەک لەم دوو ڕێیانە هەڵبژێرن:

**١)** لە کەرێ شەیتانی بێنە خوارێ و واز لە بیری بێبڕوایی بێنن و، بگەڕێنەوە بەر بارەگای خواو، سەری بەندایەتیی بۆ دابنەوێنن و، ئامێز لە بەرنامەکەی وەربێنن، هەڵبەتە هەر ئەمەشە ئەنجامی سروشتیی و حەتمیی ئەو باسانەی کە ڕابردن و هەر ئەمەش لە کەسێک چاوەڕوان دەکرێ کە گەردنی بۆ حوکمی عەقڵ و زانیاری کەچەو ڕێزیان دەگرێ.

**٢)** وەک پێشوو لەسەر بیری پووچیان چێرەگرتوو[2] بن و، گوێ نەدەنە عەقڵ و زانیاریی و، وەک جاران دەست بکەنەوە بە دەستدرێژکردن بۆ چڵەپووشی گومان و بڕوبەهانەو قسەی بێبنچینەی لاواز، تاقە چڵەپووشێکیش کە دەست بدات بێبڕوایانی کەللە وشک و نەسەلمێن، پەنای بۆ بەرن ئەوەیە کە بڵێن:

ئێمە ئەوە ناسەلمێنین کە (مادده) هەر لەدەمی دروستبوونیەوە جووڵان و بزووتنی تێدابووە، بەڵکو دەڵێین: لەپێشدا مادده لە حاڵەتێکی (وەستاو) دا بووەو لەدواییدا جووڵان و سووڕانەوەی تێدا پەیدا بووە، ئنجامادام جووڵان

---

(١) سوپاس بۆ خوای بەخشندە لە ساڵی (١٩٧٩)وە لە ئەنجامی بیرکردنەوەدا گەیشتوومە پەی بردن بەم بەڵگەیە (هذا من فضل ربّي).

(٢) چێرەگرتوو: مکوڕ، سوور.

(الحركة) لە سەرەتای بوونی ماددەوە نەبووبێ و، دوایی تێیدا پەیدابووبێ، سەلماندنی پەیدابوونی جووڵان و هەربوو نەبوونیی، بەهیچ شێوەیەک نابێتە هۆی سەلماندنی (هەربوو) نەبوونی ماددەو دروستبوونی!!

لە وەڵامی ئەو قسە بێ بنچینەیەشدا دەڵێین:

هەرچەندە ئەم قسەیە - کە دەڵێت جووڵان شتێکی زاتیی ماددە نیەو، دوایی تێیدا پەیدا بووە - هەتا ئێستا هیچ کەسێک[١] لە ڕابەرانی بێبڕوایی نەیکردوە، سەرەڕای ئەوەش زانیارییش وەدرۆی دەخاتەوەو دانووی لەگەڵی ناکوڵن،[٢] بەڵام ئێمە هەر بەوەندە واز لەو قسەیە ناهێنین و لەخاڵی دووەمدا دەگەڕێینەوە سەری، بەڵام بەرلەوەی بچینە سەر خاڵی دووەم، تێبینییەک هەیە ناگونجێ لێی بێئاگا بین:

---

(١) بەڵێ لەراستیدا ئەو قسەیە ڕدێن سپی و رابەرانی بیری بێبڕوایی وەدرۆ دەخاتەوە، کەواتە ئەو قسەیە ئەگەر درۆ بێ ئەوە درۆیەو، ئەگەر گریمان ڕاستیش بێ، ئەوە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی رەگ و ریشەی بیری بێبڕوایی، چونکە قسەی ئەو پێشەواو ڕیش سپیانە وەدرۆ دەخاتەوە کە بناغەدارێژی بیری بێبڕواییین، بۆ وێنە: بە پێی ئەو قسەیە (ئەنگلز) لەو قسەیەیدا درۆ دەکات کە دەڵێت: (جووڵان شێوەی بوونی ماددەیە، جا لەبەرئەوە قەت ماددە بەبێ جووڵان نەبووە و ناگونجێ کە جووڵان پێش ماددە هەبووبێ... جا بۆیە ناگونجێ ماددە بەبێ جووڵان بەبیردا بهێنرێ، هەروەک چۆن ناگونجێ جووڵان بەبێ ماددە بەبیردا بهێنرێ). (ضد دوهرنج) إنجلز، ل٩٢، لە (أصول الفلسفة الماركسية)، ب١، ل٨٠، وەرگیراوە. دیسان بەپێی ئەو قسەیە دەبێ (لینین) درۆ بکات کە دەڵێت: (لە دنیادا بێجگە لە ماددەی جووڵاو هیچی دیکە نیە و، ماددەی جووڵاویش لەکات و شوێندا نەبێ ناتوانێ بجووڵێ) (عرض موجز للمادة الديالتيكية)، ل٤٤-٤٥.

دیسان دەبێ (ستالین)یش بەهەڵەدا چووبێ کە گوتوویەتی: ((مارکسیزم لەسەر ئەو پەیڕەوە دەڕوات کە دەڵێ: دنیا سروشتێکی ماددیی هەیە و، ڕووداوە جۆراوجۆرەکانی جیهان چەند دیاردەیەکی جیاجیان بۆ ماددەی جووڵاو))!! (المادية الديالكتيكية والمادية التأريخية)، ل١٧، ستالین، لە (فلسفتنا)، ل٢٠٧ وەرگیراوە.

(٢) بۆ وێنە سەیری (مبادئ الكونيات)، ل٢١، چ٣، ١٩٧٩ بکە، و سەیری (الطاقة الإنسانية) أحمد حسين چ٢، ل١١٦ بکە.

ئەو حوکمەی کە لە ئەنجامی توێژینەوەمانەوە دەربارەی گەردیلە بەگشتی و گەردیلەی هایدرۆجین بەتایبەتی وەدەست هات و، بەسەر هەموو توخمەکانی ماددەماندا دا، وەک پێشتریش گوتمان، ئەو حوکمە هەر جۆرو شێوەیەکی دیکەش لە بوونی ماددە دەگرێتەوە کە لەپێش دروستبوونی توخمەکاندا هەبووبێ، چونکە تۆ مادام دانت بەوەدا هێنا کە بوونی ماددە بەبێ جوولان مەحاڵە، ئەوکاتە ماددە کەیفی خۆیەتی لە چ شێوەیەکدا خۆی دەنوێنێ؛ لە شێوەی (چەند تەنۆلکەیەکی ئەلیکترۆنی و پۆزیترۆنی و نیۆترۆنی و فۆتۆنی.... کەم تەمەن)[1]دا خۆی دەنوێنێ؛ یان لە شێوەی (بڵێسە (شهاب)ێکی یەکجار گەرمی وادا کە وەک مەنجەڵێکی پڕ لە وزەو بارگە بووە)[2]، یان لە شێوەی (گازێکی ئەوپەڕی گەرمی پێکهاتوو لە چەند تەنۆلکەو فۆتۆنێکی خاوەن وزەیەکی یەکجار بەرز)[3]دا، یان لە هەر شێوەیەکی دیکەدا، ئەوە هیچ لەو حوکمە ناگۆڕێ کە ئێمە لەبەر تیشکی عەقڵ و زانیارییدا دەستگیرمان کرد؛ چونکە مادام ماددە ئەو جوولانەی تێدا بووبێ، وەک ڕوونمان کردەوەو سەلماندمان، حەتمەن ئەو جوولانە بێ سەرەتا نیە[4]و، سەرەتاو دەستپێکردنی هەر هەیە، ئنجامادام جوولانیش سەرەتای دەستپێکردنی هەبێ، ماددەش کە لە جوولان جیا نابێتەوەو بەبێ وی نابێ، پێویستە وەبەر ئەو حوکمە بکەوێ کە بەسەر جوولاندا دراو، دەبێ ئەویش - واتە ماددەش - سەرەتاو دەستپێکردنی هەبێو، هەربوو نەبێو پەیدابووبێ، ئنجا بە حوکمی یاسای هۆکاریی، هەرشتێک خاوەنی بوونێکی زاتیی نەبێ، واتە هەربوو نەبێو پەیدابووبێ، پێویستی بە بەدیهێنەرو پەیداکەر هەیەو، پەکی لەسەری کەوتوە، کەواتە ماددە بەخۆی و بەو جوولانەوە کە تێیدا هەیە، پەیداکراوو دروستکراوەو خوای بەدیهێنەری باڵادەستی زانا، بەحوکمی ویستی

(١) بڕوانە کتێبی (نظرتنا المعاصرة إلى الکون) د.طالب ناجي الخفاجي، ل٢٢،٢١ چ١ ١٩٨١.

(٢) بڕوانە (أساسیات الفیزیاء) ص٨٥٥.

(٣) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

(٤) لەڕاستیدا هەرکام لە جوولەی بێسەرەتاو زنجیرەی بێسەرەتا، دوو شتی مەحاڵن کە عەقڵی ساغ ڕەفزیان دەکات و لە وەهم و خەیاڵدا نەبێ بوون (وجود)یان نیە.

(إرادة)ی ئازادی و بەهۆی توانای بێسنووری و، بەپێی زانیاری تەواوی، دروستی کردوەو ڕێکی خستوەو، ئەم بوونەوەرە مەزن و سەرسوورهێنەرەی لێ هەڵخستوە.

**دووەم: مادده خۆی خۆی ناگۆڕێ!**

چوارەمین چڵەپووشی دەستی یان لەسەر دوو ڕەگی زۆر لاواز راوەستابوو، یەکیان هەربووێتی مادده، دووەم ئەوەیە کە مادده بۆ خۆی خۆی دەگۆڕێو گۆڕان بەسەر خۆیدا دێنێو بەهۆی ئەو جووڵانەوە کە هەیەتی، جا ئێمە سوپاس بۆخوا لەخاڵی یەکەمدا بەتیشکی عەقڵ و زانیاری ڕەگی یەکەممان سووتاند، جا هەرچەندە سووتێنرانی ڕەگی یەکەم، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بوو بە هۆی سووتێنرانی ڕەگی دووەمیش، چونکە ئێمە کە سەلماندمان جووڵانی مادده هەربوو نیەو پەیدابوویە، مانای وایە درۆیە کە (مادده بۆخۆی خۆی دەگۆڕێ)؛ چونکە بەهۆی جووڵانەوە خۆی دەگۆڕێ، جا مادام جووڵانیش شتێکی زاتیی[1] مادده نەبێو، دروستکراو بێ، مانای وایە قسەی گۆڕین هەڵوەشایەوە؛ چونکە کە گوتمان: ترۆمبێل بەهۆی تایەکانیەوە دەڕوات، بەڵام فلان ترۆمبێل تایەکانی پێوە نەماون، مانای وایە سیفەتی (ڕۆیشتن)مان لەو ترومبێلە ناوبراوە داڕنیوەو سیفەتی (ڕاوەستان) مان بەسەردا بڕیوە، ئەوە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە ئێمە لەخاڵی یەکەمدا زیاد لەوەی پەیدابووێتی جووڵانمان ئیسپات کرد، ئەوەشمان ئیسپات کرد کە خودی ماددەش دروستکراوو پەیدابوویە، جا بێگومان مادام خودی مادده دروستکراو بێ ناچارین بڵێین: هەرگۆڕانکارییەکیش کە بەسەریدا هاتوەو دێ، هەر دروستکراوە، هەرچەندە دەستی هیچ کەسێکیش نەبینین کە ئەو گۆڕانەی بەسەردا دێنێ، چونکە مادام دانمان بەوەدا هێنا کە مادده دروستکراو(مخلوق)ە، دەبێ دانیش بەوەدا بێنین کە هەموو خەسڵەت و

---

(١) واتە مادام مادده بۆخۆی جووڵانی لەخۆیدا نەهێنابێتە دی و، تێیدا هێنرابێتە دی و، نەجووڵابێو جووڵێنرابێو نەسووڕابێو سووڕێنرابێتەوە، کەواتە ئەم قسەیە لەگەڵ ئەوەی پێشتر گوتراوە کە ماددەو جووڵە لەیەک جیانین، تێک ناگیرێو بەدوو ئیعتیباری جیاواز، گوتراون.

تایبەتییەكانیشی هەر دروستكراون، ئاخر كە گوتمان خودی مادده دروستكراوە، دیارە خەسڵەتە پێكهێنەرەكانی ئەو (خود)ەش وەبەر ئەو حوكمە كەوتوون.

بەڵێ جا هەرچەندە لەخاڵی یەكەمدا -كە بۆ سووتاندنی ڕەگی یەكەم (هەربوویێتی مادده) تەرخانكرابوو- ڕەگی دووەمیش سووتێنرا، بەڵام هەر بەوەندە وازی لێ ناهێنین و، لەم خاڵەشدا بەڵگەیەكی زۆر بەهێز دێنینەوە لەسەر پووچ كردنەوەی ئەو قسەیەی[1] كە ڕەگی دووەمی چڵەپووشی چوارەمی لێدروست بووەو لەهەمان كاتدا دەشبێتە هۆی زیاتر ڕیسواكردن و وەدرۆ خستنەوەی بیردۆزەی هەربوویێتی مادده، كە یەكەمین ڕەگی چڵەپووشی چوارەمی دەستی یان بوو، كەواتە ئەو بەڵگەیەی ئێستا دەیخەینە ڕوو، وەك بەڵگەی پێشوو چەكێكی دووسەر (سلاح ذو حدّین)ەو بەردێكە دوو نیشانان دەپێكێ.

دەڵێین: ئەگەر ڕاستە جووڵان سیفەتێكی بنچینەیی و زاتیی ماددەیەو مادده بەهۆی ئەو جووڵانە زاتییەوە دەگۆڕێو پەرەدەستێنێو بەرەو تەواوبوون (تكامل) دەچێو، ماددەش هەربوویەو دروست نەبووە، چۆن وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەنەوە؟!

وەك لەدەمی پووچاندنەوەی بیردۆزی هەربوویێتی بوونەوەردا گوتمان: زانایان تێكڕا لەسەر ئەوەن كە پێش[2] یازدە (١١) تریلیۆن ساڵ بەر لە ئێستا ئەم بوونەوەرە نەبووە، جا باشە ئەگەر ڕاستە ماددەو ئەو هۆكار (وسیلة)ەی كە بەكاری دێنێ بۆ گۆڕان و پەرەستاندن و گەشەكردن كە جووڵانە، دروست نەكراون و هەرهەبوو ون، بۆچی پێكهاتنی بوونەوەرو سەرهەڵدانی هێندەی پێوەخراو وەدرەنگا كەوت؟!

بە واتایەكی دی؛ بۆچی ماددەی جووڵاو (المادە المتحركة) لەكاتێكی

(١) ئەو قسەیەی كە دەڵێت: مادده بۆ خۆی گۆڕان بەسەر خۆیدا دێنێ.

(٢) هەندێكیان بەس چوار تریلیۆن ساڵ و (٤,٥) نیویان داناوە، بەڵام ئێمە لای زۆرییمان هەڵبژارد.

بێ سەرەتاوەو بەدرێژایی تەمەنی هەربووی، وزەو تینی گۆڕانکاریی و بەرەوپێش چوون و پەرەستاندنی خۆی نەدەخستە کارو، وەگەڕ نەدەکەوت و، ڕادەوەستا هەتا (١٥) تریلیۆن ساڵ پێش ئێستا-کە لە ئاقار هەربووێتیدا چاوترووکانێکە- ئنجا بەکاوەخۆ خەریکی دروستکردنی بوونەوەر دەبووو؟!

هەڵبەتە ماددە (عەقڵ) و (ویست)یشی نیە تاکو بگوترێ: ئاخر ماددە وای بە چاک زانی، یان لەو دەمەدا ویستی وابوو و پێشتر نەیدەویست ئەو کارە بکات.

بۆ ڕوونکردنەوەی نێوەرۆکی ئەم پرسیارە پشت شکێنە بێ وەڵامە، وێنەیەک دێنینەوە:

ئێمە کە گوتمان تیشکدانەوە (الإشعاع) سیفەتێکی زاتیی خۆرە، مانای وایە لە هەر باروودۆخێکدا بوونی خۆر ئیسپات بێ، پێویستە سیفەتی تیشکدانەوەشی بێتە دی، واتە ئەگەر بڵێین پێنج ملیار ساڵ پێش ئێستا خۆر هەبووە، ناچارین هەبوونی تیشکدانەوەش ئیسپات بکەین، بەڵام ئێمە لەلایەکەوە بڵێین تیشکدانەوە سیفەتێکی زاتیی خۆرە، لەولاشەوە بڵێین نەخێر (٥) ملیار ساڵ پێش ئێستا تیشکی نەداوەتەوە، مانای وایە قسەی پێشوومان وەدرۆ خستۆتەوەو ڕاست نیە کە تیشکدانەوە سیفەتێکی زاتیی خۆر بێ، دەجا مەسەلەی هەربووبوونی ماددەو زاتیی بوونی جووڵان و گۆڕان و پەرەستاندنیش لە ماددەدا بەهەمان شێوە؛ مادام بڵێین ماددە هەربوویەو سیفەتی جووڵان و گۆڕان و پەرەستاندنیش لە ماددەدا هەربوویە، دەبێ ئیسپاتی بکەین کە ماددە لە ئەزەلەوە پەرێزی هەیەو شتی دروست کردوە[1]، بێگومان ئەمەش مەحاڵە، چونکە واقیعی ماددەو بوونەوەر بەپێچەوانەی ئەوەوەن و، مۆری تازەیی و دروستبوونیان لەسەرە.

(١) دیارە ئەم پرسیارە ناگونجێ ئاڕاستەی بیری خواناسیی بکرێ، چونکە خوا تبارک و تعالی خاوەنی هەموو ناووسیفەتێکی بەرزو تەواوە، کە یەکێکیان حیکمەت و یەکی دیکەیان ئیرادەی بێسنوورە.

ئنجا بێبڕوایان بەهیچ شتێک لەچەنگ ئەم پرسیارە بێ وەڵامە قوتار نابن، مەگەر بەوە کە بڵێن: ئاخر جووڵان کە دینەمۆی گۆڕان و پەرەستاندنە، لە ئەزەلەوە لە ماددەدا نەبووەو دوایی تێیدا پەیدا بووە!

بەڵام ئەم قسەیەش دادیان نادات، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە پێشتر گوتمان هەم زانیاریی و هەم بناغەڕێژانی بیری بێبڕوایی، لەوبارەوە ڕایان بەراوەژوویە، بەڵێ سەرەڕای ئەوە ئەم قسەیە لەگەڵ پرسیارێکی دیکەی بێوەڵامیشدا ڕووبەڕوو دەبێت، ئەویش ئەمەیە: مادام سیفەتیی جووڵان شتێکی زاتیی مادده نیەو لەدواییدا تێیدا پەیدا بووە، حەتمەن دەبێ لەسەرچاوەیەکی دیکە-ی جگە لەخۆیەوە- بۆی هاتبێ، چونکە کە گوترا: جووڵان هۆکارو دینەمۆی کارکردن و گۆڕان و گەشەکردنی ماددەیە، مانای وایە لەکاتێکدا کە مادده خاڵیی بووە لە جووڵان، بێبەشیش بووە لە هەموو جۆرە گۆڕان و پەرەستاندن و بەرەوپێش چوونێک، جا بێگومان پەیدابوونی (جووڵان)یش، نەک هەر گۆڕان و بەرەوپێشچوونە لەماددەدا، بەڵکو بنچینەو چاوگی گۆڕان و پەرەستاندنە، کەواتە چۆن دەتوانین بڵێین: لەکاتێکدا (مادده) بەهیچ جۆرێک ئامادەیی (إستعداد)ی گۆڕان و پەرەستاندن و بەرەوپێش چوونی تێدا نەبووە - بەهۆی نەبوونی جووڵانەوە-، توانیویەتی خۆی بگۆڕێو جووڵان لەخۆیدا بێنێتە دی؟!

ئایا ئەمە وەک ئەوە نیە بڵێی: بابایەکی کوێر، بۆخۆی چاوی بۆخۆی هێناوەتە دی، یان مرۆڤێکی شەپلەلێدراو (مشلول) بۆخۆی لەشێکی ماسولکەدارو توندوتۆڵ و پتەوی بۆخۆی پەیدا کردووەو پێی ڕادەکات؟!!

کەواتە:

لە ئەنجامی ئەم کورتە توێژینەوەیەدا بۆمان دەرکەوت و سەلمێنرا، کە

درۆیە مادده هەربوو نیەو، بۆخۆشی گۆڕان بەسەر خۆیدا ناهێنێ، هەرچەندە بەڕواڵەت واش بێتە بەرچاو، بەڵکو مادده پەیدابوو و دروستکراوەو، ئەو گۆڕان و پەرەستاندن و گەشەکردنەی تێشیدا دەبینرێ، بەرهەمی خودی مادده نیەو، بەهۆی هەبوونی ئەم جموجووڵ و جووڵانەوە دێتە دی، کە لە دەرەوەی ماددەوە بەسەریدا سەپێنراوە، بەڵگەش لەسەرئەوەی کە جووڵانی نێو مادده، شتێکی زاتیی خۆی نیەو، لەدەرەوە بەسەریدا سەپێنراوە، ئەوەیە کە جووڵان ناگونجێ سەرەتاو دەستپێکردنی نەبێ، بێگومان هەر شتێکیش سەرەتاو دەستپێکردنی هەبێ، دیارە دروستکراوو بەدیهێنراوە.

وەک پێشتریش گوتمان: ئێمە لێرەدا بەکورتی دەربارەی پووچاندنەوەی هەربوویێتی مادده دواوین، بەڵام لێرەدا دەمەوێ بەڵگەیەکی دیکە لەسەر پەیدابوونی جووڵان، کە دینەمۆی گۆڕان و پەرەستاندنی ماددەیە، بەکورتی بخەمە ڕوو:

ئێمە دەبینین ئەو جووڵانەی کە لە ماددەدا هەیە، بەپێی چەندان یاسای وردی زانیارییانە بەڕێوە دەچێ، جا بێگومان ئەو یاسایانە لە زانیارییەوە هەڵدەهێنجرێن، ماددەش بەس بارگەی ساردو گەرمەو ژیریی و زانیاریی نیە، کەواتە: سەرچاوەیەکی دیکە جگە لە مادده پێویستە هەبێ، بۆ تەفسیرکردنی چۆنیەتی پەیدابوونی ئەو جووڵانەی، کە بەپێی ئەو یاسا وردو زانیارییانەوە بەڕێوە دەچێ.

ئنجا مادام سەلمێنرا کە مادده هەربوو نیەو، بۆخۆشی خۆی پێ ناگۆڕرێ، کەواتە ئەم چلەپووشەی چوارەمیش وەک سێ هاوەڵەکەی پێشووی نەیتوانی (دروست بوونی بوونەوەر) لەدەست حوکمی حەتمی (بەڵگەی یاسای هۆکاریی) قوتار بکات و، بە حوکمی ئەو بەڵگەیە کە لەسەر پتەوترین بنچینەی بەڵگەنەویستی ژیریی -کە یاسای هۆکارییە- ڕۆنراوە، ناچارین بڵێین:

(ئەم گەردوونە یاسادارو پڕ وردەکارییە، بەدیهێنەرو ڕێکخەرێکی ئەوپەڕی زاناو تواناو کاربەجێو میهرەبانی هەیە، ئەو بەدیهێنەرەش خوای پەروەردگارە).

## دوا پرسیار

دوای ئەوەی بێبڕوایان هیچیان پێ نەماو، دەستیان لە هەموو پچکان بڕا، وەک ئەو شەنەکەرە ناشێیەی کە لە سووری تێی دەدۆڕێنێو دەیەوێ لەلابای تێی هەڵبهێنێتەوە، پەنایان بردە بەر پرسیارێک کە لە هەموو قسەکانی پێشوویان پتر نەزانیی و نەفامیی لێ دەفامرێتەوە، پرسیارەکەش ئەمەیە:

(مادام یاسای هۆکاریی ڕاست بێ و، هەموو شتێک بەدیهێنەرێکی هەبێ، دەبێ خواش بەدیهێنەرێکی هەبێ)، کەواتە پێمان بڵێن: ئایا کێ خوای دروست کردوە؟!!

ئێمەش لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین:

١) یەک تاقە (وشە) بۆتە هۆی بەهەڵەداچوونی یان دەربارەی چەسپاندنی حوکمی یاسای هۆکاریی بەسەر خوای مەزندا، ئەویش ئەوەیە کە وشەی (هەموو پەیدابوویێک)یان گۆڕیوە بە وشەی (هەموو شتێک) چونکە یاساکە دەڵێ: هەموو پەیدابوویێک پەیداکەرێکی هەیە، نەک هەموو شتێک پەیداکەرێکی هەیە، هەڵبەتە ئەم دوو ڕستەیەش زۆر لێک جودان، چونکە بەپێی رستەی یەکەم-کە دەقی راستەقینەی یاسای هۆکارییە- تەنیا ئەو شتانە پێویستییان بە پەیداکەر هەیە، کە پەیداکراوو دروستکراون، بەڵام شتێک کە پەیداکراو نەبێ و خاوەنی بوونێکی زاتیی و تەواو و بێسەرەتا بێ، حەوجێی پەیداکەر نیە، ئەمما بەپێی ڕستەی دووەم -کە ڕستەیەکە نێوەڕۆکێکی هەڵەی هەیە- هەموو شتێک پەیدابووبێ یان هەربوو بووبێ، پێویستیی بە پەیداکەر هەیە.

کەواتـە دەتوانیـن بڵێیـن: لەڕاسـتیدا ئـەوەی بۆتـە هـۆی بەهەڵەداچوونـی بێبڕوایـان لـە بابـەت بەڵگـەی هۆکارییـەوە، بریتییـە لـە حاڵـی نەبـوون یـان خۆگێلکردنیـان لـە ئاقاریـدا، جـا بێگومـان هـەر هەڵوێستێکیش بەهـۆی حاڵـی نەبوون یان خۆگێل کردنەوە بێتە دی شتێکی پووچە، چونکە ئەو بنچینەیەی کـە لەسـەری بەنـدە شـتێکی خەیاڵییـە.

**٢)** ئنجـا ئەگـەر بێـت و ئـەم قسـەیە ڕاسـت بـێ -هەمـوو شـتێک حەوجێـی پەیداکەرێـک بـێ-، دەبـێ ئـەو پەیداکـەرەی کـە خواشـی هێناوەتـەدی پەیداکەرێکی هەبێو ئەویش دیسان پەیداکەرێکی هەبێو هەروەها بێکۆتایی، هەڵبەتـە لـە ئەنجامـی ئەوەشـدا زنجیرەیەکی نەبڕاوە (التسلسـل اللانهائي) دێتـە دی، کـە یەکێکـە لـەو چەمکانـەی عەقـڵ بـە (مەحاڵ)یـان دەزانـێ.

**٣)** ئـەوە هەمـووی لـە لایەکـەوە: لەلایەکی دیکەشـەوە ئەم قسـەیە لـە ئەنجامـی ئـەوەوە هاتۆتـە دی کـە بێبڕوایـان، بوونـی خوایـان لەگـەڵ بوونـی پەیدابـووەکان (قیـاس) کـردوە، بـەڵام ئـەوە شتێکی ناماقووڵ و نەگونجاوەو بەدەردی زانایانـی ژیربێژیـی (منطـق) دەڵێـن: (قیـاس مـع الفـارق)ە، چونکـە ئێمـە کاتێـک دەتوانیـن یاسـای (قیـاس) لەنێوان دوو شـتدا بەکاربێنیـن و، یـەک حوکمیـان بەسـەردا بدەیـن کـە ڕووی لێکچـوون (وجـە الشـبە)یان لەنێواندا هەبـێ، بـەڵام ئاشـکرایە کـە بوونـی خـواو بوونـی دروسـتکراوەکانی لـە هیـچ ڕووێکـەوە وێـک ناچـن:

**أ/** بوونـی خـوا بوونێکـی زاتییـە، واتـە لـە هیـچ سـەرچاوەیەکەوە بـۆی نەهاتـوە، بـەڵام بوونـی دروسـتکراوەکان، وەدەسـتهێنراو (کسبـي)ەو هەڵقـوڵاوی دەرەوەی زاتـی خۆیانـە.

**ب/** بوونـی خـوا بوونێکـی تـەواو (کامـل)و بێسـنوور (لامحـدود)ە، بـەڵام بوونـی وەدیهێنـراوەکان ناتـەواو (ناقـص)و سـنوردار(محدود)ە.

ج/ بوونی خوا نەسەرەتای هەیە نە کۆتایی، بەڵام بوونی دروستکراوەکان سەرەتای هەیەو، بەبێ پشتبەستن بەخواش ناتوانێ بمێنێتەوە.

٤) دیسان دەڵێین: ئەگەر ڕاست بێ هەموو شتێک حەوجێی بەدیهێنەر بێ، دەبێ ئەو ماددەیەش کە یان بە خوای خۆیانی دەزانن، بەپێی ئەم قسەیە، پەیداکەرو بەدیهێنەرێکی هەبێ، هەڵبەتە ئەوان ناچارن حاشا لەوە بکەن کە مادده بەدیهێنەرێکی هەبێ و دەڵێن: مادده چونکە هەربوویەو بێسنوورە، پێویستیی بە بەدیهێنەر ناکات، هەڵبەتە ئێمە سەلماندمان کە مادده پەیدابوویەو حەوجێی بەدیهێنەرە، بەڵام ئێمەش هەمان قسە کە بێبڕوایان دەربارەی مادده کردیان دەربارەی خوا، دووبارە دەکەینەوە[1]، جا هەروەک چۆن ئێمە قسەی وانمان بەدرۆ خستەوەو سەلماندمان کە مادده هەربوو نیەو دروستکراوە، ئەوانیش دەتوانن ئێمە بە بەهەڵەداچوو بزانن و بیسەلمێنن کە ناگونجێ خوا هەربوو و پەیدانەکراو بێ، بەڵام هەتا ماست ڕەش نەبێو کونەدەرزی بەدەربەند نەبێ، مەخسوودیان حاسڵ نابێ!

٥) لەکۆتاییدا دەڵێین: بۆ ئەوەی دووچاری زنجیرەی بێبڕانەوە نەبین، حەتمەن دەبێ دان بێنین بە هەبوونی شتێکی هەربوو (أزلي)دا، واتە ئێمەو بێبڕوایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتووین، کە دەبێ شتێکی هەربوو هەبێ، چاوگ و بنچینەی هەموو شتێک بێو، خاوەنی بوونێکی تەواوو بێسنوور و سەربەخۆ بێ، جا ئێمە دەڵێین ئەو شتە خوای پەروەردگارەو، بێبڕوایانیش دەڵێن: ماددەیە، ئنجالەبەر ئەوەی سەلمێنرا کە ناگونجێ مادده هەربووبێو، سەرچاوەی ئەو گەشەکردن و بەرەوپێش چوون و گۆڕان و پەرەستاندنە بێ کە بەسەریدا هاتوەو دێ، کەواتە دیارە ئەو شتە هەربووەی کە خاوەنی بوونێکی زاتیی و تەواوو بێ سنوورو سەربەخۆیەو، سەرچاوەی بوونەو مشورخۆرو پەروەردگاری بوونەوەری پان و بەرینەو، حەوجێی هیچ شتێک نیەو، هەموو شتێک حەوجێی ویەو خاوەنی هەموو سیفەتێکی پەسند و چاکەو، لە هەموو

---

(١) واتە ئێمە بە شتێک دەیانگرین کە بۆخۆیان بڕوایان پێیەتی.

سیفەتێکی خراپ و ناپەسند دوورە، بریتیە لەخوای بەدیهێنەرو پەروەردگار (سبحانه وتعالی)..

## ئـەنجـام

**خوێنەری بەڕێز!**

ئێستا کە کۆتایی بەتۆژینەوەمان دێنین دەربارەوی یەکەمین یاسای عەقڵیی، کە مرۆڤ ناچار دەکات بڕوا بەخوا بێنێ، با ئەنجامی ئەم تۆژینەوەیە لەچەند دێڕێکدا بەکورتیی بخەینە بەرچاو:

یاسای هۆکاریی یەکەمین یاسای عەقڵە، کە مرۆڤ ناچار دەکات بڕوا بەخوا بێنێ، چونکە یاسایەکی بەڵگەنەویست و بنچینەیەکی سەلمێنراوە لە عەقڵی ئینساندا، مرۆڤ بەهۆی دانهێنان بەم یاسایەدا نەبووایە، نەیدەتوانی پەی بەهیچ راستییەک بەرێو هیچ یاسایەکی زانیاریی وەدەست بێنێ، ئەم یاسایە لەگەڵ ئەوەشدا کە بنچینەیەکی بەڵگەنەویست و سەلمێنراوە، گەورەترین زانا ناتوانێ نکووڵیی لێبکات، هێندەش ساکارو ئاسانە، سادەترین ئینسان دەتوانێ تێی بگات و، بۆ ئیسپاتی بوونی خوای پەروەردگار بەکاری بێنێ، شوانێکی نەخوێندەواری حوشتر لەوەڕێن، بەهۆی ئەم یاسایەوە دەتوانێ لەو قشپلەی کە حوشترەکەی دەیکاو، لەو شوێنپێیەی کە بۆخۆی پەیدای دەکا، پتەوترین بەڵگەی ئیسپاتی بوونی خوا دروست بکات[1].

ئنجا هەموو ئەو بڕوبیانووانەی کە بێبڕوایان پەنایان دەبردنە بەرێ بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو بەڵگە پتەوەی کە لەسەر بنچینەی یاسای ناوبراو

---

(١) بێگومان خوای بەخشندەو خاوەن بەزەییش هەر وای لێ چاوەڕوان دەکرێ، کە بۆ پەی پێبران و ناسرانی خۆی، گشتیترین و ڕاستترین ڕێ دیاری بکات.

داده‌ڕێژرێ، وه‌ك ئینكاریی كردنی ڕاستیی یاسایه‌كه، یان به‌هه‌ربوو له‌قه‌ڵه‌مدانی مادده‌و جووڵانه‌كه‌ی، یان به‌بێ سه‌ره‌تا حسێب كردنی بوونه‌وه‌ر، ئه‌مانه‌ هه‌موویان له‌ تاقیگه‌ی تۆێژینه‌وه‌ی ژیریيانه‌و زانیارییانه‌دا، وه‌ك بڵقی سه‌رئاوێ پووچانه‌وه‌و له‌ كووره‌ی جه‌ڕباندندا، بوونه‌ دووكه‌ڵ و هه‌ڵم و به‌هه‌واداچوون و پووكانه‌وه‌.

ئێستاش كه‌ ڕوون بۆوه‌و سه‌لمێنرا: یاسای هۆكاریی چه‌ند زه‌مینه‌یه‌كی پته‌وو ڕه‌قه‌ بۆ دارشتنی به‌هێزترین به‌ڵگه‌ی سه‌لماندنی بوونی خوا، مانای وایه‌ ڕاستیی ئه‌و قسه‌یه‌مان سه‌لماندوه‌ كه‌ ده‌یگوت: (عه‌قڵ دووه‌مین پاڵنه‌ری مرۆڤه‌ به‌ره‌و خواناسیی)، جا بێگومان وه‌ك له‌كۆتایی (ڕێخۆشكردن)ی ئه‌م به‌شی یه‌كه‌مه‌دا گوتمان؛ ئێمه‌ چ كه‌ پاڵنه‌ری یه‌كه‌می خواناسیی و، چ كه‌ پاڵنه‌ری دووه‌می خواناسیی ده‌تۆژینه‌وه‌، له‌ ئه‌سڵدا مه‌به‌ستمان ئه‌وه‌ نیه‌ كه‌ له‌و ڕێیه‌وه‌ بوونی په‌روه‌ردگار ئیسپات بكه‌ین، هه‌رچه‌نده‌ به‌هێزترین به‌ڵگه‌ی ئیسپاتی بوونی خواش بخرێته‌ ڕوو، به‌ڵكو مه‌به‌ستمان ئه‌وه‌یه‌ كه‌ له‌ هه‌مووان ڕوون بێ؛ بڕوا به‌خوا بوون و خواناسیی خه‌سڵه‌تێكی ناڕه‌سه‌ن و بێبنه‌چه‌كه‌ نیه‌و، یه‌كێكه‌ له‌ خه‌سڵه‌ته‌ پێكهێنه‌ره‌ بنچینه‌ییه‌كانی سروشت و كه‌سایه‌تیی ئینسان و، سروشت (فطرة)ی پاك و ساغ داخوازی ده‌كات.

ئنجا بۆئه‌وه‌ی ئه‌م مه‌سه‌له‌یه‌ زیاتر ڕوون و ئاشكرا بێت، به‌ پشتیوانیی خوا ده‌چینه‌ سه‌ر باسی دووه‌مین یاسای عه‌قڵیی كه‌ مرۆڤ ناچار ده‌كات بڕوا به‌خوا بهێنێ، كه‌ بریتیه‌ له‌ یاسای ڕێك وپێكیی (قانون النظام) كه‌ ده‌ڵێ: ڕێك و پێكیی به‌بێ ڕێكخه‌ر نابێ (لا نظام بلا منظم).

## دووەم: یاسای ڕێك و پێكیی (قانون النظام)

دووەمین یاسای ژیریی کە مرۆڤ ناچار دەکات بڕوا بەخوا بێنێ، بریتیە لە: ڕێک و پێکیی بەبێ ڕێکخەر نابێ (لا نظام بلا منظم):

بەڵێ ڕێک وپێکیی و یاسا لە هەرشتێکدا ببینرێ، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە یاسادانەرو ڕێکخەرێک بۆتە هۆی ڕێکخستن و دروست بوونی ئەو شتە.

هەڵبەتە ئەم یاسایەش وەک یاسای یەکەم، بە یەکێک لە یاساو بنچینە بەڵگەنەویستەکانی عەقڵ دادەنرێ، بەڵکو لە ڕاستیدا ئەم یاسایەش هەر خودی یاسای پێشوویە، بەڵام بە ئیعتبارێکی دیکەو لەلایەن (حیثیة)ێکی دیکەوە، چونکە لە یاسای یەکەمدا، بەس ئەسڵی بوون (وجود) لەبەرچاو گیراوە، بۆیە گوتراوە: هەر پەیدابوویێک بەڵگەیە لەسەر بوونی بەدیهێنەرێک، بەڵام لەم یاسایەدا چۆنیەتی (کیفیة)ی ئەو بوونە لەبەرچاو گیراوە، بۆیە گوتراوە: هەر ڕێک وپێکییەک بەڵگەیە لەسەر بوونی ڕێکخەرێک.

کەواتە ئەم یاسایە ئەگەر بەشێوەیەک لەیاسای یەکەم دابنرێ، ئەوە بێگومان حوکمی وی هەیەو، وەک وی بە بنچینەیەکی بەڵگەنەویست و سەلمێنراو لەقەڵەم دەدرێ و، ئەگەر بە یاسایەکی جوداو سەربەخۆش دابنرێ، ئەوە دەڵێین: هەروەک چۆن بوونی شت دەبێتە بەڵگەو نیشانەی بەدیهێنەرەکەی، چۆنیەتییەکەشی بەڵگەو نیشانەی چۆنیەتی ئەو بەدیهێنەرەیە، بێگومان هیچ شتێکیش ناگونجێ هەبێ، بەبێ چۆنیەتییەکی تایبەتی،

واتـه بـوون و چۆنیەتـی (الوجود والكیفیة) قـەت لێـک جودا نابنـەوەو شـتاقیان بێشـتاقیان نابـن، جـا مـادام وابێ دەبـێ لـه حوكمیشـدا یەكسـان بـن.

ئێستاش با بۆ ڕوون بوونەوەی مەبەست وێنەیەک بێنینەوە:

هـەر (كتێب)ێـک بیگـری، بەڵگـەو نیشـانەی بوونـی نووسـەرێكە، چونكـە بەپێـی یاسـای هۆكاریـی: مەحاڵـە كتێـب بەبـێ نووسـەر پەیـدا بـێ، بـەڵام چۆنیەتـی ئـەو نووسـەرەی كـە كتێبەكـەی نووسـیوە، لـە بوونـی ڕووتـی كتێبەكـەدا نابینـرێ، بەڵكـو بـۆ زانینـی چۆنیەتـی (نووسـەر)ەكە، حەوجێـی زانینـی چۆنیەتـی (كتێب)ەكەیـن، جـا كاتێـک زانیمـان كـە كتێبەكـە لەسـەر شـێوازێكی زانیارییانـەی ڕاسـت نووسـراوەو بنچینەكانـی ژیریـی تێـدا ڕەچـاو كـراون، لەمـەوە دەزانیـن كـە نووسـەرەكەی خاوەنـی عەقـڵ و زانیاریـی بـووەو گێـل و نـەزان نەبـووە، بـەڵام ئەگـەر كتێبەكەمـان بـە پێچەوانـەوە دی، دەزانیـن كـە نووسـەرەكەشـی بەپێچەوانـەوە بـووە.

ئنجـا ئێمـە كـە دەبینیـن قـەت عەقڵی ئینسـان دیاردەیەكـی ڕێـک وپێـک و یاسـادار، بـە شـوێنەوارو پەرێزی بابایەكـی كـەودەن و نـەزان لەقەڵـەم نـادات و، قەتیش دیاردەیەكی بێسەرەوبەرەو نارێک، بە پەرێزی بابایەكی ژیـرو زانـا دانانـێ، بەڵكـو بەپێچەوانـەوە شـتی ڕێـک وپێـک و لەبـار بـە بابـای ژیـرو تێگەیشـتوو ڕەوا دەبینێـو، شتی نالەبارو بێیاسـاش، بە بابای نەفـام و نـەزان، بۆ وێنـە: مـرۆڤ لەكاتێكدا ئینسـانێكی بەدیمـەن سـاغ و كامـڵ و ژیـر دەبینێـو، ڕەفتـاری نابەجێـی لـێ دەبینێـو قسـەی ناماقووڵـی لـێ دەبیسـتێ، سـەری سـووڕ دەمێنـێ، بـەڵام دوایـی كـە بـۆی دەركـەوت ئـەو ئینسـانە بـە ڕواڵـەت كامـڵ و ژیـرە، شـێتەو خاوەنـی ژیریـی نیـە، سەرسـوڕمانەكەی نامێنـێ، هـۆی ئـەم دوو هەڵوێسـتە لێـک جویێـەش ئەوەیـە، كـە لەپێشـدا ئینسـانە شـێتەكە بەژیـرو فامیـدە دانـراوەو، مرۆڤیـش ڕەفتـاری بەجێـو قسـەی ماقـووڵ لـە ئینسـانی ژیـرو فامیـدە چاوەڕێ دەكات نـەک بـە پێچەوانـەوە، ئنجـا كاتێـک مرۆڤ شـتێكی

چاوەڕوان نەکراو لە یەکێک دەبینێ یان دەبیستێ، تووشی سەرسوڕمان دەبێ.

بەڵام دوایی کە بۆی دەردەکەوێ، ئەو ئینسانەی بەژیرو تێگەیشتووی لەقەڵەم دابوو، شێت و ناتەواوە، دەچێتەوە باری ئاسایی و سەرسوڕمانەکەی نامێنێ، چونکە دەزانێ کە مادام کابرا شێت و ناژیر بێ، هەر کردارو گوتاری ناڕێک و بێسەروبەری لێچاوەڕوان دەکرێ، بەڵام لەپێشدا بۆیە سەری سوڕما، چونکە دەیزانی کە بابای ژیرو کامڵ کردارو گوتاری ژیرانەو بەجێی لێ دەوەشێتەوە، بەڵام ئەو کردارو گوتاری نەفامانەو بێجێی دیتوەو بیستوە.

لەمەوە بەدڵنیایی تەواوەوە دەزانین: کە مرۆڤ چەندە قەناعەتی بە یاسای (هەموو پەیدابوویێک بەدیهێنەرێکی هەیە) هەیە، هێندەش بڕوای بە یاسای (هەموو ڕێک وپێکییەک ڕێکخەرێکی هەیە) هەیە؛ چونکە مرۆڤ هەروەک چۆن لەکاتی دیتنی پەیدابوویێکدا بڕواو دڵنیایی تەواوی بۆ دێتە دی، لەسەر ئەوەی کە ئەو شتە شوێنەوارو بەرهەمی پەیداکەرێکە، بەهەمان شێوەش لەکاتی دیتنی ڕێک وپێکییەکیشدا، قەناعەتی لەسەر ئەوە جەزم دەبێ کە حەتمەن ئەو ڕێک وپێکییە پەرێزو بەرهەمی ڕێکخەرێکە، کە خاوەنی تواناو زانیاریی و لێکدانەوەیە.

کەواتە ئێستا دەتوانین بڵێین:

ئەم یاسایەش وەک یاسای پێشوو، یەکێکە لە بنچینە بەڵگەنەویستەکانی ژیریی و، زەمینەیەکی یەکجار ڕەق و پتەوەو، دەشێ بکرێتە جێ بناغەی بەهێزترین و درەوشاوەترین بەڵگەی ئیسپاتی بوونی خواو سەلماندنی ئەوە کە: ژیریی پاڵنەرو پاڵپشتی بیری بڕواداریی و خواناسییە.

## چۆن ئەم یاسایە دەکرێتە بەڵگەی ئیسپاتی بوونی خوا؟!

پاش ئەوەی زانیمان کە یاسای (هەموو ڕێک وپێکییەک ڕێکخەرێکی هەیە)، یاسایەکی بنچینەیی و بەڵگەنەویستەو هاوتای یاسای هۆکارییە، با ئەمجار بزانین چۆن ئەم یاسایە دەکرێتە بەڵگەی سەلماندن و ئیسپاتی بوونی خوا؟!

لە سێ خاڵاندا دەتوانین دەریخەین؛ چۆن بەهێزترین بەڵگەی ئیسپاتی بوونی خوا لەسەر زەمینەی ئەم یاسایە هەڵدەچنرێ:

**١)** ڕوونکردنەوەی ڕاستیی ئەم یاسایە؛ چونکە هەتا ڕاستیی ئەم یاسایە مسۆگەر نەکەین، ئەگەر دیواری هەزار بەڵگەی لەسەر هەڵبچنین، بێهوودەیەو ماندووبوونێکی بەلاشە، لەبەر ئەوەی ئەم یاسایە دەکرێتە بناغەو بنچینەی هەموو قسەکانمان، بێگومان قاییمی و خۆڕاگریی دیواریش پەیوەستە بە بناغەکەیەوەو، داری خواریش سێبەری ڕاستی نابێ.

**٢)** سەلماندنی هەبوونی یاساو ڕێک وپێکیی لە بوونەوەردا؛ چونکە هەرچەندە یاسای ناوبراو ڕاست بێ، ئەگەر شتێک نەبێ بەسەریدا بچەسپێنرێ و ڕوون بکرێتەوە کە فڵانەشت یاسادارەو وردەکاریی و ڕێک وپێکیی و کارامەیی تێدا دەبینرێو، شوێنپەنجەی دەستەڵاتی زاتێکی زاناو شارەزای پێوە دەبینرێ، بێسوودە.

**٣)** ئەنجام؛ چونکە دوای ئەوەی سەلمێنرا کە یاسای ناوبراو شتێکی ڕاست و بەجێیەو، ڕاستی (حقیقة)یەکە ژیریی و زانیاریی پشتگیریی دەکەن و سەلمێنراش کە شتێک هەیە یاساو ڕێک وپێکیی تێدا دیارە، ئەوکاتە یاسای گۆڕین بەسەر شتە یاسادار(منظم)ەکەدا دەچەسپێنین و ئەنجامی

ویستراو (النتیجة المطلوبة) وەدەست دێنین.

ئێستاش بەڕێز بە خستنەڕووی ئەو خاڵانەدا دەچین کە باسمان کردن:

١- ڕوونکردنەوەی ڕاستیی یاسای ڕێك وپێکیی:

لە سۆنگەی ئەوەوە کە یاسای (بۆ هەر یاسایەک یاسادانەر هەیە) یان (بۆ هەر ڕێک وپێکییەک ڕێکخەرێک هەیە)، یاسایەکی بەڵگەنەویست و سەلمێنراوە، حەوجێی بە سەلماندنێ ناکات، چونکە ئێمە کاتێک مەسەلەیەکمان لێ عاسێ دەبێو دەمانەوێ چارەسەری بکەین، پەنا دەبەینە بەر ئەو یاسا ژیرییانەی، کە بەچەند بنچینەیەکی بەڵگەنەویست دادەنرێن، هەڵبەتە ئەم یاسایەش یەکێکە لەو بنچینە بەڵگەنەویستانە، بەڵام ئێمە پەنا دەبەینە بەر هێنانەوەی چەند وێنەیەک بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستیی یاسای ناوبراو:

وێنەی یەکەم: لە مێژوودا:

(مێژووزانان دەڵێن: ساڵانی درێژ بەسەر مرۆڤدا تێپەڕ بوون، کە چەکەکەی و ئەو کەلوپەلانەی بۆ پێداویستییەکانی ژیانی بەکاری دەهێنان، بریتی بوون لە بەردی تاشراوەو، لەبارەی ئەو ماوە دوورودرێژەوە، کە بەگومانی هەندێک لە زانایان (١٠٠,٠٠٠) ساڵ زیاتری خایاندوەو بە (دەوری بەرد) یان چاخی بەردین (العصر الحجري) ناسراوە، بێجگە لەو چەک و کەلوپەلە بەردینانە، هیچ سەرچاوەیەکی دیکەمان لەبەردەست نیە، بۆ شارەزابوون و ئاشنابوون بە ژیان و گوزەرانی مرۆڤایەتی لەو چاخەدا.

زانایانی مێژوو دەڵێن: ئنجا مرۆڤ بەرەبەرە فێری لووسکردنی بەردان بوو، جا لەوەدەمەوە - نیزیکەی (١٢٠٠٠) ساڵ پێش لەدایکبوونی (عیسی) (علی نبینا وعلیه الصلاة السلام) - ئەو چاخە دەستی پێکرد، کە بە (چاخی بەردی لووس) ناسراوە.

لـەو شـوێنەوارە سـەرنج ڕاکێشـانەی، کـە لـە مرۆڤەکانـی چاخـی بـەردی کـۆن (بـەردی تاشـراو) بەجێمـاون، چەنـد وێنەیەکـی ژیاندارانـی جۆراوجـۆرو جیاجیـان، وەک (مامـووث) و (کەرگەدێـن) و (گامێـش) و (ورچ) و (ئەسپ) و (ئاسک)... کە بە دەستڕەنگینییەکی نائاسایی لەسەر دیواری ئەشـکەوتەکانی فەڕەنسـاو ئەسـپانیا هەڵقەنـدراون.

سەرسـوڕهێنەر ئەوەیـە کـە وێنەکێشـانی ئـەو ئەشـکەوتانە، لەچۆنیەتـی جموجووڵـی ژیانـداران تەنانـەت شتێکی گچکەشیان فەرامـۆش نەکـردوە، بـەڵام لـە وێنەکێشـانی ئینسـاندا هیـچ جـۆرە وردبینیـی و هونەرمەندییەکیـان ڕەچـاو نەکـردوە، ئەمـەش ئـەوەی لـێ وەردەگیـرێ کـە دانیشـتوانی ئـەو ئەشـکەوتانە لـەو سـەردەمەدا، گرنگییەکـی تایبەتییـان بـە ژیانـداران داوە، جـا بـۆ پەرستن بووبـێ یـان هەرشـتێکی دیکـە.

ئنجا بەجێمانـی قـاپ و قاچاغـی بەردیـن لـە چاخـی بەردینـی نـوێ (بەردی لـووس)دا، ئـەوە دەگەیەنـێ کـە مرۆڤ لـەو چاخـەدا فێری دروسـتکردنی ئەوجۆرە کەلوپەلـە بـووە، بـەڵام کـەس نازانـێ مرۆڤ چـۆن فێـری قاڵکـردن و تواندنـەوەی کانـزاکان بـوو، فێـری دروسـتکردنی کەلوپەلـی جۆراوجـۆر بـوو، ڕەنگـە لـە ئەنجامـی ئاگـر هەڵایسـانێکی گـەورەدا ئـەو نهێنییـەی دۆزیبێتـەوە، بـەڵام ئـەو شوێنەوارانەی کە دەستگیرمان بوون، پێشـانمان دەدەن کە مرۆڤ سـەرەتا (مس) ی دۆزیوەتـەوەو، چەنـد کەلوپەلێکـی لـێدروسـت کـردوە، بـەڵام چونکـە کەلوپەلـە مسییەکـان نـەرم و کـەم خایـەن بـوون، زۆری نەبـرد کانزایەکـی تۆزێـک ڕەقتـری لەتێکەڵکردنـی (مـس) و (قەلـع)[1] دروسـت کـرد، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا چاخـی کانزایـی (العصر المعدني) لەکاتـی دۆزینـەوەی (ئاسـن)ەوە دەسـتی پێکـرد، کـە بـە ئەندازەیەکـی فـراوان لەزەویـدا هەیـە، جـا لـەم ڕووەوە چاخـی کانزاییـان بـۆ سـێ قۆنـاغ دابـەش کـردوە: (مـس) و (قورقوشـم) و (ئاسـن)، ئنجـا پێویسـتە بزانیـن کـە لـەم قۆناغـەدا، بگـرە لەنێـو هەندێـک گەلانـدا لـە قۆناغـی (مـس)

(١) القلع: کانزایەکە (رصاص)ی چاکی پاڵ دەدرێتە لا. (المنجد) چ٢٦ ل٦٥١.

دا نووسین (الكتابة) داهێنراو، کۆتایی بە چاخی پێش مێژوو هات)[1].

ئێستا با تێفکرین!

ئێمە ئێستا کە دەیان هەزار ساڵ لەو ڕۆژگارەوە دووریـن، کە ئەو گەلە ڕابردووانەی تێدا ژیاون، دەتوانین بەهۆی پشکنین و وردبوونەوەوە لەو شوێنەوارانەی کە لێیان بەجێماون، وەک چەند کەلوپەل و چەکێکی لە بەرد داتاشراو و، کۆمەڵێک کەلوپەل و قاپ و قاچاغی لە بەردی لوس دروست کراوو، هەندێک قاپ و قاچاغی کانزایی و، ئەو نەخش و نیگارو وێنە هەڵقەندراوانەی سەردیواری ئەشکەوتەکان، پەی بە بوونی ئەو گەلە ڕابردوە لە مێژینانەو، چۆنیەتی ژیان و گوزەران و زۆر لە کاروباری ڕۆژانەیان بەرین، ئنجا ئەو مێژووەی کە لە بابەت ئەو گەلانەوە تۆمارمان کردوە هەر لەم ڕێیەوە وەدەستمان هێناوە.

واتە: تاقە هۆیەک کە ئێمەی بەو گەلە پێشووانەوە بەستۆتەوەو بۆتە (همزة الوصل)و پردی نێوانمان، بەس ئەو شوێنەوارو پەرێزە سادەیە کە گوتمان، دەنا هیچ کەس لەئێمە تەنانەت بە خەونیش ئەو گەل و تیرانەی نەدیون.

کەواتە: لەم وێنەیەوە دەرکەوت، کە هەر شوێنەوارێک هەرچەندە زۆر ساکاریش بێت، مادام یاساو ڕێک وپێکیی تێدا دەربکەوێ، دەکرێتە بەڵگەو نیشانەی هەبوونی زاتێکی هۆشمەندو خاوەن ویست و زانییارو ئامانجدار.

وێنەی دووەم؛ لە زانیاریدا:

هەموومان دەزانین کە (نیوتن)[2] لە ئەنجامی وردبوونەوەیدا لە دیاردەی کەوتنەخوارەوەی (سێو) لە درەختەکەی و، سوورانەوەی مانگ بەدەوری زەوی و زەوی بەدەوری ڕۆژدا، بەزەحمەت سەرکەوتن بەرەو بەرزیی و...هتد، توانی

---

(١) (أنگیزەء پیدایش مذاهب) ل٢٩٠/٢٩٢،٢٩١، لە: (تأریخ آلبرماله) ب١ ل٤ تا ٨، وەرگیراوە.

(٢) نیوتن لە ساڵی ١٦٨٧زاییینیدا یاسای ڕاکێشان (قانون الجاذبية)ی دۆزییەوە.

پەی بە هەبوونی یاسای گشتیی ڕاکێشان (قانون الجاذبیة العام) بەری، واتە نیوتن چەند دیاردەیەکی دیتوون کە نەیزانیوە هۆی پەیدابوونیان چییە! بەڵام بەپێی یاسای (پەیدابوو بێ پەیداکەر نیە) کەوتۆتە گەڕان و سووڕان و لێکۆڵینەوە، بەدوای هۆی پەیداکەری ئەو دیاردانەدا، ئنجا لەبەرئەوەی بڕواشی بە یاسای (ڕێک وپێکیی بێ ڕێکخەر نابێ) هەبووە، هەر بەوەندە خۆی فریو نەداوە کە بڵێ: بەڵێ، بەڵێ، ئەم دیاردانە بێ هۆ (سبب) دروست نەبوو ون، بەڵام ئەو هۆیەی پەیدای کردوون ڕێکەوتەو هیچی دی!

بەڵێ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە نیۆتن بابایەکی زانا بووە، زانیویەتی کە بناغەی ئەم بوونەوەرە لەسەر بنچینەی زانیاری دانراوەو، بەپێی یاسا (قانون) بەڕێوە دەچێو، لە گۆڕەپانی بوونەوەردا، جێپێی ڕێکەوت نیەو، لە کۆشکی یاسادارو پڕ وردەکاریی بوونەوەردا ڕێکەوتە کوێرە شوێن پەنجەی دیار نیە، لە سۆنگەی ئەوەوە دوای دیتنی ئەو دیاردانە، هەوڵی دۆزینەوەی هۆی ڕاستەقینەیانی داوەو، بۆی دەرکەوتوە کە هەموو ئەو دیاردانە شوێنەواری یاسایەکی گشتیی و هەمەلایەنەن بە ناوی: (یاسای گشتی ڕاکێشان).

ئێستا با لەم وێنەیە ورد بینەوە:

ئایا ئەم ڕەفتارەی نیۆتن کە نموونەیەکە لە سەدان ڕەفتاری دەیان زاناو بیرتیژی وەک (ئەرخەمیدس) و (جمس واط) و (مارکۆنی) و (بوەیل) و (ئاینیشتاین) و (ریذر فۆرد) و (گالیلۆ)...هتد. بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە عەقڵی مرۆڤ بڕوای بەو یاسایە هەیە کە دەڵێت ڕێکوپێکی بێ ڕێکخەر نایەتە دی؟!

ئایا ئەگەر نیوتن و هەر زانایاکی لێکۆڵەرەوەی دیکەش، بڕوای وابایە کە؛ دەگونجێ شتێکی ڕێک وپێک بەبێ یاسادانەرو ڕێکخەر پەیدا بێ، واتە دەگونجێ ڕێکەوت (صدفة) شتی ڕێک وپێک و یاسادار دروست بکات، ئێستا ئەو هەموو یاسا سروشتییانە (القوانین الطبیعیة) دەدۆزرانەوە،

كە زانیاریی فیزیاو كیمیاو گەردوونزانیی و گیانەوەرزانیی و ڕووەكزانیی و... هتد، پێكدێنن؟!!

بێگومان نەخێر، چونكە من مادام بڕوام وابێ كە دەگونجێ لەخۆڕا واتە بە ڕێكەوت دیاردەیەكی یاسادار دروست بێ، پێویست ناكات لەكاتی دیتنی دیاردەیەكی یاسادار (منظَّم)دا - وەك سووڕانەوەی زەوی بەدەوری ڕۆژدا - سەری خۆم بئێشێنم و، بكەومە گەڕان و پشكنین بۆ دۆزینەوەی هۆی سەرەكیی سووڕانەوەی زەوی!!

كەواتە لەم وێنەیەشدا دەركەوت كە مرۆڤ وەك بنچینەیەكی بەڵگەنەویست بڕوای بەو یاسایە هەیە كە دەڵێ: ڕێك وپێكیی لە هەر شتێكدا حەوجێی ڕێكخەرێكە، هەربۆیەش بۆ تەفسیركردنی پەیدابوونی هەر دیاردەیەكی ڕێك وپێك و یاسادار، عەقڵ پاڵی پێوە دەنێ كە یاساو دەستوورەكەی بدۆزێتەوە.

**وێنەی سێیەم؛ لە ژیانی ڕۆژانەماندا:**

(دەنگە شقارتە كە بریتییە لە دارۆچكەیەكی گچكەو چوار پێنج سانتیمەتر درێژەو، نیزیكەی (٢ملم٢) ئەستورەو، لە سەرێكییەوە تۆزووكێك گۆگرد چەسپ كراوە، ئەو دەنكە شخارتەیە هەركەسێك تۆزێك لێی وردبێتەوە، دەزانێ كە وەستایەك دروستی كردوە، چونكە دەبینین درێژییەكەی و ئەستوورییەكەی و ئەو گۆگردەی كە پێیەوە نووسێنراوە، هەركامیان ئەندازەیەكی تایبەتی هەیە، بەشێوەیەك ئەگەر یەكێك لەوانە ئەندازەكەی پتر یان كەمتر بێ، ئەو ئامانج و مەبەستەی كە دەنكە شخارتەی بۆ دروست كراوە، نایەتەدی، جا بێگومان ئەو شێوەو چۆنیەتییانەش كە دەگونجا دەنكەشخارتەیان لەسەربێ، یەكجار زۆرن، جا كاتێك مرۆڤ بەراوردی نێوان حاڵەتی ئێستای دەنكەشخارتەو، حاڵەتە لە ئیمكاندا بووەكان دەكات، بێ سێودوو دەڵێ: دەبێ دەستی وەستاو كارسازێك لە دروستكردنی

ئه‌م ده‌نكه‌شخارته‌یه‌دا هه‌بووبێ)[1].

خوێنه‌ری به‌ڕێز!

وه‌ك له‌م سێ وێنه‌یه‌دا ده‌ركه‌وت، ده‌بینین یاسای (هه‌موو ڕێك وپێكییه‌ك ڕێكخه‌رێكی هه‌یه) یاسایه‌كی به‌ڵگه‌نه‌ویست و بنچینه‌یه‌كی ژیرییه‌و، هیچ كه‌س نكوولیی له‌وه نیه، كه هه‌موو ده‌مێ دیترانی شتی یاسادارو ڕێك وپێك، نیشانه‌ی بوونی ژیریی و زانیارییه‌و له‌خۆوه‌و به‌ڕێكه‌وت دروست نابێ.

جا ئێستا كه له ڕوونكردنه‌وه‌ی خاڵی یه‌كه‌م بووینه‌وه‌و، زانرا كه ئه‌م یاسایه شتێكی ڕاست و بێگرێو قۆرته‌و، بنچینه‌یه‌كی پته‌وو له‌باره‌و، دڵنیاو یه‌كخه‌م بووین له‌وباره‌وه، با بچینه سه‌روكاری ڕوونكردنه‌وه‌ی خاڵی دووه‌م و بزانین هیچ شتێك هه‌یه كه یاساو ڕێك وپێكیی و ورده‌كاریی تێدا ده‌ركه‌وێ.. به واتایه‌كی دی: دوای ئه‌وه‌ی سه‌باره‌ت به ڕاستیی یاسای ناوبراو، دڵنیاو خاترجه‌م بووین، بابزانین چ شتێك هه‌یه- له ده‌وروبه‌رمان- كه بگونجێ بیكه‌ینه بابه‌ت (موضوع)ی یاسای گۆرین و به‌سه‌ریدا بیچه‌سپێنین!

## ٢- سه‌لماندنی هه‌بوونی ڕێك وپێكیی له بوونه‌وه‌ردا:

دره‌وشانه‌وه‌ی ورده‌كاریی و ڕێك وپێكیی و یاسا له بوونه‌وه‌ردا، هه‌ر له گه‌ردیله‌یه‌كه‌وه بیگره هه‌تا كه‌هكه‌شانه زه‌به‌لاحه‌كان، شتێكی هێنده زه‌ق و به‌رچاوه، وتوێژو دم به‌دمه‌و بێنه‌وبه‌رده هه‌ڵناگرێ، به‌ڵام ئێمه چونكه نامانه‌وێ بێبڕوایان ته‌نانه‌ت سه‌نگه‌ری گومان و بڕوبه‌هانه‌شیان به‌ده‌سته‌وه بمێنێ، له ئاقار به‌ره‌ی بڕوادا، به‌پشتیوانیی خوا، چه‌ند دیمه‌ن و دیارده‌یه‌كی یاساداری سه‌رنجڕاكێش به‌نموونه له‌نێو هه‌زاران دیارده‌ی ڕێك وپێك و پڕ

---

(١) به تۆزێك ده‌ستكارییه‌وه له (پوخته‌یه‌ك ده‌رباره‌ی ئیسلام) وه‌رگیراوه، بڕوانه لاپه‌ڕه ٥٣-٥٤، چاپی یه‌كه‌م. لاپه‌ڕه (٦٥)ی چاپی دووه‌م، نووسینگه‌ی ته‌فسیر ٢٠٠٦.

ورده‌کاریی ئه‌م بوونه‌وه‌ره‌دا ڕاده‌نوێنین.

به‌ڵام وای به‌چاک ده‌زانم به‌ر له‌وه‌ی بچینه سه‌ر خستنه‌ڕووی ئه‌و چه‌ند نموونه‌یه مه‌سه‌له‌یه‌کی گرنگ له‌وباره‌وه بخه‌مه ڕوو:

بێگومان بڕوابوون به هه‌بوونی هه‌رکام له لقه‌کانی زانیاریی، بریتیه له بڕوابوون به هه‌بوونی ڕێک وپێکیی و یاساو ورده‌کاریی له بوونه‌وه‌ردا!! چونکه هه‌بوونی کۆمه‌ڵه یاسایه‌ک به‌ناوی یاسا فیزیاییی و کیمیاییه‌کان و، کۆمه‌ڵێک به‌ناوی یاسا ڕووه‌کییه‌کان و، کۆمه‌ڵێک به‌ناوی یاسا زینده‌وه‌رییه‌کان و، کۆمه‌ڵێک به‌ناوی یاسا کۆمه‌ڵایه‌تییه‌کان و ...هتد، به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر هه‌بوونی یاساو ورده‌کاریی له مادده‌ی بێ ژیان -خڕۆکه‌و ئه‌ستێره‌و که‌هکه‌شانه‌کان- و ڕووه‌ک و شیناوردو ئاژه‌ڵ و زینده‌وه‌رو مرۆڤدا، ده‌نا ئه‌گه‌ر هه‌موو ئه‌م شتانه یاسادار (منظَّم) نه‌بان و ڕێک وپێکیی و ورده‌کارییان تێدا به‌دی نه‌کرابایه، مه‌حاڵ بوو زانایان له‌هیچه‌وه یاسا سروشتییه‌کان په‌یدا بکه‌ن.

که‌واته هه‌ر خودی بڕوابوون به هه‌بوونی زانیارییه سروشتییه‌کان، یه‌کسانه به بڕوابوون به یاساداریی و ڕێک وپێکیی بوونه‌وه‌ر.

چونکه وه‌ک گوتمان ئه‌و یاساو ده‌ستوورانه‌ی که زاناو شاره‌زایان شانازیی به دۆزینه‌وه‌و په‌ییپێبردنیانه‌وه ده‌که‌ن و، له نووسراوه‌کانیاندا به زۆری به‌ناوی خۆیانه‌وه تۆماریان ده‌که‌ن، پێش ئه‌وه‌ی بێنه به‌ر چراو شه‌داوی وانیش- بێگومان- له بوونه‌وه‌ردا هه‌ر هه‌بوون و، ته‌نیا کارێک که ئه‌و زانا دۆزه‌ره‌وه (مکتشف)انه ئه‌نجامیان داوه، ئه‌وه‌بووه که هاتوون ئه‌و یاساو ده‌ستوورانه‌یان له واقیعی بوونه‌وه‌ر دارنیون و، له قاڵب و بۆته‌یه‌کی گوته‌ییدا دایانڕشتوون.

ئێستاش با چه‌ند نموونه‌یه‌ک بخه‌ینه‌ڕوو له خه‌رمانی دیارده ڕێک وپێکه سه‌رنج ڕاکێشه‌کانی بوونه‌وه‌ر:

## دیارده‌ی یه‌كه‌م: بوونه‌وه‌ر به‌ گشتی

﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ (الذاريات- ٤٧)

كاتێك ده‌توانین به‌چاكیی په‌ی به‌و ڕێك وپێكیی و ورده‌كارییه‌ به‌رین كه‌ له‌ بوونه‌وه‌ر (كون)دا هه‌یه‌، كه‌ شاره‌زای هه‌موو كه‌لێن و كونه‌كانی بین و، بزانین چییه‌و چۆنه‌و، چی تێدایه‌و، سنووری تا كوێیه‌و...هتد؟، به‌ڵام هه‌تا ئێستا مرۆڤ نه‌یتوانیوه‌ وه‌ڵامی هیچ كام له‌م پرسیارانه‌ بداته‌وه‌، به‌ڵكو هه‌موو ئه‌و زانیارییه‌ی كه‌ هه‌تا ئێستا ده‌رباره‌ی بوونه‌وه‌ر وه‌ده‌ستی هێناوه‌، وه‌ك ئه‌و دڵۆپه‌ ئاوه‌ وایه‌ كه‌ باڵنده‌یه‌ك به‌ ده‌ندووكی له‌ ده‌ریایه‌كی مه‌زن هه‌ڵی ده‌گرێ، جا بێگومان هه‌ستكردنیشمان به‌ یاساداریی و ڕێك وپێكیی هه‌ر شتێك، په‌یوه‌ندییه‌كی ڕاسته‌وانه‌ی له‌گه‌ڵ ناسینی ئه‌و شته‌دا هه‌یه‌، كه‌واته‌ ئه‌و هه‌موو ڕێك وپێكیی و ورده‌كارییه‌ی كه‌ له‌ سه‌دان به‌رگ كتێبدا له‌باره‌ی بوونه‌وه‌ره‌وه‌ تۆمار كراوه‌، وه‌ك دڵۆپێك وایه‌ له‌ ده‌ریایه‌ك، له‌چاو ئه‌و هه‌موو ڕێك وپێكییه‌ی كه‌ له‌ بوونه‌وه‌ردا هه‌یه‌و، مرۆڤ نه‌یتوانیوه‌ په‌رده‌ی له‌سه‌ر هه‌ڵداته‌وه‌و به‌ شانازییه‌وه‌ تۆماری بكات.

جا ئێستا با دووربینی زانیاریی به‌ده‌سته‌وه‌ بگرین و، ته‌ماشایه‌كی وردی بوونه‌وه‌ری پێ بكه‌ین، تاكو گه‌وره‌یی و بێڕه‌زاییه‌كه‌یمان بۆ ده‌ربكه‌وێ و، بزانین بۆچی مرۆڤ له‌ ئاقار ته‌واو ناسینیدا كلۆڵ و ده‌سته‌وستانه‌، ئه‌مما له‌پێشه‌وه‌ ئه‌وه‌ له‌به‌رچاوی خۆت بگره‌، كه‌ هه‌رچی هه‌تا ئێستا زانیاری

مرۆڤ لەوبارەوە گوتوویەتی، کەمێکەو، هەرچی هەتا ئێستا بە دووربین (تەلسکۆب)ەکانی دیتوویەتی، گۆشەیەکە لەو بوونەوەرە پان و بەرینە.

زانایان دەڵێن: ئەم زەوییەی کە لەسەری دەژین یەکێکە لە نۆ (٩) خڕۆکەیە، کە بەدەوری خۆردا دەسووڕێنەوەو پێیان دەگوترێ: کۆمەڵەی ڕۆژ، ئەمەش ناوەکانیانە بە ڕیز: (عەتارد، زوهرە، مەرریخ، موشتەریی، زوحەل، ئۆرانۆس، نیبتۆن، پلۆتۆ، زەوی).

ئنجا خۆر کە دایکی ئەم نۆ بێچووەیە، تیرەکەی نیزیکەی (٨٦٥٣٨٠) میلە، جا ئەگەر بێت و بمانەوێ چەند خڕۆکەیەکی وەک زەوی، لەسەر تیرەی ڕۆژ ڕیز بکەین، دەبێ (١٠٩) دانەی بۆ ئامادە بکەین، خۆ ئەگەر بمانەوێ قەبارەیەک لەو خڕۆکانە پێک بێنین هێندەی قەبارەی ڕۆژ، ئەوە دەبێ (١,٠٠٠,٠٠٠) یەک ملیۆن خڕۆکە خڕ بکەینەوە![1] کەواتە قەبارەی ڕۆژ یەک ملیۆن جار هێندەی قەبارەی زەوی خۆمانە!![2]

ئنجا ڕۆژیش ئەستێرەیە، وەک هەموو ئەو ئەستێرانەی کە بە ئاسمانەوە دەبینرێن، نە لە هەموانیان گچکەترە، نە گەورەتریشە، مام نێوەندییە، هەم لە قەبارەدا، هەم لە کێشدا هەم، لە تەمەندا، بۆیەش لە هەموو ئەستێرەکان گەورەتر دیار دەکاو تیشکمان زیاتر دەداتێ، چونکە لە هەموانیان لێمان نزیکترە.

بەڵێ ڕۆژ ئەستێرەیەکە لە ئەستێرەکانی مەجەڕڕەی کاکێشان (درب التبّان) بۆیەش وای پێگوتراوە، چونکە وەک ئەو ڕێیە دەچێ، کە (کا)ی پێدا کێشرابێ و کەم کەمە لێی ڕژابێ!

فارسەکانیش دیسان وەک ئێمە بەو مەجەڕڕەیان گوتوە: (کهکشان) کە هەر دەکاتەوە کاکێشانی کوردی، پێشیان گوتوە (راه شیری) چونکە، هەندێکی دیکە بە (شیر)یان شوبهاندوە!

(١) (مع الله في السماء)، ل١٤٦، چ١٩٨٤، د.أحمد زكي.

(٢) بەڵکو (١,٣٠٠,٠٠٠) هێندەی زەوییە.

عارەبیش دیسان وەک کورد و فارس وشەی (درب التبّان)یان بۆ بەکارهێناوە، (درب)یش ڕێیەو (تبّان)یش بابای کاکێشە، بەڵام بێجگە لەم ناوە (مجرّة) شیان بۆ بەکارهێناوە، کە بەمانای ڕووباری ڕۆیشتوو (النهر الجاري)ە.

ئەوروپاییەکانیش پێیان گوتوە (Milk(جل جلالە) Wa(جل جلالە): ڕێی شیریی).

جا لەبەر ئەوەی بێجگە لەم (کاکێشان)ەی ئێمە (کاکێشان)ی دیکەش هەن، واباشە ناوێکی گشتی بۆ ئەو کاکێشانانە بەکاربێنین، بۆ ئەو مەبەستەش چ (کەهکەشان) بەکار بێنین چ (مەجەڕڕە) پێم وایە جیاوازییان نیە.

جا ئێستا با بزانین کەهکەشانی کاکێشان، زانیاریی چی دەربارە دەڵێ؟

زانایان دەڵێن: ئەو کەهکەشانەی لەمەڕ خۆمان-بۆیەش دەڵێین لەمەڕ خۆمان، چونکە لە هەموو کەهکەشانەکانی دیکە لێمان نزیکترە- نزیکەی (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرە، یانی (١٠^١١^) ئەستێرەی تێدایە[1]!!

بەڵام دەزانی تیرە (قطر)ی کەهکەشانەکەمان چەندە؟!

کۆمەڵەی خۆر (المجموعة الشمسية) کە خۆرو نۆ خڕۆکە شوێنەکەوتووەکانی و مانگەکانیانن، تیرەکەی (١٢,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) دوازدە هەزار ملیۆن کیلۆمەترە، بەڵام تیرەی کۆمەڵەی خۆر لەچاو تیرەی کەهکەشانەکەماندا، وەک تیرەی خاڵێک وایە لەچاو تیرەیەکی (٣٢) کیلۆمەتریدا، چونکە تیرەی چەقی کاکێشان نیزیکەی ملیۆن ملیۆن ملیۆن -یانی یەک ملیۆن تریلیۆن- کیلۆمەترە، کە ئەگەر بە ژمارە بینوسین ئاوایە: (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) یان (١٠^١٨^کم)[2]!!

---

(١) (مع الله في السماء) ل١٩١و (راه خداشناسی) ل١٥١ جعفر سبحاني، بەڵام ئێستا: ٢٠١٩/٩/١٩ز زانایان دەڵێن: دەوری یەک تریلیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرە لە کەهکەشانی کاکێشاندا هەیە.

(٢) (مبادئ الكونيات) ل٧٦.

هه‌ڵبه‌ته یه‌ک ملیۆن تریلیۆن کم، ڕێگه زۆرزۆره، چونکه تیشک که له‌هه‌ر چرکه‌یه‌کدا (٣٠٠,٠٠٠) کیلۆمه‌تر ده‌بڕێ، پاش (١٠٠,٠٠٠) سه‌ده‌هه‌زار ساڵ ئنجا ده‌توانێ ئه‌مسه‌رو سه‌ری تیره‌ی چه‌قی کاکێشان بکات[١].

هه‌ڵبه‌ته ئه‌م که‌هکه‌شانه‌ی خۆمان وه‌ک گوتمان نزیکترین که‌هکه‌شانه، بۆیه تیشکه‌که‌ی له نیزیکترین لایه‌وه به‌س (١٥٠,٠٠٠)[٢] ساڵی پێ ده‌چێ که ده‌گاته ئێمه‌ی دانیشتووی زه‌وی!!

ئنجا کۆمه‌ڵه‌ی ڕۆژ که له‌نێو ئه‌م که‌هکه‌شانه‌دایه (٣٠,٠٠٠) سی هه‌زار ساڵی تیشکی له چه‌ق (مرکز)ه‌که‌یه‌وه دووره‌و، نێزیکترین سه‌ری ئه‌م که‌هکه‌شانه (٢٠,٠٠٠) ساڵی تیشکی له کۆمه‌ڵه‌ی ڕۆژه‌وه دووره[٣]!!

هه‌ڵبه‌ته کاکێشانه‌که‌مان وه‌کو هه‌موو خڕۆکه‌و ئه‌ستێره‌و که‌هکه‌شانه‌کانی بوونه‌وه‌ر، به پێچه‌وانه‌ی سووڕانه‌وه‌ی ده‌قه‌ژمێری کاتژمێره‌وه، له ڕۆژئاواوه به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵات ده‌جووڵێ، خێرایی جووڵانه‌که‌شی (١٧٠) میله له هه‌ر چرکه‌یه‌کدا،[٤] (واته‌٢٧٣,٥ کلم چونکه هه‌ر میلێک (١٦٠٩) مه‌تره).

به‌ڵام ئه‌م که‌هکه‌شانه (٢٠٠,٠٠٠,٠٠٠) دووسه‌د ملیۆن ساڵی تیشکی ده‌وێ تا خولێک به‌ده‌وری خۆیدا ده‌دات[٥].

ئه‌وه له بابه‌ت که‌هکه‌شانه‌که‌ی خۆمانه‌وه، به‌ڵام که‌هکه‌شانه‌کانی دیکه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی یه‌کجار دوورن، شاره‌زاییه‌کی ئه‌وتۆ ده‌رباره‌یان نیه،

---

(١) (مع الله في السماء) ل١٩٠، و (الكون) لايف - المكتبة العلمية ل١١٠.

(٢) (مبادئ الكونيات) ل٧٦.

(٣) (مع الله في السماء) ل١٩٢، و (الكون) لايف-المكتبة العلمية ل١١٠.

(٤) سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل١٩٣.

(٥) (الإسلام يتحدى) وحيدالدين خان، چ٥، ص٥٨، ، و (الكون) لايف-المكتبة العلمية، ل١١٠.

ئەوەنـدە هەیـە دەزانیـن کـە نێزیکتریـن کەهکەشـان لـە کەهکەشـانی ئێمـەوە، کەهکەشـانی (ئەندرۆمیدا)یـە، کـە لەکۆنـدا بـە ئەسـتێرەی ڕسـتەژنە (المرئة المتسلسـلة) ناسـرابوو، ئـەم کەهکەشـانە (٢,٠٠٠,٠٠٠) سـاڵی تیشـکی لـە کەهکەشـانەکەمانەوە دوورە، واتـە ئەگـەر سـواری ڕۆکێت (صاروخ)ێک بیـن کـە لـە هـەر چرکەیەکدا (٣٠٠,٠٠٠)کلم ببڕێ، ئنجاپـاش (٢,٠٠٠,٠٠٠) سـاڵ دەگەینـە قەراغـی کەهکەشـانی ناوبـراو[1]!!

کەهکەشـانەکانی دیکـە، هـی وایـان هەیـە ملیۆنـان سـاڵی تیشـکی لێمانـەوە دوورە، بـۆ وێنـە: لەنێـو ئـەو کۆمەڵـە ئەسـتێرەیەدا، کـە لـەلای پێشـینانمان بـە (کـچ، العـذراء) نـاوی دەرکـردوە، هێشـووە مەجەڕڕەیەکـی سـەیر هەیـە، کـە لـە چەنـد هـەزار مەجـەڕڕە پێکهاتـوە، نزیکـەی (٥٠) ملیـۆن سـاڵی تیشـکیی لـە ئێمـەوە دوورە و، بـە خێرایـی (٧٥٠) میـل لـە یـەک چرکـەدا، بـە پێچەوانـەی ڕێـڕەو (اتجـاە)ی کەهکەشـانەکەی ئێمـە دەڕوات.

لـە کۆشـی کۆمەڵـەی ورچـی گـەورە (الـدب الأکبـر)دا، هێشـوویەکی دیکـە هەیـە، کـە لـە دەوری (٣٠٠) مەجـەڕڕە پێکهاتـوەو (٦٥٠) ملیـۆن سـاڵی تیشـکیی لێمانـەوە دوورەو بەخێرایـی (٩٣٠٠) میـل لەچرکەیەکـدا دەڕوات.

لـە کۆمەڵـە ئەسـتێرەی (ئـازا: الشـجاع)دا ژمارەیـەک مەجـەڕڕەی کـەم تیشـک و خەفـە هـەن، لـە شـێوەی هێشـوویەکی چڕدا خۆیـان دەنوێنن، (٢٧٠٠) ملیـۆن سـاڵی تیشـکیی لێمانـەوە دوورن و، لـە چرکەیەکـدا (٣٨٠٠٠) سـی و هەشـت هـەزار میـل ڕێگـە دەبـڕن[2]!!

ئـەوە هەمـووی لەلایەکـەوە، لەلایەکـی دیکەشـەوە زانایانـی گەردوونـاس و فیزیاگـەر دەڵێـن: ئـەو کەهکەشـانە زەبەلاحانـەی بوونەوەریـان لـێپێکهاتوە،

(١) (الکون) تألیف: داڤید برجامینیي و محرري لایف، ترجمة: نزیه الحکیم، ل١٤٤. بەڵام خاوەنی (مع الله في السماء) دەڵێ: (٧٥٠٠٠) ساڵ دوورە، بڕوانە ل١٩٧.

(٢) (الکون) ل١٥٣.

بەردەوام بە خێراییەکی زۆر لە یەکدی دوور دەکەونەوە، بە واتایەکی دی: بوونەوەر بەردەوام لێک دەکشێتەوەو فراوان دەبێ[١]، تەنانەت زانایان دەڵێن: ئەو مەجەڕڕانە هی وایان هەیە بەخێرایی (٣/٢)ی خێرایی تیشک دەڕواو لە مەجەڕڕەکانی دیکە دوور دەکەوێتەوە!، دەڵێن ئەو مەجەڕڕانەی دەکەونە ئەوپەڕی مەودا (مجال)ی دووربینە بێتەلەکان (المناظیر اللاسلكية) بە خێرایی (١٠/٩)ی خێرایی تیشک دەڕۆن و لێمان دوور دەکەونەوە، هەڵبەتە لەولای ئەو مەجەڕڕانەشەوە، هی دیکە زۆرن، بەڵام لەبەر دووردەستیی، نایەنە ژێر ڕکێفی دووربینەکانەوە[٢].

بەڵام ئایا ژمارەی ئەو کەهکەشانانەی، کە هەتا ئێستا مرۆڤ توانیویەتی لە بوونەوەردا بە هۆی دووربینە جۆربەجۆرەکانیەوە بیانبینێ چەندن؟

زانایان وەڵامی جیاجیایان هەیەو هەقیشیانە، هەندێکیان دەڵێن: ژمارەیان سەد ملیۆن (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠)[٣]، هەندێکیش دەڵێن ژمارەی مەجەڕڕەکانی بوونەوەر (٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠)[٤] پێنج سەد ملیۆنە.

بەڵام هەندێکی دیکەیان دەڵێن: بەلانی کەمەوە: یەک تریلیۆن بگرە: ($١٠^{١٢}$) کەهکەشان لە بوونەوەردا هەن[٥]، واتە: دە تریلیۆن!

هەندێکیشیان دەڵێن هێندەی ئەستێرەکانی مەجەڕڕەکەمان ($١٠^{١٠}$) یان ($١^{١٢}$) دەبن[٦].

---

(١) (أساسيات الفيزياء) ل٨٦٢ و (الكون) ل١٥٤ و (الاسلام يتحدى)، ل٥٨ و (دوهزار دانشمند در جستجوى خداى برزگ)، ريموند رواية، ل٢٣١.

(٢) (الكون) ل١٥٤،١٥٣.

(٣) (مع الله في السماء)، ل١٩٧.

(٤) (الإسلام يتحدى)، ل٥٨.

(٥) (بدائع السماء)، ل٢٥٧.

(٦) (الكون الأحدب)، ل٢٥٤، لە (محاضرات في العقيدة)، ل٢٤٢ وەرگیراوە.

جا بێگومان هەرکام لەو کەهکەشانانەش هێندەی کەهکەشانەکەی ئێمە واتە (١[١٢]) یەک ملیۆن ملیۆن ئەستێرە، یان کەمتر یان زیاتری هەر تێدا هەیە، چونکە کەهکەشانەکەی ئێمە، نەک هەر گەورەترین مەجەرڕە نیە، بەڵکو لەچاو هەندێک لەو مەجەرڕانەی کە چەند ملیار ساڵی تیشکیی لێمان دوورن، وەک دەنکە تۆوێکی گچکە وایە[١].

کەواتە ئەگەر بێت و ژمارەی مەجەرڕەکانی[٢] بوونەوەر یەک تریلیۆن (١[١٢]) بێو هەرکام لەو مەجەرڕانەش هەر هێندەی کەهکەشانە گچکەکەی خۆمان (١[١٢]) ئەستێرەی تێدابن، دەزانی ژمارەی ئەستێرەکانی بوونەوەر دەکاتە چەند!

دەکاتە: $١^{١٢} \times ١^{١٢} = ١^{٢٤}$ یانی:

(١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)، واتە ژمارە (١) کە (٢٤) سفری لەپێشەوە هەبن! (یەک تریلیۆن تریلیۆن).

ئەوەندە هەر ئەستێرە لە بوونەوەردا هەن، بەڵام بێگومان هەر ئەستێرەیەک چەند خڕۆکە (کوکب)ی بەدەوردا دەسووڕێنەوە، هەر خڕۆکەیەکیش مانگ(قمر)ێک یان پتری هەیە!

ئنجاسەرەڕای ئەمانەش ملیۆنان (سەدیم) و ئەستێرەی کلکدار (مذنب) و نیازیک و...هتد!!!

ئێستا خوێنەری خۆشەویستم!

بۆ ئەوەی فراوانیی و زەبەلاحیی بوونەوەرمان چاکتر لەلا ئاشکرا بێ - بێگومان هەر ئەوەندە بوونەوەرەی کە هەتا ئێستا هاتۆتە ژێر قەڵەمڕەوی دووربینەکانەوە! -

---

(١) (دوهزار دانشمند درجستجوی خدای بزرگ)، ل٢٣١.

(٢) بەس ئەو مەجەرڕانەی کە هەتا ئێستا دووربینەکان توانیویانە بیانبینن!!!

با ئاوڕێک لە دراوسێ نێزیکەکانمان بدەینەوە:

(مانگ) نێزیکترین شتە لەئێمەی دانیشتووی سەرزەوی، چونکە نێزیکەی (٣٨٤,٥٥١) کم لێمان دوورە[١]، ئنجا وەک گوتمان: تیشک لە چرکەیەکدا (٣٠٠,٠٠٠)کم دەبڕێ، کەواتە تیشک بە چرکەیەک و سێیەکی چرکەیەک لە مانگەوە دەگاتە زەوی، بەڵام دەزانی ڕۆکێتی (ئەپۆلۆ١١) کە یەکەمین ڕۆکێتی ئەمریکایی بوو یەکەمین مرۆڤی سەرزەوی (نیل ئارمسترونگ) بگەیەنێتە سەر مانگ[٢]، بە چەند گەیشتە سەر مانگ! دەوری سێ ڕۆژی پێ چوون! چونکە لە سەعاتێکدا بەس (٦٠٠٠)کم ی دەبڕی.[٣]

بێگومان مانگ لەچاو ئەستێرەو کەهکەشانە دوورەکان، دراوسێیەکی هێندە نێزیکە لە زەوی، دەتوانین بڵێین وەک دوو ماڵ وان، کە دیواریان نێوان بێ! چونکە ئەگەر بێت و بە ڕۆکێتێک کە هەمان خێرایی (ئەپۆلۆ١١) ی هەبێ، بەرەو یەکێک لە خڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆر وەڕێ بکەوین، بۆ وێنە (موشتەریی) سی (٣٠)ساڵمان پێدەچێ، خۆ ئەگەر بمانەوێ سەردانی (پلۆتۆ) بکەین کە دوورترین دراوسێمانە، ئەوە (٢٨٠) ساڵمان پێ دەچێ،[٤] بەڵام ئەگەر بێت و بەرەو (ڕۆژ) بکەوینە ڕێ ئەوە (١٤١,١٦) سەدو چل و یەک شەوو ڕۆژ و شازدە سەعات، یاخود (٢٥,٠٠٠) سەعاتمان پێ دەچێ! چونکە ڕۆژ (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠) کم لە زەوییەوە دوورە، کەواتە:

١٥٠,٠٠٠,٠٠٠کم ÷ ٦٠٠٠ کلم/ سەعات = ٢٥,٠٠٠ سەعات.

---

(١) (مبادئ الكونيات)، ل٩٢.

(٢) (ئەپۆلۆ١١) لە ڕۆژی دووشەممە ٢١ تەموزی ١٩٦٩ز لە سەعات (٣,٥٦) گەیشتە سەر مانگ. المنجد، قسم الأعلام، ل٩٤، چ٢٦.

(٣) (راه خدا شناسی)، ص١٥١.

(٤) (راه خدا شناسی)، ص١٥٢.

٢٥,٠٠٠ ÷ ٢٤ = ١٤١,١٦ سەدو چل ویەک شەوو ڕۆژو شازدە سەعات.

بەڵام تیشک بە (٨,٢) هەشت دەققەو دوو چرکە لە ڕۆژەوە دەگاتە زەوی.

ئەمما ئەگەر بێت و بەرەو نزیکترین ئەستێرە بەهەمان خێرایی بکەوینە ڕێ، کە ئەستێرەیەکە لە کۆمەڵەی (قنطورس) بەناوی (ئەلفاقنطورس) و چوار (٤) ساڵی تیشکیی پتر لێمان دوورە[1]، ئەوە زۆر زۆرمان پێدەچێ تا دەگەینە جێ، چونکە ساڵی تیشکیی، کە یەکەی پێوان (الوحدة القياسية) ی ئەستێرەو کەهکەشانەکانە، بریتیە لەو ماوەیەی، کە تیشک لە ماوەی ساڵێکدا دەیبڕێ، واتە (٦ × ١٠^١٢) میل[2]، کەواتە: ٤ ساڵی تیشکیی × (٦ × ١٠^١٢) = ٢٤ × ١٠^١٢ (٢٤ تریلیۆن میل) لە ئەستێرەی ناوبراوەوە دوورین.[3]

جا ئەگەر بمانەوێ بە (ئەپۆلۆ١١) کە خێراییەکەی (٦٠٠٠کم)ە لە سەعاتێکدا، بەرەو ئەستێرەی گۆرین بڕۆین، دەزانی بە چەند ساڵان دەیگەینێ -پێشەکی پێویستە (٦٠٠٠) کم بکەینە میل، چونکە ساڵە تیشکییەکە بە میل حسێب کراوە، جا هەرچەندە (٦٠٠٠ کم = ٤١٧٣ میل)ە[4] بەڵام بۆ ئاسانیی ئێمە بەس (٤٠٠٠) میل دادەنێین.

کەواتە:

٢٤,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ میل ÷ ٤٠٠٠ میل/ سەعات = ٦,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ (شەش ملیار سەعات).

---

(١) (مبادئ الكونيات)، ل٩١، و (مع الله في السماء)، ل١٧١.

(٢) ساڵی تیشکیی بە وردیی (٥,٨٦٥,٦٩٦,٠٠٠,٠٠٠) میلە، بەڵام بۆ کورتی، گوتراوە: (٦ × ١٠^١٢).

(٣) خاوەنی (مع الله في السماء) (٢٦ بلیۆن ساڵی نووسیوە، چونکە مەجەڕڕەی ناوبراو (٤,٢٧) ساڵ لێمان دوورە، بەڵام ئێمە بۆ ئاسانیی (٤)مان نووسی.

(٤) چونکە هەر میلێک (١٦٠٩) مەترە.

ئنجا هەر ساڵێکیش نزیکەی (٩٠٠٠)[١] سەعاتە، کەواتە:

٦ × ١٠^١٥ ÷ ٩٠٠٠ = **٦٦٦٦٦٦** ساڵ، بەڕێوە دەبین.

بەڵام خوێنەری بەڕێز!

دەبێ ئەگەر بەرەو کەهکەشانەکەی خۆمان کە (١٥٠,٠٠٠) ساڵی تیشکیی لێمان دوورە، چەندمان پێبچێ!

یانی ئەگەر بە (٢/٣) ملیۆن ساڵ ڕێی (٤) ساڵی تیشکیی بەخێرایی (٦٠٠٠)کم لە سەعاتێکدا ببڕین، دەبێ بە چەند ملیۆن ساڵ ڕێی (١٥٠,٠٠٠) ساڵی تیشکی ببڕین؟!!

بەڵام ئایا بوونەوەر بەو قەڵەباڵغی و زەبەلاحییەی، دەگونجێ لێک خشان و لێکدان (اصطدام)ی تەنەکانی تێدا بقەومێ!

زانایان دەڵێن: نەخێر لێکدان ڕوونادات، چونکە ماوەی نێوان کەهکەشانەکان و ئەستێرەکان و خڕۆکەکان هێندە زۆرە، ئیحتمالی لێکدانی دوو مەجەڕڕە، یان دوو ئەستێرە، یان دوو خڕۆکە، کەمترە لە ئیحتمالی لێکدانی دوو مێشوولە کە هەریەکەیان لە شاخێکی دوور لەوی دیکە، لە خولگەیەکی سەربەخۆدا دەفڕێ![٢]

ئنجا زانای ناودار (سیرجیمس جینز) دوای حیسابێکی ورد دەڵێ:

لێکدانی دوو ئەستێرە لە هەر (٦٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) (**٦×١٠**^١٧) جارێک ئیحتمالی هەیە.[٣]

خوێنەری ئازیز!

لەمەوە کە ڕابرد، بۆمان ڕوون بۆوە کە ئەم بوونەوەرە چەند زەبەلاح

---

(١) ساڵێک ٨٧٦٠ سەعاتە.

(٢) (الكون)، ل١٦٤.

(٣) (مع الله في السماء)، ل٢١٤.

و مەزنـە و بۆمـان دەركـەوت، كـە ئـەم بوونـەوەرە-بەپێـی ئـەو تـۆزە زانیارییـەی كـە هەتـا ئێستا مرۆڤ لەبارەیەوە وەدەستی هێنـاوە- بەپێی بەرنامـەو پەیڕەوێكـی یەكجـار زانیارییانـەی پـڕ وردەكاریـی بەڕێـوە دەچـێ و، هێنـدەی سـەری دەرزییەكیـش بێیاسایی و ناڕێكیـی تێدا بـەدی ناكـری.

جـا ئێسـتا كـە بـە شـێوەیەكی گشـتی سـەبارەت بـە گـەورەیـی و زەبەلاحیـی بوونـەوەر چەنـد شـتێكمان خسـتە ڕوو، بابچینـە سـەروكاری یـەك یەكـی ئەندامەكانـی بوونـەوەرو، چەنـد گوڵێـك لـەو گوڵزارە هەڵبژێریـن و، چەپكێكـی وایـان لـێ پێـك بێنیـن، كـە بتوانـێ لەباتـی جارێـك سـەدجار ئیسپاتی بكات، كە بوونەوەر سـەرلەبەری ڕێـك وپێكیـی و وردەكارییەو، شـوێنپەنجەی خوایەكی زانـاو توانـاو كاربەجێـو میهرەبـان بەهەمـوو وردو درشـتێكیەوە دەدرەوشـێتەوە.

بەڵـێ دوای ئـەوەی زانیمـان، كـە زانیاریـی مرۆڤ لـە چاخـی زێڕینیدا، زۆر لـەوە كەمتـرە، كـە پـەی بـە تـەواوی ئـەو ڕێـك وپێكیـی و وردەكارییـە بـەرێ، كـە لـە دروسـتكرانی بوونـەوەردا ڕەچاوكـراوە، هـەر هێنـدەی پێدەكـرێ، كـە لەبـەردەم بوونـەوەری گـەورەو زەبەلاحدا، سەرسـامیی و دەستەوسـتانیی خـۆی دەرببـڕێ و بڵێ:

(ئایینـی مـن بریتیـە لـە سەرسـامیی-بەخۆ بەگچكـە زانینـەوە- بەرانبـەر بـەو خوایە بێسنوورەی، كە بەهۆی ئەو شارەزاییە گچكەو كەمانەوە، كە بیروهۆشـی لاوازمـان توانـای زانینیانـی هەیـە، دەدرەوشـێتەوەو، ئایینـی مـن بریتیـە لە بڕوایەكی پـڕ لـە سـۆزی قـووڵ بـە هەبوونـی دەسـتەڵاتێكی زانـاو مشـورخۆر، كـە لـە هەرشـوێنێكی ئـەم بوونـەوەرە سەرسـامكەرەدا كـە سـەرنجی بدەیـن، دەبینـرێ...)[1]

دوای ئـەوە، بـا بچینـە سـەروكاری هەندێـك لـەو دیاردانـەی، كـە لـە دەوروبـەرمانـن و لێمـان نزیكـن و، چونكـە زۆر دوورەدەسـت نیـن، زانیـاری زیاتـر

---

(١) یەكێكـە لـە قسـە بەنرخەكانـی شـارەزاترین مرۆڤـی سـەرزەوی لەسـەدەی بیسـتەمدا سـەبارەت بـە بوونـەوەرو دیـاردە ڕێـك وپێكەكانـی، ئەویـش زانـای نـاودار (ئاینیشـتاین)ە، بڕوانـە (مع الله في السماء)، ل٢٠٨.

توانـای بەسـەر دەرخستنی ڕێـک وپێکیـی و وردەکارییانـدا دەشـکێ و، پتـر توانـای پەیبـردنی هەیـە بـە ڕازو نهێنییەکانیـان.

## دیاردەی دووەم: خڕۆکـەی زەوی

﴿ وَفِي ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ (الذاريات ٢٠)

ئـەم خڕۆکەیـەی کـە لەسـەری دەژیـن، هەرچەنـدە لەچـاو کەهکەشـانە زلـەکان، وەک دەنکـە گەنمێـک وایـە لـە بەرانبـەر چیایەکـی بـەرزدا، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا تاقـە[1] خڕۆکەیەکـە، کـە توانیبـی بـاوەش بـۆ ژیانێکـی ژیاندارانـە بگرێتـەوەو مرۆڤـی لەسـەر بحەوێنێتـەوە.

هەڵبەتـە ئـەوەش بـێ هـۆ نیـەو، دیـارە دروسـتکرانی زەوی چەنـد هـەل ومەرجێکـی تێدا ڕەچـاو کـراون، کـە لـە هیـچ خڕۆکەیەکـی دیکـەدا نیـن -بێگومـان ئەسـتێرەکان لەوبـارەوە هـەر پێویسـت نـاکا بـاس بکرێـن-.

جـا لێرەدا دەمـەوێ زۆر بەکورتـی دەربـارەی ئـەو هـەل ومەرجـە تایبەتییانـە بدوێـم، کـە وایـان لـە زەوی کـردوە لـە هەمـوو بوونـەوەردا بارێکـی نائاسـایی ڕیزپەڕ (شـاذ) بەخۆوە بگرێـو، ببێتـە نیشـتمانی مرۆڤ و لانکـەی تێدا ڕاژانی و ژینگـەی تێـدا نیشـتەجێکرانی.

کەواتـە بـا لـە چەنـد خاڵێکـدا ئـەو تایبەتمەندییانـە بخەینـە ڕوو، کـە نشینگەو دەوروبەرێکـی وایـان لـە زەویـدا ڕەخسـاندوە، کـە ژیانێکـی ژیاندارانـەی تێـدا پەیـدا بـێ:

### ١) شوێنی زەوی لە کۆمەڵـەی خۆردا:

---

(١) بە پێی زانیاریی ئێستای مرۆڤ لەبارەی بوونەوەرەوە.

زەوی (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠) سەدو پەنجا ملیۆن کیلۆمەتر لە ڕۆژەوە دوورە، ئەم ماوەیەش ماوەیەکی مام نێوەندییەو، وایکردوە کە زەوی نەهێندە لە ڕۆژێ نزیک بێ، کە ببێتە دۆزەخێکی بلێسەداری گەرمی وەک (عطارد) کە نزیکترین خڕۆکەیە لە ڕۆژەوە-(٥٨) ملیۆن کم لێی دوورە- و ئەو دیوەی، کە بەرەو ڕۆژە پلەی گەرمیی دەگاتە (٤٠٠) پلەی سانتیگراد[١]، و نەهێندەش لێی دووربێ، کە لەئەندازەی پێویست کەمتر تیشکی ڕۆژی بگاتێو، وەک (پلۆتۆ)-کە نزیکەی (٥٩١٥) ملیۆن کم لە ڕۆژەوە دوورە-و ببێتە جیهانێکی ساردی بەستەڵەک[٢].

## ٢) چۆنیەتی سووڕانەوەی زەوی:

أ- زەوی سووڕانەوەیەکی هەیە بەدەوری ڕۆژدا لە خولگەیەکدا، کە (٩٤٢) ملیۆن کیلۆمەتر درێژە، بە (٣٦٥) ڕۆژو نزیکەی چواریەکی ڕۆژێک (٥ سەعات و ٤٨ دەقەو ٤٠ چرکە) تەواوی دەکات، واتە لە ماوەی ساڵێکدا،[٣] بەخێرایی (١٨) میل (٣٠کلم) لە چرکەیەکدا،[٤] واتە نزیکەی (٦٥,٠٠٠) میل لە سەعاتێکدا.[٥]

ب- سووڕانەوەیەکی دیکە هەیە بە دەوری خۆیدا لە ماوەی (٢٤) سەعاتدا جارێک دەسووڕێتەوە بە خێرایی (١٠٠٠) میل لە سەعاتێدا {(٣٠کلم) لەدەقەیەکدا} هەڵبەتە ئەندازەی خێرایی سووڕانەوەی زەوی، چ بەدەوری خۆیداو، چ بەدەوری ڕۆژدا ئەندازەیەکی مام نێوەندیی و گونجاوە لەگەڵ ژیانی مرۆڤ و دانیشتووانی دیکەی سەر زەویدا.

(١) (راه خدا شناسي)، ل١٦٠.

(٢) (مبادئ الكونيات)، ل٩٠.

(٣) (راه خدا شناسي)، ل١٧١.

(٤) (قصة الإيمان)، ل٣٢٠

(٥) (قصة الإيمان)، ل٣٢٠

بۆ وێنە: ئەگەر لەجیاتی (١٠٠٠) میل بە خێرایی (١٠٠) میل لە سەعاتێکدا بەدەوری خۆیدا خولابایەوە، ئەوە شەوگارو ڕۆژگار یەکی دەبوونە (١٢٠) سەعات! ئنجا حەتمەن لە ئەنجامی ئەو درێژبوونەی شەوو ڕۆژیشدا، ژیان لە دانیشتوانی سەر زەوی تێک دەچوو، چونکە ڕۆژگار هێندە گەرم دەبوو، شیناوردو دارودرەخت دادەگیرسان و، شەوگاریش هێندە سارد دەبوو، داروبەردی دەبەست.

دیسان ئەگەر زەوی لەجیاتی (١٨) میل، بەخێرایی (٩) یان (٣٦) میل لەچرکەیەکدا بەدەوری خۆردا سووڕابایەوە، ئەوە بێگومان لە حاڵەتی یەکەمدا ساڵ دەبوو بە (١٨٢,٥) ڕۆژ و وەرزەکان (فصول)ی ساڵ دەبوونە مانگ و نیوێک و، لە حاڵەتی دووەمدا ساڵ دەبوو بە (٧٣٠,٥) ڕۆژو، وەرزەکان یەکی دەبوونە (٦) مانگ!! بێگومان لە هەردووک حاڵانیشدا ژیانی ژیانداران تێک دەچوو!

### ٣) لاریی خولگەی زەوی:

زەوی کە بەخێرایی (١٨) میل لەچرکەیەکدا بەدەوری ڕۆژدا دەسووڕێتەوە، ئەو خولگە (محور)یەی، کە تێیدا دەسووڕێتەوە بە (٢٣,٥) بیست و سێ پلەو نیو لە هێڵی یەکسانیی (خط الإستواء) لایداوەو خوارە، جا بەهۆی خواریی خولگەوە، چۆنیەتی لێدانی تیشکی ڕۆژ لەڕووی زەوی دەگۆڕێ، ئنجا لە سۆنگەی ئەوەشەوە چوار وەرزەکان (هاوین، پاییز، زستان، بەهار) پەیدا دەبن.

چونکە لەو شوێنانەدا، کە تیشکی ڕۆژ بە شاقۆڵیی (عمودي) دەکەوێتە سەر زەوی، ساڵ گەرم دادێو بەلای هاوینەوە دەچێو، لەو شوێنانەشدا، کە بەلاریی (میلان) دەکەوێتە سەر زەوی، ساڵ سارد دەبێو بەلای زستانەوە

دەچێ.

کەواتـە ئەگـەر خولگـەی زەوی بـەدەوری ڕۆژدا بازنەیەکی تـەواو و ڕاسـت بایـە، چـوار وەرزەکان دروست نەدەبوون، چونکـە تیشکی ڕۆژ بەدرێژایی ساڵ وەک یـەک دەکەوتـە سـەر هەمـوو بەشـەکانی زەوی و، هیـچ شـوێنێکی زەوی لەشـوێنەکانی دیکـەی ساردتر نەدەبوو[1].

دیـارە دووریـی و نزیکیـی زەویـش لـە ڕۆژەوە کاردەکاتـە سـەر گـەرمیـی و سـاردیی ئاووهـەوای زەوی، بـەڵام دووریـی و نزیکیـی لـەڕۆژ، چـوار وەرزەکان نایەنێتـە دی.

## ٤) قـەبـارەو بـارسـتایی زەوی:

قەبارە (حجم)ی زەوی (١/١,٣٠٠,٠٠٠)ی قەبارەی ڕۆژە[2]، واتـە قەبارەی ڕۆژ ملیۆنێـک و سێسـەد هـەزار جـار لـە قەبـارەی زەوی گەورەتـرە، بـەڵام بارستایی (کتلة)یەکەی (١/٣٣٢,٠٠٠)ی بارستایی ڕۆژە، یانی بارستایی ڕۆژ (٣٣٢,٠٠٠) جار لـە بارستایی زەوی پترە، (بارستایی زەوی $٦×١٠^{٢١}$ تەنـە).

جـا بێگومـان زیـادی قەبارەو خێرایـی سـووڕانەوە، پەیوەندییەکی پێچەوانـەو، زیادیی بارستایی-کێش-و هێزی ڕاکێشانیش، پەیوەندییەکی ڕاستەوانەیان لـە نێوانـدا هەیـە[3].

کەواتـە ئەگـەر هاتبـاو قەبارەی زەوی لـەو ئەندازەیـەی کـە ئێسـتا هەیەتـی گەورەتـر بووایـە، ئـەوە کاری دەکـردە سـەر هێواشـکردنەوەی سـووڕانەوەی زەوی،

---

(١) (مبادئ الکونیات)، ل٨١، و (مع الله في السماء)، ل٨٩.

(٢) قەبـارەی زەوی لـە (١٢١٠)کلم٣، یانـی یـەک تریلیـۆن کیلۆمەتـر سێجا زیاتـرە. بڕوانـە کتێبـی (محاضـرات فـي العقیـدة) أحمـد البهادلـي، ل٢٣٩، و(قصـة الإیمـان)، ل٣٠٩.

(٣) (قصة الإیمان بین الفلسفة والعلم والقرآن) الشیخ ندیم الجسر، ل٣٢٠.

چ بەدەوری خۆیداو چ بەدەوری ڕۆژدا، خۆ ئەگەر گچکەتر بووایە، ئەوە بەپێچەوانەوە دەبووە هۆی خێراکردنی جووڵانی، ئاشکراشە کە لە هەردووک حاڵاندا ژیان دەشێوا.

دیسان ئەگەر-خوانەخواستە و نەشی خواستوە- کێشی زەوی لەم ئەندازەیەی کە لەسەریەتی، کە بریتییە لە (٦×١٠٢١) تەن، یانی شەش هەزار ملیۆن تریلیۆن تەن زیاتر بوایە، یان کەمتر، سەر زەوی بەکەڵکی ژیان نەدەهات.

بۆ وێنە: ئەگەر کێش و بارستایی زەوی هێندەی (٦/١) شەشیەکی کێش و بارستایی ئێستای بایە، واتە وەک مانگ بایە، ئەوە شتێک کە ئێستا لەسەر رووکاری دەریاوە کێشەکەی (٦٠)کیلۆگرامە، ئەوکات دەبوو بە (١٠) کیلۆ!

ئنجا لە حاڵێکی وادا وێڕای ئەوەی کە جموجووڵ لەسەر زەوی زۆر سەخت دەبوو، ئاووهەوای دەوری زەوییش بە مەردەی ئاووهەوای دەوری مانگ دەچوو و، پشووە بایەک و دڵۆپەئاوێکی بە دەوردەوە بەند نەدەبوو، ئەوەش بەهۆی کەمبوونی هێزی ڕاکێشانەوە!!

خۆ ئەگەر بارستایی زەوی، دوو هێندەی ئێستای بووایە، ئەوە هێزی ڕاکێشانی زەوی دوو هێندەی ئێستای لێ دەهات و، لەباتی ئەوەی لەسەر هەر (١سم٢) یەک کیلۆگرام کێشی هەوا هەبێ، بۆ هەر (١سم٢) دەبوو بە دوو کیلۆ!!

بەڵام ئەگەر بارستایی زەوی (١٥٠) هێندەی ئێستای بایە، ئەوە هێزی ڕاکێشانیشی (١٥٠) هێندەی ئێستا زیادی دەکردو، بەرزیی هەوای دەوری زەوی لە (١٠) کم کەمتر دەبوو و، هەڵمی ئاو نەیدەتوانی بەرزبێتەوەو، پەستان (ضغط)ی هەوا لەسەر (١سم٢) دەگەیشتە (١٥٠)کیلۆگرام و، جەستەی مرۆڤ هێندەی (سمۆرە)یەکی لێدەهاتەوەو، هەر گرامێک دەبوو بە (١٥٠) گرام و ئیدی ژیان لەسەر زەوی مەحاڵ دەبوو[١]!!

(١) (هستی بخش) عبدالکریم هاشمی نژاد، ل١٣٨،١٣٧، چاپ سوم.

**٥) هەوای دەوری زەوی:**

زەوی تۆپێکە توێکڵێکی (بەردین)ی تێ وەرپێچراوە، زۆربەی ئەوتوێکڵە بەردینە بە چینێک ئاو داپۆشراوە، چینە بەردو ئاوەکەش پێکڕا بە چینێک هەوا دەورەدراون، ئنجائەو هەوایە چینەگازێکی ئەستوورە، وەک دەریا، قووڵایی هەن، جا ئێمەو ژیانداران و ڕووەک زۆر بە ئاسوودەیی لەو قووڵاییەدا دەژین.

بێگومان هەوای دەوری زەوی، یەکجار گرنگ و بایەخدارە بۆ ڕووەک و ژیاندارانی سەر زەوی، ئێمەی مرۆڤ بەبێ هەڵمژینی هەوا-ئۆکسجین- پێنج دەقیقە ناژین، ڕووەک جەستەی خۆی لە هەوا-دووەم ئۆکسیدی کاربۆن- دروست دەکات، ئێمەش ڕووەک دەخۆین و ئەو ئاژەڵ و پەلەوەرانە دەخۆین کە لەسەر ڕووەک دەژین و، لە هەردووکیان جەستەی خۆمان پێکدێنین، دەمێنێتەوە نایترۆجین، ئەمیش بۆ پارسەنگ کردنی ئۆکسجینە، چونکە ئەگەر نایترۆجین نەبێ بەهۆی هەڵمژینی ئۆکسجینەوە دەسووتێین، هەڵمی ئاویش بۆ شێدارکردنەوەی هەوایە.[1]

ڕێژەی هەبوونی ئەم توخمانەش لە هەوای دەوری زەویدا، بەگوێرەی گرنگیی و پێویستییانە بۆ بە دانیشتوانی سەر زەوی، ڕێژەی دابەشبوونیان ئاوایە:

نایترۆجین (٧٨٪)، ئۆکسجین (٢١٪)، دووەم ئۆکسیدی کاربۆن (٣ر٠٪) یانی (٣/١٠٠٠)، ئەوەی دیکەش هەڵمی ئاوو هەندێک گازی دیکەی وەک: ئەرگۆن، هیلیۆم، نیۆن، هایدرۆجین، زینۆن، کربتۆن، پێکی دێنن[2].

جا ئەگەر هاتباو لەجیاتی (٢١٪) ڕێژەی گازی ئۆکسجین لە هەوادا ٥٠٪ یان ١٠٪ بایە، ئەوە لە حاڵەتی یەکەمدا بڵێسەی هەورەتریشقەیەک بەس بوو

---

(١) بە تۆزێک دەستکارییەوە لە (مع الله في السماء)، ل١٠٠ وەرگیراوە.

(٢) (مبادئ الكونيات)، ل٨٢.

بۆ داگیرساندنی هه‌موو جه‌نگه‌ڵ و دارستانه‌كانی سه‌ر زه‌وی و، له‌ حاڵه‌تی دووه‌مدا ئه‌گه‌ر گریمان ژیانداران توانیباشیان خۆیان بگونجێنن، كه‌مێك نه‌بێ پێكهێنه‌ره‌كانی شارستانه‌تی له‌سه‌ر زه‌وی نه‌ده‌بینران، بۆ وێنه‌ (ئاگر) نه‌ده‌بوو[1]! هه‌ڵبه‌ته‌ له‌ حاڵه‌تێكی واشدا ژیارو شارستانه‌تی نه‌ده‌ڕه‌خسان!!

دیسان ئه‌گه‌ر هاتباو (نایترۆجین) ڕێژه‌كه‌ی كه‌متر با له‌ ٧٨٪، ئه‌وه‌ نه‌ پارسه‌نگی كاریگه‌ریی ئۆكسجینی بۆ راده‌گیرا، نه‌ ڕووه‌كیش ده‌یتوانی ئازووقه‌و بژێو بۆ ژیانداران دابین بكات[2] ئه‌گه‌ر زیاتریش بوایه‌ ئه‌وه‌ زیاد له‌پێویست كاری له‌ (ئۆكسجین) ده‌كردو ئه‌و هاوسه‌نگی (تعادل)یه‌ی تێكده‌دا كه‌ ئێستا هێناویه‌ته‌دی.

(دووه‌م ئۆكسیدی كاربۆن)یش دیسان ئه‌گه‌ر ڕێژه‌كه‌ی (٣/١٠٠٠) نه‌بوایه‌، ژیانی ڕووه‌ك و ژیانداران ده‌كه‌وته‌ مه‌ترسییه‌وه‌، چ كه‌متر با، یا زیاتر، چونكه‌ له‌ حاڵه‌تی یه‌كه‌مدا: ڕووه‌ك وشیناورد بێبژێو و ڕۆژی ده‌كه‌وتنه‌ گۆڕێو، له‌ حاڵه‌تی دووه‌میشدا: بێجگه‌ له‌وه‌ی كه‌ ئاگر په‌یدا نه‌ده‌بوو، مرۆڤیش ته‌نگه‌نه‌فه‌س ده‌بوو و ره‌نگه‌ مردباش!

ئه‌مما وه‌نه‌بێ گرنگیی و بایه‌خیی هه‌وای ده‌وری زه‌وی، هه‌ر ئه‌وانه‌ بێ كه‌ گوتران، به‌ڵكو زۆر زیاترو مه‌زنتره‌، به‌ڵام لێره‌دا ده‌رفه‌تی ئه‌وه‌مان نیه‌ به‌درێژیی پێیاندا بچینه‌ خوار، بۆیه‌ هه‌ر به‌كورتی ئاماژه‌ بۆ هه‌ندێكیان ده‌كه‌ین:

١- ئه‌گه‌ر هه‌وا به‌ده‌وری زه‌وییه‌وه‌ به‌م شێوه‌ی ئێستا نه‌بووایه‌و، به‌ ئه‌ندازه‌ی كیلۆگرامێك په‌ستان (ضغط)ی نه‌خستبایه‌ سه‌ر هه‌ر (١سم$^{٢}$)، ئه‌وه‌ مادده‌ شله‌كانی نێو له‌شی ئێمه‌و ژیاندارانیش، به‌ فیچقه‌ ده‌هاتنه‌ ده‌رێ و، مردنی هه‌ره‌وه‌زیی ڕووی تێده‌كردین!!

---

(١) (Man does not stand alone : مرۆڤ به‌ته‌نێ ناژی) كریسی مۆریسۆن، وه‌رگێرانی بۆ عاره‌بی به‌ناوی (العلم یدعو للإیمان) به‌ قه‌ڵه‌می محمود صالح الفلكی، ل٧٨،٧٠.

(٢) هه‌مان سه‌رچاوه‌.

ئنجا ئەگەر هەوا بە دەوری زەوییەوە هەشبایە، بەڵام لەم ئەندازەیەی ئێستا، کە بە بەرزیی (١٥٠٠کم)ە[١]، کەمتر یان زیاتر بووایە، ئەوا لە حاڵەتی یەکەمدا پەستانی هەوا کەم دەبوو و، لە حاڵەتی دووەمدا زیاد دەبوو، لە هەردووک حاڵانیشدا ژیانی مرۆڤ و ژیاندارانیش تێکدەچوو.

٢- ئەگەر هەوا بەدەوری زەوییەوە نەبووایە، دنیا دەبوو بەشەوەزەنگ و تاریکستان، چونکە رووناکیی سەر زەوی لە ئەنجامی ئەوەدا دێتەدی کە شەپۆلەکانی تیشک بەهۆی لێکدانیان لەگەڵ گەردەکان (جزیئات)ی هەوادا دەشکێنەوەو بڵاودەبنەوەو، سەرزەمین ڕووناک دەبێ[٢].

٣- ئەگەر هەوا بەدەوری زەوییەوە نەبووایە، کەس دەنگی کەسی نەدەبیست و دنیا دەبوو بە (شاری خامۆشان) و، هەرکەسە لە جیهانێکی تایبەتی خۆیدا دەژیا، ئەگەر ژیابا، چونکە کە ئاخاوتن و یەکدی دواندن نەبوو، کەسیش فێری زمان نابێو...هتد!! ئاخر (دەنگی) ئێمە بۆ دروستبوونی، هەم حەوجێی هەوای سییەکان و پەستانی نێو پەنچکە و، هەم بۆ گوێزانەوەی لەزاری قسەکەر (متکلم)ەوە بۆ گوێی دوێنراو (مخاطب) پێویستیی بە شەپۆلەکانی هەوا هەیە، ئەو هەوایەی کە بەخێرایی (٣/١کم)[٣] یانی (٣٣٣) مەتر لە چرکەیەکدا دەنگ دەگوازێتەوە.

٤- ئەگەر هەوا نەبووایە، دڵۆپە بارانێکمان چەنگ نەدەکەوت، چونکە ئەو هەڵمەی کە بەهۆی گەرمیی تیشکی ڕۆژەوە لە دەریاکان پەیدا دەبێ، هەر هەوایە کە لە کۆڵێی دەنێو، بەرەو چینە ساردەکانی هەوا بەرزی دەکاتەوەو، خەست دەبێتەوەو دەبێتە باران و بەفرو تەرزە، دیسان هەر بایە کە هەورەکان لەسەر یەک کەڵەکە دەکات و متوربەیان دەکات.

---

(١) (مبادئ الكون)، ل٨٢.

(٢) (مع الله في السماء)، ل١٠١-١٠٢.

(٣) مجلة العربي الكويتية، العدد ٣٢٢ ذوالحجة، ١٤٠٥هـ، ل١٩٨.

٥- دیسان ئەگەر زەوی هەوای بەدەورەوە نەبووایە، زۆربەی دارودرەخت و گوڵ و شیناورد، دیاردەی پیتاندن (تلقیح)یان تێدا نەدەهاتە دی و، بەریان نەدەگرت، چونکە هەوا سەرەکیترین دەوری هەیە لە هێنانەدی ئەم دیاردەیەدا؛ (با) تۆوی نێرەکان هەڵدەگرێو دەیگەیەنێتە مێیەکان.

٦- ئەگەر چەتری هەوا لەسەرسەری دانیشتوانی زەوی هەڵنەدرابایە، نە ڕووەک و نە ژیانداران و نە مرۆڤ، هیچیان هەتا ئێستا شوێنەوارێکیان لەسەر زەوی نەدەبینرا! بەڵێ هەوای سەر سەرمانە کە وەک زرێیەکی پۆلایین هەموو ڕۆژێ لە هێرشی (٢٠,٠٠٠,٠٠٠) بیست ملیۆن بەردی ئاسمانیی کە بە خێرایی (٥٠)کلم لە چرکەیەکدا بەرەو زەوی دێن، دەمانپارێزێ.

بەڵێ هەوای سەرسەرمان ئەو بەردە گەرمانە دەسووتێنێو لە شێوەی تۆزو گەردو خۆڵەمێشدا بڵاودەبنەوە[١].

٧- سەرەڕای ئەوەی کە هەوا بەهۆی (ئۆکسجین)ەوە هەموو ڕۆژێ لە نزیکەی (٢٠) ملیۆن بەردمان قوتار دەکات، وێڕای ئەمەش قەڵغانێکی یەکجار بایەخداریشە بۆ شکاندنەوەو بڵاوکردنەوە (تشتیت)ی تیشکە زیانبەخشەکان؛ تیشکی سەرو بنەوشەیی، تیشکەجیمی، تیشکە گەردوونیی (الأشعة الكونية)، واتە ئەگەر خوا بە بەزەیی خۆی قەڵغانی هەوای لەسەر سەر ڕانەگرتباین، تیشکە زیانبەخشەکان قڕەواریان لە ئێمەش و ژیاندارانیش دەبڕی[٢].




---

(١) (The Evidence of God) جان کلوور موسما، وەرگێڕانی بۆ فارسی بەناوی (اثبات وجود خدا) بە قەڵەمی: ارام، أمین، مجتهدی، ل٢٠، چاپ ٤.

(٢) (مبادئ الكونيات) ل١٠و١١.

خوێنەری ئازیز!

لێدوان دەربارەی خڕۆكەی زەوی (هەویرێكە ئاوی زۆر دەوێ) و گەلێك شت ماوە، كە سەبارەت بە ڕێك وپێكیی و وردەكاریی دروست بوون و هەڵكەوتنی زەوی بیڵێین، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێرە بۆو جۆرە باسانە تەرخان نەكراوە، هەر بەوەندە وازدێنین و دەچینە سەرباسێكی دیكە لە دیاردە یاسادارو ڕێك وپێكەكانی بوونەوەر[1].



---

(١) لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد)دا زۆر شتمان لەبارەی (زەوی) یەوە خستۆتە ڕوو.

## دیارده‌ی سێیه‌م: له‌شی مرۆڤ

﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ (الذاريات- ٢١)

**خوێنه‌ری به‌ڕێز!**

له‌ دوو دیارده‌ی ڕابردوودا-بوونه‌وه‌رو خڕۆكه‌ی زه‌وی- له‌ ڕوانگه‌ی دووربین (تلسكوب)ی زانایانه‌وه‌ سه‌رنجی گه‌وره‌یی و ڕێك وپێكیی و ورده‌كاریی بوونه‌وه‌رمان داو، ده‌ركه‌وت كه‌ به‌دیهێنه‌ری بوونه‌وه‌ر، تا چ ڕاده‌یه‌ك یاساو ورده‌كاریی خستۆته‌ نێو ئه‌م بوونه‌وه‌ره‌ مه‌زنه‌وه‌ و له‌ دوو دیارده‌ی ڕابردوودا، زۆر درشت بین بووین و ساڵی تیشكیی و ته‌ن و میل و كیلۆمه‌تر، ویردی سه‌ر زمانمان بوون.

به‌ڵام له‌م دیارده‌یه‌دا، دووربین كه‌ڵكمان ناگرێو پێویسته‌ وردبین (میكرۆسكۆب) به‌ ده‌سته‌وه‌ بگرین، ئه‌مما وردبینی ئاسایی نا، به‌ڵكو وردبینی ئه‌لیكترۆنی (المجهر الألكتروني)!!

ئنجا پێویسته‌ مایكرۆن و ئه‌نگسترۆم و گرام، بكه‌ینه‌ پێوه‌رو ته‌رازوو و یه‌كجار به‌سه‌لیقه‌ وردبین بین.

ئنجا بێگومان ئه‌گه‌ر مادده‌ی بێژیان جارێك ڕێك وپێكی و یاسای تێدا به‌دی بكرێ، ژیانداران و له‌نێو ژیاندارانیشدا به‌تایبه‌تی ئینسان، ده‌یان و سه‌دان جار ورده‌كاریی و ڕێك وپێكییان تێدا ده‌رده‌كه‌وێ، وه‌ك مانگ له‌ شه‌وی چوارده‌یدا ده‌دره‌وشێته‌وه‌.

پێشینانیشمان به‌خۆڕایی نه‌بووه‌ گوتوویانه‌: (من عرف نفسه فقد عرف ربه) هه‌ركه‌سێك خۆی ناسیبێ، په‌روه‌ردگاری خۆشی ناسیوه‌.

دیسان ئەو خواناسە ژیرەی کە گوتوویەتی:

(أتحسب أنك جُرم صغير وفيك انطوى العالم الأكبر؟!!)

ئایا خۆت بە تەنێکی گچکە دەزانی، لەحاڵێکدا کە بوونەوەری هەرەزل لەتۆدا پێچراوەتەوە؟؟ زانیویەتی چ دەڵێ!

جا ئێمە لەم کورتەباسەدا نامانەوێو ئەگەر بشمانەوێ ناتوانین، کە سەبارەت بە هەموو لایەنەکانی مرۆڤ بدوێین، بەڵکو پێشەکی نەختێک دەربارەی گچکەترین خشت (لبنة)ی پێکهاتنی جەستەی ئینسان دەدوێین و، ئنجا لە دواییدا نیگایەکی گشتی و خێرا بە تێکڕای کۆئەندامەکان (أجهزە)ی نێو لەشی مرۆڤدا دەخشێنین:

## خانەکانی لەش:

هەروەک چۆن گچکەترین خشتی پێکهاتنی هەر تەنێکی بێ ژیان گەردیلەیە، گچکەترین خشتی پێکهاتنی ژیانداریش-هەر لە ئەمیباوە بیگرە هەتا مرۆڤ- خانەیە.

بەڵام ئایا دەزانی کۆشکی جەستەی ئینسان لە چەند خشت لەو خشتانە دروست بووە! لەشی مرۆڤێکی تەواو لە نزیکەی (١٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) دە ملیۆن ملیار خانە دروست بووە، کە بۆ کورتی ئاوا دەنووسرێ (١٠[١٦])!![1]

بەڵام دەزانی ئەم ژمارەیە چەند زۆرە؟! ئەگەر بێت و کەسێک بیەوێ ئەم ژمارەیە بژمێرێ، بە واتایەکی دی، ئەگەر کەسێک بیەوێ ژمارەی خانەکانی جەستەی یەک مرۆڤ بژمێرێ، بۆ ئەوەی لە ماوەی: (٣٣٣,٣٣٣,٣٣٣) (سێسەدو سی وسێ ملیۆن و سێسەدو سی و سێ هەزارو

---

(١) هەندێك لەزانایانیش بەسەد تریلیۆن (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) (١٠[١٤]) خانە مەزەنەیان کردوون.

سێسەدو سی و سێ ) ساڵدا لێوەبێ، دەبێ لە هەر چرکەیەکدا یەکێک بژمێرێ، بەبێ ڕاوەستان و پشوودان!

چونکە (ساڵ)ێک (٣١,٥٣٦,٠٠٠) چرکەیە، جا ئەگەر بێت و ئێمە هەر (٣٠,٠٠٠,٠٠٠) چرکەش دابنێین و ژمارەی خانەکانی لەشی مرۆڤ دابەش بکەین بەسەر ئەو سی ملیۆن چرکەیەدا، ئەوە ئاوا دەردەچێ:

١٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ ÷ ٣٠,٠٠٠,٠٠٠ = **٣٣٣,٣٣٣,٣٣٣** ساڵ!!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

ئەو زاناو شارەزایەی کە جەستەی مرۆڤی پێکهێناوە، دەبێ تواناو زانیاری بێسنووری هەبێ، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە لە دە ملیۆن ملیار خشت دروستی کردوە، هەرکام لەو دە ملیۆن ملیار خشت (خلیة)یەش، لانی کەم لە (١٠×٧ ١١) حەوت تریلیۆن گەردیلە پێکهاتوون[1]، کەواتە تێکڕای لەشی مرۆڤ بەلای کەمەوە لە: ١٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ × ٧ ١١ = ٧ ٢٨، حەفتا هەزار ملیۆن ملیۆن ملیۆن گەردیلە دروست بووە!

کەواتە هەرکام لەو دە ملیۆن ملیار خانەیەی کە جەستەی مرۆڤ -واتە بەس دیکۆرو ڕواڵەتی دەرەوەی- پێکدێنن، یەکی لە حەوت تریلیۆن گەردیلە-بەلای کەمەوە- پێک دێن، ئنجا هەرکام لەو حەوت تریلیۆن گەردیلەیەش، لانی کەم لە (٢٠٠) تەنۆلکە (جُسَیم) پێک دێن[2]!!

---

(١) چونکە هەر خانەیەک لە (٤٦) کرۆمۆسۆم و هەر کرۆمۆسۆمێکیش لە (٢٥,٠٠٠) جین و هەر جینێکیش لە (٣) ملیۆن گەردیلە پێکدێ، جا بێگومان ئەو (٤٦) کرۆمۆسۆمە بەس نێوکی خانە پێک دێنن، کەواتە توێلک و سپێنە (سیتوپلازم)یش لانی کەم بە هەردووکیان هێندەی کرۆمۆسۆمەکان گەردیلەیان تێدا هەن، کەواتە: ٤٦ × ٢٥,٠٠٠ = ١,١٥٠,٠٠٠ × ٣ × ١٠ ٦ × ٢ = ٦,٩٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ (٦٩ X ١٠ ١١) واتە نیزیکەی (٧) تریلیۆن. بڕوانە (سفری بە أعماق وجود انسان)، ل٢٨-٢٩.

(٢) بڕوانە (أسرار عالم الجسیمات الدقیقة)، ل٦٥، ف.تشیرنوجوروفا، ترجمە: د.محمود ابراهیم.

کەواتە بۆ ئەوەی بزانین ژمارەی ئەو خشتە هەرە وردانە چەندە کە دیکۆری مرۆڤ پێکدێنن - چونکە گیان (الروح) کاکڵ و نێوەڕۆکی مرۆڤەو جەستە بەس توێکڵ و دیکۆریەتی - پێویستە ژمارەی (٢٠٠) و (١٠×٧ ^٢٨) لێک بدەین:

٢٠٠ ×٧× ١٠ ^٢٨= .١٤,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ ٠٠٠ (١٤×١٠ ^٣٠ ) یانی جەستەی مرۆڤ بەلای کەمەوە لە (چوارده ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن) تەنۆلکە دروست بووە.

بەڵام خوێنەری بەڕێز!

دەزانی جەستەی هەرکامێکمان لە چرکەیەکدا چەند خانە سەرف دەکات! نیزیکەی (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانە لە یەک چرکەدا لە لەشی مرۆڤ دەمرن! واتە لە دەققەیەکدا (٧٥٠٠) ملیۆن خانە[1]، خۆ ئەگەر بمانەوێ بزانین لە ماوەی ساڵێکدا جەستە چەند خانەی لەدەست دەچن، دەبێ بڵێین:

٣,٩٤٢,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ = ٣٦٥ × ٢٤ × ٦٠× ٧,٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠ (سێهەزارو نۆسەدو پەنجاو دوو تریلیۆن) خانە!!

ئنجا با بزانین بەو پێیە لەشی مرۆڤ لە ماوەی چەند ساڵاندا خۆی نوێ دەکاتەوە، واتە چەندی پێ دەچێ هەتا هەموو خانەکانی دەمرن و سەرفیان دەکات:

٢,٧٥ =٣,٩٤٢,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠÷ ١٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ (واتە دوو ساڵ و نۆ مانگ).

کەواتە جەستەی هەر مرۆڤێک لە ماوەی دووساڵ و نۆمانگدا هەموو خانەکانی دەمرن و نوێ دەبنەوە.

---

(١) الطب محراب الإيمان، ب١، ل٤٠، الدكتور خالص جلبي.

بەڵێ خانەکانی لەشی ئینسان لە دەوری (٣٣) مانگدا هەموویان دەمرن و هی نوێ جێگەیان دەگرنەوە، جا هەیانە لە چەند ڕۆژێک پتر ناژی و هەشیانە هەتا دوو مانگان دەژی، وەک خڕۆکە سوورەکانی خوێن[(١)]، هەشیانە زیاتر.

بەڵام جۆرە خانەیەک هەن کە ناکەونە ژێر رکێفی ئەم مردن و گۆڕان و نوێبوونەوەوە، ئەوانیش دەمارەخانەکان (الخلايا العصبية)ن.

ئەو خانانەش کە بە چاکترین و پەسندترین خانەکانی جەستە دەژمێردرێن و، بە لەدایک بوونی مرۆڤ پەیدا دەبن و بە مردنی کۆتایی بەتەمەنیان دێ، وەک زانای ناودار (فون ئیکونومو) ژماردوونی چواردە (١٤) ملیارن![(٢)]

هەڵبەتە هەموو چالاکیی و جموجووڵ و گۆڕانکارییەکانی لەشی مرۆڤ لەژێر رکێفی ئەو چواردە ملیار خانەیە دان، بە واتایەکی دیکە ئەو چواردە ملیار خانەیە سەرلەبەری کەسایەتی ئینسان پێکدێنن[(٣)].

جا ئەگەر خوانەکردە دەمارەخانەکانیش وەک خانەکانی دیکەی لەش گۆڕان و مردن و نوێبوونەوەیان بەسەردا هاتبایە، ئەوە دەبوو هەر بە شەش مانگ جارێک زانراوەکان (معلومات)مان فێر بینەوە، تەنانەت زمانی قسەپێکردن و ئاخاوتنی ڕۆژانەشمان[(٤)]!!

بەڵام ئایا دەزانی ئەو دەمارەخانانە، تا چ ڕاددەیەک ڕێکپێکیی و وردەکارییان تێدا ڕەچاو کراوە!

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص٤٠.

(٢) بەڵام ژمارەی خانەکانی مێشک بەگشتیی (١) تریلیۆن: (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) (١٢١) خانەن و جۆریکیشیان لەنێو ئەو یەک تریلیۆنەدا سەد ملیار (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)ن.

(٣) هەمان سەرچاوە، ل٤١.

(٤) هەمان سەرچاوە ل١٧٦.

(جود سون هویک) زانای ئه‌مریکایی له‌ لێدوانێکیدا له‌ په‌یمانگای مێژوویی نیویۆرک گوتوویه‌تی:

(ئه‌گه‌ر بێت و هه‌رچی ئامێری جیهان هه‌یه‌ له‌ ڕادارو ته‌لگراف و ته‌له‌فۆن و ته‌لفزیۆن، هه‌موویان کۆبکه‌ینه‌وه‌و گچکه‌یان بکه‌ینه‌وه‌، هه‌تا به‌هه‌موویان هێنده‌ی مێشکی مرۆڤیان لێدێ، ئێستاش له‌ هاڵۆزیی و ورده‌کارییدا، ناگه‌نه‌ مێشکی یه‌ک ئینسان!!)[1]

خوێنه‌ری به‌ڕێز!

ئێستاش که‌ به‌شێوه‌یه‌کی گشتی حاڵ و باڵی خانه‌کانی جه‌سته‌ی مرۆڤمان زانی، با ئه‌مجار وردتر سه‌رنج بده‌ین و، نیگایه‌ک به‌ ده‌روون و نێوه‌وه‌ی خانه‌دا بخشێنین:

**پێکهاته‌ی خانه‌:**

خانه‌ (الخلیة) به‌شێوه‌یه‌کی گشتی له‌ سێ به‌شان پێکدێ؛ توێلکی خانه‌، سپێنه‌ (سایتۆپلازم)، نێوک.

به‌ڵام توێلکی خانه‌ زۆر ته‌نکه‌، نیزیکه‌ی (٧) میلی مایکرۆن ئه‌ستووره‌، هه‌ڵبه‌ته‌ مایکرۆنێک بریتیه‌ له‌ (١/١,٠٠٠,٠٠٠)ی میللیمه‌ترێک، که‌واته‌ ئه‌گه‌ر بێت و (٥٠٠,٠٠٠) له‌و توێلکانه‌ پێکه‌وه‌ ڕیز بکه‌ین، ئێستا هێنده‌ی په‌ڕه‌قاقه‌زێکی ئاسایی ئه‌ستوور نابێ.[2]

بێگومان ئه‌رکی سه‌ره‌کی توێلکی خانه‌ش ئه‌وه‌یه‌ که‌ پارێزگاریی سپێنه‌و نێوک ده‌کات و، چه‌ند ده‌روازه‌یه‌کی تێدان خۆراکیان لێوه‌ ده‌چێته‌ ژوورێو، پاشه‌ڕۆکیان لێوه‌ فڕێ ده‌درێته‌ ده‌رێ.

---

(١) الطب محراب الإیمان. ب١ ل٤١.

(٢) (سفری به‌ أعماق وجود انسان) ل١٣،١٢، ده‌توانین بڵێین: توێلکی خانه‌ (١٢٠ تا ١٤٠) oA (ئه‌نگسترۆم)ه‌، ئه‌نگسترۆمیش (١/١٠,٠٠٠,٠٠٠) سانتیمه‌ترێکه‌. الطب محراب الإیمان. ب١ ل٤٧.

سپێنە (سایتۆپلازم)ی خانەش زۆر ئەرکی پێ سپێرراون، بەڵام گرنگترینیان ئەوەیە کە نیزیکەی (١٠٠,٠٠٠) کارخانەی پرۆتین سازیی تێدا هەن، کە هەر یەکێکیان بەس (١٥/١,٠٠٠,٠٠٠ ملم)ێک جێگای گرتوە!![1] واتە ئەگەر بێت و (٦٦,٦٦٦) کارخانە لەو کارخانە پرۆتین سازانە بەتەنیشت یەکەوە ڕیز بکەین، ئەوجار هێندەی یەک (ملم) درێژ دەبن!

نێوکی خانەش کە فەرمانڕەوایەتیی خانەی بەدەستە، چەندان کارگەی زل زل و پڕ وردەکاریی تێدا هەن؛ لە نێوکی هەر خانەیەکدا (٢٣) جووت کارگە هەن، کە لەشێوەی شریتێکی درێژدان و، پێیان دەگوترێ (کرۆمۆزم)، ئەو کرۆمۆزمانەش دوو جۆرن؛ هەندێکیان لە شێوەی پیتی ((رضي الله عنهم)) ڤی دان و، هەندێکیان لە شێوەی (X) ئێکس دان، هەڵبەتە ئەو کرۆمۆزمانە لەهەموو خانەکانی لەشی مرۆڤدا هەن و، لە هەموو مرۆڤەکاندا ژمارەیان یەکسانە.[2]

ئەرکی سەرەکیی ئەو کرۆمۆزمانەش کە چل و شەش (٤٦) دانەن، کارێکی یەکجار گرنگ و کاریگەرو ناسکە، ئەویش بریتیە لە گواستنەوەی هەموو سیفەتە سەرەکییەکانی دایک و باب بۆ منداڵ.[3]

بەڵام دەزانی هەر یەکێک لەو (٤٦) کرۆمۆزمەی نێو خانە، لە چ دروست بووە! هەر یەک لەوانە لە (٢٥,٠٠٠) جین (genes) پێکهاتوە، هەڵبەتە هەر ئەو جینانەن کە سەرپەرشتیی کردنی کرۆمۆزم و هەموو خانەشیان بەدەستەوەیە، بەڵکو دەتوانین بڵێین: هەموو کاروباری جەستە لەژێر چاودێریی و بەپێی ڕێڕوونییکردنی ئەو جینانە بەڕێوەدەچێ[4].

(١) (سفرى به أعماق وجود انسان)، ل١٧.

(٢) (سفرى به أعماق وجود إنسان)، ل١٧.

(٣) (الطب محراب الإيمان) ل٤١.

(٤) سفري به أعماق وجود إنسان، ل٢١.

ئێستا ڕەنگە یەکێک بپرسێ؛ باشە ئاخر ئەو جینانە چۆن دەتوانن، ئەو هەمـوو کاروبـارە زۆرو زەوەنـدەی خانەکانی لـەش جێبەجێ بکـەن؟!

زانایانـی هاوچەرخی خانەنـاس (علمـاء الخليـة المعاصـرون) دەڵێـن: هـەر کرۆمۆزمێک لەو (٤٦) کرۆمۆزمەی نێو هەر خانەیەک، هێندەی زانیاریی تێدا هەیە کە کتێبێکی گەورەی (٤٦) بەرگی پڕ بکات، بەمەرجێک هـەر بەرگێـک لـەو (٤٦) بەرگانـە (٢٠,٠٠٠) لاپـەڕ بێـت، کەواتـە بـۆ ئـەوەی بزانیـن یـەک کرۆمـۆزم لـەو (٤٦) کرۆمۆزمـەی نێـو خانـە، چەنـد لاپـەڕە زانیـاری تێدایـە، دەبێ بڵێیـن:

٤٦ × ٢٠,٠٠٠ = ٩٢٠,٠٠٠ لاپەڕ!

کەواتـە هـەر کرۆمۆزمێـک لـە (٤٦) کرۆمۆزمەکانی نێو هـەر خانەیەک لـە خانەکانـی لەشـی هـەر مرۆڤێـک، نیزیکـەی ملیۆنێـک لاپـەڕە زانیاریـی تێدایـەو هـەر خانەیـەک لـە خانەکانی لەشی مرۆڤ، دەوری (٤٦) ملیـۆن لاپەڕە زانیـاری تێدا هەیە، کەواتـە ئەگـەر بمانـەوێ بزانیـن تێکـڕای خانەکانی لەشـی یـەک مـرۆڤ چەنـد لاپـەڕە زانیارییـان تێدا تۆمـار کـراوە، پێویسـتە بڵێیـن:

$١٠^{١٦}$ × ٤٦,٠٠٠,٠٠٠ = ٤٦٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ (٤٦ × $١٠^{٢٢}$) لاپـەڕە زانیاریـی لـە تێکـڕای خانەکانـی جەسـتەی هـەر مرۆڤێکـدا هەیە.

جا ئێستاش خوێنەری بەڕێز با سەرنج لەم بەراوردکارییە بدەین:

مرۆڤایەتی دوای چەند سەدە هەوڵ و کۆشش، سەرەنجام توانی کەشتییەکی هەوایی (السفينة الفضائية) بە یارمەتیی و هاوکاریی (٣,٠٠٠,٠٠٠) (سێ ملیـۆن) پارچـە دروسـت بـکات،[١] بـەڵام دەبـێ ئـەو ئەندازیـارو کرێکارانـە، دوای چەنـد ساڵ بتوانـن لەشـی مرۆڤێـک لـە (١٤ × $١٠^{٢٩}$) (چواردە ملیۆن ملیـۆن ملیـۆن ملیۆن) پارچـە (تەنۆلکـە) دروسـت بکـەن؟!!

---

(١) سفري به أعماق وجود إنسان، ص٣٠.

هەڵبەتە دروستکردنی ئینسان لە (١٤ × ١٠^٢٩) تەنۆلکە مەحاڵە بە مرۆڤ بکرێ، چونکە ئێمە هەتا ئێستا بەتەواویی هەر نازانین چۆنیش دروست بووە![١]

بەڵام با بزانین بەو (٣٠,٠٠٠) کەسەی کە کەشتی هەواییان دروست کرد بەچەند ساڵان، هەر لە ژماردنی پارچەکانی لەشی مرۆڤێک دەبنەوە! ئەگەر بێت و مرۆڤێک بیەوێ بەتەنیا سەرلەبەری ئەو پارچە هەرەووردانە بژمێرێ، کە لەشی مرۆڤیان لێ پێکهاتوە، پێویستی بە:

(١٤,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ ÷ ٣٠,٠٠٠,٠٠٠[٢]
= ٤٦٦,٦٦٦,٦٦٦,٦٦٦,٦٦٦,٦٦٦,٦٦٦) ساڵ هەیە.

بە مەرجێک لە هەر چرکەیەکدا یەکێک بژمێرێ بەبێ پشوودان و ڕاوەستان.

جا ئێستا با بزانین داخۆ (٣٠,٠٠٠) کەس چەند ساڵ بەژماردنی ئەو پارچە وردیلانەوە دەبن:

( ٤٦٦,٦٦٦,٦٦٦,٦٦٦,٦٦٦,٦٦٦,٦٦٦ ÷ ٣٠,٠٠٠ =
١٥,٥٥٥,٥٥٥,٥٥٥,٥٥٥,٥٥٥) ساڵ بە ژماردنی ئەو پارچە وردیلانەوە دەبن کە لەشی هەر مرۆڤێکیان لێ پێکهاتوە!!

ئەوەندە ساڵە بەس بەژماردنی ئەو پارچانەوە دەبن، بەڵام دروستکردنی ئەو پارچانەو کۆکردنەوەیان بۆ دروست کردنی گەردیلان و، گردکردنەوەی گەردیلان بۆ هێنانەدی گەرد (جزيء)ان و، دروست کردنی خانە لەو گەردانەو، پێکهێنانی شانە (نسيج) لە خانان و، ئەندام لە شانان و، کۆ

---

(١) واتە ئەگەر گریمان تەمەنی مرۆڤیش هێندەی بەبەردەوە هەبووایە، چونکە بەتەواوی نازانین مرۆڤ چییەو چۆن دروست کراوە، دروستکردنی هەر مەحاڵ بوو.

(٢) هەرچەندە ساڵ (٣١,٥٣٦,٠٠٠) چرکەیە، بەڵام ئێمە بۆ ئاسانی کردمانە (٣٠) ملیۆن.

ئەندام (جهاز) لە ئەندام (عضو)ان و، لە کۆتاییدا جەستە لە کۆئەندامان، ئەوە مەگەر بڵێین بە خەون و خەیاڵ دەنا لە وزەو دەستەڵاتی مرۆڤدا نیەو نەبووەو نابێ.

ئێستاش کە چەند پەردەیەکمان لە سەر ڕووی پەنهانی خانەکانی لەشی ئینسان هەڵدایەوە، با بەشێوەیەکی گشتی سەرنجێکی ورد لە جەستە بدەین و، بەو سەرنجەش کۆتایی بەم دیاردەی سێیەمەش بێنین و، بچینە سەر خاڵی سێیەم و ئەنجام وەدەست بێنین:

## دەوڵەتی لەش:

ئەو دەملیۆن ملیار[1] خانەیەی کە لەشی هەر مرۆڤێکیان لێ دروست بووە، کۆمەڵ کۆمەڵ و چین چین ڕیز دەبن و، هەزاران شانە (نسیج) پێک دێنن، ئەو هەزاران هەزار شانەیەش، زۆر ژیرانەو ڕێک وپێک دەستەدەستە شان لێک دەدەن و، دەیان ئەندام (عضو) پێک دێنن و، لەو ئەندامانەش چەندان کۆئەندام (جهاز)ی ژیرو ئازاو چالاک دروست دەبن، بۆ وێنە کۆئەندامی هەرس (الجهاز الهضمي) کە لە چەند ئەندامێک پێکهاتوە، وەک: زار، زمان، گەروو، قورگ، سورێنچک، گەدە، دەرگا، دوازدەگرێ، ریخۆڵە باریکە، ریخۆڵەی گەورە...

ئنجا لە ئەنجامی تەبایی و یەکڕیزیی لەنێوان کۆئەندامەکاندا، لەشی ئینسان دروست دەبێ.

ئنجا هەرچەندە جەستەی ئینسان، بەس دیکۆرو رووکەشی بەرچاوەو بەرگ و کاڵایەکی گیانەو هیچی دی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو توێلکە ڕواڵەتییە هێندەی وردەکاریی و ڕێک وپێکیی تێدا ڕەچاو کراوە، کە دەتوانین بڵێین:

---

(١) زۆربەی زانایان ئێستا بە سەد تریلیۆن (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) مەزەندەیان دەکەن.

به‌ ئه‌ندازه‌ی پێشكه‌وتووترین ده‌وڵه‌ت، وه‌زاره‌ت و دامــوده‌زگای جۆراوجۆری تێدان، كه‌ هه‌ركامێكیان به‌ باشترین شێوه‌ ئه‌ركی سه‌رشانی خۆی ئه‌نجام ده‌دات.

به‌ڵێ ده‌توانین:

له‌شی مرۆڤ وه‌ك ده‌وڵه‌تێك بچوێنین، خانه‌كانی دابنێین به‌ تاكه‌كان (أفراد)ی گه‌ل و، كۆئه‌ندامی مێشك به‌ سه‌رۆك و فه‌رمانڕه‌واو مشورخۆر له‌قه‌ڵه‌م بده‌ین و، هه‌ركام له‌ كۆئه‌ندامه‌كانی دیكه‌ش به‌ وه‌زاره‌تێك له‌ وه‌زاره‌ته‌كانی ده‌وڵه‌ت دابنێین:

**یه‌كه‌م:** كۆئه‌ندامی سووڕی خوێن (جهاز الدوران)، كه‌ خۆراك و ئۆكسجین بۆ خانه‌و شانه‌ برسی و تینووه‌كانی له‌ش ده‌بات و، پاشه‌ڕۆك و زبڵی خۆراكه‌كه‌یان ده‌گێڕێته‌وه‌و ڕێوبانان خۆش ده‌كاو بژێو ده‌گه‌یه‌نێ، ئه‌وه‌ وه‌ك وه‌زاره‌تی هاتوچۆ (مواصلات) وایه‌.

**دووه‌م:** به‌ڵام كۆئه‌ندامی هه‌رس (جهاز الهضم)، كه‌ شیرینی و پرۆتین و چه‌وریی و ئاوو خوێ و ڤیتامینه‌كان ده‌گه‌یه‌نێته‌ ڕیخۆڵه‌كان و، به‌رماوو پاشه‌ڕۆك فڕێ ده‌دات، ئه‌وه‌ وه‌ك وه‌زاره‌تی بژێودان (تموین) وایه‌.

**سێیه‌م:** كۆئه‌ندامی هه‌ناسه‌دان (جهاز التنفس)یش كه‌ گازه‌ پێویسته‌كان بۆ وێنه‌ ئۆكسجین بۆ له‌ش دێنێو، گازی دووه‌م ئۆكسیجی كاربۆن له‌ له‌ش داوێته‌ ده‌رێو خوێن پاك ده‌كاته‌وه‌، وه‌ك وه‌زاره‌تی ئابووریی وایه‌، چونكه‌ دێنێ و ده‌نێرێ (یستورد ویصدر).

**چواره‌م:** كۆئه‌ندامی میزیش وه‌ك وه‌زاره‌تی نێوخۆ (داخلي) وایه‌، چونكه‌ ئه‌و شتانه‌ی، كه‌ گومانلێكراون له‌ڕێی میزه‌وه‌ فڕێیان ده‌داته‌ ده‌رێو، پارێزگاریی بارودۆخی نێوه‌وه‌ی له‌ش ده‌كات و، هاوسه‌نگیی تێدا دێنێته‌ دی و نایه‌ڵی بگۆڕێ، دیسان ئه‌و شلانه‌ی دێنه‌ نێو له‌شه‌وه‌و ده‌ڕۆن، ڕێكیان ده‌خات، بۆیه‌ ده‌توانین بڵێین وه‌ك پاڵاوگه‌یه‌كی مه‌زنیش وایه‌.

**پێنجـەم:** کۆئەندامـی ماسـولکەو ئێسـکیش، وەک وەزارەتـی بەرگریـی (وزارة الدفاع) وان، چونکە لە دەمی پێویستیدا بەرگریی لە جەستە دەکەن و دەیپارێزن.

**شەشـەم:** پێست و نینـۆک و مووەکانیـش، کـە نوێنـەری دەرەوەی مرۆڤن، وەک وەزارەتـی دەرەوە (الـوزارة الخارجية) وان.

**حەوتـەم:** جەرگیـش وەک نێوجەرگـەی گومرگـی گشـتی (مرکـز الجمـارك العـام) وایـە، چونکـە هەرچی لـە ڕێی کۆئەندامـی هەرسـەوە دێتـە نێو لـەش، بەوێـدا تێدەپـەڕێ، ئەویـش چالاکانـە هەڵدەسـتێ بـە فڕێـدان و دەرکردنـی ئـەو شتانەی، کـە گومانلێکـراون و هێنانـە ژوورەوەی ئـەو شـتانەی، کـە جێـی مەبەسـت و پێویسـتینی.

**هەشتەم:** سپڵ (طحال)یش ئـەوە گۆڕستانی سامناکی خڕۆکـە سـوورەکانە، چونکـە ئـەو خڕۆکانـە لـە دوو مانـگان پتـر ناژیـن، ئنجا پـاش مردنیـان بـە تابووتێـک ڕەوانـەی گۆڕسـتانی (سپڵ) دەکرێـن، ئنجا لـە هەمـووی سـەرنج ڕاکێشـتر ئەوەیـە کـە ئـەو مـردوو ناشـتنەی خڕۆکەسـوورەکان، وەک عادەتـی مسوڵمانان وایە، چونکە وەک نامسوڵمانەکان تابووت لەگەڵ مردوو نانێژرێ! بەڵـێ دوای نێژرانـی تەرمـی هـەر خڕۆکەیەکـی سـوور، گەردێکـی ئاسـن-کە وەک تابـووت بـووە بـۆی- دەگەڕێتـەوە، بـۆ ئـەوەی لـەش لـە دروسـتکردنی خڕۆکەیەکـی دیکـەدا سـوودی لـێ وەربگـرێ!!

**نۆیـەم:** کۆئەندامـی دەنـگ (الجهـاز الصوتي)یش لەنێو پەنچـک و صندوقـی دەنـگ و ژێیەکانـی و قـوڕگ و زارو زمـان و لێـو و لـووت و...هتـد، وەک وەزارەتـی ڕاگەیانـدن (وزارة الإعـلام) و هەواڵنێـری و دەنگوبـاس وایـە.

**دەیـەم:** لـووە ئارەقڕژێنەکانیـش، وەک وەزارەتـی گەشـت و هاوینەهـەوار (السـياحة والإصطيـاف) وان، چونکـە لـە دەمـی گەرمـادا لـەش سـارد دەکەنـەوەو لـە دەمـی سـەرماشـدا گەرمـی دادێنـن.

**یـازدەم:** مـۆخ (نخـاع)ی نێـو ئێسـکەکانیش، زۆر وەک وەزارەتـی پیشەسـازیی وایـە، چونکـە خڕۆکەسوورەکان و خڕۆکەسپییەکان و گەلێـک شتی دیکـەش لەوێدا دروست دەکرێن.

**دوازدەم:** پێنج هەستەکانیش ئەوە یاریدەدەری وەزارەتی دەرەوەن.

وەک دیتمان دەوڵەتی لەشی ئینسان تێکڕای ئەو وەزارەت و دامودەزگایانەی تێدا بوون، کە بۆ پێکهاتنی دەوڵەت پێویستن، بەڵام جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کـە وەزارەتێـک کـە لەهەمـوو وەزارەتـەکان گرنگتـرو بایەخدار تـرە، لەنێـو دەوڵەتی لەشدا هیچ شوێنێکی تەرخان و دیاریکراوی نەبوو، کە بریتییە لە وەزارەتـی ئەوقـاف، باشـە دەبێ بۆچـی وەزارەتـی ئەوقـاف و کاروبـاری ئایینـی (وزارة الأوقـاف والشـؤون الدينيـة) لەنێو دەوڵەتی لەشدا جێیەکی تایبەتی و دیاریکراوی نەبێ؟!!

لە وەڵامدا دەڵێین:

لـە سۆنگەی ئـەوەوە کـە هەمـوو پێکهێنەرەکانی لـەش، لـە خوێن و لمف و ڕەگ و دەمـارو ئێسـک و پێست و ماسوولکەو مـوو و جومگەو...هتد. بەپێی ئـەو بەرنامـەیە بەڕێوە دەچن کـە خوای بەدیهێنەر بۆی دیاری کردوون و، پێویست نـاکات شـوێنێکی تایبەتـی و سـنووردار بـۆ کاروبـاری ئاییـن و خواپەرسـتیی دیاریی بکرێ، کەواتە ئەوانەی دەڵێن: پێویسـتە کاروباری ئایینی لەچوارچێوەی مزگـەوت و ئەوقـاف دەرنەچێـو، لـەو جوغـزە تەسـکەدا کـورت هەڵبێـو، هەمـوو دامودەزگاکانی دەوڵـەت بەپێی پەیڕەوێکی دیکـە -غـەیری بەرنامـەی خوا- بەڕێوە ببرێن، ئـەوە قسـەیەک دەکـەن کـە لەگـەڵ سروشتی ئینسـان و واقیعی ژیانـدا ناگونجێو، ئەوجۆرە کەسانەش لـە دوو خاڵان بەدەر نین، یـان گێـل و نەفامـن و سروشـتی بەرنامـەی خوایان نەناسیوە، یـان شـەیتان و زۆرزانـن، بـەڵام بەشـیری گوانی ئیمپریالیزم فرچک دراون و کوفر دەروونیانی کڕیوە!![1]

---

(١) بۆ نووسـینی ئـەم باسـە (دەوڵەتی لـەش) سـوودم لـە کتێبی (الطب محراب الإيمان)، ب١، ل٢٥٢-٢٥٤ وەرگرتـوە.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

سـەرلەبەری جەسـتە بـە خانـەو شـانەو ئەنـدام و کۆئەندامەکانیـەوە، سـەرگەرمی گەردنکەچیـی و خواپەرسـتییەو، هـەر بەشـێکی لەبـواری خۆیـدا خەریکـی نوێژکـردن و خواپەرسـتییەو، هەموویـان بـە زمانـی حـاڵ دەڵێـن:

﴿ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٣٩﴾ (یوسف- ٣٩).

ئایا چەند پەروەردگارێکی جیاجیا باشترن، یان خوای تاکی دەستەڵاتدار؟!

ئێستاش دوای ئەوەی ماوەیەکی کورت لەبەردەم بوونەوەرو خڕۆکەی زەوی و جەستەی مرۆڤدا ڕامایـن و ورد بووینـەوەو، زانیمان ڕێـک وپێکیـی و یاسا چەند شتێکی زەق و بەرچاوە، لـە گەورەتریـن شتی بوونـەوەرو گچکەترینیـدا، کاتـی ئەوە هاتـوە بچینـە سـەر خاڵـی سێیەم و، ئەنجامی کۆتایی ڕابگەیەنین و ئامانج وەدەست بێنیـن.

## سێیەم: ئـەنجــام

خوێنەری بەڕێز!

لـە خاڵـی یەکەمـدا بەهێنانـەوەی سـێ وێنـە (وێنەیـەک لـە مێـژوودا، وێنەیەک لـە زانیارییدا، وێنەیەک لـە ژیانی ڕۆژانەماندا) روونمان کـردەوەو سـەلماندمان کـە یاسـای ڕێـک وپێکیـی (دلیـل النظـام) یاسـایەکی ڕاسـتەو، ڕاستە هەمـوو ڕێـک وپێکییـەک لـە هـەر شـتێکدا بـێ، حەوجێـی یاسادانەرو ڕێکخەرێکـەو لەخۆوە نایەتـە دی.

واتـە لەخاڵـی یەکەمـدا سـەلمێنرا کـە هـەر شـتێک ڕێکوپێکیـی و یاسـای تێـدا بـەدی بکـرێ، ئـەو ڕێکوپێکیـی و یاسـایە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە یاسـادانەرو ڕێکخەرێـک مشـووری خـواردوەو ڕێکـی خسـتوە.

لـە خاڵـی دووەمیشـدا سـەلماندمان کـە بوونـەوەر، ئەوپـەڕی یاسـاو ڕێـک وپێکیـی و وردەکاریـی تێدایـە، بـۆ ئـەو مەبەسـتەش سـێ دیاردەمـان کردنـە جێـی سـەرنج؛ بوونـەوەری گـەورەو فـراوان، خڕۆکـەی زەوی، لەشـی مرۆڤ.

واتـە لـە خاڵـی دووەمـدا سـەلمێنرا کـە بابـەت (موضوع)ێـک هەیـە شـیاوی ئـەوەی بـێ کـە یاسـای ناوبـراوی بەسـەردا بچەسـپێنرێ.

لـەم خاڵـی سێیەمەشـدا کاتـی ئـەوە هاتـوە کـە ئـەو ئەنجامـەی لـە دوو خاڵـی پێشـوودەوە دەسـتگیر دەبـێ، بخەینـەڕوو.

بێگومـان ئەنجامەکـەش دوای ڕوونکردنـەوەی خاڵـی یەکـەم و دووەم، وەک میوەیەکـی گەیـوی لێهاتـوە، کـە بـەس دەسـت بـۆ بـردن و چنینـی دەوێـو، هیـچ زەحمـەت و ماندوبوونێکـی پێنـاوێ، چونکـە مـادام ئـەو یاسـایە راسـت بـێ کـە دەڵـێ؛ ڕێـک وپێکیـی و یاسـا لەهـەر شـتێکدا، بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە زاتێکـی زانـاو توانـا ڕێکـی خسـتوەو نەخشـەی دروسـت بـوون و بەڕێوەچوونـی

بۆ کێشاوە و بوونەوەریش دەوربەرو بابەت (موضوع)ێکی لەبارو گونجاوبێ، بۆ بەسەردا چەسپاندنی یاسای گۆڕین، کەواتە ئەنجام ئەوەیە کە [ئەم بوونەوەرە بەپێی حوکمی (یاسای ڕێک وپێکیی) خوایەکی کاربەجێو تواناو زانا خوڵقاندوویەتی و بەڕێوەی دەبات و سەرپەرشتی دەکات].

واتە:

ڕاستیی یاسای ڕێکۆپێکیی + هەبوونی ڕێک وپێکیی لە بوونەوەردا = سەلماندنی هەبوونی خوای پەروەردگار.

ئێستاش بەر لەوەی کۆتایی بەم بەشی دووەمە بهێنین، با سەرنج بدەین، داخۆ بێبڕوایان لەئاقار ئەم بەڵگە بەهێزەدا، پەنا بۆ چی دەبەن!!

بێبڕوایان لەراست ئەم بەڵگەیەدا، وەک بابای بەڕووباریدا چوو، دەگونجێ دەست بۆ ئەم سێ چڵەپووشە بەرن:

١) مادده هەربوویە.

٢) مادده بۆخۆی خۆی دەگۆڕێ.

٣) مادده بەڕێکەوت گۆڕاوە، ئەم بوونەوەرەی لێ پێکهاتوە.

جارێ چڵەپووشی یەکەم سەرباری ئەوەی کە پێشتر بەتیشکی عەقڵ و زانیاری سووتا، ئەگەر گریمان ڕاستیش بووایە، هیچ کاری نەدەکردە سەر ئەم یاسایە، چونکە ئەم یاسایە قسە لە پەیدابوونی ڕێکۆپێکیی و یاسای نێو بوونەوەر دەکات، نەک پەیدابوونی مادده، کەواتە ئەگەر گریمان مادده هەربووش بوایە —هەرچەندە پێشتر ئەوەمان بە درۆ خستۆتەوە-، بەحوکمی (یاسای ڕێک وپێکیی) بۆ تەفسیرکردنی پەیدابوونی ڕێک وپێکیی لە بوونەوەردا، هەر ناچاربووین دان بنێین بە بوونی خوای بەدیهێنەرو زاناو توانادا.

چڵەپووشی دووەمیش هەرچەندە پێشتریش سووتێنرابوو، بەڵام لێرەشدا بەهۆی خستنەڕووی چەند دیمەن و دیاردەیەکی پڕ وردەکاریی و یاسادار (منظم) هێندەی دیکە سووتێنراو بوو بە خۆڵەمێش، چونکە هەتا پتر ڕێک وپێکیی و وردەکاریی بوونەوەر ئاشکرا بێت، زیاتر ئەفسانەیی ئەو قسەیە دەردەکەوێ کە دەڵێ مادده بۆ خۆی خۆی دەگۆڕێ.

سەبارەت بە چڵەپووشی سێیەمیش دەڵێین:

ڕێکەوت وێڕای ئەوەی کە ڕێکەوت پەرستان نازانن چیەو، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە لەسەر ئیسپات بوونی، سەرەڕای ئەوەش بە دان پێداهێنانی ئەوانەی بڕوایان پێیەتی، هیچ جۆرە ژیریی و زانیاری و تواناو دەستەڵاتێکیش شک نابات، کەواتە ئەگەر گریمان هەشبێ، لەبەر نەبوونی ژیریی و زانیاریی و توانا، ناگونجێ دروستکرانی بوونەوەرو ڕێکخستنی ماددەی پاڵدەینە لا و، ئەو کەسەش کە لەگەڵ بڕوابوونی بەوە کە ڕێکەوت شتێکی بێگیان و بێ ئیرادەو نەزان و کەڕو کوێرو دەستەپاچەیە، بڕوای بەوەش هەیە کە ڕێکەوت، بوونەوەر دروستکردن و مادده ڕێکخستنی لەدەست دێ، ئەوە وەک ئەو کەسە وایە کە بڕوای بە بوونی (کۆسەی ڕیش پان) هەیە!![1]

خوێنەری سەنگین و خۆشەویست!

لێرەدا کۆتایی بە توێژینەوەمان دێنین دەربارەی دووەمین یاسای عەقڵ (یاسای ڕێک وپێکیی) کە مرۆڤ ناچار دەکات بڕوا بە خودا بێنێ، هەڵبەتە لێرەشدا دەرکەوت کە ڕاستە زگماک و عەقڵ پاڵنەری ڕاستەقینەی بەرەو خوا چوونی ئینسانن، واتە ئەو شتەی کە پاڵی بەمرۆڤەوە ناوە بڕوا بەخوا بێنێو هەوڵی ناسین و پەرستنی بدات، هۆیەکی ئابووریی، یان دەروونیی، یان کۆمەڵایەتیی یان جینسیی نیە، وەک بێبڕوا کورتبینەکان گومان دەبەن،

---

(١) چونکە ئەگەر کۆسەبێ، ریش یانی چی؟!

بەڵکو زگماکی مرۆڤ و ژیرییەتی کە بەرەو خواناسیی تاوی دەداو هانی دەدات.

جا لەبەرئەوەی تاقە مەبەست و ئامانجی ئێمەش لەم بەشەدا، ئیسپاتی ئەو ڕاستییە بوو و، سوپاس بۆ خوا بە چاکترین شێوەش ئیسپات کرا، لێرەدا کۆتایی بەم بەشی یەکەمە دێنین و، دەچینە سەر بەشی دووەم، بەڵام دوای ئەوەی هەست و نەست و سەرنج (انطباع)ی خۆم لەمەڕ نووسینی ئەم جۆرە باسانە، لەم چەند دێڕەدا، دەخەمە ڕوو:

بەڕاستی خوێنەری بەڕێز!

لەکاتی نووسینی ئەم جۆرە باس و بابەتانەدا، لەسەرێکەوە کە هەست دەکەم بەشێک لە ئەرکی سەرشانم جێبەجێ دەکەم، هەست بە ئارامیی و ئۆخژنی دەروون دەکەم، بەڵام لە سەرێکی دیکەوە: هەست بە دڵتەنگیی و ناڕەحەتیی دەکەم!! دەزانی بۆچی؟! چونکە:

تۆ لە کاتێکدا لە جەنگەی نیوەڕۆیەدای و خۆری پرشنگدار، تیشکی زێڕینی خۆی بە هەموو لایەکدا پەخش کردوە، خەڵکی لەبەر تیشک و ڕۆشنایی ویدا، سەرگەرمی کارو چالاکیی و کەسابەتن و، ئەگەر بێت و لێیان ئاواو پەنهان بێ، دنیایان لێ دەبێتە شەوەزەنگ و تاریکییەکی ئەنگوستەچاو، بەڵێ ئەگەر لەحاڵێکی وادا، بابایەکی کەللەڕەق و نەفامت لێ پەیدا بێت و، نکوولیی و عینادیی و سەرەخەریی بکات لە هەبوونی خۆری تیشک زێڕین و دنیا ڕۆشنکەرەوەدا، ئنجا تۆش ناچار بی کە بەڵگەی هەبوونی ڕۆژێی بۆ بێنییەوەو قەناعەتی پێ بێنی، دیارە لەحاڵێکی وادا هەست بە ئاسوودەیی و دڵئارامیی ناکەی و، دەروونت تەنگ دەبێ و دڵت دەگوشرێ، چونکە تۆ خەریکی ڕوونکردنەوەو سەلماندنی بوونی شتێک دەبی، کە لەلای تۆ لە هەموو شتێک ڕوون و سەلمێنراوترە!

ئنجا ئێمەی بڕواداریش، کە لە جیهانێکدا دەژین شوێن پەنجەی دەسـتەڵاتی خوا بە هەموو دیاردەیەکی وردو درشتیەوە دەبینین و، سەرنج دەدەین:

١- مرۆڤ ناتوانیَ تەنانەت چەند دەقیقەیەکیش بەبیَ بەزەیی خوا بژی، ئەو بەزەییەش بە جوانترین شێوە لەدیاردەی لێدانی دڵ (نبض القلب) و هەناسە هەڵمژین و دانەوەو، کارکردنی خۆبزوێن (أوتوماتیكي)انەی کۆئەندامەکانی دیکەی لەشدا دەدرەوشێتەوە.

٢- دەبینین هەموو تاوێک حەوجێی ڕۆژی خواو زەوی خواو هەوای خواو ئاوی خواو میوەی خواو دانەوێڵەی خواو ...هتدی خوایە!

٣- دەبینین نە پەیدابوونی و نە ژیانی و نە لەنێوچوونی، لەژێرو ویستی خۆیدا نین!

٤- دەبینین ئینسان و بوونەوەر بەگشتیی، وەک کاروانێک بەرەو ئەو مەنزڵگایە بەڕێوەن، کە خوا بۆی بڕیار داون، بێئەوەی هیچ شتێکیان لەدەست بیَ!!

بەڵێ کە ئینسان و بوونەوەر ئاوا بە کەمدەستیی و گەردنکەچیی و هیچ لەدەست نەهاتوویی لەئاقار ویست و دەستەڵاتی خوادا دەبینین و، ئینسان هێندە بە داماویی و ئاتاجیی و پەککەوتەیی-سەبارەت بە بەزەیی خوا- دێتە بەرچاومان، ئنجا دەشبینین کەسانێکی دەروون ژەنگ گرتوو و سپڵەو بێنمەک و دڵمردوو، لاموجیمیی و نکووڵیی لە بوونی خوادا دەکەن، بەدەست خۆمان نیە لە دەمی وتوێژو دم بەدمەکردن لەگەڵیاندا لەبارەی بوونی خواوە، کە لەلای ئێمە درەوشاوەترین و گەورەترین ڕاستی (عظمی الحقائق)یە، دڵمان دەگوشرێو سینەمان ڕێک دیَ، بێگومان نەک لەبەر بێوەڵامیی و دەستەوستانیی خۆمان، بەڵکو لەبەر پیَ لێنەنان و کاڵفامیی و بێتامیی ئەو جۆرە باسانە!!

لەڕاستیدا من هەر جارێک هەڵوێستی بێبڕوایان سەبارەت بە خوای میهرەبان دەبینم:

١- هەڵوێستی سپڵەو بێنمەکانەی کۆمەڵە ڕووەک و درەختێکم دێتە بەرچاوی خەیاڵ، کە بەوپەڕی بێشەرمییەوە، بێمنەتیی و بێباکیی خۆیان بەرامبەر بەو خۆرە پیشان دەدەن-کە بەبێ تیشکی وی، زەرد هەڵدەگەڕێن و ئیشک دەبن- دەڵێن؛ ڕۆژێک لەڕۆژان شتێکی وەک (خۆر) ئێمەی نەژیاندوەو خۆراک و تیشکی نەداوینێ!!

٢- هەڵوێستی کۆمەڵە گلۆپێکم دێتە بەرچاوی خەیاڵ، کە دەربارەی بوونی ئەو دینەمۆیەی ڕووناکیی لێوە وەردەگرن، لاموجیمی و سەرەخەرییەکی بەدفەڕانە دەکەن و، خۆ هەڵدەکێشن و دەڵێن: ئنجا ئێمە کەنگآ حەوجێی غەیری خۆمان بووین! ئەگەر گریمان هەر حەوجێش بووبین، حەوجێی[1] ئەو پلاک و وایەرە بووین کە پێمانەوە پەیوەستن و هیچی دیکە!!

٣- هەڵوێستی منداڵێکی سپڵەو لاسارو نالەبارم دێتە بەرچاو، کە لە ڕووی بابی - ئەو بابەی هۆی پەیدابوون و بەخێوکران و فراژوو بوونیەتی - هەڵدەگەڕێتەوەو بێشەرمانە بەڕوویدا هەڵدەشاخێو، وەک نێرەقەلێک خۆی فش دەکات و دەڵێ: کوا ئنجا تۆ چت بۆ من کردوە؟! ئەگەر تۆش نەبای، هەر دەبووم و دەژیام و هیچ منەتم بە تۆ نیە!

٤- هەڵوێستی ئەو قوتابییە پێنەزان و بێوەفایەم دێتە بەرچاو، کەپاش ئەوەی مامۆستایەکەی بەوپەڕی دڵسۆزیی و میهرەبانیی و خزمەتگوزارییەوە، فێری دەکاو باری دێنێو، لەگۆمی نەزانیی دەری دێنێ، بەڕوو قاییمیەوە لووتی

---

(١) بێبڕواو لەخوا یاخیبووانیش وەک ئەو گلۆپانە، هێندە بیرکورت و دڵکوێرن لەجیاتی خوا، سوپاسی ئەو ڕۆژو زەوی و ئاوو هەوایە دەکەن کە ڕۆزیی و بژێویان بۆ دابین دەکەن! نازانن کە دەستی بەزەیی و میهرەبانیی خوا، لەو دیو ئەو ڕۆزی و بژێوەوەیەو، ئەو ڕۆژو زەوی و ئاوو هەوایە کە دەیانبینن، وەک وایەری کارەبا بەس ئامرازو هۆی گەیاندنن!!

له‌ عاسمانێ ده‌کاو، خۆی پۆز ده‌کاو، به‌ماماۆستایه‌که‌ی ده‌ڵێ: ئه‌وه‌ی که‌ ده‌یزانم و فێری بووم هیچی له‌تۆ نازانم و، بۆ خۆم به‌ هه‌وڵ و ڕه‌نجی خۆم فێری بووم و، بێئه‌وه‌ی تۆ هیچ ده‌ورت بێ، ئه‌م کوڕه‌ ده‌رچووم!!

٥- به‌ڵکو هه‌وڵێستی بێبڕوایان وه‌ک هه‌ڵوێستی هه‌موو ئه‌وانه‌ ویکڕاو خراپتر به‌د فه‌ڕانه‌و بێوه‌فایانه‌تریشه‌و، گه‌لێک له‌ولاوه‌تریشه‌!

## ڕێخۆشکردن

خوێنەری خۆشەویست و سەنگین!

ئەم بەشی دووەمە تەرخان کراوە بۆ وەڵامدانەوەیەکی پوختی هەرکام لەو پرسیارانەی، کە کراونە سەرباس:

لە وەڵامی پرسیاری یەکەم (ئایین چیە؟!)دا پێشەکی لە باسی یەکەمدا لە گۆشەو نیگای زمانەوە، وشەی ئایین (الدین) شی دەکەینەوە، دوایی لەڕوانگەی قورئانەوە پێناسەی دەکەین و دەیتوێژینەوەو، وێڕای ویش، وشەی ئیسلام (الإسلام)یش پێناسە دەکەین، چونکە هاوواتا (مرادف)ی وشەی ئایینە،[1] ئنجا لە باسێکی دووەمدا بەمەبەستی زیاتر دەرکەوتن و درەوشانەوەی چەمکی ئایین و خستنەڕووی کاکڵ و نێوەرۆکی لە حەوت خاڵاندا دروشم و نیشانە سەرەکیی و بنەڕەتییەکانی ئایین و بەرنامەی خوا (جل جلالە) ڕادەنوێنین.

پاشان لە باسێکی سێیەمدا، پێنج تێبینی گرنگ دەربارەی ئایین و دەرخستنی جەوهەرو حەقیقەتی دەخەینە ڕوو.

لە وەڵامی پرسیاری دووەمدا (ئایین چۆن پەیدا بووە؟!)یشدا سەرەتا لەڕوانگەی بەرنامەی خواوە، ڕوونی دەکەینەوە، کە ئایین چۆن و کەی سەری هەڵداوەو پەیدا بووە!، دوایی دێینە سەر خستنەڕووی هەڵوێست و بیروبۆچوونی بێبڕوایان دژی ئایین.

---

(١) دیارە وشەی (دین) بە ڕەهایی هاوواتای (إسلام) نیە، بەڵکو لەچەند حاڵەتێکداو بەچەند مەرجێکەوە وایە، وەک دوایی ڕوونی دەکەینەوە.

لە بارەی مەسەلەی چۆنیەتی پەیدابوونی ئایینەوەو، یەک لە دوای یەک ئەو بیروبۆچوون و بیردۆزانە باس دەکەین، کە بە خەیاڵی کاڵی وان، هەرکامێکیان دەگونجێن بکرێنە وەڵامی پرسیاری (ئایین چۆن پەیدا بووە؟!)، سەرجەمی ئەو بیردۆزانەش ئەمانەن:

١- بیردۆزەی ئابووریی.

٢- بیردۆزەی ترسان.

٣- بیردۆزەی نەزانیی.

٤- بیردۆزەی جینسیی.

٥- بیردۆزەی داخوازییە دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکان.

دوای خستنەڕووی هەرکام لەو بیردۆزانەش، ڕەخنەو هەڵسەنگاندنی خۆشمان دەخەینە ڕوو و، لە کەووبێژینگیان دەدەین و پووچەڵییان دەردەخەین.

لە وەڵامی سێیەمین پرسیار (ئایین بۆچی هاتوە؟!)دا، (٢١) بیست و یەک خاڵ دەخەینە ڕوو و ڕوونی دەکەینەوە، کە ئایین بۆیە هاتوە، کە ببێتە بەرنامەو پەیڕەوی سەرلەبەری ژیانی تاکیی و کۆمەڵیی و، ماددیی و مەعنەویی ئینسان و، چارەسەری هەموو ئەو کێشەو گیروگرفتانە بکات، کە لە هەر لایەنێکی ژیانی تاک و کۆمەڵدا سەر هەڵدەدەن، ئنجا لە کۆتاییدا وەڵامێکی کورت و پڕ واتا بۆ پرسیاری گۆرین دادەنێین، کە جێی هەموو ئەو وەڵامانە بگرێتەوە، کە لە (٢١) خاڵاندا خراونە ڕوو، وەڵامەکەش ئەوەیە، کە (ئایین بۆیە هاتوە، کە ئینسان مسوڵمان بێ).

ئێستاش بە پێویستی دەزانم، بەر لەوەی بچینە سەر ئەسڵی مەبەست لە سێ خاڵاندا، بە کورتیی و گوشراویی پەیوەندیی ئەم بەشەو بەشی یەکەم و هۆی بەدوای یەکدا هاتنیان بخەینە ڕوو:

**١**- پەیوەندیی نێوان بڕوابەخوا بوون و ئایین، وەک پەیوەندیی دەزوو و دەنکەکانی تەسبیح، یان سەرو جەستە، یان ڕەگ و ڕیشەو لق و پۆپ، یان بناغەو دیوار، یان تیشکی ڕۆژ و ڕووەک، یان هەورو باران وایە.

واتە هەروەک چۆن تەسبیحی بێ دەزوو و، جەستەی بێ سەرو، لق وپۆپی بێ ڕەگ و ڕیشەو، دیواری بێ بناغەو، ڕووناکیی بێ تیشک و، بارانی بێ هەور، هیچ کامیان لە دنیای واقیعدا نین و نابن، ئایین -خواپەرستیی و فەرمانبەریی-یش بەبێ بڕوا بەخوا بوون، بوونی مەحاڵەو، هەرکاتێکیش خواناسیی و بڕوابەخوا بوون لە دڵ و دەروونێکدا چەسپی و هاتە دی، ئەوە بەبێ وەخران، پابەندیی و دیندارییش پەلکێش و داخواز دەکات و، مەحاڵە لەیەک جیا ببنەوەو بترازێن.

کەوابێ پەیوەندیی نێوان بڕوا بەخوا بوون و ئایین، بە زاراوی ژیربێژیی (منطق)ی کتومت وەک پەیوەندیی نێوان پێشەکی و ئەنجام (المقدمة والنتیجة) وایە.

جا لەبەرئەوەی[1] زۆربەی خەڵکی ئێستا لەم ڕاستییە بێئاگان و پێیان وایە، بڕوابەخوا بوون و خواناسیی، شتێکی سەربەخۆو جوێیە لە خواپەرستیی و پابەندیی و، ئینسان بەبێ هیچ جۆرە گەردنکەچیی و فەرمانبەرییەکیش دەتوانێ خۆی بە بڕوادارو خواناس لەقەڵەم بدات، بە پێویستم زانی لەم بەشی دووەمەدا مەسەلەی ئایین و گەردنکەچیی بتوێژمەوە، تاکو خوێنەری بەڕێز ئەنجام و بەرهەمی بڕواداریی و خواناسیی لەبەرچاو بێو، زۆرچاک بزانێ کە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بڕوای بێگەردنکەچیی و، فەرمانبەریی بوونی نیەو، ئەگەر گریمان هەشبێ، ئیسلام وەک پارەی قەڵب و گوێزی قرپۆکی حسێب دەکات.

**٢**- لەبەرئەوەی بڕوا بەخوا بوون، بەشێکە لە ئایین -بێگومان بنچینەو بنەڕەتییەتی- ناتوانین وەک پێویست پەی بە گرنگیی و چۆنیەتی و ڕێوشوێنی

---

(١) سوپاس بۆ خوا ئێستا ئەوجۆرە تێگەیشتنە زۆر کەم بووە، (٢٠٠٨/٤/١١).

بەرین، بەبێ چاوپێکداگێڕانێکی سەرلەبەری ئایین، هەروەک چۆن ئەگەر بمانەوێ پەی بە گرنگیی و چۆنیەتی کۆڵەکەیەک بەرین، کە بەشێکە لە خانووێک، حەوجێی چاوپێداخشاندنێکی گشتی تەواوی خانووەکەین، جا منیش وام بە پەسند زانی پاش خستنەڕووی پاڵنەری ڕاستەقینەی خواناسیی و ئیمان، چاوێک بە خانووی ئاییندا بگێڕین.

**٣**- زۆربەی هەرەزۆری ئەوانەی خۆیان بێبڕوا بە پێشان دەدەن، وەنەبێ لەبیری قرپۆکی بێبڕوایی (إلحاد)دا گەیشتبنە قەناعەت و دڵدامرکان و هیچ جۆرە قەناعەتێکیان بەبوونی خوا نەمابێ، چونکە گەیشتنە دڵنیایی و یەقین لە بیرێکی هەڵەو بێبنچینەی وەک بێبڕواییدا، کە دژی سروشتی ئینسان و بوونەوەرە، مەحاڵ و نەگونجاوە، بەڵکو هۆی خۆ بە بێبڕوا[1] (ملحد) لەقەڵەم دانیان و، چوونی نێو سەنگەری بێبڕواییان، ئەوەیە کە لەپێشدا لەبەر چەند هۆیەک لە ئایین ڕەویونەوەو لێی پرینگاونەوە، ئنجا بۆ پاساودان (تبریر)ی هەڵوێستی چەوتی خۆیان، ناچار بووون بڵێن: ئێمە هەر لە ئەسڵدا قەناعەتمان بەبوونی خوا نیە!

چونکە ئەو کەسەی لە ئایین لاڕێ دەبێ و، سەرپێچیی لە یاسایەکانی دەکات، دەکەوێتە بەر لووزەوی ڕەخنان و ڕێژنەی تانەو تەشەران، بۆ وێنە:

بۆ نوێژان ناکەی؟!

بۆ ڕۆژووان ناگری؟! بۆ زەکات نادەی؟!

بۆ هامووشۆی مزگەوتێ ناکەی؟!

بۆ زیادەڕۆو زۆر خۆریی؟! بۆ وا نەگبەت و دوومۆریی؟!

بۆ قومارچیی؟ بۆ هێندە بەدو ساختەچیی؟!

---

(١) هەرچەندە وشەی بێبڕوا بۆ (کافران) بەگشتی بەکاردێ، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان پێی کافرێکی تایبەتە کە بابای دان بەبوونی خوادا نەهێنەر (ملحد)ە.

بۆ مەیخۆرو سەربەشەڕی؟! بۆ هێندە درۆزن و بەدفەڕی؟!

بۆ بەدڕەوشتی، بۆ داوێن پیسی؟!

بۆ هێندە بەدو نەگریسی؟! بۆ دۆستی نزیکی ئیبلیسی؟!

بۆ وا بەدئاکارو پەستی؟!

بۆ هێندە دنیاپەرستیی؟!

بۆ هێندە بێهۆش و گۆشی؟!

بۆ خۆت بە طاغووت دەفرۆشی؟!

جا بێگومان بابای لاڕێ و یاخی لە ئاقار ئەم پرسیارانەدا دوو ڕێی لەپێشن:

١) کە خۆی بە بڕوادار پیشان بداو، بڵێ: سوێند بەخوا بێبڕوا و بێدین نیم، بەڵام تەنبەڵیی و قالب گرانییم بۆتە پەرچ و لەمپەر لەڕێی بەجێهێنانی ئەرک و فەرمانەکانی ئاییندا.

٢) کە خۆی بە بێبڕواو بێدین بناسێنێو بڵێ: بۆیە پابەندی فەرمانەکانی ئایین نیم و، لە خەتێم لاداوەو یاخییم، چونکە من بابایەکی بێبڕوام و، پێم وایە خواو بەهەشت و دۆزەخ و سزاو پاداشت و...هتد، ئەفسانەن و هیچی دی.

جا کەسێک کە ڕێی یەکەم هەڵبژێرێ، هەرچەندە کەمتر لەو کەسە خراپە کە هی دووەم هەڵدەبژێرێ، بەڵام بە قسەی سەرزارەکیی و بێکاکڵ و دەعوای بێبەڵگەش واقیعی شتان ناگۆڕێ.

ئنجا سەرباری ئەوەش ئەو کەسە چەندان پرسیاری بێوەڵام دەستەویەخەی دەبن، کە لە ئاقاریاندا دەستەوستان دەبێو، دۆش دادەمێنێو، بێجگە لە سەرکزکردن و خۆگێل کردن هیچی پێ نامێنێ.

دەگونجێ بە بابایەکی وا بگوترێ:

(باشە ئەگەر ڕاستە بڕوات بەخوا هەیە، بۆچی بە قسەی ناکەی؟!

ئایا لێی دەترسێی؟

ئەگەر لێی دەترسێی بۆچی فەرمانەکانی جێبەجێ ناکەی؟!

خۆشت دەوێ؟ ئەدی بۆچی لەخۆتی ڕازی ناکەی؟!

بڕوات بە بەهەشتێ هەیە؟ ئەدی بۆچی ڕەنجی بۆ نادەی؟!

لە دۆزەخێ دەترسێی؟ ئەدی بۆچی ناتبینم لەبەری ڕاکەی؟!

بڕوات بە لێپرسینەوەی دوارۆژ هەیە؟

نەخێر وانیەو ڕاست ناکەی، دەنا کوا! بۆچی خۆتی بۆ ئامادە ناکەی؟!

ڕەنگە لە وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانەدا، بەرەو تەلیسمی نەتوانین و قالب گرانیی و تەنبەڵیی ڕاکەی! بەڵام سوور سوور بزانە، تەلیسمی گۆڕین ئەفسانەیەکی ڕووتەو، بێهوودەیە، بەقسەم دەکەی بە خت وخۆڕایی خۆت ماندوو ناکەی، چونکە قەت قەت بە کلیلێکی ئەفسانەیی، چاری دەرگای پۆڵایینی ئەم پرسیارانە ناکەی.

ئەگەر ڕاستە تەوەزەل و قالب گران و تەپلۆسی، ئەدی بۆچی لە مەیدانی کارو کاسبیی و گوزەراندا، بەهیچ ڕەنگێک بە بەهانەی نەتوانین و قالب گرانیی، ڕێ بەخۆت و بەهی کەسێکی دیکەش نادەی کە پێت بڵێ: لێی دانیشەو گوێ مەدە هیچ ئیش و کارێک، توخوا پێم بڵێ: کەسێک کە داوای وات لێ بکات، زۆری خۆ لێ تووڕە ناکەی!!).

بەڵێ کەسێک کە ڕێی یەکەم بگرێ، هەر زوو دەیان پرسیاری بێوەڵامی ئاوا بەرۆکی دەگرن، کە هیچ ڕێی قوتاربوونی نامێنن، بێجگە لە حەپەسان و قسە پێنەمان!

جا بۆیە کەسانێک کە هەستیان بەو سەغڵەتیی و تەنگاویی و پێبڕانە کردوە کە لەڕێی یەکەمدا تووشیان دێ، پەنایان بردۆتە بەر ڕێی دووەم و، بەخەیاڵی کاڵا و بۆچوونی خواروخێچیان، ئەویان پێ سەلامەتتر بووە، بەڵام بە دەردی کورد دەڵێ: (لە کۆلک سڵەمیونەوەو بەسەر بەرازدا کەوتوون) و (عوزر لە قەباحەتێ خراپتر) لەوان ڕووی داوە!!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز! لەڕاستیدا زۆربەی هەرەزۆری ئەوانەی خۆیان بە (ملحد) ڕادەنوێنن، بەر لەوەی نێوانیان لەگەڵ خوادا تێکچێ، لەگەڵ ئاییندا تێک چووە، بەبێ لەگەڵ خوا تێکچوونەکەیان، ئەنجام و بەرهەمی دوودڵیی و دڕدۆنگییانە بەرانبەر بە ئایین، چونکە وەک لە هەموان ڕوونە، ئایین نەبوونێکی ڕاستەقینەی لە واقیعی ژیاندا هەیە[1]،و، نە لە بواری خرانەڕوو و ڕاگەیاندندا پشکێکی چاکی هەیە[2]، کە بایی ئەوە بکات بابایەکی بێئاگا بڕوای پێ بێنێو، لە ڕاستیی و تەواویی دڵنیا بێ.

جا بێبڕواو لە خوا یاخیبووانیش، لە ئەنجامی دیتنی واقیعێکی بەناو ئیسلامییانەی بێسەرەوبەرەو گەندەڵ و، بیستنی گەلێک قسەی بە ڕواڵەت ئایینیانەی بێخێرو پووچەڵدا[3]، لە بابەت ئایینەوە کەوتوونە گومانەوەو دڵیان

---

(١) واتە لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا.

(٢) تێبینی: ئەمە لە سەردەمی نووسینی کتێبەکەدا نووسراوە، واتە ساڵی ١٩٨٥، کە لەو سەردەمەدا لە کوردستاندا واقیع و کیان و بوونێکی ئیسلامی ئەوتۆ نەبوو، جا هەرچەندە ئێستاش کیان و قەوارەو واقیعێکی ئیسلامی کە بەها بەرزە ئیسلامییەکان (القیم الإسلامیة العلیا) بەرجەستە بکات، هەر پەیدا نەبوە، بەڵام ڕابوون و حاڵەتی ئیسلامیی تارادەیەک و لە هەندێک بواردا بەشێکی ئیسلامی ڕانواندوەو لەسەر زەوی واقیع خراوتەڕوو. (٢٠٠٨/٤/١١).

(٣) پێویستە ئاگاداربین کە ئەو قسانەی سەرێ لەسەردەم و ڕۆژگاری شوومی بەعسی پیس و نەگریسدا کراون و نووسراون، کە بەداخەوە زۆر مەلای دین فرۆش و شێخی دڵنەخۆش و نووسەری سەرخۆش، بووبوونە بڵندگۆ (مکبرة)ی ئەو ڕژێمە طاغووتیی و دیکتاتۆرەو بە هەواو ئاوازی وی هەڵدەپەڕین و، فەتوای ڕەوایی سیخوڕیی و جاشایەتییان بۆ خەڵکی دەداو، دینی خۆیان بە دنیای طاغووت دەدا، ئێستاش خەڵکێک لەو شێوەیە هەر دەبینرێن.

لێی ڕه‌نجاوه‌، له‌به‌رچاویان بێزراوه‌و وازیان لێهێناوه‌، ئنجا دوایی بۆ پاکانه‌ی هه‌ڵوێستی خۆیان، په‌نایان بردۆته‌ به‌ر بێبڕوایی، بۆ ده‌رباز بوون له‌ ته‌وژمی ڕێژنه‌بارانی ئه‌و پرسیاره‌ بێوه‌ڵامانه‌ی که‌ سه‌رو گوێلاکی بابای لاڕێی خۆ به‌ مسوڵمانزان ده‌کوتیّ!!

واته‌: ئه‌و خۆ به‌ بێبڕوا ناسێنه‌رانه‌، دوای ڕیش پیس بوونیان به‌ هۆی له‌ ئایین دوورکه‌وتنه‌وه‌وه‌، به‌ ناچاری ده‌ستیان داوه‌ته‌ شانه‌ی بێبڕوایی!

جا ئێمه‌ له‌به‌ر ئه‌و هۆیانه‌ی که‌ گوتران، له‌م به‌شه‌دا به‌پێویستمان زانی له‌ سیّ خاڵی سه‌ره‌کییدا پێناسه‌ی ئایین بکه‌ین و، دروشم و نیشانه‌ سه‌ره‌کییه‌کانی و، چۆنیه‌تی په‌یدابوونی و، حیکمه‌ت و هۆی هاتنی، بخه‌ینه‌ ڕوو.

تاکو ئه‌وانه‌ی له‌ ئایین حاڵی بوونی هه‌ڵه‌، ناچاری کردوون شانه‌ی بێبڕوایی و دژی خوایی هه‌ڵگرن، هه‌ر له‌به‌رایییه‌وه‌ ناچاری هه‌ڵگرتنی شانه‌ی گۆرین نه‌بن.

ئاخر که‌سێک شانه‌ی ڕیش پاک کردنه‌وه‌ ده‌ست ده‌داتیّ، که‌ ڕیشی تێوه‌چووبێو پیس بووبیّ، به‌ڵام که‌ نه‌تهشێت تووشی ڕیش پیس بوون بێو، هه‌ر له‌ پێشه‌وه‌ ئه‌و شته‌ی ده‌بوو به‌هۆی ڕیش تێوه‌چوون، لات برد. مانای وایه‌ له‌هه‌مان کاتیشدا پاڵنه‌ری شانه‌ هه‌ڵگرتنت لابردوه‌و نه‌هێشتوه‌.

ئێستاش با یه‌ک له‌دوای یه‌ک، وه‌ڵامی ئه‌و سیّ پرسیاره‌ بده‌ینه‌وه‌، که‌ کردوومانن به‌ سه‌رباس و ناوونیشانی ئه‌م به‌شی دووه‌مه‌:

---

ئێستاش: ٢٠١٩/٩/١٩ – ٢٠ محرم١٤٤١ک، واقیعه‌که‌مان شێوه‌ی ئه‌و ڕۆژگاره‌ی زۆر تێدایه‌، ته‌نیا ڕواڵه‌ت و فۆرمه‌که‌ گۆڕاوه‌!




# ئایین چییە؟!

## دەستپێك

خوێنەری بەڕێز!

خوا پشتیوان بێ لە سێ باساندا، هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەدەین، لەباسی یەکەمدا، هەم لە گۆشەنیگای زمانەوە، هەم لە ڕوانگەی قورئانەوە پێناسەی ئایین (الدین) دەکەین و، لەباسی دووەمدا، حەوت دروشم و نیشانەی بنەڕەتیی و گرنگی ئایین دەخەینە ڕوو، لەباسی سێیەمیشدا: پێنج تێبینیی گرنگ لەبارەی ئاینی خواوە-کە ئیسلامە- دەخەینە ڕوو:

## باسی یەکەم

## پێناسەی ئایین

### یەکەم: وشەی ئایین لە ئەسڵ و بنچینەی زماندا:

بێگومان وشەی ئایین (الدین) وشەیەکی عارەبییەو، ئەگەر بشمانەوێ بە ئەسڵ و بنەچەکەیدا بچینە خوارێ، پێویستە سەرنجی فەرهەنگەکانی زمانی عارەبی بدەین، ئنجا با بە وردیی سەرنجی قسەو بیروڕای زمانزانانی عارەبی بدەین، داخۆ لەو بارەوە چی دەڵێن:

١- (ابن منظور) دەڵێ:

(والدين: الجزاء والمكافأة، ودِنْتُهُ بِفعلِهِ دِيْناً: جَزيتهَ،... ويوم الدين: يوم الجزاء... ومنه الديّان في صفة الله عز وجل.. والدّين الحساب.. والدين الطاعة، وقد دِنْتهُ و دِنتُ لهُ أي أطعتهُ.. والجمع الأديان، يقال دان بكذا ديانة، وتديَّن به فهو دَيّنٌ ومُتديِّنٌ...)[1]، واتە: ئایین[2] (الدین) واتە پاداشت دانەوەو چاکە دانەوە، (دنته بفعلِهِ ديناً) واتە: پاداشتم دایەوە بە پێی کردەوەکەی،... (یوم الدین) یانی ڕۆژی تۆڵەو پاداشت.. لە وشەی (الدین) وشەی (دیّان) دروستکراوە کە بەمانای تۆڵە ئەستێن و پاداشت دەرەوەیەو سیفەتی خوای دەستەڵاتدارو پایە بەرزە، (الدِّین) واتە لێپرسینەوە.. (الدِّین)

---

(١) لسان العرب. ب٤، ل٤٥٨ –٤٦٢.

(٢) (ومعنى الآيين النظم والعادات والعرف والشرائع) یانی: واتای ئایین یاساو نەریت و خووەکانن و، عورف و بەرنامەکانن. بڕوانە کتێبی (ضحى الإسلام)ب١ ل١٧٧ أحمد أمين. واتە لە زمانی فارسیدا ئەمەیە واتای ئایین، هەڵبەتە کوردی و فارسیش یەک بنەچەکەیان هەیە.

واته: گه‌ردنكه‌چیی و فه‌رمانبه‌ریی، و (دِنتهُ ودنت لَهُ) هه‌ردووكیان یانی: گوێڕایه‌ڵی بووم و گه‌ردنم بۆ كه‌چ كرد.. كۆی (الدین) بریتیه له (الأدیان) ده‌گوترێ: (دان بكذا دیانةً وتدین به فهو دَیِّنٌ ومتدیِّن) گه‌ردنی بۆ فلان شته كه‌چ كرد به گه‌ردن كه‌چكردن و كردیه ئایینی خۆی، جا ئه‌و به‌دین و ئایین په‌روه‌ره.

٢- (زمخشـریی) ده‌ڵێ:

(ودِنتُهُ بما صنع: جزیتُهُ، ومنه یوم الدین، والله الدیّان، وقیل هو القهار، من دان القوم، اذا ساسهم وقهرهم فدانوا له، ودانوهُ: انقادوا له)[١]، واته: (ودِنتهَ بما صنع) واته پاداشتم دایه‌وه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كردبووی و (یوم الدین) یش هه‌ر له‌وییه‌و، خوا (دیان)ه و گوتراویشه ئه‌و (قهار)ه، كه له (دان القوم)ه‌وه هاتوه، واته حوكمی به‌سه‌ردا كردن و گه‌ردنی پێ كه‌چ كردن و ئه‌وانیش ملیان بۆ كه‌چ كردو، په‌رستیان، یانی فه‌رمانبه‌رییان بۆ كرد.

٣- (راغب الأصفهاني) ده‌ڵێ:

(والدین یُقال للطاعة والجزاء واستعیر للشریعة)، واته: دین به فه‌رمانبه‌ریی و سزاو پاداشت ده‌گوترێ و بۆ به‌رنامه‌ـی خوا- خوازراوه‌ته‌وه.

٤- (الرازي)[٢] ده‌ڵێ:

(الدین: الجزاء والمكافأة، الدین: الطاعة...)[٣]، واته: (الدین) یانی: تۆڵه‌و چاكه‌دانه‌وه، (الدین) واته: گه‌ردنكه‌چیی.

---

(١) (أساس البلاغة) جارالله الزمخشري، ل٢٠٠ وشه‌ی (الدین).

(٢) مه‌به‌ست (فخرالدین الرازي) خاوه‌نی (التفسیر الكبیر) نیه، به‌ڵكو مه‌به‌ست (الرازي) پسپۆڕی زمانه‌وانییه.

٣) (مختار الصحاح) ل٢١٨ چ١٩٢٦.

٥- (فيروز آبادي) دەڵێت:

(الدين: الجزاء والإسلام والعبادة والحكم والتدبير والتوحيد والحساب والغلبة والسلطان والطاعة، واسم لجميع ما يُتعبَّد الله عزوجل به..)[1]، واتە: (الدين) یانی سزاو پاداشت، ئیسلامەتیی، پەرستن، حوکمکردن، ڕێوشوێن دانان، خوابەیەکزانین، لێپرسینەوە، زاڵبوون، دەستەڵات، گەرنکەچیی و، ناوە بۆ هەموو ئەو شتانەی خوای دەستەڵاتدارو پایەبەرزیان پێ دەپەرسترێ.

٦- (المنجد) دەڵێ:

(الدين جمع أديان، يعني الطاعة ويعني المعصية، واسم لجميع ما يُعبدُ به الله)[2]، واتە: (الدين) کۆیەکەی (أديان)ە واتە: گەردنکەچیی و، سەرپێچیی و، ناوە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە خوایان پێ دەپەرسترێ.

کەواتە وشەی (دین) کە لەزمانی کوردیدا وشەی (ئایین)ی بۆ دانراوە، لە بنەڕەت و ئەسڵی زمانی عارەبیدا، بۆ چەند مەبەست و واتایەک بەکارهێنراوە، بەڵام لە ئاکامدا هەرکام لەو چەمک و واتایانە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لەم دووانە:

١- سزاو پاداشت.

٢- فەرمانبەریی و گەردنکەچیی.

بەڵێ ئەمەیە چەمک و واتای وشەی (الدين) لە ئەسڵی زماندا، بەڵام دوای هاتنی ئایینی ئیسلام، ئیسلام وەک هەرکام لە زاراوەکانی (جهاد، صلاة، زكاة، صوم، حج) زاراوەی ناوبراویشی دەستکاریی کردو، جۆرە چەمک و مەبەستێکی تایبەتیی و ئیسلامییانەی بۆ هێنایەکایەوە.

---

(١) (القاموس المحيط)، ب٤، ل٢٢٧.

(٢) (المنجد) ل٢٣١، چ٢٦.

ئێستاش دوای ئەوەی زانیمان وشەی (الدین) لە ئەسڵ و بنەڕەتی زماندا، چ واتاو مەبەستێک دەگەیەنێ، با ئەمجار لە ڕوانگەی قوڕئانەوە سەرنجی بدەین:

## دووەم: وشەی ئایین لە ڕوانگەی قوڕئانەوە:

قورئانی بەپێز وشەی (دین)ی بە هەرکام لەو دوو واتایەی، کە لە ئەسڵ و بنچینەی زماندا هەیبوون، بەکارهێناوە، بەڵام بێجگە لەو دوو واتایە چەمک و واتایەکی دیکەی نوێ و فراوانیشی بۆ زیاد کردوە، کە هەردووک واتا پێشووەکانیشی تێدا هەن، کەواتە: قورئانی بەڕێز سەرجەم وشەی (دین)ی بە سێ واتایان بەکار هێناوە:

١- سزاو پاداشت.

٢- گەردنکەچیی.

٣- بەرنامەی ژیان.

ئێستاش چەند نموونەیەک بۆ هەرکام لەم سێ واتایە دێنینەوە:

### أ/ (دین) بە مانای سزاو پاداشت:

١) خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ۝٥ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ۝٦ ﴾ (الذاريات: ٥-٦)، واتە: بێگومان ئەوەی گفتتان پێدراوە راستەو، شکی تێدا نیە، کە سزاو پاداشت دێتەدی.

٢) هەروەها فەرموویەتی: ﴿ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ۝٤ ﴾ (الفاتحة-٤)، واتە: خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتە.

٣) دیسان فەرموویەتی: ﴿ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ ۝٥٦ ﴾ (الواقعة- ٥٦)، واتە: ئەمەیە میوانداریان[1] لە ڕۆژی سزاو پاداشتدا!!

---

(١) ئەم تەعبیرە بۆ سزاو تۆڵەی کافرەکان لە دۆزەخدا بەکارهێنراوە، کە جۆرێکە لە

**ب/ (دین) بەمانای گەردنکەچیی:**

١) خوای توانا فەرموویەتی: ﴿ وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ (الأنفال- ٣٩).

واتە: لەگەڵیاندا بجەنگن، هەتا کافران توانای ئازاردانی بڕوادارانیان نامێنێو گەردنکەچیی و فەرمانبەریی هەمووی بۆ خوا دەبێ.

٢) هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَلَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًا ﴾ (النحل- ٥٢).

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هی خوایە و، گەردن بۆ کەچکرانی حەتمیی بەس بۆ وی یە.

٣) دیسان فەرموویەتی: ﴿ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ﴾ (الزمر- ٣)، واتە: ئاگاداربن! گەرنکەچیی و پەرستنی بێخەوش، بەس بۆ خوایە.

**ج/ (دین) بە مانای بەرنامەو پەیڕەو:**

١) خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴾ (یوسف-٤٠).

واتە: فەرمانڕەوایەتیی بەس هی خوایە، فەرمانی کردوە کە غەیری وی مەپەرستن، ئەوەیە بەرنامەی ڕاست و تەواو.

٢) هەروەها فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ ﴾ (یوسف-٧٦).

گاڵتەپێکردنیان.

واته: ئاوا ته‌گبیرمان بۆ یوسف کرد، ده‌نا نه‌یده‌توانی به‌پێی به‌رنامه‌ی پادشا-ی میسر- برایه‌که‌ی به‌دیل بگرێ.

٣) فه‌رموویه‌تی: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ ﴾ (غافر-٢٦).

واته: فیرعه‌ون گوتی: لێمگه‌ڕێن با مووسا بکوژم و، با له‌به‌ر په‌روه‌ردگاری وه‌پاڕێ، بێگومان من ده‌ترسێم که به‌رنامه‌که‌تان لێ بگۆڕێ.

٤) دیسان فه‌رموویه‌تی: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝٦ ﴾ (الكافرون-٦)، واته: به‌رنامه‌ی خۆتان بۆ خۆتان و به‌رنامه‌ی خۆم بۆ خۆم.

وه‌ک دیتمان قورئانی به‌ڕێزو پیرۆز، وشه‌ی (دین)ی هه‌م به مانای سزاو پاداشت و هه‌م به‌مانای گه‌ردنکه‌چیی و فه‌رمانبه‌ریی، هه‌م به مانای به‌رنامه‌ی ژیان، به‌کار هێناوه، وه‌ک گوتیشمان: وشه‌ی (دین) دوو مانای یه‌که‌م و دووه‌می له ئه‌سڵی زماندا هه‌ر هه‌بوون، به‌ڵام واتای سێیه‌م، ئایینی ئیسلام بۆی زیاد کردو، واتای سێیه‌میش هه‌رکام له واتای یه‌که‌م و دووه‌م ده‌گرێته خۆی، چونکه به‌رنامه (دین)ی خوا له‌سه‌ر خه‌ڵک پێویست ده‌کات و ناچاریان ده‌کات، که گه‌ردنی بۆ که‌چ بکه‌ن و پێیه‌وه پابه‌ند بن و، پێشیان ده‌ڵێ: که له ڕۆژی دواییدا-و هه‌ندێک جاران له دنیاشدا- له به‌رانبه‌ر پابه‌ندیی و فه‌رمانبه‌رییدا، پاداشت و له به‌رانبه‌ر یاخیبوون و لاڕێبووندا، سزا چاوه‌ڕێیان ده‌کات.

ئنجا وشه‌ی (دین) به هه‌موو ڕێژگه (صیغه)کانییه‌وه، نزیکه‌ی (٩٧) جار له قورئانێدا دووباره بۆته‌وه، نیزیکه‌ی (٢٠) جاران به مانای سزاو پاداشت به‌کارهێنراوه و، (٧٧) جاران به مانای به‌رنامه‌و په‌یڕه‌و یان گه‌ردنکه‌چیی و فه‌رمانبه‌ریی، ئنجا له‌و (٧٧) جاره‌ش بێجگه له چه‌ند جارێکی که‌م، که به ژماره‌ی په‌نجه‌کان ده‌ژمێردرێن، ئه‌گه‌ر نا هه‌ر به مانای به‌رنامه‌و

په‌یڕه‌وی ژیان به‌كارهێنراوه‌، جا ئه‌و به‌رنامه‌و په‌یڕه‌وه‌، چ خوایی بێ، چ هی غه‌یری خوا بێ.

ئنجا هه‌ركاتێك ویسترابێ: به‌ وشه‌ی (دین) به‌رنامه‌ی خوا بفامرێته‌وه‌، ئه‌وه‌ وشه‌ی ناوبراو نیشانه‌ (قید)ێكی جوێكه‌ره‌وه‌ی ڕه‌گه‌ڵ خراوه‌، ئه‌و جوێكه‌ره‌وه‌یه‌ش:

**یه‌ك:** به‌زۆریی ئه‌لیف و لامی (عهد)[1]ه‌، وه‌ك:

١- ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ۝١﴾ (الماعون-١).

٢- ﴿لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ﴾ (التوبة-١١٢).

٣- ﴿وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ﴾ (الأنفال-٧٢).

**دوو:** هه‌ندێك جارانیش سیفه‌تێكی (دین)ی خوایه‌ وه‌ك:

١- ﴿ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾ (یوسف-٤٠).

٢- ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ﴾ (الروم-٤٣).

٣- ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ﴾ (التوبة-٣٣).

٤- ﴿قُلْ إِنَّنِى هَدَىٰنِى رَبِّىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا﴾ (الأنعام-١٦١).

**سێ:** هه‌ندێك جارانیش ئه‌و جوێكه‌ره‌وه‌یه‌ بریتییه‌ له‌ پاڵدان (إضافة)ی (دین) بۆ لای خوا (جل جلاله‌) یان بۆ لای بڕواداران، وه‌ك:

﴿وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ﴾ (النور-٢).

---

(١) ئه‌لیف و لامی (عهد) له‌زمانی كوردییدا: (كه‌) یه‌ بۆ نموونه‌: (جئني بالكتاب) كتێبه‌كه‌م بۆ بێنه‌.

﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ (آل عمران-٨٣).

﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ﴾ (البقرة-٢١٧).

﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ (المائدة-٣).

﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ﴾ (البقرة-٢١٧).

ئێستاش هەرچەندە کە لەبەر تیشکی قورئانی قسەلەجێدا وشەی (دین)مان توێژییەوە، حەوجێی بەهیچی دیکە ناکات، بەڵام بۆ زێدە دڵنیایی خوێنەری بەڕێز، با چاوێکی خێراش بە هەندێک لە فەرهەنگەکاندا بگێڕین، تاکو بزانین زمانزانان وشەی (دین)یان لەڕوانگەی شەرعەوە چۆن لێکداوەتەوە:

١- (راغب الأصفهاني) دەڵێ:

(الدين يقال للطاعة والجزاء واستعير للشريعة)[1]، واتە: ئایین بە گەردنکەچیی و سزاو پاداشت دەگوترێ و، بۆ بەرنامەی خواش خوازراوەتەوە.

٢- (الجرجاني) دەڵێ:

(الدين وضع إلهيٌّ يدعو أصحابَ العقول إلى قبول ما هو عند الرسول (صلى الله عليه وسلم))[2]، واتە: ئایین بەرنامەیەکی خواییە، خاوەن عەقڵان بانگ دەکات بۆ وەرگرتنی ئەوەی لە لای پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم).

---

(١) (معجم مفردات ألفاظ القرآن) ل١٧٧.

(٢) (كتاب التعريفات)، ل٤٧.

**٣- (ابن منظور) دەڵێ:**

(وفي التنزيل العزيز: ما كان ليأخذ أخاه في دين الملك، قال قتادة: في قضاء الملك)[١]، واتە: لە قورئانی بەرزو زاڵدا هاتوە: (ما كان ليأخذ أخاه في دين الملك) قەتادە گوتوویەتی: واتە لە حوکم و دادوەریی پادشادا.

**٤- (فريد وجدی)یش دەڵێ:**

(الدين هو الطاعة والإنقياد، واسمٌ لجميع ما يعبد به الله..)[٢]، واتە: ئایین فەرمانبەریی و گەردنکەچ کردنە و، ناوە بۆ تێکڕای ئەو شتانەی خوایان پێ دەپەرسترێ.

ئنجا لەبەرئەوەی وشەی (إسلام)یش لەزۆر جێی قورئانیدا وەک بە هاوتا[٣] (مرادف)ی وشەی ئایین بەکارهێنراوە، بەپێویستی دەزانم کورتە هەڵوەستەیەکیش لەبەردەم ویدا بکەین و، لەدوو دەلاقەی ئەسڵی زمان و قورئانەوە سەرنجێکی بدەین:

وشەی (إسلام) لە ڕوانگەی زمانەوە:-

**١- (فيروز آبادي) دەڵێت:**

(وأسلم: انقاد وصار مسلماً)[٤]، واتە: (أسلم) یانی گەردن کەچ بوو و بوو بە مسوڵمان.

---

(١) (لسان العرب)، ب١٣، ل١٧٠.

(٢) (دائرة المعارف قرن العشرين)، ب٤، ل١٠٦.

(٣) بۆیە گوتوومە: وەک هاو واتا چونکە قەناعەتم وایە وشە هاو واتاکان (الألفاظ المترادفة) لەقورئاندا بوونیان نیە.

(٤) (القاموس المحيط)، ب٤، ل١٣١.

دیسان دەڵێ:

(والسلامة: البراءة من العيوب) [1]، واتە: (السلامة) یانی پاكیی لە كەموكوڕیی و ناتەواوییەكان.

٢- (ابن منظور) دەڵێ:

(والإسلام والإستسلام: الإنقياد) [2]، واتە: (إسلام) و (إستسلام) یانی فەرمانبەریی و گەردنكەچیی.

وەک دەبینین وشەی (إسلام) [3] لە ئەسڵ و بنچینەی زماندا، دوو واتای هەن:

**یەكەم:** گەردنكەچیی و فەرمانبەریی.

**دووەم:** سەلامەتیی و پاكبوونەوە.

قورئانی بەڕێزیش، كە ئەم وشەیەی بەكارهێناوە، هەردووک واتایەكەی تێدا ڕەچاو كردوون، بەڵام چەمک و مەبەستێكی تایبەتیی و سەربەخۆشی پێبەخشیوە.

وشەی (إسلام) لە ڕوانگەی قورئانەوە:-

١- (الجرجاني) گوتوویەتی:

(الإسلام هو الخضوع والإنقياد لما أخبر به الرسول (صلى الله عليه وسلم)) [4]، واتە: ئیسلام بریتییە لە سەرنەوی كردن و گەردنكەچیی بۆ ئەو-بەرنامەی-ەی، كە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) -لەلایەن خواوە- هەواڵی پێداوە.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو.

(٢) (لسان العرب)، ب١٢، ل٢٩٣.

(٣) وشەی (إسلام) بە هەموو ڕێژگەكانیەوە نزیكەی (٩٤) جار لە قورئانێدا دووبارە بۆتەوە. تێبینی: بۆ سەرژمێری دووبارەبوونەوەی وشەی (دین) و وشەی (إسلام) پشتم بە (المعجم المفهرس لألفاظ القرآن الكريم) نوسراوی محمد فؤاد عبدالباقی بەستوە.

(٤) (كتاب التعريفات)، ل١٠.

**٢- (ابن منظور) گوتوویه‌تی:**

(والإسلام من الشريعة: إظهار الخضوع وإظهار الشريعة، والتزام ما أتى به النبّي (صلى الله عليه وسلم))[١]، واته‌: ئیسلام له‌ شه‌رعدا بریتیه‌ له‌ پێشاندانی گه‌ردنكه‌چیی و خستنه‌ڕووی به‌رنامه‌ی خوا-له‌ژیاندا- و پابه‌ندبوون به‌وه‌ی كه‌ پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم)-له‌لایه‌ن خواوه‌- هێناویه‌تی.

**٣- (راغب الأصفهاني)یش گوتوویه‌تی:**

(والإسلام في الشرع على ضربين: أحدهما دون الإيمان وهو الإعتراف باللسان وبه يحقن الدم، حصل معه الإعتقاد أم لم يحصل، وإياه قصد بقوله [قَالَتْ الأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا] والثاني فوق الإيمان، وهو أن يكون مع الإعتراف اعتقاد بالقلب ووفاء بالعمل واستسلام لله في جميع ما قضى وقدّر، كما ذكر عن إبراهيم (عليه السلام) في قوله: [إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ])[٢]، واته‌: ئیسلام له‌ ڕوانگه‌ی شه‌رعه‌وه‌ دوو جۆره‌؛ یه‌كیان له‌خوار بڕواوه‌یه‌ ئه‌ویش دان پێداهێنانه‌ به‌زمان و، به‌م جۆره‌ش خوێنی مرۆڤ ده‌پارێزرێ، جا بڕوای نێودڵی له‌گه‌ڵ هه‌بێ یان نا، به‌م ئایه‌ته‌ش ئه‌م جۆره‌ مه‌به‌ست بووه‌: (عاره‌به‌ خێڵه‌كییه‌كان گوتیان: بڕوامان هێنا، بڵێ بڕواتان نه‌هێناوه‌، به‌ڵام بڵێن مسوڵمان بووین).

وه‌ جۆری دووه‌میان له‌ سه‌رووی بڕواوه‌یه‌، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه‌ كه‌ وێڕای پێڵێنان بڕوای به‌دڵ و جێبه‌جێكردنی به‌كردارو، گه‌ردنكه‌چ كردن بۆ خوا هه‌بێ له‌هه‌ر شتێكدا كه‌ كردوویه‌تی و بڕیاری له‌سه‌ر داوه‌، وه‌ك له‌ ئیبراهیمه‌وه‌ گێڕدراوه‌ته‌وه‌ كه‌ ده‌فه‌رموێ: (كاتێك خوا پێی فه‌رموو: مسوڵمان به‌! گوتی: گه‌ردنكه‌چم بۆ خوای په‌روه‌ردگاری جیهانه‌كان).

---

(١) (لسان العرب)، ب١٢، ل٢٩٣.

(٢) (معجم مفردات الفاظ القرآن)، ل٢٤٦.

**٤- دیسان (ابن منظور) گوتوویەتی:**

(دەگوترێ فلان کەس مسوڵمانە، ئەویش دوو ڕای تێدا هەن؛ یەکەمیان یانی ئەو کەسە گەردنی کەچە بۆ فەرمانی خوا، دووەمیان یانی ئەوکەسە پەرستن و بەندایەتیی خۆی بۆ خوا یەکلا کردۆتەوە-واتە بێجگە لە خوا بەشی کەسی پێوە نەماوە-)[١]

هەروەها گوتوویەتی:

(وقوله تعالى [يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا] فسره ثعلب فقال: كل نبي بعث بالإسلام غير أن الشرائع تختلف)[٢]، واتە: قسەی خوای بەرز-کە دەفەرموێ- (ئەو پێغەمبەرانەی کە مسوڵمان بوو ون حوکمی پێ دەکەن-واتە بە تەورات-) (ثعلب) ئاوای لێکداوەتەوە گوتوویەتی: هەموو پێغەمبەرێک ئیسلامی پێدا نێرراوە، ئەوەندە هەیە بەرنامەکان جیاوازن.

کەواتە: ئیسلام لە ئەسڵ و بنەچەکەی زماندا واتە: گەردن کەچ کردن و ساف بوونەوەو یەکلا بوونەوە.

بەڵام لە شەرعدا، ئیسلام بریتیە لە گەردنکەچکردنی ئینسان بۆ بەرنامەی خوا، جا بڕوای نێو دڵی لەگەڵ بێ یان نا[٣]، واتە شەرعی خوا کە وشەی ئیسلامی بەکارهێناوە، هەر لەسەر بنچینەی واتا زمانییەکەی بەکاری هێناوە، ئەوەندە هەیە گەردنکەچیی و یەکلابوونەوەکەی تایبەت کردوە، بە گەردن کەچ کردن و یەکلابوونەوە بۆ بەرنامەی خوا.

---

(١) (لسان العرب)، ب١٢، ل٢٩٣.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ب١٢، ل٢٩٥.

(٣) ئەمە واتایەکی ئیسلامەو واتای دیکەشی هەیە کە لەگەڵ ئیماندا هاوواتایە، شایانی باسیشە لە کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتدا) دەرسێکمان تایبەت کردوە بە جیاوازیی نێوان ئیمان و ئیسلامەوە، بڕوانە بەرگی یەکەم، چاپی ٢٠٠٦، نووسینگەی تەفسیر.

ئێستاش هەرچی کە دەربارەی (دین) و (إسلام) گوتمان لەچەند خاڵێکدا بەکورتی دەیخەینە ڕوو:

**یەکەم:** وشەی (دین) لە ئەسڵ و بنچینەی زماندا، دوو واتای هەن: یەکەم: سزاو پاداشت، دووەم: گەردنکەچیی و فەرمانبەریی.

**دووەم:** بەڵام قورئان کە وشەی ناوبراوی بەکارهێناوە، وێڕای دوو واتا ئەسڵییەکەی واتایەکی دیکەی سێیەمیشی بۆ زیاد کردوە، کە هەردووک واتا پێشووەکەشی تێدان، ئەویش ئەوەیە کە (دین) واتە: بەرنامەو پەیڕەوی ژیان، جا ئەو بەرنامەیە سەرچاوەکەی خوا بێ یان نا، و ڕاست بێ یان هەڵە.

**سێیەم:** هەرجارێکی ویسترابێ بە وشەی (دین) بەرنامەی خوا بفامرێتەوە، ئەوە نیشانەو (قید)ێکی جوێکەرەوەی ڕەگەڵ خراوە.

**چوارەم:** وشەی (إسلام)یش لە زماندا دوو واتای هەن: یەکەم: گەردنکەچیی و سەردانەواندن، دووەم: خۆساغ کردنەوەو یەکلابوونەوە.

**پێنجەم:** لە بەکارهێنانی قورئانیشدا هەردووک واتا ئەسڵییەکەی لەبەرچاو گیراون، بەڵام چەمک و مەبەستەکەیان تەسک کراوەتەوەو، تایبەت کراوە بە بەرنامەی خواوە، واتە سەردانەواندن و یەکلابوونەوە بۆ بەرنامەی خوا.

**شەشەم:** ئیسلام ناوە بۆ هەموو ئەو ئایین و بەرنامانەی، کە خوا بە پێغەمبەرانیدا (علیهم الصلاة والسلام) ناردوونی، هەرچەند لە چۆنیەتی و چەندیەتیشدا لێک جوێ بووبن، بەڵام لە کاکڵ و مەبەستدا یەک بوو ون، کە بریتیە لە سەردانەواندن و گەردنکەچ کردن بۆ بەرنامەی خواو، خۆ یەکلاکردنەوە بۆ بەندایەتیی و فەرمانبەریی خوا.

**حەوتەم:** وەک گوتمان: ئیسلام ناوی ئایینی هەموو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، بەڵام دوایی لە ڕێگەی عورفەوە وەک ناوێکی تایبەتی بەسەر ئەو بەرنامەیەدا براوە، کە بەدوایین پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) نێردراوە.

خوێنەری بەڕێز!

ئێستا کە زانرا (دین) لە ڕوانگەی قورئانەوە، بریتیە لە دەستوورو بەرنامەی ژیانی مرۆڤ، سادەیی و نەفامیی یان دەغەڵیی و بێتامیی، ئەو جۆرە کەسانەمان بۆ دەرکەوت کە وا بیردەکەنەوە: ئایین[1] بریتیە لە پەیوەندییەکی مەعنەویی و گیانیی لە نێوان خواو بەندەداو، هیچ پەیوەندییەکی بە لایەنەکانی دیکەی ژیانەوە نیە![2]

بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئایینی ئیسلام لیتەولاڵی سەرچاوەی ئەفسانەی زۆرو، تۆزو خۆڵی گێژەڵووکەی بای نەفامیی جۆراوجۆری زۆر لێ نیشتوە، بەپێویستی دەزانم لە باسێکی تایبەتیدا لە چەند خاڵێکدا، نیشانەو دروشمە گرنگ و سەرەکییەکانی ئایین بخەمە ڕوو، تاکو بەتەواویی چەمک و واتای ڕەسەنی ئایین لە ئاوێنەی دڵ و مێشکی خوێنەرانی خۆشەویست و سەنگیندا، ئاشکراو درەوشاوە بێ.

هەڵبەتە ئایین و بەرنامەی خواش، دروشم و نیشانەی گرنگ و سەرەکیی زۆرن، بەڵام ئێمە لێرەدا بەس حەوتانیان لێ دەخەینە ڕوو؛ چونکە لە بەندی سێیەمیشدا ئەم باسە بەسەر دەکەینەوە.

---

(١) مەبەستمان لە (ئایین) ئایینی ئیسلامە؛ چونکە وەک گوتمان وشەی (دین) بەهەر بەرنامەیەکی ژیان دەگوترێ، خوایی بێ یان مرۆڤکرد، بەڵام لەنێو مسوڵماناندا بەهۆی عورفەوە، ئایین بەس بە بەرنامەی خوا دەگوترێ، جا بێگومان تاقە بەرنامەی ڕاست و نەگۆڕڕاویش کە شوێنکەوتنی مایەی ڕازیبوونی خواو سەربەرزیی و بەختیاریی ئەم دنیاو ئەو دنیابێ، ئیسلامە.

(٢) لەکاتی نووسینی ئەم کتێبەدا مەبەستم لە خاوەنی ئەم جۆرە قسانە ڕژێمی بەعس و وابەستەو دابەستەکانی بوون، نەشمدەزانی کە پاش لاچوونی نیری بەعسی طاغووت لەسەر شان و ملی کۆمەڵگای کوردستان، برادەرانی عەلمانیی و لائیکیش هەمان قاوان دووبارە دەکەنەوە، وێڕای خستنەسەری هەندێک شتی داهێنراوی خۆشیان!! ﴿ أَتَوَاصَوْا بِهِۦ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ (الذاريات-٥٣). چاپی دووەم: ٢٠٠٨ز. ئێستاش (٢٠١٩/٩/١٩ز — ٢٠/محرم/١٤٤١ک) واقیعەکە هەروایە!

باسی دووەم

## نیشانەو دروشمە سەرەکییەکانی ئایین

١- بەرنامەی ژیان بەس لەلایەن خواوە دادەنرێ:

خوای زاناو بەهێز فەرموویەتی: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾ (آل عمران-٨٣).

واتە: ئایا بەرنامەیەکی دیکە، جگە لە هی خوا دەخوازن! لە حاڵێکدا کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، بیەوێو نەیەوێ گەردنکەچیەتی و بۆ لای ویش دەگەڕێنرێنەوە؟!!!

وەک دەبینین خوای زاناو فەرمانڕەوا، گەردنکەچیی بوونەوەر بۆ ئەو نەخشەو بەرنامە گشتییەی کە لەلایەن خواوە دانراوە، دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پێویستە ئینسانیش بەس پابەند و ملکەچی ئەو ئایین و بەرنامەیە بێ، کە وەک بەرنامەی گشتی بوونەوەر لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دانراوە.

جا لەڕاستیدا هەر ئەوەش لە مرۆڤ دەوەشێتەوەو، هەر ئەوەش شتێکی ماقووڵ و چاوەڕوانکراوە؛ چونکە مرۆڤ بەشێکە لەم بوونەوەرەو، پێویستە ئەو سەرچاوەیەی کە نەخشەو بەرنامەی بوونەوەری لێوە دەرچووە، بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی مرۆڤیش هەر لەوێوە دەربچێ، بۆ ئەوەی:

**یەکەم:** جووڵان و (الحركة والإتجاه)ی ئینسانیش لەگەڵ هی بوونەوەردا ڕێک و هاوئاهەنگ بێ، چونکە بابای بێبڕواو دوور لە خوا، بەهۆی

بێبڕوایی و لاڕێبوونییەوە لە ئایینی خوا، لە یاسای گشتیی بوونەوەر لاڕێ دەبێو، وەک ئەو ترۆمبێلەی لێدێ، کە بەخواریی و نالەباریی دەڕواو، لەیاسای گشتی هاتوچۆ (قانون المرور العام) لادەداو، ڕێزپەڕ (شاذ)و ناقۆڵا دێتە بەرچاو!!

**دووەم:** چونکە تێکڕای زاناو شارەزاو پشکنەرانی زانیارییە سروشتییەکان، لەوەدا ڕێک کەوتوون کە لە بەرنامەو پەیڕەوی سەرلەبەری بوونەوەردا، هێندەی نووکە دەرزییەکیش بێیاسایی و ناڕێکیی بەدی ناکرێو، بوونەوەری زەبەلاح و فراوان وەک یەک جەستە، هەرکام لە ئەندامەکانی هاوکاریی ئەوانی دیکە دەکات و، هەموویان بەرەو یەک ئامانج دەجووڵێن و، ڕووەو یەک قیبلەی پەرستن کڕنووش دەبەن و بەچۆک دادێن.

مادام وابێ ئەو بەدیهێنەرو پەروەردگارە زاناو تواناو کاربەجێیەی، کە توانیویەتی بەرنامەیەکی هێندە ڕێک وپێک و پڕ وردەکاریی بۆ بوونەوەر دابنێ، هەر ئەویش دەتوانێ بەرنامەو ئایینێکی تێرو تەواو و بێ کەموکووڕیی، بۆ بەڕێوەچوونی ژیانی مرۆڤ دابنێ.

**سێیەم:** هەر ئامێرێک لە چ کارگەو فابریقەیەکەوە دەرچێ، هەر لەهەمان شوێنیشەوە (کەتەلۆک)-نەخشەو شێوازی کارکردن و بەڕێوەچوون-ی ڕەگەڵ دەخرێ، دەجا شتێکی ڕوونیشە، کە ئینسان بەرهەم و دروستکراوی کارگەی زانیاری و دەستەڵات و بەزەیی خوایە.

بەڵێ لە ڕوانگەی ئایینەوە، بێجگە لە خوای پەروەردگار، هیچ کەسێکی دیکە ڕێی ناکەوێو مافی ئەوەی نیە، خۆی لە خەڵکی بکاتە پەرستراوو، بەرنامەو نەخشەی ژیان و گوزەران و بەڕێوەچوونیان بۆ دابنێ.

**چوارەم:** خوای میهرەبان لە جێیەکی دیکەدا پتر تیشک داوێتە سەر ئەم مەسەلەیەو دەفەرموێ: ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ

مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾ ﴾ (الشورى-٢١).

واتە: ئایا ئەوانە-ی دەکەونە دوای بەرنامەی غەیری خوا- چەند هاوبەشێکیان هەن جۆرە بەرنامەیەکیان بۆ داناون، کە خوا ڕێی نەداوە! لەبەر ئەوە نەبووایە کە خوا بڕیاری داو (کە تا ڕۆژی دوایی کەس سزا نادات) خوا حوکمی لەنێواندا دەکردن و، زۆرداران سزایەکی بەئازاریان هەیە.

وەک لەم ئایەتە بەپێزەدا دەبینین، شوێنکەوتنی هەر بەرنامەیەک بێجگە لە هی خوا، بەهاوبەش بۆخوا پەیداکردن (الشرک بالله) دادەنرێ، واتە ئەو کەسەی بەرنامەی ژیان-جا بەرنامەی تەواوی ژیان بێ، یان بەس هی لایەنێکی- بۆ خەڵکی دادەنێ مانای وایە خۆی لەسەر کردوونە پەرستراو (إلە)، هەڵبەتە هەموو تاوانێکیش ڕێی دەچێتێ چاوپۆشی لێ بکرێ، بێجگە لە هاوبەش دانان (الشرک)، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ﴾ (النساء-٤٨).

واتە: بێگومان خوا لەوە نابوورێ کە هاوبەشی بۆ دابنرێ، بەڵام بێجگە لەوە هەرکەسێکی بوێ لێی خۆش دەبێ.

کەواتە: ئەگەر دەمانەوێ خوا بە بەندەی خۆیمان لەقەڵەم بدات و، بە شوێنکەوتووی ئایین و بەرنامەکەیمان حسێب بکات، با هەوڵ بدەین هەرچی زووتر ژیانی خۆمان و کۆمەڵمان، لەهەر جۆرە یاساو ڕژێمێکی نەفامیی و شەیتانیی پاک بکەینەوەو، بە یاساکانی حوکم و بەرنامەی خوای پەروەردگار جێیان پڕ بکەینەوە.

خۆ ئەگەر وانەکەین، ئەگەر بە هاوبەش بۆ خوا بڕیاردەرو طاغووت پەرستیش دانەنرێین، لانی کەم بە بابایەکی سەرشۆڕکەر بۆ طاغووت و قایل بوو بە ڕژێمی هاوبەش پەرستیی و نەفامیی دادەنرێین.[1]

---

(١) ئەم قسەیە کاتی خۆی بۆ ڕۆژگاری ڕژێمی حیزبی بەعسی عارەبی سۆشیالیستی

## ٢- بەرنامەی ژیانی مرۆڤ لەلای خوا، بەس ئیسلامە:

١- خوای دەسەڵاتدارو میهرەبان فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَـٰمُ ﴾ (آل عمران-١٩)، واتە: بێگومان بەرنامە لەلای خوا بەس ئیسلامە.

وەک لەباسی یەکەمی ئەم خاڵەدا گوتمان و سەلماندیشمان؛ (دین) واتە: بەرنامەو پەیڕەوی ژیان، ئنجا لێرەدا خوای قسەلەجێ بە ئاشکرا فەرموویەتی: تاقە بەرنامەیەک کە خوا پێی ڕازی بێو، بەتێروتەسەلی بزانێو، پێی لە مرۆڤایەتی بوەشێتەوە، بریتیە لە ئایینی ئیسلام و، بێجگە لەوی، هیچ بەرنامەیەکی دی دەبارانیدا نیە بکرێتە ڕێبازی ژیان و بەڕێوەچوونی ئینسانەکان.

٢- هەر لەوبارەوە خوای پاک و بەرز فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ (آل عمران-٨٥)، واتە هەرکەسێک بێجگە لەئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ، ئەوە لێی وەرناگیرێو، لەدوارِۆژیشدا لە زیانبارانە.

٣- دیسان فەرموویەتی:

﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا ۚ ﴾ (المائدة-٣)، واتە ئەمڕۆ بەرنامەکەتانم بۆ تەواوکردن و، چاکەو نیعمەتی خۆم بەسەردا تەواوکردن و، ئیسلامم بە بەرنامە-ی ژین- بۆ پەسەند کردن.

بەڵێ لە ڕوانگەی ئایینەوە"کە مەبەستمان لە ئایین لێرەداو لەهەر شوێنێکی دیکەش کە دووبارە دەبێتەوە، هەر ئیسلامە، ئنجا هەرچەندە وشەی ئایین کە تەرجەمەی وشەی (الدین)ە لە ئەسڵدا ئیسلام و غەیری ئیسلامیش

---

گوتراوە، هەر ڕژێم و سیستەمێکی طاغووتی نەفامییش دەگرێتەوە.

ئێستاشک: (٢٠١٩/٩/١٩ز) دەڵێم: هیچ کەس لەبەرانبەر خوادا مافی ڤیتۆ یان پارێزبەندیی (حصانە)ی نیەو لادان و تاوان هەر لادان و تاوانە، لەهەرکەسێکەوەو لەهەر ڕۆژگارێکدابێ.

لە بەرنامە خواییەکان و بگرە هەر بەرنامەو ڕێچکەیەکی مرۆڤکردیش دەگرێتەوە، بەڵام لە بەکارهێنانی عورف و باوی خەڵیکدا وشەی ئایین (الدین) تەنیا ئیسلامەتییە، ئێمەش بە ماناو چەمکە باوو عورفییەکەی بەکاری دەهێنین» بەرنامەی ژیانی ئینسان بەس ئەو بەرنامەیەیە کە خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەری نەخوێندەوار (النبيّ الأمّيّ)دا ناردوویەتی و، هەرکەسێک خۆی بە بڕوادار بزانێو، لە دۆزەخێ بترسێو، بەتەما چوونە بەهەشتێ بێ، پێویستە لەهیچ وردو درشتێکی ژیانیدا، بێجگە لە بەرنامەی خوا، پرس بە هیچ بەرنامەیەکی دیکە نەکات.

زۆر سەیرە مرۆڤێک بڵێ: بڕوام بەم ئایەتانە هەیەو خۆی بە بڕوادار بزانێو، بەخۆشی ڕەوا ببینێ، پەنا بەرێتە بەر غەیری خواو بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی لێوەربگرێ!

ئایا ئەو سادەبیرە نازانێ کە بەو ڕەفتارە نالەبارەی، بەزمانی حاڵ درۆ دەداتە لای خوای بەرزو پاک؟!

خوای زانا فەرموویەتی: ئایینەکەتان تێرو تەواوە (أكملت لكم دينكم) بێگومان شتی تەواویش حەوجێی پینەو پەڕۆیان نیە، بەڵام ئەو گێل و نەفامە، ئەگەر بەزمانی وتار (مقال)یش نەیگوتبێ، بەزمانی کردەوەو حاڵ گوتوویەتی: ئیسلام ناتەواوە! چونکە:

بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت.

یان بۆ بەرەوپێش بردنی ئاوەدانیی وڵات.

یان بۆ پەرەپێدانی پیشەسازیی و کشتوکاڵ و گەشەپێدانی بازرگانی.

یان بۆ وەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکان.

یان بۆ رزگاربوون و گەیشتن بە ئازادیی.

یان بۆ چارەکردنی کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان.

یان.. یان.. هتد. پەنای بردۆتە بەر فڵان و فیسار بیردۆزەو بیروبۆچوون و، بۆتە داشی دامەی فڵانە حیزب و ڕێچکە!!

جا بێگومان مرۆڤیش هەتا شتێک لە ماڵی خۆیدا شک بەرێ، پەنا ناباتە بەر یەکی دی، مادام وابێ هەر کەسێک لەهەر لایەنێکی ژیانیدا: گیانیی و پەروەردەیی، سیاسیی، کۆمەڵایەتیی، ئابووریی،...هتد. پەنا بەرێتە بەر پەیڕەوو بەرنامەیەک، بێجگە لە هی خوا، ئەوە بە زمانی کردەوە دانی پێداهێناوەو پێی لێناوە، کە بەرنامەی خوای پێ ناتەواوە!!

هەڵبەتە بنەڕەتییترین و کاریگەرترین هۆی پەیدابوونی ئەم دیاردەیەش- دیاردەی کەوتنە دوای بەرنامەیەکی مرۆڤکرد- لەنێو گەلانی ئیسلامدا ئەوەیە، کە چەمک و واتاو مەبەستی ئایین لە دڵ و مێشکی زۆربەی هەرەزۆری مسوڵماناندا هێندە گچکە بۆتەوەو، وا خۆی ڕێک هێناوە، کە لە جوغزی مزگەوت و خانەقاو تەکیەکان دەرناچێو، هێندەی لێقرتێنراوەو وا کەچ وکرووچ کراوە، لە هەگبەی سیاسەتی پڕ فڕوفێڵ و پیلانی هەموو طاغووتێکی بە زەبرو زۆرو چاونەشۆرو دیکتاتۆردا دەحەوێتەوە، واتە: چەمک و واتای ئایین هێندە گچکە کراوەتەوەو بە جۆرێک گۆڕراوەو دەستکاریی کراوە، ئەو جۆرە طاغووتانەش دەتوانن لەنێو خەڵکیدا لافی مسوڵمانەتیی و بگرە خزمەتکردن بە ئیسلامیش لێبدەن و هاوکات لەگەڵ ڕیشەکێشکردنی ئاییندا، لافی دینداریش لێبدەن!!

بەڵێ ئەو ئیسلامی وا پان و پۆڕو هەمەلایەنە، کە لە سەردەمی پێغەمبەرو هاوەڵە بەڕێزەکانیدا، سەرلەبەری ژیانی تاک و کۆمەڵی وەبەر خۆ دەداو، دەرمان و چارەی بۆ هەموو دەردو نەخۆشییەک دادەنا!

دەستی ڕیسواو زەبوونی کرێ وەرگری، بەناو پێشەوایانی زڕو دڵنەخۆش و بێهۆش و گۆش و هەموو شت فرۆش و، بۆ خزمەتی طاغووت بەجۆش، لە قڵت و بڕکردن و کەچ و کرووچ کردنی وەخۆ کەوت و، هێندەی لێنەهێشتەوە،

کە بەشی هیچ بکاو، هیچ دەردان چارە بکات؛ چونکە ئیسلام وەک خوا ناردوویەتی، توانای چارەسەری گرفت و کێشەکانی کۆمەڵگای هەیە، بەڵام پاش گۆڕرانی و شێوێنرانی نا!

جا توخوا ئایین گچکەکردنەوەو، ئایەت و فەرموودە لادان و گۆڕین لەوە پتر، کە ئەو ئایینەی کاتی خۆی درەختێک بوو، هەموو گەلێکی چەوساوەو بەشخوراو لەسێبەریدا دەسرەوت و، ئاواتی وەچنگ دەکەوت و، ئەو ئایەت و فەرموودانەی هەر یەکێکیان بوومەلەرزەیەکی بەهێزو تێکەوە ڕاشەقێن بوون، بۆ دڵ و گیان و کۆشک و بارەگای زۆردارو ملهوڕان، ئێستا ئەو درەختە بەرزە، دەستی بەدو نەگریسی بەناو پێشەوایانی دین فرۆش، بە تەورداسی گۆڕین و لادان (تغيير وتحريف) هێندەی لق و پۆپ لێبڕیون و، وای هەڵپەرداوتوە، کەس دڵی خۆی پێ خۆش نەکاو، ڕوو لە سێبەری نەکات، ئایەت و فەرموودەکانیش بە نەشتەری تەئویلکاریی کۆلکە مەلا[1] و زڕەشێخان، هێندە بێکاکڵ و نێوەڕۆک کراون، کە لەجیاتی دڵ ڕاچڵەکاندن و کۆشک لەرزاندن، کراونە هۆی دڵ دامەزران و کۆشک چەسپێنرانی طاغووت!!

---

(١) سەرنج بدە چۆن بە وشەی (کۆلکە مەلا) زانایانی ڕەسەن و میراتگری سەرڕاستی پێغەمبەری خواS و، بە وشەی (زڕەشێخ)یش، شێخ و پێشەوای حەقیقی جیاکراونەتەوە، کە (الحمدلله) کەم و زۆر لە هەر چاخ و ڕۆژگارێک و لەنێو هەر گەل و کۆمەڵێکدا هەر هەبوون و هەن و دەبن، بەڵام مەرج نیە بەناوی (مەلا) و (شێخ)ەوە بن و، لە بەرگ و پۆشاکێکی تایبەتی و جیاواز لەهی خەڵک و جەماوەرەکەیاندا بن، هەر بۆیەش لە قورئان و سوننەتدا مەدحی زانایان (العلماء) و پێشەوایان (الأئمة) و مشورگێڕی سەرڕاستکەر (ولياً مرشداً) کراوە، واتە مەدح و ستایشی خەسڵەتە بەرزەکانی زانیاریی و پێشەوایەتیی و ڕێپیشاندان کراوە، جا هەرکەسێک ئەو سیفەت و نیشانانەی تێدا بێنە دی، دەقەکانی قورئان و سوننەت دەیگرنەوە، ئەگەرنا ناوی بۆش و ڕواڵەت و دیکۆر هیچ نیە، مەگەر بۆ خەڵکی عەوام و ناحاڵی، ئەگەرنا بۆ ئیسلام بایی فلسێکە.

بەڵی خوێنەری بەڕێز!

بەرنامەی ژیانی مرۆڤ، بەس ئایینی ئیسلامە، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە ناسینی ئیسلامدا بەهەڵەدا نەچی و، بزانی چ جۆرە ئیسلامێک!

ئەو ئیسلامەی کە بۆ رازیکردنی زۆرداره خۆبەخوا زانەکان، هێندەی لێ کەچ کراوەو، وای پەڕوباڵ کێشراوە، کە لە دەرگای کۆشک و بارەگای هەموو طاغووتێک و، شیپانەی بنکەی هەموو حیزب و ڕێچکەیەکی شەیتانییەوە دەچێ!!

هەڵبەتە نەخێر، بەڵکو ئەو ئیسلامەی کە لە قورئان و سوننەتدا خراوەتە ڕوو و، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی (رضي الله عنهم) و شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی، بەدێری درشتی هەڵوێست و ئاکاری مەردانەیان ڕووی مێژووی مرۆڤایەتییان پێ سپی کردوەو، ڕاستیی و تەواویی بەرنامەی خواو، لێهاتوویی مرۆڤی مسوڵمان و خواناسیان پێ سەلماندوە.

٣- کاکڵ و نێوەڕۆکی بەرنامەی پێغەمبەران، یەك شتە:

١- خوای تاک و بێهاوتا فەرموویەتی: ﴿ ۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ﴾ (الشـوری-١٣).

واتە: ئەوەی-خوا- بۆ ئێوەی کردۆتە بەرنامە، هەر هەمان ئایینە کە نووحی پێ ڕاسپاردبوو و، ئەوەیە کە بە تۆمان دا ناردوە، ئەوەیە کە ئیبراهیم و مووساو عیسامان پێ ڕاسپاردبوون..

کەواتە بەرنامەی خوا لە سەرانسەری مێژوودا، یەک نێوەڕۆک و یەک واتاو مەبەستی هەبووە، هەر لە نووحەوە (علیە السلام) کە یەکەمین پێغەمبەری خاوەن ئوممەت بووە، تا دوایین پێغەمبەر (محمد) (صلی الله علیە وسلم)، هەموویان بەڕێوەبردنی یەک ئەرک و، هێنانەدی یەک ئامانجیان پێ سپێرراوە، وەک لە جێیەکی دیکەدا فەرموویەتی:

٢- ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾ (النحل-٣٦).

واتە: لە هەموو کۆمەڵێکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردوە، کە پێیان بڵێ خوا بپەرستن و خۆتان لە طاغووت[1] دوور بگرن.

---

(١) (الطاغوت عبارة عن کل متعد وکل معبود من دون الله)، واتە: طاغووت بریتیە لە هەموو سنوور شکێنێک و هەموو پەرستراوێک بێجگە لەخوا. بڕوانە (معجم مفردات الفاظ القرآن) راغب الأصفهاني، ل٣١٤.

(والطاغوت: الشیطان والکاهن وکل رأس في الضلال)، واتە: طاغووت شەیتان و فاڵچیی و هەر سەرکردەیەکی گومڕاییە. بڕوانە (لسان العرب) ب١٥ ل٩.

بەڵێ، بانگەوازی هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆئەوە بووە، کە مرۆڤەکان لەژێر تینی نیری زۆردارانی بێویژدان و خۆ بەخوا زان رزگاریان بێو، لەگێژی دەریای پڕ شەپۆلی بتپەرستیی و کۆیلایەتیی قوتاریان بێو، بچنە بن سێبەری درەختی پڕ پیت و پێز و سەربەخێری خوا بە یەکگرتن (توحید)و، هەروەک چۆن بێجگە لە خوا کەس بەدیهێنەرو، رۆزیدەرو ژیێنەرو مرێنەرو حەوێنەرەوەیان نیە، بێجگە لەویش هیچ کەس بە داوالێکراوو هانا بۆبراوو پشت پێ بەستراوو بەرنامەڕێژو باڵادەست و فەرمانڕەوای خۆیان نەزانن و، هەر ئەو بە شایستەی پەرستران بزانن، کە خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو، دوورە لە هەموو کەم وکوڕیی یەک.

٣- پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی یەکبوونی ئەرک و ئامانجی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) فەرموویەتی: {إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلُ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنى بَيْتًا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ، وَيَعْجَبُونَ لَهُ، وَيَقُولُونَ: هَلاَّ وُضِعَتْ هذِهِ اللَّبِنَةُ فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ} (أخرجه البخاري برقم: ٦٨٥٤، ومسلم برقم: ٦١٠٠).

واتە: وێنەی من و پێغەمبەرانی پێش من، وەک ئەوە وایە کابرایەک خانووێک دروست بکات و، ڕێکی بخات و جوانی بکات، بێجگە لە جێی خشتەیەک لە گۆشەیەک لە گۆشەکانیدا، ئنجا خەڵک بە دەوریدا بێن و بچن و پێی سەرسام ببن و بڵێن: بریا ئەم خشتەیەش ڕۆنرابایە! ئنجا من ئەو خشتەیەم و من کۆتایی پێغەمبەرانم.

وەک لەم فەرموودەیەدا دەبینین ئەرک (وظیفة)و ئامانج (هدف)ی هەموو پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) یەک شت بووە، کە بریتیە لە دروستکردن و ڕێک وپێککردنی کۆشکی بەرزی خوا بەیەکگرتن.

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەک هەیە حەوجێی روونکردنەوەیە، نەوەک پێی هەندێک کەسی تێدا هەڵخلیسکێو بەهەڵەدا بچێ:

ئێمە کە دەڵێین ئەرک و ئامانجی پێغەمبەرانی خوا، هەر لە ئادەمەوە تا خاتەم، (عليهم من الله أفضل الصلوات وأحسن البركات وأتم التسليمات وأدومهنّ) بریتی بووە لە چاندن و فراژووکردنی نەمامی دینداریی و خوا بەیەکگرتن لە دڵ و مێشکی مرۆڤدا، ئەم قسەیەمان-کە زۆر ئایەت و فەرموودە ڕایانگەیاندوە- هیچ ناکۆکیی و دژایەتییەکی لەگەڵ ئەوەدا نیە کە چەسپاندنی دادگەریی (قسط) لەنێو خەڵکیدا تاقە ئامانج و مەبەستی پێغەمبەران بووەو، پیرۆزترین ئەرکیان بووە، وەک خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾ (الحديد-٢٥).

واتە بێگومان پێغەمبەرانی خۆمان بە بەڵگەی ڕوونەوە ناردوون و، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوارێ، بۆ ئەوەی خەڵکی بە دادگەریی بەڕێوە بچن..

نەخێر ئەم ئایەتەو هاووێنەکانی لەگەڵ ئەو ئایەتانەدا، کە ئەرک و ئامانجی پێغەمبەرانی خوا لە چەسپاندنی خوا بەیەکگرتندا کورت هەڵدێنن، هیچ دژایەتییەکیان لەنێواندا نیە، چونکە:

**یەکەم:** بەڵێ چەسپاندنی خواپەرستیی و خوا بەیەکگرتن (توحید) تاقە ئەرک و ئامانجی نێررانی پێغەمبەرانە (عليهم الصلاة والسلام)، بەڵام تاقە ڕێبازو هۆی وەدەست هێنانی ئەو ئامانجەش، بریتییە لە دروستکردنی کۆمەڵگایەکی وا کە هەڵدەستن بە چەسپاندنی دادگەریی لەنێو خۆیاندا، کەواتە چەسپاندن و هێنانەدی دادگەرییش ئامانج و ئەرکی هەرەبەرزو

پیرۆزی پێغەمبەرانە، بەڵام نەک لەبەر خودی خۆی، لەبەر ئەوەی ڕێگای چەسپاندنی ئامانجی بەرزی خوا بەیەکگرتنە لەنێو خەڵکیدا[1].

**دووەم:** هەروەک چۆن ئەو نەمامەی ڕەگ و ڕیشەکانی بەناخی زەویدا ڕۆ دەچن، دوایی قەد و لق و پۆپی پەیدا دەبن و، قەد و لق و پۆپەکانی دەبنە شایەد و بەڵگەی سەلماندنی بوونی، هەر کاتێکیش خواپەرستیی و خوا بەیەکگرتن ڕەگ و ڕیشەی لە زەوی دڵ و دەروونی کۆمەڵە مرۆڤێکدا داکوتا، وەک ئەنجام و بەرهەمێکی حەتمیی و سروشتیی، ئەو بیروبڕوا خواییە هەوڵی سەلماندنی بوونی خۆی دەدات، لە ڕێی ئەو کردەوەو ئاکارو چالاکییە گیانیی و سیاسیی و کۆمەڵایەتییانەوە، کە ئەو کۆمەڵە ئینسانە ئەنجامیان دەدەن و، دەبنە لق و پۆپ و واقیعێکی زیندوو و بەرچاوی ئەو تێڕوانین و بیروبڕوایەی کە لەدڵ و دەروونیاندا بۆتە ڕەگ و ریشەیەکی ڕۆچوو و دامەزراو.

کەواتە بەڵێ چەسپاندنی بیری خوا بەیەکگرتن لە دڵاندا، گەورەترین ئەرک و بەرزترین ئامانج و مەبەستی پێغەمبەران بووە، بەڵام هەر بڕوایەک بەڕاستیی لە دڵدا دابمەزرێ و ڕەگان دابکوتێ، حەتمەن پەرێزو شوێنەوارێکی واقیعیی و بەرهەست بەرهەم دێنێ، دەجا دروستکردنی کۆمەڵگایەکی خوایی وا کە دادگەریی تێدا بەڕێوە دەبرێ، بەرهەم و شوێنەواری بیری خوا بەیەکگرتنە هەرکاتێک بەراستی لە دڵاندا جێگیر بێ.

مادام وابێ لەنێوان ئەم دوو ڕستەیەدا هیچ جیاوازیی نیە، چ جای دژایەتیی:

١- پێغەمبەران بۆ چەسپاندنی بیروبڕوای خوا بەیەکگرتن نێرراون.
٢- پێغەمبەران بۆ هێنانەدی کۆمەڵگەیەک نێرراون کە بە دادگەریی بەڕێوە دەچێ.

---

(١) لەوە ڕاستتر ئەوەیە بڵێین: هەرکام لە خوا بەیەکگرتن (توحید)و دادگەریی (عدل) ئامانجی گەورەی پێغەمبەرانن، یەکەمیان وەک پەیوەندیی نێوان خواو مرۆڤەکان و دووەمیشیان وەک پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان خۆیان، ٢٠١٩/٩/١٩ز – ٢٠/ محرم/١٤٤١ک.

چونکـە لـە ڕسـتەی یەکەمیانـدا خـودی ئامانـج و مەبەسـتی پێغەمبـەران لەبەرچاو گیراوە، بەڵام لەهی دووەمیاندا، بەرهەم و شوێنەواری ئەو ئامانجەو، بەڵگەو شایەدی بوونی لەبەرچاو گیراوە.

**سێیەم:** کەواتـە لەنێوان لـە دڵانـدا (دامەزرانـی حەقیقەتـی خوا بەیەکگرتـن) و ( لـە کۆمەڵـگادا چەسـپێنرانی دادگەریـی)دا پەیوەندیـی و کارلێککردنـی دووسـەرە (تأثیر متبادل) هەیە، چونکـە بیروبڕوا تێڕوانینی خوا بەیەکگرتنە کـە کۆمەڵـە مرۆڤێکـی هەڵبژاردەی خوایـی هەڵدەنێو دەجووڵێنێ، بەرەو گۆڕینی کۆمەڵگاو، ڕامالّین و پێچانـەوەی خێوەتـی بۆری طاغـووت و، تێکنانـی بارگەو بنـەی بـەرەو هـەواری زبڵدانـی مێژوو و، دامـەزراندنـی کۆمەڵگایەکـی خوایـی لەسـەر بنچینـەی بڕواو چەسپاندنی دادگەریـی.

ئنجا دوایی ئەو کۆمەڵگایە نوێیەو، ئەو دادگەریی چەسـپاندنە لەنێویـــدا، کاردەکاتـە سـەر بزواندنـی هەسـت و نەسـتی خەڵکـی و، هاتنەدەریـان لـە قـاوغ و قەپێلکـی تەسـک و تـرووسـکی بیروبۆچوونـە میراتیـی و تایبەتییەکانیـان و، شـەقاو هەڵێنانیـان بـەرەو بڕواهێنـان بـەو بیروبـڕوا ڕاسـت و دروسـتە خواییـەی، کـە توانـی لـە دنیـای واقیعـدا بوونـی خـۆی بسـەلمێنێو، کۆشـکی طاغـووت بڕووخێنێو، دادگەریـی بچەسـپێنێ.

ئنجائەوەی گوتمان بە شێوەیەکی کردەیی و واقیعی لە ژیانی پێغەمبەرماندا (صلی الله علیه وسلم) دەدرەوشێتەوە:

لەپێشـدا کۆمەڵـە ئینسـانێکی خوایـی هەڵبژاردە-کـە هاوەڵـە کۆچکـەرو پشتیوانەکاننی (المهاجرون والأنصار)- بیروبڕوای خوا بەیەکگرتنیـان لـە دڵ و دەروونـدا چەسـپی و، دەسـتبەجێ پێی کـەوتنە جموجووڵ و تێکۆشـان و ڕەنجدان، هەتـا کاتێـک کـە بەهـۆی بیروبڕوای پتـەوو قووڵیان، بەسـەر سـەدان جۆرە ئازارو ناڕەحەتیـی و گیروگرفتـی گیانیـی و جەسـتەیی و تاکیـی و کۆمەڵییـدا زاڵ بـوون و، توانیـان دەوڵەتـی قورئـان، پاش هەبوونـی لـە دڵانـدا، لـە واقیعـی ژیانـدا

بەرپا بكەن و، لەنێو خۆیان و لەگەڵ خەڵكیدا بە دادگەریی ڕەفتار بكەن، لەو كاتەدا زۆربەی هەرەزۆری خەڵكی دەوروبەریان، پەردەی خامۆشییان لاداو، تاق تاق و، جووت جووت و، كۆمەڵ كۆمەڵ بەرەو سێبەری درەختی خوا بەیەكگرتن هاتن و، خۆیان بە كاروانی مسوڵمانە هەڵبژاردەكانەوە پەیوەست كردو مسوڵمان بوون، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢﴾ (النصر: ١-٢).

واتە: كاتێك یارمەتی خوا هات و، سەركەوتن هاتە دی و خەڵكت دی كۆمەڵ كۆمەڵ هاتنە نێو ئایینی خواوە..

ئنجا با كۆتایی ئەم باسە بەم قوڵە نەزیلەیە بێنین، كە مێژووی ئیسلامی بۆی تۆمار كردووین، ئەویش بریتیە لە ڕوبەڕووبوونی یەكێك لە هاوەڵ و قوتابییە بڕوادارو خوا بەیەكگرتووەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ (ڕۆستەم)ی سەركردەی سوپای فارسدا:

(كاتێك دوو سوپایەكان ڕووبەڕووی یەك بوون، ڕۆستەم وەڵامی نارد بۆ سەعد[1] (سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص) كە پیاوێكی تێگەیشتوو و زانای بنێرێتە لا، لە بابەت ئەو شتەوە كە پرسیاری لێ دەكات، ئەویش موغەییرەی كوڕی شوعبەی نارده لا (خوا لێی ڕازی بێ)، ئنجا كاتێك چووە لای، ڕۆستەم پێی گوت: ئێوە دراوسێی ئێمەن و، لە ڕابردوودا ئێمە چاكەمان لەگەڵتاندا دەكردو، ئازارمان لێ وەدوور دەخستن، ئنجا بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان و ئێمەش ڕێ لە كاروانی بازرگانیتیان ناگرین كە بێتە وڵاتمانەوە.

موغەییرە پێی گوت: ئێمە وەدوای دنیا نەكەوتووین؛ بەڵكو ئەوەی بەلامانەوە گرنگەو مەبەستمانە دوارۆژە، بێگومان خوا پێغەمبەرێكی ناردووینە لا، پێی فەرمووە: من ئەو كۆمەڵەم بەسەر هەر كۆمەڵێكدا زاڵ كردوە، كە

---

(١) سەعد خوا لێی رازی بێ، لەو كاتەدا سەركردەی سوپای ئیسلام بوو.

ملکەچی بەرنامەی من نابێ، ئنجا من بەم کۆمەڵە -خوابەیەکگرە- تۆڵە لەوانە دەستێنم -کە ملکەچی بەرنامەکەم نابن- سەرکەوتنیان دەدەمێ، هەتا بە بەرنامەی منەوە پابەند بن، بەرنامەی منیش تاقە ئایینی ڕاستە، هەرچی لێی لامل بێ زەبوون دەبێو، ئەوەی دەستی تێبگرێ سەربەرز دەبێ.

ڕۆستەم گوتی: ئەو ئایینە چییە؟

گوتی: جارێ ئەو پایەو کۆڵەکەیەی کە بەبێ وی هیچ شتێک چاک نابێ، ئەوە شایەدیی دانە بەوەی کە بێجگە لەخوا چ پەرستراو نین و، موحەممەد پێغەمبەری خوایەو، دان هێنان بەوەدا کە لەلایەن خواوە هاتوە.

گوتی: ئنجا لەمە چاکتر! ئنجا چی دیکەش؟!

گوتی: ڕزگارکردنی بەندەکان لە پەرستنی بەندەکان بۆ پەرستنی خوا.

گوتی: ئەمەش چاکە، چی دیکەش؟!

گوتی: خەڵکی وەچەی ئادەمن، کەوابێ بران و ڕۆڵەی باب و دایکێکین.

گوتی: ئەمەش دیسان چاکە.

دوایی ڕۆستەم گوتی: باشە ئەگەر هاتینە نێو ئایینەکەتانەوە، ئایا واز لە وڵاتمان دێنن و دەگەڕێنەوە؟!

گوتی: ئەرێ وەڵڵا دوایی نیزیکی وڵاتتان نابین، مەگەر بۆ بازرگانیی یان پێویستییەک.

گوتی: ئەمەش دیسان چاکە.

گوتی: ئنجا کاتێک موغەییرە لەلای ڕۆستەم چۆ دەرێ، ڕۆستەم لەبارەی ئیسلام وەرگرتنەوە لەگەڵ سەرانی گەلەکەیدا دوا، بەڵام ئەوان خۆیان بە زل گرت و ڕازی نەبوون بچنە نێو ئیسلامەوە، خوا زەبوون و ڕیسوایان بکات و، بێگومان واشی کرد)[1].

---

(١) ئەوەی لێرەدا نەقڵمان کرد دەقی قسەی (ابن کثیر)ە، بڕوانە (البدایة والنهایة) بەرگی چوار، ل٣٩. (ابن الأثیر)یش هەمان بەسەرهاتی گێڕاوەتەوە لەگەڵ جیاوازییەکی کەمدا،

## ٤- بەرنامەی خوا بەسەر هەموو بەرنامەیەكدا زاڵە:

خوای بەرزی مەزن (العليُّ العظيم) فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ۝٩ ﴾ (الصف-٩).

واتە-خوا- ئەو زاتەیە كە پێغەمبەری خۆی بە ڕێڕوونیی و بەرنامەی ڕاستەوە ناردوە، تاكو بەسەر هەموو بەرنامەیەكدا وەسەری خات، هەرچەندە هاوبەشدانەران پێیان ناخۆش بێ.

بەڵێ خوا بۆیە بەرنامەی خۆی ناردوە، كە ببێتە پەیڕەوی ژیانی تێكڕای مرۆڤایەتی و، هەموو تیرەو گەلەكانی لەبن سێبەریدا وەحەسێن، چونكە؛ زەوی زەوی خوایەو، ئایین بەرنامەی خوایەو، ئینسانیش جێنشینی خوایە!!

ئنجا بەرنامەی خواش هەروەك چۆن لەچاخی زێڕین (العصر الذهبي)یدا، بۆ ماوەیەكی زۆر كورت توانی تەمی نەفامیی بڕەوێنێو، شەیتانی بەدفەڕ بڕەتێنێو، سوپای كوفر ببەزێنێو، كۆشك و بارەگای بڕووخێنێو، ئامێزی پڕ میهرو سۆزی لە دنیای بەرین وەربێنێ، ئێستاش و دوای ئێستاش، هەركاتێك ئەو هەوڵ و كۆشش و ڕەنجدانەی كە پێویستیەتی بۆی بخرێتە كارو، شوێنكەوتووانی وەك شوێنكەوتووە دڵسۆزە ڕەسەنەكانی چاخی زێڕینی، لە پێناویدا خوێن و ئارەق و سامانی خۆیانیان لێ وەچاو[1] نەبێ، دیسان دەتوانێ هەمان دەور كە دیتوویەتی ببینێتەوەو، دەوڵەتی خوا بەیەكگرتن و دادگەریی لە سەرانسەری دنیادا دابمەزرێنێو، ڕەگ و ریشەی كوفرو ستەم و نەفامیی لەبن دەربێنێو، جارێكی دیش مافی ڕەوای چەوسێنراوان لەچاوی طاغووتان دەرێنێو ئینسانەكان تێكڕاو وێكڕا لە خەمی دنیاو دوارۆژ بڕەخسێنێ.

---

بڕوانە (الكامل في التأريخ) بەرگی دوو، ل٤٦٢-٤٦٣.

(١) لێ وەچاونەبێ: چاویان تێیەوەنەبێ، بتوانن بیبەخشن.

ئنجا هیچ بیروبۆچوون و کوێرەڕێیەکیش تواناو برستی خۆڕاگریی و بەرهەڵستیی کردنی نیە لەئاقار بەرنامەی خوادا، نە لە مەیدانی وتوێژو دم بە دمەدا، وەک لە ڕوبەڕووبوونەوەی نێوان زاناو پێشەوایانی ئیسلام و سەران و دەمڕاستانی کوفرو نەفامێتیدا، وەک مانگی چواردە دەبینرێ، نە لەمەیدانی جەنگدا، وەک مێژووی کۆن و نوێی جەنگی نێوان ئیسلام و کوفر سەلماندوویەتی و، خوای دەستەڵاتدار پشتیوان بێ، لەمەودواش دەیسەلمێنێ!!

حەتمیی بوونی سەرکەوتنی بەرنامەی خواش بەسەر هەموو بیروبۆچوون و بەرنامەیەکی دیکەدا، لەوەدەیە کە بەرنامەی خوا نەمامی دەستنێژی خوایە، بەڵام بیردۆزەو ڕێچکەکان، زادەی مرۆڤن کە یەکێکە لە دروستکراوانی خوا!!

هەڵبەتە جیاوازیی نێوان بەرنامەی خواو بەرنامەی مرۆڤیش، هێندەی جیاوازیی نێوان خواو مرۆڤە، ئاشکراشە کە خوا لەهەموو ڕوویێکەوە تەواوو بێسنوور و بەرزو بێلەکەیەو، مرۆڤیش لەهەموو ڕوویێکەوە ناتەواوو سنوردارو پڕ هەڵەو پەڵەیە، هەرکەسێکیش خۆی و خواو بەرنامەی خوای ناسیبێ، یان لانی کەم لە هەرسێکان یەکیانی ناسیبێ، دەزانێ ئەوەی گوتمان چ دەگەیەنێو، بێ سێودوو دەیسەلمێنێ.

مسۆگەریی سەرکەوتن و زاڵبوونی بەرەی خواناس و برواداریش لە تێکهەڵچوونیدا،[1] لەگەڵ پێڕو تاقمە شەیتانی و لاڕێبووەکان، لەوەدەیە کە ئەو شۆڕشگێڕو تێکۆشەرەی کە لەسەر بنچینەی خوا بەیەکگرتن و لە قوتابخانەی بەرنامەی خوادا پێدەگاو بار دەهێنرێ، بە پێچەوانەی هەموو سەربازو جەنگاوەرێکی دیکەوە، وا حاڵی دەکرێ و تێدەگەیەنرێ، کە ژیانی ڕاستەقینە لەو کوژران و مردن و لەنێوچوونەدا ببینێ، کە لەڕێی بەرزکردنەوەی ئالای بەرنامەی خوادا تووشی دەبێو دێتە ڕێی، یانی: کە جەنگاوەرێکی خوانەناس، لە سۆنگەی بڕوانەبوونییەوە بە پاداشتی خواو ژیانی دوارۆژ، لە ترس و حەژمەتی مردنێ کونەمشکی پێ دەبنە قەیسەریی و، هەتا لاقی پێوەن هەڵدێ، جەنگاوەری خواناس و مسوڵمان لە سۆنگەی ئەو

---

(١) تێکهەڵچوونیدا: ڕووبەڕوو بوونەوەیدا

تێڕوانین و بڕوایە، کە لە سەرچاوەی ڕوونی خوا بەیەکگرتن هەڵدەقوڵێ، ژیانی دنیای لەچاو ژیانی دواڕۆژدا: وەک خەون و سێبەرو، دڵۆپە ئاوێک لە دەریایەک و، باڵە مێشوولەیەک دێتە بەرچاو، وەک پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {مَا لِي وَلِلدُّنْيَا؟ مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلاَّ كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ، ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا} (أخرجه أحمد برقم: ٣٧٠٩، والترمذي برقم: ٢٣٧٧)، وابن ماجه برقم: ٤١٠٩)، والحاكم برقم: ٧٨٥٩، والبيهقي في شعب الإيمان برقم: ١٠٤١٥)، واتە من چیم لە دنیا داوە! من لە دنیادا وەک ڕێبوارێکم کە لە سێبەری درەختێکدا دەسرەوێ، دوایی دەڕواو بەجێی دێڵێ.

دیسان فەرموویەتی: {مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ أُصْبُعَهُ فِي الْيَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِعُ} (أخرجه مسلم برقم: ٢٨٥٨)، واتە: دنیا لەچاو دواڕۆژ، هەر وەک ئەوەیە کە یەکتان قامکی دەخاتە نێو دەریاوە، جا با بڕوانێ داخۆ چەندەی پێوە هاتوە -لەچاو دەریاکە-!!

هەروەها فەرموویەتی: {لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، مَا سَقَى كَافِراً مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ} (أخرجه الترمذي برقم: ٢٣٢٠، ابن ماجه برقم: ٤١١٠)، واتە: ئەگەر دنیا لەلای خوا باڵەمێشوولەیەکی هێنابایە، قومە ئاوێکی لێنەدەدا بە هیچ کافرێک.

ئنجا لەئەنجامی ئەمەشدا، وەک کڕیار بەدوای مردن و شەهیدییدا دەگەڕێ[1]، بۆ ئەوەی لەو ڕێیەوە ژیانی هەتاهەتایی بەهەشتی نەبڕاوەو ڕازاوە وەدەست بێنێ، بێگومان بابای واش هەر زاڵ و سەرکەوتوویەو، کەس نیە خۆی بۆ ڕابگرێ.

---

(١) بەدوای مردندا گەڕان بە جوانترین شێوە لەژیانی هاوەڵانی پێغەمبەردا(رضي الله عنهم) دەدرەوشێتەوە، هەر بۆیەش خالیدی کوڕی وەلید خوا لێی ڕازی بێ هەرجارێک کە لەگەڵ سوپای کوفردا بەرەنگار دەبوو پێی دەگوتن: (فوالذي لا اله غيره، لأبعثن اليكم قوماً يحبون الموت كما تحبون أنتم الدنيا)، واتە: جا سوێند بەو زاتەی بێجگە لەوی هیچ پەرستراو نین، دڵنیا بن کۆمەڵێکتان بۆ سەر دەنێرم، ئێوە چەندەتان ژیان خۆش دەوێ، ئەوان هێندەیان مردن خۆش دەوێ!! بڕوانە (البداية والنهاية) بەرگی: ٦، ل٣٤٣، ابن كثير.

## ٥- به‌رنامه‌ی خوا له‌سه‌ر بنچینه‌ی تێگه‌یشتن وه‌رده‌گیرێ:

خوای وردبین و قسه‌له‌جێ فه‌رموویه‌تی: ﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾ (التوبة-١٢٢).

واته: بۆچی له هه‌ر كۆمه‌ڵێك-له بڕواداران- ده‌سته‌یه‌ك-به دوای زانیارییدا- ناڕۆنه ده‌رێ، بۆ ئه‌وه‌ی له به‌رنامه‌-ی خوا- شاره‌زا بن و، تاكو كه گه‌ڕانه‌وه لای گه‌له‌كه‌یان، ئاگاداریان بكه‌نه‌وه، به‌ڵكو وریابنه‌وه‌و بترسێن!

به‌ڵێ خوای كاربه‌جێو زانا نایه‌وێ هیچ كه‌س كوێرانه‌و له‌سه‌ر بنچینه‌ی لاساكردنه‌وه، دوای به‌رنامه‌كه‌ی بكه‌وێ؛ چونكه به‌رنامه‌ی خوا له سۆنگه‌ی ئه‌وه‌وه كه له‌سه‌ر بنچینه‌ی حیكمه‌ت و زانیاری دانراوه، به‌س كه‌سانێك وه‌ك پێویست ده‌یناسن و، ڕێزی ده‌گرن، كه له‌به‌ر تیشكی زانیاریی و لێحاڵی بووندا دوای بكه‌ون و پێیه‌وه پابه‌ند بن.

ئه‌مه له‌لایه‌كه‌وه، له‌لایه‌كی دیكه‌شه‌وه، خوای مه‌زن و به‌رز وه‌ك یاسایه‌كی گشتی ڕێگا به ئینسانی خواناس و بڕوادار نادات، كه به‌بێ زانیاریی و شاره‌زایی بڕوا به‌هیچ شتێك بێنێو، دوای بكه‌وێ، وه‌ك فه‌رموویه‌تی:

﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ﴾ (الإسراء ٣٦)، واته: دوای شتێك مه‌كه‌وه كه زانیارییت ده‌رباره‌ی نیه.

كه‌واته پێویسته له‌هه‌ر كۆمه‌ڵگایه‌كدا كه‌سانێكی وا هه‌بن، كه خۆیان ته‌رخان بكه‌ن و لێ ببڕێن، بۆ گه‌ڕان و سووڕان و پشكنین به‌دوای وه‌ده‌ستهێنانی شاره‌زاییدا له‌باره‌ی به‌رنامه‌ی خواوه، چونكه زاناو شاره‌زایان چاوساغی گه‌لن و، به‌بێ وان خه‌ڵكی سه‌ری لێ ده‌شێوێ و، هه‌ق و ناهه‌ق و،

حەڵاڵ و حەرام و، چاکەو خراپەی لێ تێکەڵ دەبن و، دەبێتە مەڕی بێ شوان.

بەڵام پێویستە ئەوەش بزانرێ کە ئەو زانیاریی و شارەزایی پەیداکردنە، بە مەبەستی ئەوە نیە کە دوایی بابای زاناو شارەزا، زانیارییەکەی بکاتە پیشەی پێژیان و، دەستەگیرەی گوزەران و، هۆی ماڵ وەسەرێک نان و، لەپەنای ئایینـدا بژی و، خۆی و زانیارییەکەی بکاتە کەلوپەلێکی بازرگانیی و، هەرکە دەرفەتی لێ هەڵکەوت و، کڕیاری گیرفان پڕو باخەڵ گەرمی چاو پێکەوت، بەنرخێکی کەم، یان زۆر زایەی بکات و، دوارۆژی خۆی بە دنیای خەڵکی بدات!![1]

بەڵکو مەبەست و ئامانجی زانیاربوون و شارەزایی پەیداکردن دەربارەی بەرنامەی خوا، ئەوەیە کە خوای بەرزو مەزن خستوویەتە ڕوو: [وَلِيُنـذِرُوا قَوْمَهُـمْ إِذَا رَجَعُـوا إِلَيْهِـمْ لَعَلَّهُـمْ يَحْـذَرُونَ].

بەڵێ بەرنامەی خوا داوا لە کۆمەڵی بڕواداران دەکات، کە لەسەر بنچینەی تێگەیشتن و فام کردن و، لەبەر ڕۆشناییدا بڕوا بە بەرنامەکەی بێنن و پێیەوە پابەند بن، وەک فەرموویەتی:

﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِىۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ (يوسف-١٠٨).

واتە: بڵێ ئەمەیە ڕێبازی من، بانگەوازی خەڵکی دەکەم بۆ لای خوا، لەسەر ڕۆشنایی و بەرچاو ڕوونیی، من و ئەوانەی شوێنم کەوتوون و، من لە هاوبەش دانەران نیم، پاکیی بۆ خوا.

---

(١) وەک لەم ڕۆژگاردا دەبینین و دەبیستین!!

تێبینی: ئەمەم کاتی خۆی نووسیوە کە ڕژێمی دیکتاتۆری بەعس حوکمڕان بوو، بەڵام پێم وایە هەڵوێستی هەندێک لە ئەهلی مینبەرو میحراب لەم ڕۆژگارەشدا هەروەک ئەوسایە! ئێستاش «بەداخەوە» (٢٠١٩/٩/١٩ز – ٢٠/محرم/١٤٤١ک) لەلای ئێمەی گەلی کوردو تێکڕای دنیادا هەروایە.

بەڵام لەبەرئەوەی هەموو کەس بۆی نالوێ و بۆی پێک هەڵنایەت خۆی تەرخان بکات و، یەکلابێتەوە بۆ لێکۆڵینەوەو گەڕان و سووڕان و پشکنین، بۆ زانیاربوون و شارەزابوون بە بەرنامەی خوا، خوای زانا لەسەر هەر گەل و کۆمەڵێکی مسوڵمانانی پێویست کردوە، کە لەنێو خۆیاندا دەستەیەک هەڵبژێرن، بۆ خۆ تەرخان کردن و یەکلابوونەوە لەپێناوی تێگەیشتنی بەرنامەی خوادا و، لەسەر ئەو دەستەیەشی پێویست کردوە، کە ئامانج و مەبەستی بەئایین شارەزابوون و زانیاریی پەیداکردنەکەیان، بەس بریتی بێ لە تێگەیاندن و وریاکردنەوەو چاوکردنەوەی ئەو گەل و کۆمەڵانەی، کە تێیاندا ژیاون و پێگەیون و، لە سایەی هاوکاریی و یاریدەی وانەوە، لە ئاییندا شارەزا بوو ون و تێی گەیون.

ئەو وریاکردنەوەو تێگەیاندنەش بۆ ئەوەیە، کە لە ڕۆژی لێپرسینەوەداو، لەپێش دادگای خوادا هیچ کەس بەهانەی نەبێو، بەڵگەی بەدەستەوە نەبێ، وەک خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ ﴾ (النساء-١٦٥).

واتە: پێغەمبەرانێکی مـوژدەدەرو ترسێنەرمان ناردن، تاکو لەدوای هاتنی پێغەمبەران خەڵک هیچ بەڵگەیان بەدەستەوە نەبن لەسەر خوا.

ئنجا بێگومان زانایانیش جێگرو میراتگری پێغەمبەرانن و پێویستە ئەو ئایین و بەرنامەیەی، کە لە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) بەمیرات وەرگرتوە بە خەڵکی ڕابگەیەنن و، ئەو ئەرکەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەوانی سپاردوە، جێبەجێی بکەن، وەک پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {الْعُلَمَاءُ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ} (أخرجه أحمد برقم: ٢١٧٦٣، وأبو داود برقم: ٣٦٤١، والترمذي برقم: ٢٦٨٢)، واتە: زانایان میراتگری پێغەمبەرانن.

دیسان فەرموویەتی: {الْعُلَمَاءُ مَصَابِيحُ الأَرْضِ، وَخُلَفَاءُ الأَنْبِيَاءِ، وَوَرَثَتِي وَوَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ} رواه ابن عدي عن علي، وهو حديث صحيح كما قال المناوي، ولكن ضعفه الألباني، انظر حديث رقم : ٣٨٨٨ في ضعيف الجامع). واتە: زانایان چرای زەمینن، و جێگری پێغەمبەرانن و، میراتگری من و میراتگری پێغەمبەرانن.

ئنجا من لێرەدا وەک قوتابییەکی گچکەی زانا خواناس و ڕاستەقینە میراتگرەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشەرم و ئەدەبەوە، ڕوو لە زانا دەمڕاستانی ئەم ڕۆژگارەی بەرنامەی خوا دەکەم و دەڵێم[1]:

خوا لە هەموو لایەکمان ببورێ! هەڵخزان و بێکاریی و نووستن هەتا کەنگآ! هەتا زووە با بەدەم بانگی خواو پێغەمبەرەوە بچین و، لە خەوی قووڵ و درێژخایەنی بێئاگایی و هەڵخزاویی بێداربینەوەو، بێترس و بیم قۆڵی مەردایەتی و تێکۆشانی لێ هەڵکەین و، هەرچی پترو چاکتر گەلی لە ئیسلام بێهەواڵمان وریا بکەینەوەو بە بەرنامەی خوا ئاشنای بکەین، بەشکم ئەوە خوایە کۆمەڵێکی وا دڵ و بیرڕوون و پارێزکارو بەجەرگ و تێکۆشەر بڕەخسێ، کە بگونجێ شۆڕشێکی ڕاستەقینەی خواناسانەی پێ بەرپا بکەین، کە بتوانێ ڕەگ و ڕیشەی بێبڕوایی و هاوبەشپەرستیی لە بنەوە بێنێو، کوفرو ستەم و نەفامیی و خراپەو بەدڕەوشتیی بەرەو زبڵدانی مێژوو ڕەپێچەک بدات و، نەمامی خواناسیی و خوا بەیەکگرتن لە جێشوێنی درەختی زڕی بێبڕوایی و هاوبەشپەرستییدا بچەقێنێو، هێندەی ئارەق و خوێن لەبن بکات، کە یەک ڕۆژەی دوو ڕۆژە بێو، هێندە نەبات لە جێی کوفرو ستەم و نەفامیی و خراپەو بەدڕەوشتیی، بڕواو دادگەریی و زانیاریی و چاکەو ڕەوشتبەرزیی، بەرهەم بێنێ.

---

(١) هەروەها ئێستاش لەسەر گوتن و ئاڕاستەکردنی ئەم ئامۆژگارییە دڵسۆزانەیەم هەر سوورو بەردەوامم و هەر بەپێویستی دەزانم، هەرچەندە سوپاس بۆ خوا لەوکاتەوە (١٤٠٦ی کۆچی و ١٩٨٥ی زایینی) ئەم کتێبەم نووسیوە، تاکو ئێستا گۆڕانکاریی چاک و ئیجابیی زۆر بووە، بەڵام زۆری ماوە بگاتە ئاستی ویستراوو پێویست.

با زۆر چاک بزانین که ئه‌م شێوه ئیسلام ڕاگه‌یاندنه‌ی ئێستاو ئه‌م بارودۆخه‌ی تێیدا ده‌ژین، له‌باتی ئه‌وه‌ی به‌ڵگه‌ی خوا بێ له‌سه‌ر خه‌ڵکی، به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ به‌ڵگه‌ی ده‌ستی خه‌ڵکییه‌و، به‌هانه‌ی مسوڵمان نه‌بوون و، بیانووی به‌ره‌و حیزب و ڕێچکان چوونیانه‌، چونکه‌ بابایه‌ک که‌ له‌م ڕۆژگاره‌دا ده‌ژی و، به‌م شێوازه‌ی ئێستا ئیسلامی ده‌خرێته‌ به‌رچاو، ئه‌گه‌ر له‌ڕۆژی دواییدا بچێته‌ به‌ر دادگای خوا، بۆی هه‌یه‌ که‌ به‌خوای په‌روه‌ردگاری زاناو میهره‌بانی بڵێ:

جا خۆ ئه‌ی په‌روه‌ردگاری خۆشه‌ویست و به‌رزم! وه‌ک بۆ خۆت ئاگاداری-من که‌ له‌ به‌رنامه‌ی تۆ پشت په‌ل بووم و، له‌ڕاسته‌ شه‌قامی تۆ لاڕێ بووم، له‌به‌ر ئه‌وه‌ نه‌بوو که‌-پاکیی بۆ تۆ- ڕقم له‌ تۆ بێو دژایه‌تیی ئایینه‌که‌ت بکه‌م، به‌ڵکو له‌به‌ر ئه‌وه‌بوو که‌ من به‌شێوه‌یه‌ک به‌رنامه‌ی تۆم له‌لایه‌ن هێندێک جێگرو میراتگرانی پێغه‌مبه‌ره‌که‌ته‌وه‌ ده‌خرایه‌ به‌رچاو، که‌ تۆ پێی قایل نی! من بۆیه‌ بڕوام به‌ ئایین نه‌بوو چونکه‌ ئاوام ده‌دی و ده‌بیست[1]:

١- له‌ خزمه‌تی طاغووت و زۆرداره‌ خوانه‌ناس و دژئینسان و چه‌وسێنه‌ره‌کان دابوو و، ئه‌و مینبه‌ره‌ی که‌ کاتی خۆی پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) هه‌قی له‌سه‌ر ڕاده‌گه‌یاند، کرابوو به‌ پاڵپشتی طاغووت و دووعای بۆ له‌سه‌ر ده‌کرا!!

٢- به‌ ماڵ و سامان و چه‌پڵه‌و ئافه‌رین و خه‌ڵات و زارچه‌ورکردن و قوڕئان گوته‌نی: به‌ نرخێکی که‌م (ثمنا قليلاً) ده‌فرۆشرا!!

٣- بڕوای به‌ ڕاپه‌ڕین و جموجووڵ و شۆڕش و تێکۆشان نه‌بوو، دژی چه‌وسێنه‌رو داگیرکه‌رانی بێبڕواو جووله‌که‌و دیان، یان کلکی وان!!

---

(١) ئه‌م قسانه‌م هی ساڵانی نیوه‌ی یه‌که‌می هه‌شتایه‌کانی سه‌ده‌ی ڕابردوون، که‌ ڕژێمی به‌عس حوکمڕان بوو و گه‌رمه‌ی ڕه‌واجی ڕێچکه‌و بیردۆزه‌کان بوو، به‌تایبه‌ت مارکسیزم. (٢٠٠٨/٤/١٢) چ٢.

٤- بڕوای بەوە نەبوو، کە پێویستە دادگەریی بچەسپێنرێ و، دەبێ مرۆڤەکان وەک یەک و هەرکەسە بەپێی ڕەنجدان و بە ئەندازەی پێویستی خۆی لە زەوی و نیعمەتەکانی بەهرەمەند بێ، نەک خێرو بێرەکانی دنیا لە چەنگی دەستەیەکی تایبەتیدا کەڵەکە بن و، خەڵکەکەی دیش قۆڕەقۆڕی زگیان بێو، زەقەزەقی چاویان بێ!!

٥- بڕوای بە زانیارییە سروشتییەکان (العلوم الطبيعية) نەبوو و، پاڵی دەدانە لای شەیتانی بەد و، هەرکەسێکی پێشیانەوە خەریک بایە، پێی وابوو لە توخم و تۆوی شەیتانەو، یەکجار بەدو بێئیمانە[1]!!

٦- لە مەسەلەی قەزاوقەدەر (القضاء والقدر) کۆت و زنجیرێکی زۆر بێڕەزای دروست کردبوو و، لەدەست و پێی خەڵکی کردبوو، بەجۆرێک کە هیچ کەس نەتوانێ بجووڵێو، بگرە هەر بڕواشی بە جووڵان و هەوڵ و کۆشش نەبێ، چونکە دەیگوت:

هەر لە ئەزەلەوە خوا هەموو شتێکی بڕیوەتەوەو، چارەنووسی هەموو کەسێکی دیاریی کردوە[2] و، هەڵپەڕین و داپەڕینی ئینسان بێ سوودەو، هیچ لە واقیع ناگۆڕێ، کەواتە کێ دیەوێ لە ڕیزی خۆڕاگرو شوکرانەبژێران (الصابرين والشاكرين) بژمێررێ، با بە واقیع ڕازی بێ و دەستکاریی کاری خوا نەکات و، خوا لەخۆی قەڵس نەکات!!}

---

(١) دیارە ئەو کاتە شێخ و مەلای وا هەبوون کە بیرکردنەوەیان وابوو، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئێستا زۆر کەم و دەگمەنن، (٢٠٠٨/٤/١٢)
بەڵام ئێستا (٢٠١٩/٩/١٩ز) دووبارە لەزێدە بوونەوەدان و وێڕای وانیش خەڵکێکی دیکەی مەشرەب و ناو و نیشانیان جیاوازیش سەریان هەڵداوە!

(٢) دیارە ئەمە خۆی لە خۆیدا هەق و ڕەوایەو هەر وایە، بەڵام شوێنی گلەیی و نکووڵیی لێکردنی ئێمە ئەنجامگیرییەکەی دواییەو، ئەم مەسەلەیە عەلی کوڕی ئەبوتالیب گوتەنی: (كلمة حق يراد بها باطل).

بەڵێ، ئەگەر بمانەوێ نەسەب و ڕەچەڵەکی میراتگرایەتیی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ خۆمان ئیسپات بکەین، پێویستە پێشەکی هەوڵ دەین لە تێکڕای بەرنامەی خوا-میراتی پێغەمبەر- حاڵی بین و خەڵکی پێ ئاشنا بکەین، نەک فێڵ لە خۆمان و خەڵکی بکەین و، خۆمان و خەڵکی بە بەشێکی بەرنامەی خوا-وەک پێنج دروشمەکان[1]-ەوە سەرگەرم بکەین و، ئەوی دیکەی فەرامۆش بکەین، ئنجا پاش حاڵی بوون و تێگەیشتن و پەروەردەبوون و پێگەیشتن، بچینە قۆناغی جۆرێکی دیکەی تێکۆشان و، ...ئاوا... بەرەو پێش بچین و بەردەوام بین، هەتا یان بە شانازییەوە پلەی بڵیندی شەهیدیی دەستگیر دەکەین، یان حوکمی خوا کە مایەی بەختەوەریی دنیاو دوارۆژی مرۆڤە، دەچەسپێ.

بەڵێ با زۆرچاک بزانین کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەس نوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەجی بە میرات بۆ بەجێ نەهێشتووین، تاکو بە سەد بارەو هەزار بارەکردنەوەی باسکردنی وان بتوانین ئەرکی جێگرایەتی پێغەمبەر ئەنجام بدەین و، میراتەکەی بپارێزین، بەڵکو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەرلەبەری بەرنامەی خوای بەسەردا بەجێ هێشتووین و، حەواڵەی کردووین، بەرنامەی خواش، هەم عیبادەتە هەم سیاسەت، هەم تەقوایە هەم غەزا، هەم دوارۆژە هەم دنیا، هەم ڕازی کردنی خوای دەوێ، هەم رزگارکردنی خەڵکی و...هتد.

ئنجا خوایە بمانگێڕی بە زانایەک کە لە بەندایەتیی تۆو، میراتگرایەتی پێغەمبەرو، دەمڕاستایەتیی بەرنامەکەت و، ڕابەرایەتی حیزبەکەت،[2]

---

(١) خۆزگە هەر پێنج دروشمەکانیش وەک پێویست ئەنجام درابان، دیسان وەزعی دنیا زۆر دەگۆڕا!!

(٢) وشەی (حزب) وەک خاوەنی (لسان العرب) دەڵێ: بە کۆمەڵە کەسێک دەگوترێ کە دڵ و کردەوەکانیان وێک بچن. بڕوانە بەرگی یەک، ل٣٠٨.
ئەم وشەیە (٢١)جار لە قورئانێدا دووبارە بۆتەوە، لەو (٢١)جارە (١١) جاران بە ڕێژگە

دەوەشێتەوەو، بەڵگەی تۆ و بەرنامەکەت دەبێ لەسەر خەڵکی، نەک بەڵگەی خەڵکی بێ لەسەر خۆت و بەرنامەکەت.. ئامین.

---

(صیغـة)ی کۆ، ئـاوا (الاحزاب) و هـەر یازدەجاران بۆ پێڕو کۆمەڵە کافرەکان بەکارهێنـراوە، دوو جارانیـش بـە وشـەی (کل) کراوەتـە کۆ (جمع) و دیسـان هـەر بۆ پێڕو تاقمـە کافرەکانـە، ئـاوا: (کل حـزب) و دوو جارانیـش بـە (حـزب الشـیطان) هاتـوەو، جارێکیـش هـەر بـۆ پێـڕی شـەیتان بـە (حزبـە) هاتـوەو، جارێکیـش بـە (حزبیـن) کـە مەبەسـتی پـێ دوو کۆمەڵـە خەڵکـە، نـەک کۆمەڵـی خـواو کۆمەڵـی شـەیتان و ئـەو وشـەیە سـێ(٣) جارانیـش بـۆ کۆمەڵـی خـوا بەکارهێنـراوە، بەوشـەی (حـزب اللـه).

جا لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیـە کـە بـەزۆری پێڕو تاقمـی شـەیتان بـە (الأحـزاب) ناونـراوە، هـۆی ئەمـەش ئەوەیـە؛ کـە کوفـر پێـڕو تاقمـی جۆراوجـۆری هـەن و، لەنێـو خۆیانـدا لێـک جـوێ و پێکـەوە دژن، بـەڵام کۆمەڵـی ڕاسـتەقینەی خـوا، لـە نێوەڕۆکـدا بـەس یەکـە، ناوونیشـانی جۆراو جۆریشـی هەبـن.

لە کۆتاییدا دەڵێم: هەرچەند پێڕو تاقمە شـەیتانییەکان ئەم وشەیەشـیان وەک زۆر وشـەی دیکە- بـۆ وێنـە سیاسـەت- پیـس کـردوە، بـەڵام مـادام قورئـان بـۆ کۆمەڵـی خـوای بەکارهێنـاوە، وازی لـێناهێنین و دەستبەرداری نابین، بەڵام خوا پشتیوان بێ بە پەیدابوونی کۆمەڵی ڕاستەقینەی خوا، ئـەم وشـەو زۆر وشـەی دیکـەش دەبنـە کاکڵدار!!

تێبینـی: ئـەم پەراوێـزەش کاتـی خـۆی (١٩٨٥) نووسـراوەو ئێسـتاش هەرچەنـدە لـە کۆمەڵـگای کوردەواریـدا ڕێڕەوی ئیسـلامیی (الإتجاه الإسـلامي) کـۆڕو کۆمەڵـی سیاسـی هـەن، بـەڵام کـرچ و کاڵیـی و کەموکوڕییـان هـەن و خـوا یاریدەدەرمـان بـێ، کـە بیگەیەنینـە ئاسـتی ئیسـلامی بـەرزو کـرچ وکاڵیـی و ناتەواوییـەکان، چ لـە ئاسـتی قیـادەو چ لـە قاعیـدەدا چارەسـەر بکەیـن. (٢٠٠٨/٤/١٢).

٦- بەرنامەی خوا نە بۆخۆی سەغڵەت دەبێ، نەکەس سەغڵەت دەکا:

خوای بەهێزو بەبەزەیی فەرموویەتی: ﴿...هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ...﴾ (الحج-٧٨).

واتە: -خوا- لە بەرنامەکەیدا شتێکی وای لەسەر دانەناون کە پێی سەغڵەت بن.

یان -خوا- هیچ جۆرە سەغڵەتیی و تەنگاوییەکی لە ئاییندا دانەناوە لەسەر ئێوە.

بەڵێ ئەم ڕستە قورئانییە، هەرکام لەم دوو واتایەی لێ وەردەگیرێن، چونکە لە فامرانەوەی واتای یەکەمدا دەڵێین: وشەی (من حرج) پەیوەست (متعلق)ە بە وشەی (علیکم)ەوە، لەو حاڵەشدا چەمکی ئایەتەکە ئاوای لێدێ: خوا هیچ جۆرە تەنگاویی و سەغڵەتییەکی نەخستۆتە سەرشانی ئێوە، بەهۆی پابەندییتان بە بەرنامەکەیەوە.

لە فامرانەوەی واتای دووەمدا دەڵێین: وشەی (من حرج) پەیوەستە بە وشەی (في الدین)ەوە، ئەو کاتەش چەمکی ئایەتەکە ئاوای لێدێ: خوا هیچ تەنگییەکی نەخستۆتە بەرنامەکەیەوە لەسەر ئێوە، واتە بەرنامەی خوا تەنگ وترووسک نیەو، لەئاقار ژیانی ئێوەدا سەغڵەت نابێو، دووچاری تێگیراویی و دەستەوستان بوون و پێبڕان و مەحتەل بوون نابێ؛ چونکە یەکجار پان و بەرین و دەوڵەمەندە.

ئنجا سەرەڕای ئەوەی کە فامرانەوەی ئەم دوو واتایە، بەپێی ڕێزمانی عارەبی شتێکی ڕاست و دروست و بێگرێیەو، هەردووک واتایەکەش لەگەڵ سروشتی بەرنامەی خوادا دەگونجێن، بەڵام دوایی کە بۆ پتر دڵنیابوون

سەرنجی تەفسیرانم دا دیتم (ابن الجرير الطبري) خوا پاداشتی بداتەوە، کە بە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان ناسراوە، هەردووک واتایەکەی لە تەفسیرە بەپێزەکەیدا نووسیون، هەرچەندە یەکەمیانی پێ پەسندتر بووە.[1]

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست!

خوای بەرزو بێوێنە بۆ خۆی ئینسانی خوڵقاندوەو، ئەگەر بێت و هەر بۆ خۆشی بەرنامەی ژیانی بۆ دابنێ، ئەوە پێکەڵپێک و پڕ بەپێستی یەکدی دەبن و کورد گوتەنی: (کاڵا بەقەد باڵا دەبێ) بێ کەم و زیاد.

ئێستاش با سەرنجێکی وردو ژیرانە بدەینە هەر کام لەو دوو واتایەی کە لە ئایەتی ناوبراو وەرگیران:

**یەکەم: سەغڵەت نەبوونی ئینسان بەهۆی بەرنامەی خواوە:**

سەغڵەت نەبوون و تەنگەتاو نەبوونی ئیسنان بەهۆی بەرنامەی خواوە، لەزۆر ڕووەوە دەردەکەوێو، لەگەڵێک بوارانداً خۆی دەنوێنێ، بەڵام لێرەدا مەودای خستنەڕووی هەمووانمان نیەو، سەرەکییترین و بەرچاوترینیان دەخەینە ڕوو:

**یەك: بەرنامەی خوا واقیعبینانە سەرنجی مرۆڤ دەدات:**

بەڵێ ئایین و بەرنامەی خوا بە پێچەوانەی هەموو بیروبۆچوونەکانی دیکەوە بەشێوەیەکی واقیعبینانە تەماشای ئینسان دەکاو، لەسەر بنچینەی واقیعی سروشتی ڕەفتاری لەگەڵ دەکات.

بەرنامەی خوا ئینسان وەک خۆی بەبێ لێکەمکردن و هاویشتنە سەر وەردەگرێو، هەموو غەریزەو داخوازییەکانی لەبەرچاو دەگرێ، چ مەعنەویی و گیانی بن، چ جەستەیی و ماددیی، لەو بارەشەوە بەڵگە زۆرن، بۆ نموونە:

---

(١) بڕوانە تەفسیری (جامع البيان) ب٩، ج١٧، ص١٤٢-١٤٣.

أ) خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ۞ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿١٥﴾ ﴾ (آل عمران: ١٤-١٥).

واتە: خۆشەویستی ئارەزووەکان-ی نەفس- لە ژنان و کوڕان و، خەزنەی لەسەریەک کەڵەکەکراو لە زێڕو زیوو، ئەسپانی نیشانەدارو، ماڵات و کشتوکاڵ، بۆ خەڵکی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە-هۆیەکانی- ڕابواردنی ژیانی دنیان و خوا چاکترین پاشەڕۆژی لەلایە. بڵێ ئایا هەواڵتان بدەمێ بە-شتێکی- چاکتر لەو نازو نیعمەتانەتان-کە باسکران-؟ بۆ ئەوانەی کە پارێزکارن لەلای پەروەردگاریان: باغ گەلێک هەن کە ڕووباریان بە بندا دەڕۆن تێیاندا دەمێننەوە و، هاوسەرانی پاک بووەویان هەن و، ڕەزامەندییەکی مەزنیش لەلایەن خواوە و خواش بینەری بەندەکانیەتی.

لێرەدا دەبینرێ کە بەئاشکرا دان بەوەدا هێنراوە، کە خۆشەویستیی هەرکام لەم نازو نیعمەتە ماددیی و دنیاییانە، وەک غەریزەو داخوازییەکی ڕەسەن و سروشتیی لە دەروونی ئینساندا هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە وەک شتێکی واقیعی دانیان پێداهێنراوە، هەوڵ دراوە کە مرۆڤ وەدەست هێنانیان نەکاتە ئامانج و مەبەستی ژیانی دنیای، بۆ ئەو مەبەستەش چاوی وەرچەرخێنراوە بەرەو پاداشتی خواو ژیانی دوارۆژ، ئنجا کە پاداشتی خواش بۆ پارێزکاران وەسف کراوە، دیسان هەموو لایەنە ماددیی و مەعنەوییەکانی سروشتی ئینسانی، تێدا لەبەرچاو گیراون.

**ب)** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ،

فَمَـنْ رَغِـبَ عـن سُـنَّتِي فَلَيْـسَ مِنِّـي } (أخرجه البخاري برقم: ٤٧٧٦، ومسلم برقم: ٣٤٦٩).

واتـه: ئاگاداربن! بەخوا مـن لـه هەمووتـان لـه خواترسترو پارێزكارتـرم، بەڵام مـن بـەڕۆژووش دەبـم و ڕۆژبوێریشـی دەدەمێ -مەبەست ڕۆژووی سوننەتە- وە- شـەوێ- نوێژیـش دەكـەم و دەشـنووم و، لەگـەڵ هاوسەرانیشـدا جـووت دەبـم، ئنجـا هەركـەس لـه ڕێوشـوێنی مـن لابدات ئـەوە لەمـن نیـه.

وەك دەبینیـن پێغەمبـەری پێشـەوامان (صلى الله عليه وسلم) لـه وەڵامـی ئـەو سێ كەسـەدا كـه بڕیاریانـدا: یەكیـان هەرگیـز بەشـەوێ نەنـوێ و هـەر نوێژان بـكات و، ئـەوی دیكەیـان هەمیشـه بـەڕۆژوو بێـو قـەت نەیشـكێنێ، هـی سێیەمیشـیان لـه ئافرەتـان دوورەپەرێـز بێـو قـەت ژنـێ نەهێنـێ؛ تێـی گەیانـدن كـه ئـەوەی ئـەوان بڕیاریـان لەسـەر داوە، چونكـه دژی سروشـتی ئینسـان و ژیانـی دنیایـه، پێغەمبـەر (صلـى اللـه عليـه وسـلم) بـەلادان لـه ڕێوشـوێنی خـۆی -ڕێوشـوێنی ویـش بەرنامـەی خوایـە- لـه قەڵەمـی دەدات و پێـی قایـل نیـه.

خوێنەری بەڕێز!

لـەم دوو دەقـەوە كـه ڕابـردن، بـێ پێـچ وپەنـا دەزانـرێ كـه بەرنامـەی خـوا تـا چ ڕادەدیـەك واقیعییانـه لەگـەڵ مرۆڤـدا ڕەفتـار دەكات و، چـۆن دان بەهەمـوو لایەنەكانـی سروشـتی دادێنـێ و، چەنـد بەڕێـك و پێكیـی و هاوسـەنگیی غەریزەكانـی تێـر دەكاو داخوازییەكانـی جێبەجـێ دەكات.

بێگومان لە ئەنجامی ئەمەشدا، مرۆڤ هەم لەكاتی ئەنجامدانی چالاكییەكانی تێركردنـی غەریزەكانـی و وەڵامدانـەوەی داخوازییەكانیدا، هەست بە جێبەجێكردنی ئـەرك و فەرمانەكانی بەرنامـەی خـوا دەكات و، هـەم لەكاتـی جێبەجـێ كـردن و بەڕێوەبردنـی ئەركەكانـی ئایینـدا، هەسـت بـە تێربوونـی غەریزەكانـی و وەڵام درانـەوەی داخوازییەكانـی و ئاسوودەیی دڵ و گیانـی دەكات.

کەواتە مرۆڤ پابەندبوونی بەبەرنامەی خواوە، یەک تۆز دووچاری تەنگەتاویی و سەغڵەت بوون نابێو، بێچارەو دەستەوستان ناکەوێتە گۆڕێ.

**دوو: بەرنامەی خوا زیاد لە توانا لەسەر مرۆڤ پێویست ناکات:**

یەکی دیکە لەو هۆیانەی دەورێکی بنەڕەتیی دەبینن لەوەدا کە مرۆڤ لە بەرنامەی خوادا، دووچاری تێگیراویی و سەغڵەتیی نەیەت، ئەوەیە کە بەرنامەی خوا هیچ ئەرکێکی نەخستۆتە سەر شانی ئینسان کە پێی ئەنجام نەدرێ، ئەوە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە لەهەر بوارێکدا مرۆڤ تووشی بارودۆخ و هەلومەرجێکی نەگونجاوو نائاسایی بێ، ئایین بەهۆی مۆڵەت (رخصة)کانەوە بەڕێوەبردنی ئەرک و فەرمانەکانی بۆ ئاسان دەکات، ئێستاش چەند وێنەیەک بە نموونە لە هەردووک لایەکانەوە دێنینەوە:

خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ (البقرة-٢٨٦)، واتە: خوا ئەرک ناوێتە سەر هیچ کەسێک لەتوانای خۆی بەدەر.

ئەم ئایەتە بەپێزە بنچینەیەکی گشتییە لە بەرنامەی خوادا، چونکە خوای میهرەبان و دادگەر هیچ یاساو ئەرکێکی لە بەرنامەی خۆیدا دانەناوە، کە سروشتی ساغی مرۆڤ توانای و بڕستی بەڕێوەبردنی نەبێ، ئاخر شتی وا لە خوای میهرەبانی کاربەجێو دادگەر ناوەشێتەوە، ئنجا ئەگەر سەرنجێکی وردو بە ویژدانەوەش لە ئەرک و مافەکانی بەرنامەی خوا بدەین، ڕاستیی ئەم قسەیە وەک رۆژی روون دەبینین، بۆ وێنە: جەنگ کردن لەپێناوی خوادا، کە ڕەنگە گرانترین و بەزەحمەتترین ئەرکی بەرنامەی خوا بێ، لەسنووری توانای ئینسان بەولاوە نیە؛ چونکە ئێمە دەبینین بە درێژایی مێژوو و ئێستاش، ئینسانەکان جەنگاون و خۆیان بەخت کردوە لە پێناوی گەلێک ئامانج و مەبەستی وادا، کە لەچاو ئامانجی بابای شوێنکەوتووی بەرنامەی خوا، وەک دڵۆپەو دەریا، یان گەردیلەو دنیا وان!!

ئنجا ئەگەر هات و ئینسان تووشی هەلومەرجێکی نائاسایی و نەگونجاویش بوو، ئەوە مۆڵەت (رخصە)کان ڕێگای بۆ فراوان دەکەن و کاری بۆ ئاسان دەکەن.

هەڵبەتە وەرگرتنی ئەو (رخصة)انەش کارێکە خوا خۆشی دەوێو پێی رازییە، وەک پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ اللَّـهَ يُحِبُّ أَنْ تُقْبَلَ رُخَصُهُ كَمَا يُحِبُّ العَبْد مغفرة رَبّه} (أخرجه الطبراني في الكبير برقم: ٧٦٦١)[1]، واتە: خوا پێی خۆشە مۆڵەتەکانی وەربگیرێن، هەروەک چۆن بەندە پێی خۆشە پەروەردگاری لێی ببووڕێ.

ئنجا ئەو مۆڵەتانەش هەر لە بیروبڕواوە بیگرە هەتا گچکەترین یاسای بەرنامەی خوا، دەوری تێدا دەبینن، ئەمەش چەند نموونەیەک:

١- ڕێگادان بە گوتنی وشەی کوفر لە دەمی زۆرلێکران دا، وەک خوا دەفەرموێ:

﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ ﴾ (النحل ١٠٦).

٢- نەگرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان لە سەفەرێداو، لەکاتی نەخۆشییدا:

﴿ ... كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ ... ﴿١٨٣﴾ ... فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَ ... ﴿١٨٤﴾ ﴾ (البقرة: ١٨٣-١٨٤).

٣- بەکارهێنانی خۆڵ[2] لەباتی ئاو بۆ لابردنی بێدەستنوێژیی گچکەو گەورە:

---

(١) قال الألباني: باطل بهذا اللفظ: فقد ورد من طرق بعضها صحيح بلفظ إِنَّ اللَّـهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ كَمَا يكره أن معصيته، وفي رواية كما يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ، ورد ذلك عن جماعة من الصحابة. ( انظر إرواء الغليل ٥٥٧).

(٢) لە بەرگی یەکەمی مەوسووعەی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا ڕوونمان کردۆتەوە کە ئەو ڕایە بەهێزترە کە دەڵێ مەبەست لە (صعید) ڕووی زەوییە، ئنجا گڵ بێ یان هەر شتێکی دیکە بێ. بڕوانە: خواپەرستیی ئیسلامیی بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٩٣ تا ٣١١، چاپی یەکەم ساڵی١٤٢١.

﴿ ... فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ... ﴾ (النساء-٤٣).

٤- کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەرێدا:

﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ ﴾ (النساء-١٠١).

٥- ئینسانی لاوازو بێداروبار، یان نەخۆش، یان نەدار، بۆیان هەیە لە چوونە جەنگی کافراندا بەشداریی نەکەن:

﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾ (التوبة-٩١).

٦- خواردنی هەرکام لە مردارو خوێن و گۆشتی بەرازو گۆشتی سەربڕاوێک کە لە دەمی سەربڕانیدا ناوی جگە لە خوای لەسەر هاتوە، بۆ کەسێک کە مەترسی مردنی لە پێشەو، هیچی دیکە شک نابات، حەڵاڵە:

﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ ﴾ (البقرة- ١٧٣).

هەروەها زۆر مۆڵەتی دیکە ڕەچاو کراون، کە لەکاتی بێچارەیی و سەغڵەتییدا دە فریا ئینسان دێن و ڕێی بۆ ئاسان و فراوان دەکەن[1].

**سێ: هەموو دەمێ دەرگای تۆبەو پاك بوونەوە لەسەر پشتە:**

یەکی دیکە لەو هۆیانەی کارێکی وایان کردوە کە بەرنامەی خوا ئینسان دووچاری سەغڵەتیی و پێبڕان نەکات، ئەوەیە کە هەموو دەمێک

---

(١) بۆ شارەزایی پتر لەو بارەوە وا باشە سەرنجی سەرچاوەکانی (أصول الفقه) بدرێ، بۆ وێنە کتێبی (المستصفى من علم الأصول) للغزالي (الفصل الرابع في العزيمة والرخصة) ب١ ل٦٢، و (أصول الفقه) للشيخ محمد خضري بگ، ل٦٦ چ٦.

دەرگای تۆبە وەرگیران و تاوان شۆردنی، بۆ هەموو کەس خستۆتە سەر پشت بەبێ جیاوازی، خوای بەخشندە لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ ﴾ (النساء-١٧).

واتە: بێگومان تۆبەوەرگرتن لەسەر خوا بەس تایبەتە بەوانەوە کە بە نەزانیی خراپە دەکەن، دوایی زوو تۆبە دەکەن، ئەوانە خوا لێیان خۆش دەبێ و، خوا زانای کاربەجێیە.

وەک دەبینین خوای بەخشندەو تاوان پۆش، وەرگرتنی تۆبەی تاوانبارانی لەسەر خۆی پێویست کردوە!!

ئنجا ئەو تاوان و خراپانەش کە خوای میهرەبان بەهۆی تۆبەکردن و پەشێمان بوونەوەی بەندەوە، دەیانبەخشێ، هەموو جۆرە تاوان و خراپەیەکن، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ ۞ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ (الزمر-٥٣).

واتە: ئەی پێغەمبەر! لەلایەن منەوە بەو بەندانەم بڵێ کە سەبارەت بە خۆیان زیادەڕۆییان کردوە-و سنووریان شکاندوە-؛ لە بەزەیی خوا تەمابڕاو مەبن، بێگومان خوا تێکڕای تاوانەکان دەپۆشێ، بەڕاستیی هەر ئەوە تاوانپۆشی بەبەزەیی.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ الله تَعَالَى يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ، وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيلِ، حَتَّى تَطلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا} (أخرجه أحمد برقم ١٩٥٤٧، ومسلم برقم ٢٧٥٩)، واتە: بێگومان خوای بەرز بە شەوێ دەستی-بەزەیی- خۆی ڕادەخا تاکو تاوانباری

ڕۆژێ تۆبە بکات و، بە ڕۆژێ دەستی-بەزەیی- خۆی ڕادەخات، تاکو تاوانباری شەوێ تۆبە بکات و، هەتا ڕۆژ لە ڕۆژئاوایەوە هەڵدێ. (واتە تا ڕۆژی دوایی).

ئنجا گومانیشی تێدا نیە، کە بەرنامەیەک هەموو دەمێ هەل و دەرفەتی تۆبەو پەشێمان بوونەوەو، لە خراپەو تاوان شۆران و پاکبوونەوەی تێدا بێ، هیچ کاتێک هیچ جۆرە ئینسانێک وا لێ ناکات، کە هەست بە بێچارەیی و نائومێدیی و بێدەرەتانیی بکات، چونکە ئەو ئینسانە هەرچەندە یەکجار خراپەکارو بەدئاکار بووبێو، لە زەلکاوی تاواندا نوقم بووبێ، هەل و دەرفەتی بادانەوەو خۆ شۆردن و تێهەڵچوونەوەی هەر لەپێشە.

کەواتە: بەڵێ بەرنامەی خوا نابێتە هۆی سەغڵەت کردن و تەنگەتاو کردنی مرۆڤ؛ چونکە:

**یەکەم:** بەرنامەی خوا واقیعبینانە تەماشای ئینسان دەکاو، هەموو غەریزەو داخوازییەکانی ڕەچاو دەکات و، حیساب بۆ هەموو لایەنەکانی دەکات.

**دووەم:** بەرنامەی خوا قەت ئەرکێک بە ئینسان ناسپێرێ، کە توانای بەسەردا نەشکێ و، لە هەل ومەرجە نەگونجاوو نائاساییەکانیشدا، بەهۆی مۆڵەتانەوە، ڕێی بۆ فراوان دەکاو، کاری بۆ ئاسان دەکات.

**سێیەم:** هەموو دەمێ دەرگای تۆبە وەرگرتن و لێبوردنی لەسەر پشتەو، بابای خراپەکار قەت بێهیواو تەمابڕاو ناکات و، ناچاری ناکات کە هەر زیاتر بە جلێتاوی خراپەو تاواندا بچێتە خوارێ.

ئێستاش دەچینە سەر توێژینەوەی واتای دووەمی ئایەتەکە:

**دووەم: سەغڵەت نەبوونی بەرنامەی خوا لە ئاقار ژیانی ئینساندا:**

ئایین و بەرنامەی خوا هێندە پان و بەرین و هەمەلایەنەیەو، لەسەر بنچینەیەکی زانستی هێندە پتەوو قووڵ دامەزراوە، کە هیچ کاتێک لەبەرانبەر ژیانی ئینساندا، بە هەموو لایەنە تاکیی و کۆمەڵیی و ماددیی و مەعنەوییەکانییەوە، سەغڵەت نابێو وەتەنگ نایەت، بەڵگەش بۆ ئیسپاتی راستیی ئەم قسەیە زۆرن، بەڵام بەهەموویان ڕاناگەین بەس هەندێکیان لێ دەخەینە ڕوو:

**یەك: هەرچی بەرنامەی خوا فەرمانی پێکردوە ژیریی ساغیش پەسندی دەکات:**

خوای زانا لە وەسفی پێغەمبەری نەخوێنەوارماندا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ﴿يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ (الأعراف-١٥٧)، واتە: فەرمانیان پێ دەکات بە هەرچی پەسندو چاکە.

وشەی (المعروف) -کە لێرەدا بۆ ئەوەی هەرچی جۆری (معروف) هەیە بیگرێتەوە ئەلیف و لامی ناساندن (أل)ی (تعريف)ی خراوەتە سەر لێرەدا بۆ تێکرا (إستغراق)یە -لە ئەسڵی زمان و زاراوەی قورئاندا بەهەر قسەو کردەوەیەک دەگوترێ کە ژیریی پەسندی دەکاو، شەرع فەرمانی پێ کردوەو، دڵ و دەروونی ئینسان پێی ئاشنایەو پێی ئارام دەگرێ[1].

بەڵێ لە راستیدا هەرچی ئایین و بەرنامەی تێرو تەواوی خوا فەرمانی پێکردوەو لەسەر ئینسانی پێویست کردوە، سروشتی ساغ و ژیریی ڕاست، وەک پەپوولەی دەوری چرا لەدوای عەوداڵن و داخوازی دەکەن و، ئەگەر بەوردیی سەرنج بدەینە دوو سەرچاوە ڕوونەکەی بەرنامەی خوا، قورئانی خاوەن پێزو سوننەتی پێغەمبەری بەڕێز (صلى الله عليه وسلم)، دەبینین

---

(١) بڕوانە (لسان العرب) ب٩، ل٢٣٩، و بڕوانە: (معجم مفردات الفاظ القرآن)، ل٣٤٣.

هیچ شتێکی چاک و بەسوود نەماوە، فەرمانیان پێ نەکردبێ، لە هەموو لایەنەکانی ژیانی تاک و کۆمەڵدا.

ئنجا گومانیشی تێدا نیە کە بەرنامەیەک هەرچی چاکە هەیە، فەرمانی پێکردبێ، حەتمەن بەرنامەیەکە فراوان و دەوڵەمەندە، قەت لە بەرانبەر وەڵامدانەوەی پرسیارێک، یان چارەسەرکردنی کێشەیەکدا، سەغڵەت نابێ و، پەکی ناکەوێ، وەک واقیعی مێژوویی چاخەزێڕینەکانی[1] بەرنامەی خوا سەلماندوویەتی و، خوا پشتیوان بێ لەمەودواش دەیسەلمێنێ.

**دوو: هەرچی بەرنامەی خوا پێشگیریی لێ کردوە، ژیریی ساغیش فڕێی دەدات:**

دیسان خوای زانا لە وەسفی پێغەمبەرماندا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ﴿وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ (الأعراف-١٥٧)، واتە: پێشگیرییان لێدەکات لە هەرچی خراپەیە.

وشەی (المنكر)یش، کە وەک هاوەڵە پێشووەکەی ئەلیف و لام (أل) جینسی خراوەتە سەر، تاکو هەرچی جۆری خراپەیە بیگرێتەوە، لە ئەسڵی زمان و زاراوەی قوڕئاندا بەهەر قسەو کردەوەیەک دەگوترێ، کە ژیریی ساغ بەخراپی دادەنێو، شەرع پێشگیری لێ کردوە، دژی سروشتی ساغی ئینسانە[2].

بەڵێ بەڕاستیی هەرچی لە بەرنامەی خوادا بەخراپ دانرابێو پێشگیریی لێکرابێ، حەتمەن حەتمەن بەدو خراپ و زیانبەخشە، بۆ دنیاو دوارۆژو جەستەو گیانی ئینسان، هەرچەندە هەندێک جاریش مرۆڤ نەتوانێ بەس لەڕێی ژیریی کەم و کورتییەوە، پەی بە خراپیی و زیانبەخش بوونی بەرێ.

---

(١) مەبەست لە چاخەزێڕینەکان، ئەو قۆناغە مێژووییانەن، کە بەرنامەی خوایان بەتەواویی تێدا بەڕێوەبراوە.

(٢) بڕوانە (لسان العرب)، ب٥، ل٢٣٣، و بڕوانە: (معجم مفردات ألفاظ القرآن)، ل٥٢٦،٥٢٧.

ئەمەش چەند نموونەیەک لە چاکە (معروف) و خراپە (منکر)ەکان:

| چــاكە (معــروف) | خراپــە (منكــر) |
| --- | --- |
| ١- خوابەیەک گرتن [فاعلم أنه لا اله الاّ الله]محمد -١٩- | هاوبەش پەرستن [ولا تُشركوا به شيئا] النساء -٣٦- |
| ٢- دادگەریی [إن الله يأمر بالعدل] النحل -٩٠- | ستەم و زۆر [ألا لعنة الله على الظالمين] هود -١٨- |
| ٣- چاكەكاریی [إن الله يحب المحسنين] البقرة -١٩٥- | خراپەكاریی [عاقبة الذين أساءوا السوٰى] الروم -١٠- |
| ٤- زانایی [قل هل يستوي الذين يعلمون والذين لا يعلمون] الزمر -٩- | نەزانیی [إني أعظك أن تكون من الجاهلين] هود -٤٦- |
| ٥- ئیخلاص [وادعوه مخلصين له الدين] الأعراف -٢٩- | ڕیاكاریی [فويل للمصلين، الذين هم عن صلاتهم ساهون، الذين هم يراؤن] الماعون -٤و٥- |
| ٦- تێكۆشان لەڕێی خوادا [وفَضّل الله المجاهدين على القاعدين أجراً عظيماً] النساء -٩٥- | ترسان لە جەنگ و تێكۆشان [ألم تر الى الذين خرجوا من ديارهم وهم ألوف حذر الموت] البقرة -٢٤٣- |
| ٧- تێگەیشتن و شارەزابوون [ليتفقهوا في الدين] التوبة -١٢٢- | كەودەنیی و نەشارەزایی [لهم قلوب لا يفقهمون بها] الأعراف -١٧٩- |
| ٨- ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا [أنفقوا مما جعلكم مستخلفين فيه] الحديد -٧- | چرووكیی و ڕژدیی و نەبەخشین [الذين يبخلون ويأمرون الناس بالبخل] الحديد -٢٤- |
| ٩- خۆڕازاندنەوە بە خەسڵەتە بەرزەكان [قد أفلح من تزكى، وذكر اسم ربه فصلى] الأعلى -١٤- | خۆشاردنەوە لەژێر ژەنگ و چڵكی خەسڵەتە بەدەكان دا [وقد خاب من دسّاها] الشمس -١٠- |
| ١٠- چاكسازیی و چاكسازیی كرد لە وڵاتدا [إن أريد إلاّ الإصلاح ماستطعت] هود -٨٨- | تێكدان و خراپەكاریی لەوڵات و لەنێو كۆمەڵگادا [ولا تطيعوا أمر المسرفين الذين يفسدون في الأرض ولايصلحون] الشعراء -١٥١و١٥٢- |

**سێ: هەرچی بەرنامەی خوا حەڵاڵی کردوە، بە لەزەت و بەکەڵکە:**

دیسان خوای تاک و پاک لەبارەی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ (الأعراف-١٥٧)، واتە: هەرچی پاک و سوودبەخشە، بۆیان حەڵاڵ دەکات.

وشەی (طيبة) کە کۆیەکەی (طيبات)ە، لە بنەڕەتی زمان و زاراوەی قورئاندا بە هەر شتێک دەگوترێ، کە پێنج هەستەکان چێژی لێ وەربگرن و نەفس ئازەرووی بکات[1]، یان هەرشتێک کە پاک و خاوێن و چێژدار بێ.[2]

بەڵێ هەرچی چاک و بەکەڵک و چێژدار بێ، لە خواردەمەنی و خواردنەوەکان، خوا لە بەرنامەی خۆیدا حەڵاڵی کردوەو پێشگیریی لێنەکردوە، هەڵبەتە بەرنامەیەکیش هیچی چاک و بەکەڵک لە خەڵکی قەدەغە نەکات، دیارە بەرنامەیەکی پان و بەرینەو سەغڵەتی و تەنگیی ڕووی تێ ناکات.

لە خاڵی پێنجەمدا پتر تیشک داوێینە سەر ئەم مەسەلەیە.

**چوار: بەرنامەی خوا هەرچی خراپ و زیانبەخشە، قەدەغەی کردوە:**

هەروەها خوای بەرزو مەزن لەبارەی پێغەمبەری کۆتاییەوە فەرموویەتی: ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ﴾ (الأعراف-١٥٧)، واتە: هەرچی پیس و زیانبەخشە لێیان قەدەغە دەکات.

وشەی (خبيثة) کە کۆیەکەی (خبائث)ە، لە بنەڕەتی زمان و زاراوەی قورئاندا بە هەرشتێک دەگوترێ، کە نزم و بەد و زیانبەخش و چارەنەویستراو بێ، جا ئەو شتە بەرهەست بێ یان مەعنەویی و، بە جۆرە خواردنێک

---

(١) (معجم مفردات ألفاظ القرآن) ل٣٢١.
(٢) (لسان العرب) ب١ ل٥٦٣.

دەگوترێ کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا نەگونجێ[1]، یان بە هەر شتێک دەگوترێ کە تام و بۆنی ناخۆش بێو پیس و زیانبەخش بێ.[2]

بەڵێ خوای میهرەبان و شارەزا، هەر جۆرە ڕۆزییەکی پیس و زیانبەخش و لەگەڵ سروشت و میزاجی ساغدا نەگونجاوی لە بەرنامەی خۆیدا، لە مرۆڤ قەدەغە کردوە، بۆ ئەوەی ئینسان ساغ و سەلیم و تەندروست بێو، تووشی دەردو نەخۆشییان نەبێ، هەڵبەتە بەرنامەیەکیش هێندە وردبین و بەمشوور بێ، هەرچی خراپ و پیس و زیانبەخشە، لە مرۆڤی قەدەغە بکات، دیارە تێبوو و بەبەرەوەبوویەو[3]، قەت تێگیراویی و دەستەوستان بوون ڕێی تێ نابات.

**پێنج: لە بەرنامەی خوادا، بنچینەی گشتی لە شتان (الأشیاء)دا حەڵاڵییە[4]:**

یەکێک لە بنچینە هەرە گەورەو گرنگەکانی بەرنامەی خوا، ئەوەیە کە هەرچی خوا خوڵقاندوویەتی، حوکمی حەڵاڵییەتی (حلّیة)و (إباحة)ی هەیە، مەگەر شتێک بەڵگەیەکی ئاشکرا هەبێ لەسەر حەرامیی و قەدەغەکرانی.

ئەم یاسا گشتی و بنچینەییەش، کە گوتمان لە زۆر ئایەت و فەرموودان دەفامرێتەوە، بۆ وێنە:

خوای پاک و تاک فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ تَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴾ (لقمان-٢٠).

واتە: ئایا نابینن کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە بۆی ڕام کردوون و، نیعمەتە ئاشکراو پەنهانەکانی خۆی بەسەردا ڕشتوون!

---

(١) (معجم مفردات ألفاظ القرآن) ل١٤١،١٤٢.

(٢) (لسان العرب)، ب٥، ل١٤٣،١٤٤.

(٣) تێبوو: پێکڕاو بەبەرەوە بوو: لەباراندا هەبوو.

(٤) بڕوانە: (أصول الفقه) الشیخ محمد الخضري بگ، ل٣٥٤، چ٦.

دیسان فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ (البقرة- ٢٩)، واتە: -خوا- ئەو زاتەیە کە هەرچی لە زەویدا هەیە بۆ ئێوەی خوڵقاندوە.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((الْحَلالُ مَا أَحَلَّ اللهُ فِي كِتَابِهِ، وَالْحَرَامُ مَا حَرَّمَ اللهُ فِي كِتَابِهِ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ، فَهُوَ مِمَّا عَفَا عَنْهُ} (أخرجه الترمذي برقم: ١٧٢٦)، وابن ماجه برقم: ٣٣٦٧)، والحاكم برقم: ٧١١٥)، واتە: حەڵاڵ ئەوەیە کە خوا لە کتێبەکەیدا حەڵاڵی کردوە و، حەرام ئەوەیە کە خوا لە کتێبەکەیدا حەرامی کردووە، هەرشتێکی لێی بێدەنگ بووە، ئەوە لەو شتانەیە کە وازی بۆ لێ هێناون.

ئنجا ئەو بنچینە گشتییەی گوتمان، بەس لە جوغزی شتەکان (الأشياء)دا حوکمی ناڕوا، بەڵکو کردەوەو ڕەفتاران (الأفعال والتصرفات)یش دەگرێتەوە، واتە ئەوەی ئێمە لە زاراوی شەرعدا پێی دەڵێین (العادات والمعاملات) یانی داب و نەرێت و سەوداگەریی و مامەڵە تاقە لایەنێک کە نەکەوێتە ژێر ڕکێفی ئەم بنچینەیەوە، بریتییە لەو بەشەی کە لە زاراوەی شەرعدا پێی دەگوترێ: (العبادات) پەرستنەکان و ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێ: {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ} (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: البخاري برقم: ٢٦٩٧، ومسلم برقم: ١٧١٨)، واتە: هەرکەسێک لە ئایینماندا شتێکی وا پەیدا بکات کە تێیدا نەبێ، ئەو شتەی بەسەردا دەدرێتەوە. تایبەتە بە بەشی بیروبڕوا (عقیدة) و خواپەرستیی (عبادة)وە؛ چونکە کاکڵی خواپەرستیی دوو شتە؛ یەکەم کە بەس خوا بپەرسترێ، دووەم کە خوا بەس بەو شێوەیە بپەرسترێ کە بڕیاری لەسەر داوە، کەواتە هەرکەسێک لە بواری خواپەرستییدا، شتێک دابێنێ، ئەوە ئەو شتە بەداهێنراو (بدعة) دادەنرێو بەسەریدا دەدرێتەوە.

بەڵام داب و نەریت و مامەڵەکردن، خەڵک بۆ خۆیان دایان هێناوەو لەسەری ڕێککەوتوون، ئنجا دوایی خوای زانا ئەوی ڕاست و چاک بووبێ،

هێشتوویەتەوەو، ئەوەی خواربووبێ، ڕاستی کردۆتەوەو، ئەوەش، کە هەڵەو بێجێ بووبێ لای بردوە.[1]

کۆتایی ئەم باسەش بە چەند قسەیەکی (شيخ الإسلام ابن تيمية) دێنین، ئەو پێشەوا مەزنە لەوبارەوە گوتوویەتی:

(چالاکیی و ڕەفتاری بەندەکان لە قسەو کردەواندا دوو جۆرن: یەکیان ئەو پەرستن (عبادة)انەن، کە ئایینەکەیانیانی پێ بەڕێوە دەچێ، دووەمیان ئەو داب و دەستوورانەن، کە لە ژیانی دنیایاندا حەوجێیان دەبن، ئنجا بە سەرنجدان و تێوەڕامانی بنچینەکانی شەرع، دەزانین کە ئەو پەرستنانەی خوا پێویستی کردوون، یان حەزیان لێ دەکات، بەبێ بەڵگەیەکی شەرعیی ناچەسپن، بەڵام داب و دەستوورەکان خەڵک، کە سەریان تێیان وەستاوە، دایاننـاون و خوویان پێوە گرتوون و، بنچینەی گشتی لەواندا بریتییە لە قەدەغە نەکردن (عدم الحظر)، کەواتە پێشگیرییان لێ ناکرێ، مەگەر لەو شتانەی خوای پاک و بەرز قەدەغەی کردوون)[2].

**شەش: بەرنامەی خوا بریتیە لە چەند بنچینەیەکی گشتی نەگۆڕو چەند یاسایەکی بەرین و لێك کشاو:**

بەرنامەی خوا (شريعة الله) بەشێوەیەکی گشتی دوو بەشە: بەشێکیان چەند بنچینەیەکی گشتی و سەرەکیی و نەگۆڕن، بەشەکەی دیکەیان چەند یاسایەکی پان و بەرینن و مەودای لێک کێشرانەوەیان هەیە.

بۆ وێنە: ئەو یاساو بنچینانەی پەیوەندییان بە بیروبڕواوە هەیە، گۆڕان ڕوویان تێناکات و ڕێیان تێ نابات، بۆ نموونە: خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو

---

(١) ئەم چەند دێڕەم بە نەختە دەستکارییەکەوە لە کتێبی (الحلال والحرام في الإسلام) وەرگرتن، نووسراوی د.يوسف القرضاوی، ل٢١، چ٧.

(٢) بڕوانە (القواعد النورانية الفقهية) ل١١٢ چ١٩٧٩، ابن تيمية.

ڕۆزییـدەرو بەرنامەڕێژەو، لـە هەمـوو ناتەواوییـەک دوورە، خاوەنـی هەمـوو سیفەتێکی چاکـە، ئەمانـە چەنـد ڕاسـتییەکن، هەرگیـز گۆڕانیـان بەسـەردا نایـەت و لا ناچـن.

هەروەها ڕەوشت و ئاکارە پەسندەکانی وەک: ڕاستیی، پاکیی، ئازایەتیی، خۆڕاگریی، شوکرانە بژێریی، بە نـمەکیی، سینە خاوێنیی...هتد. ناگونجێ بگۆڕرێن، چونکـە لاچوون و گۆڕرانـی هەرکامێکیـان دەبێتـە هۆی پەیدابوونـی خەسڵەتێکی بەدو ناپەسند.

دیسان ئەو یاسایانەی پەیوەندییان بە خواپەرستییەوە هەیە، وەک فەرزبوونی نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات و، چۆنیەتـی جێبەجێ کرانیـان، ناکەونـە ژێر ڕکێفی حوکمی گۆڕانکارییەوە.

هەروەهـا باقـی بنچینـە چەسپاوەکانی شـەرع کـە بـە دەقێکـی بێ پێـچ و پەنـا (نص صريح) یـان بـە یەکدەنگیی زانایـان (إجماع العلماء) چەسـپێنراون، گۆڕانیـان بەسـەردا نایـەت و نابێ شـتێکی دیکەیـان لەجێ دابنـرێ، وەک قەدەغەبوونی کوشتن و داوێنپیسیی و دزیی و فێڵکردن لـە مامەڵەدا و بەشـە دیارییکراوەکانـی میـرات و..هتـد.

بـەڵام ئـەو یاسـا شـەرعییانەی پەیوەندییـان بـە وردە بابەتـەکانـی بازرگانیـی و سـەوداو مامـەڵەو کاروبـاری ژیانـی دنیـاوە هەیـەو، هیـچ دەقێکـی تایبەتییـان دەربـارە نەهاتـوە، وەک ئـەو یاسـاو حوکمانـەی تایبەتـن بـە ڕێکخسـتنی پەیوەندییەکانـی ژیـان و گوزەرانـی تاکەکانـی کۆمـەڵ لەگـەڵ یەکدیـداو، پەیوەندییـان لەگـەڵ دەوڵەتـدا و پەیوەندیـی کۆمەڵگا ئیسـلامییەکان لەگـەڵ یەکـدا و، پەیوەندییـان بـە کۆمەڵگایەکانـی دیکـەوە، ئەوانـەن ئـەو یاسـا شـەرعییانەی کـە دەکەونـە بـەر قەڵەمـڕەوی حوکمـی گـۆڕان و جێگـۆڕ کـە (تبدیـل)ەوە، بەهـۆی گـۆڕان و پەرەسـتاندنی بـارودۆخ و جێگـەو شـوێنەکانەوە، بەپێـی داخوازیـی بەرژەوەندییەکانـی خەڵکـی مسـوڵمان، لـە جوغـزی بنچینـە سـەرەکیی و گشـتییەکانی بەرنامـەی خـوادا.

کەواتە شەریعەتی ئیسلام چەسپاوەو ناگۆڕێ، بەڵام شەرع (فقە)ی ئیسلام چەسپاوو نەگۆڕ نیەو، جێی لابردن و گۆڕانکاریی تێدایە.

مەبەستیشمان لە شەریعەت ئەو یاساو بنچینە گشتی و سەرەکییە چەسپاوانەن کە پەیوەستن بە لایەنی بیروبڕواو، ڕەوشت و ئاکارو، خواپەرستیی[1] و، چوارچێوەی گشتی و پایە بنەڕەتییەکانی بەرنامەی خواوە.

بەڵام مەبەستمان لە شەرع (فقە) ئەو یاسایانەن کە پەیوەستن بە وردە بابەتەکان (جزئیات)ی بەرنامەی خواوەو، مەودای بیرکردنەوەو کۆشش (اجتهاد)ی زانایانیان تێدا هەیەو، لەبارانیان دا هەیە، واتاو لێکدانەوەی جۆراوجۆر هەڵبگرن و، جێگۆڕکە (تبدیل)ی حوکمانیان تێدا بکرێ.

بەکورتیی: مەبەستمان لە شەرع ئەو یاسایانەن کە چوارچێوەو سنوورێکی وردو دیاریکراویان تێ نەگیراوەو، مەودای فراوانبوون و لێک کێشرانەوەیان هەیە.[2]

جا خوێنەری بەڕێز ئێستا با سەرنج بدەین:

ئایا بەرنامەیەک هەرچی چاکەو، سروشتی ساغ و ژیریی ڕاست[3] پەسندی دەکەن، فەرمانی پێ بکات و، هەرچی خراپەو، سروشتی ساغ و ژیریی ڕاست بەچاکی نازانن، پێشگیریی لێ بکات و، هەر ڕۆزیی و بژێوێکی چاک و سوودبەخشە، حەڵاڵی بکات و، هەرچی زیانبەخشە، قەدەغەی بکات و، حەڵاڵیی و ڕێگەدان بنچینەی گشتیی بێ، لە داب و نەریت و سەوداگەریی و شتانداو، چەند یاسایەکی بنچینەیی چەسپاوو

---

(١) خواپەرستی بە چەمکی عورفی و تەسکی، ئەگەرنا خواپەرستیی هەموو شتێک دەگرێتەوە.

(٢) بۆ شارەزایی پتر واباشە سەرنجی (تطور الفقه الإسلامي) بدرێ لە کتێبی (مفهوم الفقه الإسلامي) نووسراوی (نظام الدین عبدالمجید)، هەڵبەتە ئێمەش لە نووسینی ئەم باسەدا سوودمان لێ وەرگرتوە.

(٣) بەڵام مەرج نیە ژیریی (عقل) پەی بە هەموو ڕازو نهێنی و حیکمەتەکانی بەرنامەی خوا بەرێ، چونکە بەرنامەی خوا بەپێی زانیاریی و حیکمەتی بێسنووری خوا دانراوە، بەڵام ژیریی ئینسان، وەک هەموو هێزەکانی دیکەی شتێکی گچکەو سنووردارە.

نەگۆڕی تێدا بن و، وێڕای وانیش کۆمەڵە یاسایەکی پان و بەرین و مەودا بە بەرەوە بوو و لێک کێشراوە؛ ئایا بەرنامەیەکی ئاوا دەگونجێ سەغڵەتیی و تەنگیی و بێچارەیی ڕووی تێ بکات؟!!

هەروەها ئایا بەرنامەیەکی ئاوا دەگونجێ لە ئاقار ژیانی ئینساندا تەنگاوو بێچارەو دەستەوستان بێ؟! بێگومان نەء.

کەواتە: ئەو کەسانەی کە بێئەوەی دوو دێڕان لە قورئانی مەزن و بەپێزو فەرمووودەی پێغەمبەری بەڕێز (صلی الله علیه وسلم) بخوێننەوە، دەکەونە تانەو تەشەر لە ئیسلام دان و، تفەنگ بە تاریکییەوە نان و، وەک تووتی قسەو قسەلۆک و پروپاڵانتەی دوژمنانی داخ لەدڵ دەڵێنەوەو، جارێک تۆمەتی (دوگماتیزم) بوونی پاڵدەدەنە لای ئیسلام و دەڵێن: مەودای گۆڕان و پەرەستاندن و بەرەوپێش چوونی تێدا نیەو، لەگەڵ ڕەوتی ژیاندا ناگونجێ و[1]، کەرەتێک تۆمەتی کۆنەپەرستیی (رجعي) بوونی دەدەنە پاڵ و دەڵێن: ئایین وا لە مرۆڤ دەکات کە بەرەو دوایە بگەڕێتەوەو، دژی گۆڕانکاریی و نوێخوازیی بێ و، جارێک تۆمەتی ئەوەی دوا دەخەن کە مافی نەتەوایەتیی تێدا نیەو، دەمێک دەڵێن: مافی ئافرەتانی نەداوەو، جارێک بەدژی زانیاریی بوون تاوانباری دەکەن و...هتد.. بەڵێ ئەو فامکاڵ و بێهەواڵانە، بەم جۆرە قسە پووچەڵ و هەڵوێستە گەندەڵانەیان، شایەدیی نەزانیی و بێئاگایی لەخۆیان دەدەن و، خۆیان شەرمەزاری لای خواو خەڵکی دەکەن، ئنجا هەر کەسێک دەیەوێ بە بێئاگاو فامکاڵ لەقەڵەم نەدرێ و، ڕیسواو شەرمەزار نەبێو، لە ڕیزی (شەلم کوێرم کەس نابوێرم)ان حسێب نەکرێ، با نە بەچاک نە بەخراپ باسی ئیسلام نەکات، هەتا لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەکی وردو قووڵ و هەمەلایەنەی دەربارە نەکات.

---

(١) لە کتێبی (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان)داو لەژێر سەرباسی: (چەسپاوو گۆڕاو لە دین و ژین دا) توێژینەوەیەکی باشمان لەو بابەتەوە کردوە، بڕوانە لاپەڕە (١٥٠-١٧٢)، چاپی یەکەم/٢٠٠٨ز.

## ٧- جاری وایە بەرنامەی خوا، دەکرێتە ئامرازی یاریی و شمەکی بازرگانیی

خوای وردبین و زانا فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ (الأعراف-٥١).

واتە: ئەوانەی کە ئاییەنەکەیانیان کردۆتە هۆی کات پێ بەسەربردن[١] و یاریی[٢] و ژیانی دنیا فریوی داون، جا ئەمڕۆ ئێمەش لەبیریان[٣] دەکەین، هەروەک چۆن ئەوان دیداری ئەم ڕۆژەیان لەبیر چووبۆوە و وەک چۆن بڕوایان بە ئایەتەکانمان نەدەکرد.

لەم ئایەتەدا بەئاشکرا دەبینرێ کە جاری وایە بەرنامەی خوا بەدەست کەسانێکەوە کە بە ئارەزووەکانی ژیانی دنیا فریو دەخۆن و، ژیانیان بە تەمەن بەڕێکردنی بێسوود و گاڵتەو یاریی دەبەنە سەرو، لە دیداری خواو ڕۆژی دوایی بێئاگا دەبن، دەبێتە بووکەشووشەو ئامرازی گاڵتەو یاریی!!

---

(١) (اللهو: هو الشيء الذي يتلذذ به الإنسان فيلهيه ثم ينقضي)، واتە: (لهو) ئەو شتەیە کە مرۆڤ خۆشی لێوەردەگرێو بێئاگای دەکات دوایی بەسەر دەچێ.

(٢) (اللعب: هو فعل الصبيان يعقبه التعب من غير الفائدة) واتە: (لعب) بریتیە لە ڕەفتاری منداڵان، ماندووبوونێکی بێسوودی لەدوایە، بڕوانە (التعريفات) السيد الشريف علي بن محمد الجرجاني، ص٨٣-٨٤.

(٣) بێگومان خوای بێوێنەو پاک هیچ شتێکی لەبیر ناچێو لێ ون نابێ، کەواتە لێرەدا مەبەست لە (ننساهم) مانا حەقیقییەکەی نیە، بەڵکو مەبەست مانا مەجازییەکەیەتی کە بریتییە لە پشتگوێخستن و بەبێبایەخ تەماشاکردن.

تێبینی: لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر تیشکی قورئان و سووننەتدا) بەدرێژیی باسی ئەم مەسەلەیەمان کردوە، لە باسی صیفەتە خەبەرییەکانی خوای پەروەردگاردا، بڕوانە بەرگی سێیەم (خوا بە یەکگرتن لە ناوو سیفەتەکان و لە پەرستراوێتیی دا).

دیسـان خـوای بـەرزو مـەزن فـەرمووبەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ١٧٤ ﴾ (البقـرة-١٧٤).

واتـە: بێگومـان ئەوانـەی ئەو-یاسایان-ە دەشارنەوە، کـە خـوا لـە کتێبەکەیدا ناردوونیـە خـوار و نرخێکـی کەمـی پـێ دەکـڕن، ئـەو جـۆرە کەسـانە-ی، کـە نرخی ئـەو ئاییـن فرۆشتنە دەخـۆن- جگـە لـە ئاگر هیچی دی ناخۆن و ناخەنـە زگیانـەوە و خـوا- لـە ڕۆژی دواییـدا- نایاندوێنـێ و پاکیـان ناکاتـەوەو سزایەکی بەئێشیان هەیە.

لـەم ئایەتەشدا دیاردەی سـەودا بـە ئاییـن کـردن و، بازرگانیـی بـە بەرنامـەی خـواوە کـردن، بـێ پێچ و پـەنا دێتـە بەرچـاو.

ئێسـتا کـە زانیمـان هـەرکام لـە دیـاردەی بەرنامـەی خـوا بـە گاڵتـەو یاریـی گرتـن و، بازرگانیـی و مامـەڵـە بـە بەرنامـەی خـواوە کـردن، لـە ڕوانگـەی قورئانـەوە، دوو شـتی سـەلمێنراون، بابزانیـن ئـەو ئاییـن بـە یاریـی گرتـن و، بازرگانیـی و مامـەڵەپێوەکردنـە چییـەو چۆنـە؟!!

## یاریی و گاڵته به ئایین كردن

خوێنه‌ری خۆشه‌ویستم!

ئایا ئه‌گه‌ر به برادەرێكت بڵێی؛ تۆ خۆشه‌ویستترین كه‌سمی و، شاییو شینت به‌هی خۆم ده‌زانم و، هه‌ر ئیشێكت به‌من بێ دریغیی ناكه‌م! به‌ڵام رۆژێك له رۆژان ئه‌و برادەرەت كۆستی كه‌وت و ده‌ستی له هه‌موو پچكان پچڕاو، په‌نای بۆ لا هێنای و په‌رێشانی و شپرزه‌یی خۆی تێگه‌یاندی و، كووره‌ی دڵ و ده‌روونی به فووی سكاڵا ده‌ماندی و[1]، داوای یارمه‌تی لێكردی و، تۆش له‌گه‌ڵ ده‌سته‌ڵاتت و ده‌سترۆیشتنتدا، رووت لێ وه‌رچه‌رخاندو گوێت نه‌دایه‌وه، وات نه‌زانی هه‌ر (با)شی دێ! ئه‌و برادەرەت پێت ناڵێ؛ كه‌واته تۆ هه‌تا ئێستا درۆت له‌گه‌ڵ كردووم و، پێت رابواردووم و گاڵته‌ت پێكردووم؟!! دیاره، با.

ده‌جا به هه‌مان شێوه ئه‌و كه‌سه‌ش كه ده‌ڵێ:

بڕوام وایه كه خوا له هه‌موو شتێك به‌رزترو مه‌زنترو به‌ده‌سته‌ڵاتتره‌و، به‌رنامه‌كه‌ی له هه‌موو به‌رنامان ته‌واوتره‌و، پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی تاقه پێشه‌وایه‌و، له هه‌موو رابه‌رو پێشه‌وایه‌كی دیكه چاكترو په‌سندترو لێهاتووتره، به‌ڵام هێنده‌ی له غه‌یری خوا ده‌ترسێ و غه‌یری وی ده‌په‌رستێ، هێنده‌ی نیو هێنده‌ش له‌خوا ناترسێو، گه‌ردنكه‌چی نابێو، هێنده‌ی پابه‌ندی به‌رنامه‌ی غه‌یری خوا ده‌بێ، ده‌یه‌كی ئه‌وه‌ش پابه‌ندی به‌رنامه‌و ئایینی وی نابێو، هێنده‌ی دوای رابه‌رو پێشه‌وایانی دنیاخۆرو به زه‌برو زۆرو فێڵبازو چاونه‌شۆر ده‌كه‌وێ، سه‌دیه‌كی ئه‌وه‌ش لا به‌لای پێغه‌مبه‌ری خوادا (صلی الله علیه وسلم) ناكاته‌وه!

---

(١) كووره ده‌ماندن: گه‌رمكردن به‌هۆی فوو لێكردن و باوه‌شێن كردنه‌وه.

١- دەڵێت: بڕوام هەیە کە ئیسلام حەوجێی فیداکاریی و قوربانییدانە، بەڵام ئامادە نیە لەسەر ئیسلام تەنانەت زللەیەکیشی لێ بدرێ!

٢- دەڵێت: بڕوام بە بەهەشتێ هەیە، بەڵام خۆی بۆ ئامادە ناکات!!

٣- دەڵێت: لەئاگری دۆزەخێ دەترسم، بەڵام لەبەری ڕاناکات!

٤- دەڵێت: دەزانم کە زیندوو دەبمەوە، بەڵام وەڵامێک بۆ بەر دادگای خوا ساز ناکات!!

٥- دەڵێت: دەزانم هەرچی بیکەم تۆمار دەکرێو هەڵدەگیرێو دێتەوە ڕێم، بەڵام لە تاوان و بەدکاریی پارێزێ ناکات!!

٦- دەڵێت: دەزانم کە حەڵاڵ و حەرام هەن، بەڵام فەرقێیان پێ ناکات!

٧- دەڵێت: بڕواداران خوشک و برامن، ئەمما بە کردار و ئاکار، پیاوانیان بە براو، نە ئافرەتانیان بە خوشک، حسێب ناکات!

٨- دەڵێت: بڕوام وایە کە دەبێ مرۆڤی مسوڵمان سەربەرزو بەدەمارو سەربەخۆ بێ، بەڵام هەتا ملشۆڕیی و زەبوونیی و خۆفرۆشیی لەوێ بێ، قمان[1] لە هیچــی دیکە خۆش ناکات!![2]

بەڵێ بابایەکی ئاوا بە زمانی کردەوەو حاڵ، درۆی لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا کردووە، گاڵتەو یاریی بە بەرنامەی خوا کردووە!

ـ ئینجا نۆرەی ڕوونکردنەوەی دیاردەی دووەمە.

(١) قمان: لەهیچی دیکە خۆشناکات، بەهیوای هیچی دیکە نیە، قم: قوم قمی لێخۆشکردن: بەتەمای بوو، تەماعی تێکرد.

(٢) کاتی خۆی مەبەستم پێ لەم قسانە زیاتر ئەو خەڵکە عەوامە بوو، کە بێپەروا ڕێی سیخوڕیی و وابەستەیی و دابەستەیی کردن بۆ ڕژێمی بەعسی دیکتاتۆریان دەگرتەبەرو، خۆشیان هەر پێ مسوڵمان و دینداریش بوو! بەڵام بێگومان ئێستاش خەڵکی لەو بابەتە بەڵام بە جۆرو شێوەی دیکە، هەرهەن! (١٢/٤/٢٠٠٨). ئێستاش: (١٩/٩/٢٠١٩ز) ئەو جۆرە کەسانە زیاتربوون!!

## سەوداو مامڵەت بە ئایینەوە کردن

١- ئەو کەسەی دەزانێ ئایین و بەرنامەی خوا دژی طاغووت و زۆردارانە، بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان نێوەچاوانی لە ئاقاریاندا گرژ ناکات!

٢- دەزانێ کە لەبەرنامەی خوادا کۆیلایەتیی گەورەترین تاوانە، بەڵام هەتا کۆیلایەتیی لەوێ بێ، هیچ ناکات!

٣- دەزانێ هەق نەبێژ شەیتانی لاڵە[1]، بەڵام شتێک، کە ناحەزانی خوا هێندەی گەردێک پێی قەڵس بن، هەرگیز خۆی لێ نادات!

٤- دەزانێ کە فەرمانکردن بە چاکەو، ڕێگرتن لە خراپە فەرزە، بەڵام وەک مەڕی بەستەزمان هەرگیز خۆی شلوێ ناکات!

٥- دەزانێ کە لادان و گۆڕین (تحریف و تغییر)ی حوکم و یاساکانی بەرنامەی خوا بۆ ڕازیکردنی طاغووت، فرۆشتنی دینە بە دنیاو، گۆڕینەوەی خوایە بە خورما، بەڵام بابای طاغووتی خۆ بەخوازان، نەک هەڕەشەو خۆ لێسوورکردنەوە، بگرە هەر تۆزێک گەرووێی شیرن بکاو، بە عاستەم زاری چەور بکاو، نرخێکی کەمی پێشان بدات، خۆی و ئایینی و نەتەوەی و خاک و ئاوی پێ دەفرۆشێو، هەر سێ ودووێی لێ ناکات!

٦- دەزانێ کە نزیک بوونەوە لە حیزبی کافرو ڕێچکەی خوارو بابای زۆردار دەبێتە هۆی نێزیک کەوتنەوە لە ئاگری بلێسەداری دۆزەخ وەک خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ﴾ هود: ١١٣.

---

(١) (الساكت عن الحق شيطان أخرس) قسەیەکی حەکیمانەو نەستەقی پێشینانی چاک و پەسندمانە.

مەبەست بەم قسانەش ئەو مەلاو شێخە دین فرۆش و دڵنەخۆش و بێهۆش و گۆشانەن، كە كاتی خۆی دەست لەسەر سینگ لە خزمەتی ڕژێمی طاغووتی بەعسی عارەبی سۆشیالیستی ڕاوەستابوون، بەڵام ئێستاش هەندێك لەوانەو غەیری وانیش هەر ئەو هەڵوێست و خزمەتەی ئەوسایان بەجۆرو شێوەیەكی دیكەو بۆ طاغووتێكی دیكە دووبارە دەكەنەوە، واتە جەوهەرو نێوەڕۆكی كارو پیشەكەیان هەر یەكەو، تەنیا ڕواڵەت و دیكۆرەكەی گۆڕاوە! (٢٠١٩/٩/١٩ز) - (٢٠/محرم/١٤٤١ك)، بەڵام بۆ چەپڵەو ئافەرینێك و، بۆ بڕە موچە (معاش)و تۆزە ژینێك، ئامادەیە ببێتە بڵیندگۆی طاغووت و بەدڵی وی فتوایان دەربكاو، مینبەرو میحرابی پێغەمبەر بۆ دووعاكردن بۆ طاغووت بە ئیجارە بگرێو، ئەو چۆنی بەدڵ بێ، وا بدوێو وا ڕەفتار بكات!

بێگومان كەسێكی ئاوا با بەدرۆ خۆشی بڵێ: ڕابەرو پێشەوای ئیسلام و میراتگرو جێنشینی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، بەزمانی كردەوەو حاڵ، دڵنەخۆشیی و ئایین فرۆشیی و بێهۆش و گۆشی و سەوداو مامڵە بەئایینەوە كردنی خۆی، خستۆتە ڕوو و سەلماندوە![1]

---

(١) قوڵە نەزیلەیەكی سەیر:
لە سەرەتای هەشتایەكاندا كە گەرمەی سیخوڕیی و جاشایەتیی بوو، چەند جارێك وابووە كە كۆمەڵێك لە چەكدارەكانی ڕژێم هاتوونە لام و لەوبارەوە كە جاشایەتی حەرامەو پارەكەشتان حەرامە، ئامۆژگارییم كردوون و هەیانبووە وازیشی هێناوە، ئنجا جارێكیان كۆمەڵێك كە بەرپرسیارێتییان هەبوو، سەردانیان كردم و منیش ئامۆژگارییم كردن كە واز بهێنن، كەچی یەكێكیان گوتی: مامۆستا تۆ دەڵێی: پارەو مەعاشی جاشەتیی و خزمەتی ڕژێم حەرامە؟!
گوتم: بەڵێ، چونكە پارەو مەعاشی ئێوە لە بەرامبەر خوێن و كەرامەتی خۆتاندا لە ڕژێمی بەعسی وەردەگرن بۆ جەنگ كردن دژی گەل و نیشتمانی ستەمدیدەو داگیركراوی خۆتان.
ئنجا ئەویش گوتی: وەڵڵا دەنا من پرسی (مامۆستا مەلا....)م كرد لەوبارەوە، ئەویش گوتی: كاكە ئەگەر واجبەكەتان باش جێبەجێ بكەن پارەكەتان حەڵاڵە، ئەگەرنا حەرامە!
منیش گوتم: ئاخر كاكە وا نیە، چۆن هەتا جاشی باشتر بن، پارەتان حەڵاترە!!
ئنجا كاتی خۆی لەوجۆرە كەسانەو لەو چەشنە فەتوا هەواییانەمان هەبوون و ئێستاش هەمانن.

چونکه بڕبڕه‌ی پشتی ئیسلام و کاکڵ و نێوەڕۆکی، بریتیه له یه‌کلابوونه‌وه بۆ خواو، بەس ڕووکردنه خواو، بەتەنێ پشت بەستن بەخوا، مادام وابێ کەسێک کە قیبلەی طاغووتەو، دنیاپەرستێکی ڕووتەو، هاوبەش پەرستێکی نابووتە، ڕێی ناکەوێ کە شوێنکەوتوویێکی سادەی ئیسلامیش بێ، چ جای ڕابەرو پێشەوا!!

چونکه پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تایبەتیترین و سەرەکیترین خەسڵەتی بریتی بووە لە طاغووت فەوتاندن و زۆردار ڕەتاندن و، هەموو ژیانی پڕ پیت و پێزی بریتی بووه لە چەسپاندنی خوا بەیەکگرتن (توحید) و، ڕیشەکێشکردنی بیری پووچی کۆیلایەتیی و هاوبەش پەرستیی، مادام وابێ کەسێک هەموو ژیانی تەرخان کردبێ بۆ خزمەتکردنی طاغووت و، سووککردنی دینداریی و، لەبەرچاوی خەڵکی خستن و بێزاندنی ئیسلامەتیی، لەوەی هەر بگەڕێ کە جێنشین و میراتگری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نیە، بەڵکو دژی بەرنامەو ڕێوشوێنی پێغەمبەرە، چونکە ئەو خەسڵەت و ئاکارانەی کە تێیدان و، ئەو وتارو ڕەفتارانەی کە لێی دەپوشکوونەوە، خەسڵەت و ئاکارو وتارو ڕەفتارێک نین کە پێغەمبەری خوا بە یەکگرو خاوەن عیززەت و دژ طاغووت و تێکۆشەرو دنیا بەکەمگر (زاهد) و ئازاو بەدەمارو خۆڕاگرو بەرچاوتێر (صلی الله علیه وسلم)، بە میرات لێی بەجێ ماون، بەڵکو هی کەسانێکی خوانەناس و بێعیززەت و طاغووت پەرست و هەڵخزاوو دنیاویست و ترسنۆک و بێدەمارو پشووکورت و چاوچنۆکن!!

بەڕاستی شتێکی یەکجار ستەم و بێجێو ناماقووڵە کە بەناو زاناو بە ڕواڵەت پێشەوایەکی ترسنۆک و طاغووت پەرست، خۆی بەجێگرو میراتگری پێغەمبەرێک لەقەڵەم بدات و، لافی ڕابەرایەتی بەرنامەیەک لێ بدات، کە ئەوەندە ڕقیان[1] لە بەناو زاناو بە ڕواڵەت پێشەوایانی وەک ویە، کە بۆ ئێسکە

---

بەڵکو ئێستاکە: (٢٠١٩/٩/١٩ز) ئەو جۆرە هەڵوێست و فەتوا بۆش و بێ بنەمایەی کەسانێکی لەرزۆک و قرپۆک، زیاتربوون!

(١) ڕاناوەکەی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بەرنامەیەک دەگەڕێتەوە.

گۆشتێکی کرووسراوە وەک سەگێکی زەبوون و برسیی، چاو دەبڕنە دەستی تاغووت و، بەتەمای گیرفانی پڕو گەرمی و پارووی چەورو نەرمی، دەست دەکەن بە کلک لەقاندن و ئێشکەگرتن!! وەک خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ... ﴿١٧٦﴾ ﴾ (الأعراف: ١٧٥-١٧٦).

واتە: بەسەرهاتی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەوە کە-زانیاری- ئایەتەکانی خۆمانمان دابۆیە، بەڵام ئەو لەخۆی داپڕنین و یەکسەر شەیتان دوای کەوت و چووە ڕیزی گومڕایانەوە و ئەگەر ویستبامان -بەو ئایەتانە- بەرزمان دەکردەوە، بەڵام ئەو بەزەوییەوە نووساو، وەدوای ئارەزووی خۆی کەوت، وێنەو حاڵی وی وەک وێنەو حاڵی سەگە.. هەروەها وەک گوێدرێژێک بە ئومێدی مستەجۆیەک و چەنگە کایەک، دەبنە بارهەڵگری تاغووت و، چۆنیان لێبخوڕێ وادەڕۆن[1]، وەک خوای بێوێنە فەرموویەتی:

﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢا ﴾ (الجمعة -٥).

واتە: وێنەو دیمەنی ئەوانەی تەوراتیان پێ سپێررا، دوایی هەڵیان نەگرت-و حوکمەکانیان جێبەجێ نەکردن- وەک وێنەو دیمەنی کەر وایە- کە- کتێبان(ی لێ باربکەن و) هەڵبگرێ - سوودیان لێ نابینێ-..

**تێبینی:** خوای قسەلەجێو دادگەر بێجگە لە زانای دنیاپەرست و ئایین فرۆش هیچ کەسی بە سەگ و کەران نەچوواندوە، چونکە تاوانی زانای دینفرۆش و

---

(١) ئەو وشەو تەعبیرانە کاتی خۆی پاساو (مبرر)ی خۆیانیان هەبووە، جا هەرچەندە من ئێستا کەمتر وایە ئەو جۆرە تەعبیرانە بەکار بهێنم، بەڵام بۆیە لام نەبردن، چونکە ئێستاش خەڵکی وام پێ شک دێ ئەو جۆرە تەعبیرەی پڕ بەپێست بێت و، ئەسڵی وشەو تەعبیرەکانیش تەفسیرو لێکدانەوەی ئایەتەکانی خوای دادگەرو قسەلەجێیە!

طاغووت پەرست و دنیادۆست، لە تاوانی هەموو کەس گەورەترە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو تاوانەش بریتی بێ لە بازرگانیی کردن بە ئایینی خواوە، یانی کڕینی ئێسکی کڕووساوەی دەستی طاغووت بە بەرنامەی خواو، بوون بە کەرێ باری بۆ لەخۆ هەڵدانی باری قورسی طاغووت!!

هەڵبەتە ڕەنگە هەمووشتان بزانن کە (کەر) بێهۆش ترین گیاندارەو وێنە پێهێنراوە (مضرب المثل)ی کەرایەتییە و (سەگ)یش پیسترین گیاندارەو بۆ زۆر پیسیی و بەدیی و گلاویی وێنەی پێ دەهێنرێتەوە.

جا خوێنەری خۆشەویستم!

ئەگەر هات و هەرکام لە دیاردەی گاڵتە بەئایین کردن و، سەوداو مامەڵە بە ئایینەوە کردنت دیتن، ئەوە هیچ نیگەران مەبەو لەبارەی ئایین و بەرنامەی خواوە دوودڵ و دڕدۆنگ مەبە، چونکە دەریا بە زاری سەگ پیس نابێو، بیروبڕوا مادام ڕاست بێ، بە لادانی شوێنکەوتووانی سووک نابێ، ئنجا هەموو دەمێش وێڕای بەناو پێشەوای دڵنەخۆش و ئایین فرۆش، پێشەوای بەرزو پاک و لێهاتوو و چاکیش هەن، کە بە چاکیی لە دین گەیشتوون و، دینی خوا بە تەواویی ڕادەگەیەنن و سەری ئۆممەتی ئیسلامییان پێ بەرزەو جێی شانازین و، وێڕای بەناو مسوڵمان و مسوڵمانۆچکان، مسوڵمانی کامڵ و تێرو تەواویش هەن.

ئنجا تاوانبارکردنی بەرنامەی خواش، لەبەرئەوەی کەسانێکی خراپ و نەفام یاری پێدەکەن و سەوداو مامەڵەی پێوە دەکەن، ڕاست وەک تاوانبارکردنی کەسێکی پاک و بێتاوانە، بەهۆی پڕوپاڵانتەو قسەوقسەڵۆکی ناحەزو دوژمنێکییەوە، بێگومان ئەمەش ئەوپەڕی ستەم و بێدادیی و بێویژدانییە!!

بەڵێ، هەرچەندە ئەو گاڵتەچیی و بازرگانانە، بە ڕواڵەت خۆ بە مسوڵمان پیشان دەدەن، بەڵام لە ڕاستیدا وا نین و، وەک جەردەیەکی فێڵباز ناوی ئیسلامیان کردۆتە دەمامکی سەر ڕوویان و، بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیی

تایبەتیی خۆیان، وەک زەرووێکی پیس خۆیان بە ئیسلامی بێگەردو پاکەوە هەڵاوەسیوەو، تەمایانە لە خستنەڕووی چەند ڕواڵەتێکی بێ کاکڵی بەناو ئیسلامییانە، چاوپێچێک دروست بکەن، بۆ چاوبەستەکردنی خەڵکی سادەو کورت بین، بەڵام خەیاڵیان خاوەو، ئەو وڵاخەی

ئەوان سواری بوو ون، لەپێش واندا زۆرکەسی لەسەر گلاوەو ملی شکاوە!!

بەڵام لێرەدا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە جاری واش هەیە زانایەکی ڕاست و ڕێک بەڵام فەقیرحاڵ و لەدنیاو خەڵک و سیاسەت بێهەواڵ، بە تەڵەو داوی ئەو طاغووتە فێڵبازانەوە دەبێت و، لەگەڵ پێڕی بێخێری دینفرۆشەکاندا تێکەڵ دەبێ، بەڵام لەوان نیەو بە هەڵەو ڕێ لێ تێکچوون ڕەگەڵیان کەوتوەو، پێویستە بەرەی هەق وریاو هۆشیار بن و، بەناهەق و بەنەزانیی ئەو جۆرەکەسانە لەخۆیان نەتۆرێنن، بەڵکو بەقسەو هەڵوێستی خێرو برایانەو دڵسۆزانە، چاوپێچکی سەرچاویان لابەرن و بێداریان بکەنەوەو بیانهێننەوە سەر خەت و ڕێبازی حەق و نێو ڕیزو بەرەی ئیسلامەوە.

هەروەها لەسەر ئەهلی ئیمان و ئیسلامییەکانیش پێویستە، کە هەرچی لەتوانایاندا هەیە، بیخەنە گەڕ بۆ خۆچاککردن و ڕیزو کۆمەڵی خۆ لە ناشەرعیی و هەڵەو پەڵە بژارکردن، بۆ ئەوەی چاکتر (إقامة الحجة)یان بۆ لەسەر خەڵکی بکرێو، پەڵپ و بیانووی خەڵکیشیان چاکتر بۆ ببڕێ، هەرچەندە هیچ کاتێک هەڵەو کەموکوڕیی ئەهلی هەق، پاساوو بیانووی ڕەگەڵ (باطل) کەوتن و بەسەر پێی طاغووتدا کەوتن نیە.

ئێستاش کە لە خستنەڕووی حەوت دروشم و نیشانەی گرنگ و سەرەکیی بەرنامەی خوا بووینەوە، پاش خستنەڕووی پێنج تێبینی گرنگ، بەڵام زۆر بەکورتیی و گوشراویی، واز لە بەندی یەکەمی بەشی دووەم دێنین و، دەچینە سەروکاری بەندی دووەم.

## باسی سێیەم

## پێنج ڕاستیی گەورەو گرنگ لەبارەی ئیسلامەوە

### یەکەم/ ئایین بەتۆبزیی بەسەر کەسدا ناسەپێنرێ:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ﴾ (البقرة-٢٥٦)، واتە: تۆبزییکردن لە-وەرگرتنی- ئاییندا نیە، بێگومان ڕاست و هەڵە لێک جوێ بوو ونەوە.

بەڵێ بەرنامەی خوا، پێویستە لەسەر بنچینەی تێگەیشتن و شارەزایی و دڵنیایی وەربگیرێ و، بڕوای پێ بهێنرێ و، هیچ کاتێک بەرنامەی خوا لەلایەن مسوڵمانانی واقیعیی و ڕەسەنەوە بە کوتەک و بەزەبری شیرو تیر بەسەر کەسدا نەدراوە و، ئەو مسوڵمانانەش کە لەسەرەتای مێژووی ئیسلامەوە، بەناوی ئیسلامەوە دەستیان دایە چەک و بە وڵاتاندا بڵاوبوونەوە، ئەو چەکەیان بە مەبەستی خەڵک بەزۆر مسوڵمان کردن دەست نەدابۆیە، بەڵکو وەک مێژوو شایەدە ئەو چەک و هێز بەکارهێنانە بۆیە بووە، بەڵکو ئەو طاغووت و زۆردارە خۆبە پەرستراوزانانەی، گەلانی بێچارەو بێدەستەڵاتی خۆیانیان کردبۆ کۆیلە و دیل و ڕێی هەناسەدانیان لێگرتبوون، کۆشک و بارەگای ستەمکارییان بڕووخێنرێو بڕەتێنرێن، بۆ ئەوەی گەلانی نیر لەسەرشان و چرۆساو[1]، هیچ کۆسپ و لەمپەریان لەسەر ڕێیە نەمێنن و بتوانن ئازادانە بیر بکەنەوە، جا بڕوابێنن یان نا، ئنجاهیچ کاتێکیش

---

(١) چرۆساو: چەوساوە.

سوپای ئیسلام بەهیچ گەلێکیان نەگوتوە؛ یان مسوڵمان بن یان دەتانکوژین! بەڵکو هەموو جارێ ئەو گەلەی لەگەڵی ڕووبەڕوو بوونەوەوە، سێ ڕێیان بۆ داناون:

١- یان بڕواهێنان و مسوڵمان بوون.
٢- یان مانەوەیان لەسەر ئایینی خۆیان بە مەرجی سەرانە (جزیە)دان.
٣- یان ئامادەبوون بۆ جەنگ[١].

کەواتە؛ ئەوانەی کە دەڵێن: ئیسلامەتیی بە زەبری هێزو شیر بڵاوبۆتەوەو بەتۆبزیی بەسەر خەڵکیدا سەپێنراوە، یان مسوڵمانێکی سادەو نەفامن و لە سروشتی ئایینەکەیان و مێژووی بڵاوبوونەوەی بێهەواڵن، یان لەخشتەبراوو فریودراوێکی دەستی کوفرن و بەشیری گوانی دوژمنانی ئیسلام فرچک دراون، یان خوانەناسێکی بەفێڵ و شەیتانن و دەزانن ڕاستیی چۆنە، بەڵام خۆ بەسەرەوە نابەن و فێڵ لەخۆیان و لایەنگرانیان دەکەن[٢].

---

(١) بۆ وێنە بڕوانە: (البداية والنهاية) ب٤، ل٧، ل٤٠-٤١، ابن كثير، و بڕوانە: (تأريخ الأمم والملوك) أبو جعفر الطبري، ب٢، ل٥٥٤، و بڕوانە: (حياة الصحابة) ب١، ل٢٠٣، محمد يوسف كاندهلوي.

(٢) لە هەرکام لە نامیلکەکانی: (جیهاد لەڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەک) چاپی دووەم/١٩٩٩، و (پێشمەرگەی ئیسلام یان مسوڵمانی موجاهید) چاپی سێیەم/١٩٩٩دا، ئەو مەسەلەیەو چەند مەسەلەیەکی دیکەی گرنگی لەو بابەتە، ڕوون کراونەوە.
لەکتێبی: (هەڵوەشاندنەوەی پەرگیریی)یشدا، باسێکی پوختمان لەبارەی جەنگ و جیهادەوە کردوە، بڕوانە: چ٢/٢٠١٩ز.

## دووەم/ ئایین دژی پەرتەوازەیی و تاقم تاقمێنەیە:

خوای تاک و بێهاوەڵ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ... ﴿١٥٩﴾ ﴾ (الأنعام- ١٥٩).

واتە: بێگومان ئەوانەی کە-بەهۆی تاقم تاقمێنەوە- ئایینەکەیانیان پارچەپارچە کردوە، تۆ هیچ شتێکت لەگەڵ وان نیە، (واتە ئەوانە شوێنکەوتووی تۆ نین-ئەی پێغەمبەری خوا- و لەگەڵ تۆدا هیچ پەیوەندییەکیان نیە).

گومانی تێدا نیە کە ئەم ئایەتە ئاگادارکەرەوەو ترسێنەرێکی زۆر کاریگەرە بۆ ئەوانەی دەبنە هۆی تێکدانی ڕیزی مسوڵمانان و نەهێشتنی یەکیەتییان و، پەیداکردنی پێرو دەستەی پێکەوە دژو نەگونجاوو، وێک هەڵنەکەر، بگرە لێک خوێنەرو لێکدەر!!

چونکە بێ پێچ و پەنا دەفەرموێ: ئەو جۆرە کەسانە هیچ پەیوەندییان بە پێغەمبەری خواوە نیە، نەکەم نە زۆر!!

کەواتە؛ با هەرکەسێک بە تەنگ ئایینی خواو بەرژەوەندیی مسوڵمانان و دوارۆژی خۆیەوەیەتی، واز لەهەر جۆرە قسەو ڕەفتارێک بێنێ کە بە گومانی خۆی بۆ قازانجی ئیسلامیەتی، بەڵام ئەوەی کە بەوجۆرە قسەو ڕەفتارانە دەیڕووخێنێ، زۆر زیاترە لەوەی کە بەشێوەیەکی ڕاست یان هەڵە دروستی دەکات!

چونکە ئەوەی ئەو پێیەوە سەرگەرمە، ڕەنگە شتێکی سوننەت یان یەکێک بێ لە وردەبابەتەکان (جزئیات)ی ئیسلام، بەڵام ئەوەی بەوجۆرە قسەو ڕەفتارانەی زیانی پێدەگەیەنێ، بریتیە لە یەکیەتی (وحدة)ی مسوڵمانان

کە لەهەمـوو شـتێک گرنگتـرو لەپێشـترەو، بـە نەمانـی وی-خوانەخواسـتە-بوونـی بەرنامـەی خـوا، بـە وردو درشـتەوە دەکەوێتـە مەترسـیی لەنێوچوونـەوە.

جا سوپاس بۆ خوا لـە بەرهەمێکـی دیکەشدا، ئەم باسـەمان توێژیوەتـەوەو، زیاتـر لێـی دواویـن، بۆیـە خوێنـەر حەواڵـەی وێ دەکـەم.[1]

شـایانی باسیشـە لەکتێبـی دووەمـی مەوسـووعەی: (بریکردنـەوەی ئیسـلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا) بەنـاو و نیشـانی: (هێڵە گشـتییەکانی ڕێبـازی جەمـاوەری مسـوڵمانان) لێکۆڵینەوەیەکـی وردو قووڵمـان لەبـارەی ئـەو بنەمـا فیکریـی و ئیمانیـی و ئاکارییانـەوە کـردوە کـە پێویسـتە مسـوڵمانان لەدینداریيانـدا پێیانـەوە پابەندبـن.

---

(١) بڕوانە (لاباسێکی زۆر گرنگ) لە بەرگی یەکەمی کتێبی (یادی خودا) چاپی یەکەم، ساڵی ١٩٨٧، لاپەڕە (١٢٣ تا ١٣٤).

تێبینی: بەڵام شوێنی تەرخان و تایبەتی توێژینەوەی ئەو بابەتە کتێبی: (چەند ڕێڕوونییەک بـۆ ئیسـلامییەکانی کوردسـتان)ە، چاپـی یەکـەم ١٩٨٨، کـە پێـم وایـە ئەگـەر ڕێڕوونیـی و ئامۆژگارییەکانی ئەو کتێبە ڕەچاو بکرێـن، ئیسلامییەکانی کوردستان، زۆر لـەو وردە گرفت و کـرچ و کاڵییانـەی هەیانـن نامێنـن و، دەبنـە ڕیزێکـی پتـەوو تۆکمـەو پێکـەوە جۆشـدراو.

شایانی باسیشـە کتێبی ناوبراو حەوت بەشەو هەربەشێکیان لەدوو بنچینـەی گرنگ پێکهاتوە، جگە لە بەشی حەوتەم، کە ئەمانـەن:

بەشی یەکەم: چاکتر تێگەیشتنی ئایین و، باشتر ئاشنابوون بە ژین.

بەشی دووەم: برایەتی قووڵ و فراوان و، ڕیز لە بوون و کاری یەکترنان.

بەشی سێیەم: بەجێهێنانی مافی برا لەبەر خواو، نەبوونی دوو هەڵوێستی دژ بەیەک و جیا.

بەشی چوارەم: پێ لە کرچ و کاڵیی خۆنان و، دان بە فەزلاً و چاکەی یەکتردا هێنان.

بەشی پێنجەم: تاقە دینەمۆی ئیسلام گیانی بەرەنگاربوونەو، تەنها ڕێی حوکمڕانیش توانایی و دەستەڵاتدار بوونـە.

بەشـی شەشـەم: کۆمـەڵ و تەوژمـە ئیسـلامییەکان تەواوکـەری یەکتـرن و، لەهەمـوو کـەس لەیـەک نیزیکتـرن.

بەشـی حەوتـەم: پێکهێنانـی کۆڕێکـی راوێژی فـراوان، گرنگتریـن مەرجی برابـوون و یەکەمیـن هەنـگاوی یەکبوونـە.

**سێیەم: بەرنامەی خوا، بە غەریبی هاتووەو بەغەریبییش دەگەڕێتەوە:**

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ الإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ} (أخرجه مسلم برقم: ٣٩٠، عَنِ ابْنِ عُمَرَ).

واتە: بێگومان ئایین بە غەریبیی سەری هەڵداوە و هەروەک چۆن بە غەریبی هاتوە، کە دەشگەڕێتەوە (بۆ مەیدانی ژیان) هەر بە غەریبی دەگەڕێتەوە.

زۆر کەس بە هەڵە لەم فەرموودەیە حاڵی دەبن و پێیان وایە، مەبەستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەوەیە کە ئایین هەروەک چۆن کاتی خۆی بە غەریبیی هاتوە، ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش هەر غەریب دەبێتەوە!!

بەڵام ئەو جۆرە لێکدانەوەیە سەرەڕای ئەوەی کە لەگەڵ سروشتی گشتی بەرنامەی خواو چەندان ئایەت و فەرمووددا دژایەتیی و ناکۆکیی هەیە، هەڵەو ناتەواویشە؛ چونکە:

**یەکەم:** فەرموودەکە دەڵێ (وسیعود) نەک (وسیموت) هەڵبەتە (إعادة)ش گەڕانەوەیە بۆ ژیان و زیندووبوونەوە، نەک بۆ مردن و پووکانەوە.

**دووەم:** فەرموودەکە دەڵێ (کما بدأ) کەواتە ئەو گەڕانەوەیەش گەڕانەوەیە بۆ دەستپێکردنەوە، چونکە لەگەڵ (بدأ)دا بەراوردی پێکراوە، دیارە (بدأ)ش بۆ دەستپێکردنی ژیان و گەشەکردن بەکارهێنراوە.

**سێیەم:** وشەی (غریب)یش دوو واتای هەن، هەردووکیان لەگەڵ ئەو لێکدانەوەیەی ئێمەدا دەگونجێن؛ ١- غەریب واتە شتی ناوازەو سەیر، ٢- غەریب واتە دوور لە وڵات و گەل.[1]

---

(١) بڕوانە (معجم مفردات الفاظ القرآن) ل٣٧١ و بڕوانە: فەرهەنگی (المنجد) ل٥٤٧ چ٢٢.

جا بێگومان به‌رنامه‌ی خوا، هه‌م كه‌ یه‌كه‌م جار سه‌ری هه‌ڵداوه‌و هاتوه‌ و، هه‌م هه‌ركاتێكی دیكه‌ش كه‌ بویسترێ دوای گۆڕران و لادران (تغییر وتحریف) و گچكه‌كرانه‌وه‌و لێقرتێنران و كه‌چ و كرووچ كران و هه‌ڵپه‌ردێوران، وه‌ك خۆی و به‌شێوه‌یه‌كی ڕاسته‌قینه‌ ڕابگه‌یه‌ندرێته‌وه‌، دوای دوور خرانه‌وه‌ی له‌ مه‌یدانی ژیان و گوزه‌ران، بهێنرێته‌وه‌ مه‌یدانی ژیان، ئه‌وه‌ شتێكی سه‌یرو سه‌رسوڕهێنه‌رو بارپێوه‌نه‌گیراو بووه‌و ده‌بێ، له‌به‌رچاوی خه‌ڵكی.

كه‌سێكیش كه‌ بیه‌وێ ڕێوشوێنی كوژێنراوه‌و تێكدراوی پێغه‌مبه‌ری خوا(صلى الله عليه وسلم) زیندوو بكاته‌وه‌، هه‌روه‌ك چۆن كاتی خۆی هاوه‌ڵه‌كانی پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) خوا لێیان ڕازی بێ، له‌نێو خه‌ڵكی ڕۆژگاری خۆیاندا، وه‌ك بابایه‌كی نه‌ناسراوو دوور له‌ گه‌ل و نیشتمان بوون، ئه‌و كه‌سه‌ش وه‌ك غه‌ریب و نه‌ناسراوو نه‌گونجاو دێته‌ به‌رچاوی خه‌ڵكی ڕۆژگاری خۆی.

به‌ڵام گرنگ نیه‌؛ چونكه‌ به‌ختیاریی و سه‌ربه‌رزیی و بردنه‌وه‌، به‌س له‌ گره‌وی وان دایه‌و، په‌روه‌ردگاریان خوایه‌و، پێغه‌مبه‌ریان پێشه‌وایه‌!!

## چوارەم: ئەو کۆمەڵەی بەرنامەی خوایان پێ بەڕێوە دەچێ:

وەک لە ڕاستیی سێیەمدا گوتمان: بەرنامەی خوا کە لەسەرەتاوە هاتوە، خەڵکی لەبەرچاویان سەیرو نەناسراوو، شوێنکەوتووانیشی وەک بابای دوور لە گەل و نیشتمان هاتوونە بەر چاوی خەڵکی و، گوتمان: بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەر کاتێکی دیکەش بویسترێ بەرنامەی خوا وەک خۆی ڕابگەیەنرێتەوەو بگێڕرێتەوە بۆ مەیدانی ژیان، هەم بۆخۆی وەک شتێکی سەیرو نامۆو سەرسوڕهێن تەماشا دەکرێ و، هەم ئەوانەی کە مشووری هێنانەوەو گێڕانەوەی دەخۆن، وەک بابایەکی سەیرو نەناسراوو بیانیی دێنە بەرچاوی خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان.

بەڵام وەک گوتمان مادام ئەو غەریبانە مزگێنی ژیانی نەبڕاوەو پڕ لە خۆشی و بەختیاریی بەهەشتی ڕازاوەو ڕەنگینیان لەلایەن پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) پێدراوە، هیچ پێیان گرنگ نیە، هەرچۆنێکی بێنە بەرچاوی خەڵکی.

لەم ڕاستیەشدا گرنگترین و سەرەکیترین خەسڵەتەکانی ئەو کۆمەڵە ئینسانە غەریبە بەکورتی باس دەکەین، تاکو بزانین داخۆ ئەو کۆمەڵەی خوا بۆ ژیاندنەوەو چاککردنەوەی ڕێوشوێنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و گێڕانەوەو هێنانەوەی بەرنامەکەی هەڵیان دەبژێرێ کێن و چۆنن؟!

خوای زاناو وردبین لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ ﴾ (المائدة-٥٤).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکەسێک لەئێوە لە ئایینەکەی هەڵگەڕێتەوە، ئەوە خوا کۆمەڵێکی وا دێنێ (بۆ ژیاندنەوەو گێڕانەوەی بەرنامەکەی) کە خۆشی دەوێن و خۆشیان دەوێ، لەگەڵ بڕواداران نەرم و نیان و گەردن کەچن، لەسەر کافران ڕەق و بەدەمارن، لەڕێی خوادا تێدەکۆشن و، لە گلەیی و لۆمەی هیچ لۆمەکەرێک ناترسن، ئەوەش بەخششی خوایە دەیدا بە هەرکەسێک کە حەز بکات و، خودا (دەستەڵات) فراوانی زانایە.

وەک لەم ئایەتە بەهێزو پێزەدا دەردەکەوێ، جاری وا دەبێ کەسانێک کە خۆیان بە شوێنکەوتووی بەرنامەی خوا دەزانن، لێی هەڵدەگەڕێنەوەو وازی لێ دێنن، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەم بەرنامەی ئیسلامە دوایین بەرنامەو ڕێڕوونی خوایە بۆ مرۆڤ و، دوایین تیشکی ڕێڕوونکەرەوەی ئاسمانە بۆ دانیشتوانی سەر زەوی، خوای میهرەبان و لێزان لێناگەڕێ یەکجاریی بکووژێتەوەو، بەهۆی لادان و وەرگەڕانی (پشت)ێک لە شوێنکەوتووانی، شوێنەواری کوێر بێتەوەو بەسەر بچێ، بۆیە خوای کاربەجێ و دەستەڵات فراوان، لە هەموو چاخ و ڕۆژگارو لەهەر سەرە سەدەیەکدا، بەهۆی ڕەخساندن و پەیداکردنی خواناسێکی زاناو پارێزکارو تێکۆشەرەوە، کۆمەڵێک لەنێو مسوڵماناندا پەیدا دەکات و ساز دەکات، کە ببنە مایەی ژیاندنەوەی بەرنامەی خواو، گێڕانەوەی خۆشەویستیی و سام و ڕێزی بۆ نێو دڵ و دەروونی خەڵکی و، گێڕانەوەی تێڕوانین و بیروبۆچوونەکانی بۆ نێو بیرو هۆشیان و، گێڕانەوەی یاساو دەستوورەکانی، بۆ نێوجەرگەو مەیدانی ژیان و گوزەرانیان، وەک پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە فەرموویەتی: {إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا} (أخرجه أبو داود برقم: ٤٢٩١، والطبراني في الأوسط برقم ٦٥٢٧، والحاكم برقم ٨٥٩٢)، والديلمي برقم: ٥٣٢، قال المناوي (٢٨٢/٢) : قال الزين العراقي وغيره: سنده صحيح).

واتە: بێگومان خوا لەسەری هەر سەد ساڵێکدا، کەسێک (یان کۆمەڵێک، چونکە (مَنْ) بۆ تاک و کۆیە بۆ ئەم ئۆممەتە دەنێرێ، کە ئایینەکەی بۆ نوێ دەکاتەوە.

ئنجا ئەو کۆمەڵەی کە خوای بەرزو مەزن ئەرکی ژیاندنەوەی بەرنامەکەییان پێ دەسپێرێ و، بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە هەڵیان دەبژێرێ، پێویستە خاوەنی ئەم شەش خەسڵەتە بنەڕەتیی و سەرەکییە بن:

**یەکەم:** خوا خۆشی بوێن (يُحبهم).

**دووەم:** خوایان خۆش بوێ (ويُحبونه).

**سێیەم:** لەگەڵ بڕواداران نەرم و نیان و خۆبەکەم گرو گەردن کەچ بن (أذلة على المؤمنين).

**چوارەم:** لەسەر کافران (لەکاتی بەرەنگاربوونەوەو جەنگدا) ڕەق و تونددو نەفس بەرزو بەدەمار بن (أعِزَّةٍ على الكافرين).

**پێنجەم:** بە دڵ و زمان و دەست و سامان لەڕێی خوادا تێبکۆشن (يجاهدون في سبيل الله).

**شەشەم:** لە گلەیی و تانەو تەشەری لۆمەکارو گازندەکەران نەترسن (ولا يخافون لومة لائم).

هەڵبەتە توێژینەوەی ئەم خەسڵەتانەو شیکردنەوەیان، هەویرێکی ئاوخوازەو حەوجێی باسێکی تەرخان و سەربەخۆیە.

## پێنجـەم/ چۆن و لەکوێـوە دەست پێبکەیـن؟

کەسێک هەر لە ئەلیف و بێی بەرنامەی خوا ئاشنا بێو، سەرەدەرێک لە قورئـان و سوننەت بـکات، زۆر چاک دەزانێ کە بەرنامەی خوا لـەم سەردەم و رۆژگارەدا، تا چ رادەیـەک دەستی پەستی گۆڕیـن و لادان (تغییر وتحریف)ی کۆلکە زانایانی بەناو پێشەوای دینفرۆش[1] و زرە شێخانی دڵنەخۆش[2]، لەبیرو هۆشی خەڵکیدا گچکەی کردۆتەوەو، لەبەرچاویان نابووت و ناقۆڵای کردوە[3]، هەست دەکات تا چ ڕادەیەک لەسایەی سەری گاڵتە بەئایین کەران و بازرگانیی بەئایین کەرانەوە، کوفرو طاغووت بەرنامەی خوایان لە مەیدانی ژیان و گوزەران دوور خستۆتەوەو، تەنگیان پێ هەڵچنیوەو فززەیان لێ بڕیوە!!

---

(١) وەک چەندان جاری دیکە گوتوومانە: زوڵم و ستەمە کە زانـاو میراتگری ڕەسەنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە هیچ رۆژگارو کۆمەڵێک لێیان خاڵیی نابێت، لەگەڵ دینفرۆشانی بە ڕواڵەت زاناو بەناو پێشەوا، وەک یەک تەماشا بکرێن! بۆیە ئێمە بە وەسف و پێناسەی (کۆلکەمەلا) و (دینفرۆش) پێناسەی ئەو جۆرە کەسانە دەکەین کە (أبو حامد الغزالي) لە (إحياء علوم الدين)ەکەیدا بە (علماء السوء) ناویان دەبات، وەک چۆن زانایانی رەسەن بە (علماء الآخرة) ناو دێنێ. شایانی باسیشە لە زنجیرە دەرسەکانی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا، هەڵوێستی ڕاست و شەرعییانەمان لەبەرانبەر زانایاندا خستۆتە ڕوو. بڕوانە بەرگی شەشەم.

(٢) جگە لە کتێبی (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەوخوا چوون)، یەکێک لە دەرسەکانی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یشمان بۆ هەڵسەنگاندنی تەزکیەی نەفس و ڕێبازەکانی تەصەووف تەرخان کردوە. بڕوانە بەرگی شەشەم، دەرسی پەنجایەمین.
هەروەها لەکتێبی: (گیانی ژیان)و کتێبی پێنجەمی مەوسووعەی (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا)شدا قسەمان لەو بابەتە کردوە.

(٣) لەڕاستییدا وشەکانی: (بەناو پێشەوای دینفرۆش و، زرەشێخی دڵنەخۆش) هەرکەسێکم پێ مەبەست بوون، کە لەبەرگی دیندا دنیا دەخۆن، بەهەر ناو و نیشانێکەوە بن و سەربە هەر ڕەوشت و مەشرەبێک بن: سۆفیگەریی، وەهابیگەریی (سەلەفیی)...هتد.

ئنجا هەر مسوڵمانێکی بە پەرۆش کە ئەمە دەزانێ، حەتمەن بیرو داڵغەی نوێکردنەوەی بەرنامەی خواو گۆڕینی واقیع و لابردنی ڕژێمی طاغووتیی و نەفامیی بەمێشکدا دێ و، نیازو مەبەستی چاککردنەوەی ڕێوشوێنی ونکراوو شێوێنراوی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)ی لەدڵدا پەیدا دەبێ.

بەڵام ڕەنگە بپرسێ؛ باشە چۆن و لە کوێوە دەست پێبکەین؟!

ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین:

خوای وەڵامگۆ فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ (الأحزاب-٢١).

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقیی و پێشڕەوایەتییەکی چاک هەیە بۆ ئێوە، بۆ هەرکەسێک کە بەتەمای (پاداشتی) خواو ڕۆژی دواییە و، زۆر یادی خوا دەکات.

بەڵی پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) سەرمەشق و پێشڕەوی ئێمەی بڕوادارە، نەک هەر لە بواری بەڕێوەبردنی پێنج دروشمەکاندا، بەڵکو لە هەموو لایەنێکی ژیان و، لە هەموو بوارێکی بەرنامەی خوادا، چونکە خوای کاربەجێ هەر ئایین و بەرنامەیەکی ناردبێ بە پێغەمبەرێکی ئینساندا ناردوویەتی و، بۆ ئەوەی بەرنامەی خوا بەس مەرەکەبی سەر قاقەز نەبێ، ئەو پێغەمبەرە بەرنامەی خوای لە ژیانیدا بەهۆی کردەوەو ئاکارەکانیەوە لە قاڵبێکی واقیعی و زیندوو و بەرهەستدا خستۆتە بەرچاوی خەڵکی.

ئنجا پێغەمبەری نەخێندەواریش (صلی اللە علیە وسلم) کە هەڵگری مەشخەڵی دوایین بەرنامەو پەیڕەوی خوایە بۆ بەندەکانی، وردو درشتی ئەو بەرنامەیەی بە دێڕی روونی کردەوەو ئاکارو هەڵوێستەکانی، وەک واقیعێکی دیتراوو زیندوو خستۆتە ڕوو، تاکو لەدوای خۆی زاناو پێشەوا میراتگرە ڕاست و ڕەسەنەکانی، لە شێوازو چۆنیەتی زیندووکردنەوەو گێڕانەوەی

ڕێوشوێن و بەرنامەکەیدا بەهەڵەدا نەچن و، وێڕای بەرنامەی خوایی، ڕێبازی خوایی بەڕێوەبردنی ئەو بەرنامەیەشیان لەبەردەست دابێ، شایانی گوتنیشە:

هەرگیز زەمین لە کۆمەڵە زاناو پێشەوایەکی راشتەقینەی جێگرو میراتگری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خاڵی نابێ، وەک پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {لا تَـزَالُ طَائِفَـةٌ مِـنْ أُمَّتِـي قَائِمَـةً بِأَمْـرِ اللـهِ لا يَضُرُّهُـمْ مَـنْ خَذَلَهُـمْ وَلا مَـنْ خَالَفَهُـمْ حَتَّـى يَـأْتِيَ أَمْـرُ اللـهِ وَهُـمْ ظَاهِـرُونَ عَـلَى النَّـاسِ} (أخرجه أحمد برقم: ١٦٩٧٤، والبخاري برقم: ٣٤٤٢، ومسلم: برقم ١٠٣٧)، واتە: بەردەوام کۆمەڵێک لە ئۆممەتم بە بەڕێوەبردنی بەرنامەی خوا هەڵدەستن، نە کەسێک کە پشتیان بەردەداو، نەکەسێک کە دژیان دەوەستێ، زیانیان پێ ناگەیەنن (واتە ناتوانن لەسەر ڕێبازی راستیان لایدەن) هەتا فەرمانی خوا دێ-بۆ تێکدانی دنیا- و ئەوان لەو حاڵەدا بەسەر خەڵکیدا زاڵ و سەرکەوتوون.

ئنجا بێگومان شێوازو چۆنیەتی ئایین بەڕێوەبردنی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) وەک لە مێژوو و بەسەرهاتی ژیانیدا دەردەکەوێ ئاوا بووە:

لە سەرەتاوە سێزدە (١٣) ساڵی پێغەمبەرایەتیی، سەرگەرمی ڕوونکردنەوەو راگەیاندنی بناغەو بنچینەو هێڵەسەرەکیی و گشتییەکانی بەرنامەی خوا بوو، هەتا لە ئەنجامی ئەو سێزدەساڵەدا، لەلایەکەوە: زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی دەوروبەری بە کاکڵ و مەبەست و ئامانجی بانگەوازەکەی ئاشنا بوون و، خەڵکی زانی چ دەڵێو چی مەبەستە!!

لەلایەکی دیکەشەوە: کۆمەڵە هاوەڵێکی پەروەردە کردن و پێگەیاند، کە هەریەکەیان جێگرو میراتگرێکی ڕەسەنی پێغەمبەرو، قورئانێکی واقیعی و زیندوو بوو، لە خواپەرستیی و ڕەوشت بەرزیی و خۆڕاگریی و دنیا بەکەمگریی و ئازایەتیی و ژیریی و بیرفراوانیی و زانایی و.... هتددا.

ئنجا کە زانی خەڵکی بەگشتی لە بەرنامەکەی گەیشتوون و، ئەو کۆمەڵە هاوەڵەی شوێنی کەوتوون، تا ڕاددەیەکی چاک پەروەردەکراون و پاڵێوراون و بۆ قۆناغی تێکۆشانی چەکدارانەو جەنگ و غەزا ئامادە بوون، بە فەرمانی خوا، شاری مەککەی بەجێهێشت و، خۆی و هاوەڵانی بەرەو شاری مەدینە وەڕێ کەوتن و، هەتا کاتێک کە خۆیان داکوتاو نیشتەجێ بوون، وردەوردە بەئەندازەی بڕست و هێزیان، دەگژ دوژمنانی خوا ڕاچوون و لەگەڵیان دەستەو یەخە بوون..

ئنجا ئەو شێوازو چۆنیەتییەی پێغەمبەریش (صلی اللە علیە وسلم) سەرباری ئەوەی کە بەئایەتی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ لەسەرمان پێویست دەبێ، بەم ئایەتە بەپێزەش بێپێچ و پەنا، ڕەچاوکردنی دەبێتە فەرزو، پێویستە وەک بنچینەیەکی گرنگی تێکۆشانی ئیسلامیی تەماشا بکرێ:

خوای پەنهانزان و شارەزا فەرموویەتی: ﴿ ...إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ... ﴾ (الرعد-١١).

واتە: بێگومان خوا ئەو حاڵە ناهەموارە کە گەلێک تووشی بووە، نایگۆڕێ، هەتا ئەوەی کە دەروونیان گیرۆدەی بووە نەیگۆڕن.

لەم ئایەتەوە بەڕوونیی دەردەکەوێ کە هەموو دەمێ گۆڕان و چاکبوونی حاڵ وباڵ و بارودۆخی گەل، ئەنجام و بەرهەمی گۆڕان و چاکبوونی دەروونیانە.

ئنجا مەبەستیش لە گۆڕان و چاکبوونی دەروون دوو شتە:

**یەکەم:** وەرگرتنی بیروبڕواو زانیاریی ڕاست، دەربارەی خواو پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) و بەرنامەی خواو ڕێوشوێنی پێغەمبەری خوا، ئەم قۆناغەش لە زاراوی قورئاندا پێی دەگوترێ (فێرکردن- التعلیم).

**دووەم:** ئیشکردن بەو زانیاریی و شارەزاییەی کە لە قۆناغی یەکەمدا وەرگیراوە و هەوڵدان بۆ پاککردنەوەی دەروون لە سیفەت و ئاکارە بەدە ئاژەڵیی و شەیتانییەکان و، ڕازاندنەوەی بە سیفەت و ئاکارە پەسندە خوایی و فریشتەییەکان، ئەم قۆناغەش لە زاراوی قورئاندا پێی دەگوترێ: (پاککردنەوە و گەشەپێدان- التزکیة)[1].

ئنجا ئەم ئایەتە هەردووک قۆناغەکەی کۆکردوونەوە، بە ئامانج و مەبەستی نێررانی پێغەمبەریشی (صلى الله عليه وسلم) لەقەڵەم داون:

﴿ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ ﴾ (البقرة- ١٢٩).

واتە: ئیبراهیم و ئیسماعیل گوتیان: پەروەردگارمان! پێغەمبەرێکیان تێدا بنێرە، ئایەتەکانتیان بەسەردا بخوێنێتەوە و بەرنامە و لێزانییان فێربکات و تەزکییەیان بکات، بەڕاستیی هەر تۆی زاڵی کاربەجێ.

ئاشکراشە زۆربەی لە توێژەرەوانی قورئان: (الکتاب والحکمة)یان بە قورئان و سوننەت داناون! بەڵام ئەو ڕایە بێهێزە، چونکە پێشتر باسی خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان کراوە؛ (يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِك)، وشەی (حکمة) یش لە قورئاندا ناگونجێ بە سوننەت تەفسیر بکرێ، بۆ وێنە [ولقد آتينا لقمان الحكمة](لقمان-١٢)، و [ومن يؤت الحكمة فقد أوتي خيراً كثيراً] (البقرة- ٢٦٩)، هیچیان ناگونجێ بە سوننەت تەفسیر بکرێن، بەڵکو وەک ئێمە نووسیومانە مەبەست لە (کتاب) ئەو دەستوورو یاساو بنچینانەن، کە لە وەحیی خوا هەڵدەهێنجرێن و، مەبەست لە (حکمة)یش لێزانیی و وەستایی و

---

(١) وشەی (تزکیة) هەرکام لە پاکبوونەوەو گەشەکردن و چاکبوون (الطهارة والنمو والصّلاح) دەگەیەنێ، (المعجم الوسيط: ل٥٩٤) ئەوەی کە لە زاراوی ئەهلی عیرفاندا پێی دەڵێن (التخلية والتحلية) لە کتێبی (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)دا بەدرێژی باسی ئەم مەسەلەیەمان کردوە.

کارامەییە بۆ پیادەکردن و چەسپاندنی ئەو یاساو بنچینەو دەستوورانە لە واقیعی ژیانی و کۆمەڵگادا، کەواتە [يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ] و [وَيُزَكِّيهِمْ] بۆ حاڵەتی تێگەیاندن و پێگەیاندنی تاکەکان و [وَيُعَلِّمُهُمْ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ]ش بۆ چۆنیەتی ئیدارەو بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی کۆمەڵگاو ژیان و گوزەرانیەتی.

بەڵێ یەکەمین قۆناغی دەستپێکردنی شۆڕش و تێکۆشان لەپێناوی خوادا، بۆ ژیاندنەوەی ڕێوشوێنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و گێڕانەوەی حوکمی خوا، بریتیە لە گۆڕین و چاککردنی بیروهۆش و دڵ و دەروونی خەڵکی بەگشتی و، بەتایبەتی ئەو کۆمەڵەی کە وای لێ چاوەڕوان دەکرێ، ببێتە پێشەنگ و سەرقافڵەی شۆڕشی بڕوا.

هەر بۆیەش لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) گێڕراوەتەوە کە لەیەکێک لە جەنگەکان گەڕایەوە فەرموویەتی: ((و قَدِمْنا من الجهاد الأصغر إلى الجهاد الأكبر، قالوا وما الجهاد الأكبر؟ قال: مجاهدة العبد هواه))[1]، واتە:... لەجەنگی گچکەترڕا هاتینەوە بۆ جەنگی گەورەتر، گوتیان: جەنگی گەورەتر چییە؟ گوتی: جەنگکردنی بەندەیە لەگەڵ ئارەزووەکان-یدا.

بەڵێ پێویستە کۆمەڵی مسوڵمان پێش ئەوەی دەست بە جەنگیی دەرەکی (الجهاد الخارجي) بکەن و یەخە بەطاغووت بگرن، جەنگی نێوخۆیی (الجهاد الداخلي) لەگەڵ بیروهۆش و دڵ و دەروونی خۆیاندا بکەن و، بەرۆکی شەیتان بگرن و لەشاری دڵ و مێشکیان وەدەری بنێن؛ چونکە بەدەردی عارەب دەڵێ: (فاقد الشيء لا يعطيه) کەسێک شتێک شک نەبات پێی نابەخشرێ و، مەحاڵە بابایەک نەتوانێ دڵ و سینەی خۆی کە بستێکە[2] بە بستێک، لەژێر ڕکێفی شەیتان دەرێنێ، بتوانێ وڵات و نیشتمانەکەی، کە چەندان فەرسەخە بە چەندان فەرسەخ، لەژێر نیری طاغووت قوتار بکات، چونکە کەسێک بەخۆی نەوێرێ، هەرگیز بەغەیری خۆی ناوێرێ.

---

(١) أخرجه البيهقي في الزهد برقم: ٣٧٣، وقال: هذا فيه ضعف.

(٢) بە عەرەبیی دەگوترێ: شِبْرٌ بِشِبْرٍ.

بەڵام لێرەدا لەبارەی قۆناغی پەروەردەو فێرکردن و خۆپاککردن و چاککردنەوە دوو سەرنجی گرنگ دەخەینەڕوو:

**یەکەم:** ئێمە کە دەڵێین: قۆناغی یەکەم دەبێ بریتی بێ لە فێرکردن و پەروەردە، مانای وا نیە کە هەتا دنیا دەبڕێتەوە هەر لەو قۆناغەدا بمێنینەوە؛ چونکە ئەوە پێچەوانەی سروشتی ئیسلام و دژی چۆنیەتی کارکردنی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم).

**دووەم:** کە دەڵێین: جەنگی دەروونیی و پاککردنەوەی نەفس لە خەسڵەتە بەدەکان (الرذائل)و ڕازاندنەوەی بە خەسڵەتە پەسندەکان (الفضائل)، پێویستە قۆناغی یەکەم بێ و، بە جەنگی گەورەتر دابنرێ، مانای وا نیە، کە چەمکی بەرفراوانی تێکۆشانی ئیسلامیی (الجهاد الاسلامي) لە جوغزی ئەو خۆ پاککردنەوەو خۆ ساف کردنەوەیەدا کورت هەڵبێنین، چونکە ئەم جۆرە تێڕوانین و ڕەفتارە، دژی قورئان و سوننەتەو، پێچەوانەی واقیعی ژیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و جۆرو چۆنیەتی تێکۆشانیشیەتی.

ئنجا لە خوای میهرەبان داواکارم کە بەرەو تێکۆشانێکی ئیسلامییانەی ڕاست و بەپێی ڕێوشوێنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێڕوونییمان بکات و، دەستمان بگرێ و، بمانگێڕێ بە کۆمەڵێک کە بەرنامەی خۆییان پێ دەگێڕێتەوە مەیدانی ژیان و، ڕێوشوێنی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) پێ چاک دەکاتەوە.. ئامین.

لێرەشدا کۆتایی بە بەندی یەکەمی ئەم بەشە دێنین و، دەچینە سەر بەندی دووەم.




# ئایین چۆن پەیدا بووە ؟!

## دەستپێك

خوێنەری بەڕێز!

هەرچەندە دوای وەڵامدانەوەی پرسیاری یەکەم (ئایین چییە؟!) حەوجێ بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ناکات و، لە بەندی یەکەمدا وێڕای خستنەڕووی چیەتی (ماهیة)و نێوەڕۆکی ئایین، چۆنیەتی پەیدابوونیشی خراوەتە ڕوو، بەڵام لەپێناوی پتر ڕوونبوونەوەی مەبەستدا لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە بە مەبەستی خستنەڕوو و هەڵسەنگاندن و پووچاندنەوەی ئەو بیردۆزەو بیروبۆچوونانەی کە هەڵگرانی دروشمی بێبڕوایی و دژئایینی، بە مەبەستی تەفسیرکردنی پەیدابوونی دیاردەی ئایین دۆستیی و خواپەرستیی، پەنایان دەبەنە بەرێ، بە پێویستم زانی ئەم بەندەش تەرخان بکەم بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری ناوبراو.

ئنجا ئێمە، خوا (جل جلاله) پشتیوان بێ، لە دوو باساندا وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەینەوە؛ لە یەکەمیاندا بەکورتیی تێڕوانین و هەڵوێستی خودی ئایین لەو بارەوە دەخەینە ڕوو و، لە دووەمیاندا یەک بەیەک بەو بیردۆزەو بیروبۆچوونانەدا دەچینە خوار کە دژ ئایین و لاڕێبووان، بەخەیاڵی کاڵی خۆیان، چۆنیەتی پەیدابوونی ئایین و خواپەرستییان پێ تەفسیر دەکەن، پاش خستنەڕووی هەرکام لەو بیردۆزە پووچانەش، ڕەخنەو هەڵسەنگاندنی خۆشمان دەخەینە ڕوو.

باسی یەکەم

## وەڵامی بەرنامەی خوا، بۆ پرسیاری
## ئایین چۆن پەیدا بووە ؟!

وەڵامی ئایین و بەرنامەی خوا بۆ پرسیاری (ئایین چۆن پەیدا بووە؟!) ئەوەیە کە ئایین بەرنامەو پەیڕەوو ڕێڕوونیی خوای پەروەردگاری میهرەبان و بەبەزەییە، بەچەند ئینسانێکی یەکجار پەسندو هەڵبژاردەو لێهاتوودا بۆ مرۆڤایەتیی ناردوە، لەهەر چاخ و سەردەمێکدا بەپێی ئاستی ژیانی مرۆڤەکان، بۆئەوەی دووچاری دەردی خۆدۆڕاندن و خۆ لەلا گچکەبوونەوە نەبن و، گیرۆدەی داوی خۆپەرستیی و بتپەرستیی و کۆیلایەتیی نەبن و، بەهۆی لەخوا دوورکەوتنەوەوە، وەک مەڕی بێ شوان، هەر سەرەی بەدەم گورگ و طاغووتێکەوە نەچێ!!

ئنجا ئایین بەرنامەی سەرلەبەری ژیانەو، لەلایەنێک و دووانداکورت هەڵنەهاتوەو، لە هەموو وردو درشتی ژیاندا ڕێڕوونیی ئینسان دەکات، بۆ نواندنی تاقە هەڵوێستی ڕاست لە ئاقار خۆی و خواو خەڵک و بوونەوەرو ژیاندا.

خوای بێوێنەو هاوەڵ لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ ۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ﴾ (الشورى-١٣).

واتە:-خوا- ئەوەی بۆی بڕیارداون لە ئایین، هەمان بەرنامەیە کە نووحی پێ ڕاسپاردبوو، هەروەها ئەوەیە کە بە تۆمان ڕاگەیاندووە، ئەوەیە کە ئیبراهیم و مووساو عیسامان پێ ڕاسپاردبوون.

دیسان خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٦٥﴾ ﴾ (النساء ١٦٣-١٦٥).

واتە: ئێمە پەیاممان بۆ لای تۆ نارد، هەروەک چۆن پەیاممان بۆ لای نووح و پێغەمبەرانی دوای وی نارد، هەروەها پەیاممان بۆ لای ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و ئەو تیرانەی[1] کە لێی وەپاش کەوتبوون و عیساو ئەیووب و یونوس و هاروون و سولەیمان ناردو، زەبوورمان دا بە داوودو، پێغەمبەرانێکمان ناردوون لەپێش تۆدا کە بۆمان باس کردووی، وە پێغەمبەرانێک کە بۆمان باس نەکردووی و، خوا قسەی لەگەڵ مووسادا کرد، ئەو پێغەمبەرانەمان ناردن مژدەدەرو ترسێنەر بوون، بۆئەوەی لەدوای هاتنی پێغەمبەران، خەڵکی هیچ بەڵگەیەکیان نەمێنێ لەسەر خواو، خوا زاڵی کاربەجێیە.

---

(١) (أسباط) کۆی (سبط)ە، (سِبط)یش کوڕی کوڕە (ولد الولد)، و (سِبط) واتە: تیرە، هەر تیرەیە وەچەی پیاوێکە. (معجم مفردات الفاظ القرآن) ل٢٢٧. (یەعقوب (علیه السلام) دوازدە کوڕی هەبوو ون، هەر کوڕە تیرەیەکی لێ وەپاش کەوتوە، بەهەر دوازدە تیرەکە گوتراوە: (أسباط).

وه‌ک له‌م ئایه‌تانه‌دا ده‌بینرێ، ئایین بریتیه له‌و په‌یام و به‌رنامه‌و رێڕوونیی و ئامۆژگارییه‌ی، که‌ خوای زاناو توانا بۆ پێغه‌مبه‌رانی (علیهم الصلاة والسلام) ناردوه‌، به‌ مه‌به‌ستی ئه‌وه‌ی: خه‌ڵکی سه‌رزه‌وی هیچ بڕوبه‌هانه‌یان به‌ده‌سته‌وه‌ نه‌مێنن له‌ ئاقار خواداو، هیچ بیانوویان نه‌بن، بۆ په‌نابردنه‌ به‌ر شه‌یتان و بت و طاغووته‌کان.

که‌واته‌؛ سه‌رچاوه‌ی ئایین خوایه‌و، سه‌ره‌تای په‌یدابوونیشی ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ سه‌ره‌تای نیشته‌جێبوونی ئینسان له‌سه‌ر زه‌وی؛ چونکه‌ هه‌ر له‌ به‌ره‌به‌یانی مێژووه‌وه‌، خوا مرۆڤایه‌تیی فه‌رامۆش نه‌کردوه‌و، له‌تیشکی رێڕوونیی خۆی بێبه‌شی نه‌کردوه‌، به‌ پێغه‌مبه‌راندا به‌رنامه‌ی ژیانی بۆ ناردوه‌.

ئه‌مه‌ به‌کورتیی و پوختیی، وه‌ڵامی ئایین بوو ده‌رباره‌ی پرسیاری گۆرین.

ئنجا با بچینه‌ سه‌روکاری بیردۆزه‌ پووچ و قسه‌و وڕێنه‌ بێکاکڵه‌کانی بێبڕواو خوانه‌ناسان، له‌باره‌ی چۆنیه‌تی سه‌رهه‌ڵدان و په‌یدابوونی ئایین و بیری خواپه‌رستییه‌وه‌، پاشان هه‌ڵسه‌نگاندن و له‌بێژنگدانیان و له‌ مه‌حه‌کی عه‌قڵ و زانست دانی هه‌موانیان و، ده‌رخستنی پووچه‌ڵیی و قرپۆکییان و سه‌لماندنی ئه‌فسانه‌ییان.

باسـی دووەم

## وەڵامی ڕێچکەو بیردۆزەکان

بەپێویستم زانی بەرلەوەی بچینە سەر وڕێنەو قسە بزڕکێنراوەکانی دژئایینان و دژخوایان، دوو تێبینییان بخەمە ڕوو:

**یەکەم:** هەڵوێستی هیچ کام لە ڕێچکەو بیردۆزەکان، لە ئاقار چۆنیەتی پەیدابوونی ئاییندا، لەگەڵ هەڵوێستی ئایین و بەرنامەی خوادا تێک ناکاتەوە، چونکە ئەوان پێش ئەوەی دەست بە لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە بکەن، مەسەلەی پەیدابوونی ئایینیان لەو سەرچاوەیەوە کە بڕواداران دیاریی دەکەن، بە شتێکی هەڵەو نەگونجاوو حەوجێی (بیر لێکردنەوە نەبوو) لەقەڵەم داوە واتە؛ بەرلەوەی بەشێوەیەکی واقیعییانە دەست بە تێوەڕامان و توێژینەوە بکەن، ئەو قەناعەتەیان لەخۆیان کردۆتە لغاو، کە گوایە ئایین دیاردەیەکە هیچ پەیوەندیی و خزمایەتییەکی لەگەڵ جیهانێکی نادیاری واقیعیدا نیە!

ئنجا گومانیشی تێدا نیە کە بڕواهێنان و قەناعەتی پێش بیرکردنەوە، لغاوێکی بەدو پیس و نەگریسەو، نایەڵێ ئینسان بگاتە دۆزینەوەی ڕاستیی و، ئەگەر گریمان دۆزیشیەوە، ڕێی پێ لێنانی نادات!!

**دووەم:** دژ ئایینان چونکە بەهۆی بڕوابوونیان بەس بەدیاردە بەرهەستەکانەوە، ڕێی ئەوەیان لەخۆیان گرتوە کە پەی بە سەرچاوەی

واقیعی ئایین بەرن، هەر لە یەکەمین شەقاوەوە[١] تووشی چۆرتمێ[٢] بوون و سەرنگرێ[٣] بوون!!

با بزانین چۆن؟!

ئەوانە دیتوویانە خەڵکێکی زۆرو زەوەند خواناس و ئایین دۆستە، لێرەدا واقیع ناچاری کردوون تەفسیرێک هەر بخەنە ڕوو بۆ چۆنیەتی پەیدابوونی ئایین، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە دەلاقەی گچکەو تەسکی بێبڕوایی و ماددەپەرستییەوە سەیری شتان دەکەن، ناچار بوو ون کە سەرچاوەیەکی ماددیی بۆ پەیدابونی ئایین دیاری بکەن، ئنجا چاکترین و نیزیکترین سەرچاوەی گونجاویش بۆ ئەو مەبەستە، مرۆڤ بووە؛ بۆیە بە ناچاری ویستوویانە هۆی پەیدابوونی ئایین هەر لەخودی مرۆڤدا بدۆزنەوە، پێشینانیش گوتوویانە: (هەرکەسە لە هەمبانەی خۆیدا گوێز دەژمێرێ).

بەڵگەش بۆ ڕاستیی ئەم قسەیەمان، ئەوەیە کە سەرجەمی ئەو ڕاو بیردۆزانەی پێشنیاریان کردوون و پشتیان پێ بەستوون، دەگەڕێنەوە بۆ یەکێک یان پتر لە غەریزەو داخوازییە سروشتییەکانی ئینسان.

بێگومان ئێمەی بڕواداریش وێڕای ئەوەی کە دەڵێین: سەرچاوەی پەیدابوونی ئایین لە دەرەوەی زاتی مرۆڤە-کە پەیام (وحي)ی خوایە-، دانیش بەوەدا دێنین کە لە سروشت و دەروونی مرۆڤدا پاڵنەری وا هەن، کە بەرەو خواناسیی و دینداریی بەرن، بەڵام نەک ئەو هاندەرانەی کە بێبڕوایان دەڵێن، وەک لە بەشی یەکەمی (خواناسیی)دا باسمان کرد.

ئێستاش یەک لەدوای یەک بەخستەڕوو و ڕەخنە لێگرتن و پووچاندنەوەی ئەو بیردۆزە پووچانەدا دەچین، کە بێبڕواو دژئایینان بەمەبەستی تەفسیرکردنی پەیدابوونی دیاردەی ئایین و خواناسیی خستویاننە ڕوو. (والله ولي التوفيق).

---

(١) شەقاو: هەنگاو.

(٢) چۆرتم: تەنگوچەڵەمە، گرفت، کۆسپ.

(٣) سەرەنگرێ: سەرەوبن، سەرەنگرێبوون، تەقڵە لێدان، کەوتن.

### یەکەم: بیردۆزەی ئابووریی

لەبەرئەوەی لایەنگرانی ئەم بیردۆزەیە بەزۆری لەو کەسانەن کە لە ئاوی بۆگەنیوو قوڕاوی درۆزناوی مارکسایەتییان خواردۆتەوە، وای بەچاک دەزانم لەپێشدا هەڵوێستی مارکسایەتیی و تێڕوانینی دەربارەی مێژوو، بەکورتی بخەمە ڕوو:

مێژوو لە ڕوانگەی مارکسایەتییەوە لەسەر بنچینەی حەتمییەتی ئابووریی بەڕێوە دەچێ، بەواتایەکی دی؛ مێژووی مرۆڤایەتیی بەرهەمی دژایەتیی چینەکانەو، چینەکانی کۆمەڵگاش، بەرهەمی پەیوەندییەکانی هۆیەکانی بەرهەمهێنانی هەر چاخ و ڕۆژگارێکن.

مارکس و ئەنگڵز لەوبارەوە گوتوویانە:

(مێژووی هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی تا ئێستا پەیدا بوو ون، بریتیە لە مێژووی دژایەتیی و ناکۆکیی چینەکان).[1]

بەڵێ لە ڕوانگەی شیوعییاتەییەوە هۆیەکانی بەرهەمهێنان بزوێنەری مێژوو و کۆمەڵگان، هۆ و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان ژێرخانی هەرجۆرە کۆمەڵگایەکن، پەیوەندییەکانی کۆمەڵگاش پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بەجۆری هۆیەکانی بەرهەمهێنانەوە هەیە، واتە هەرکاتێک هۆیەکانی بەرهەمهێنان، بگۆڕین، ئەوە پەیوەندییەکانی کۆمەڵگاو شێوەی ژیانیشی دەگۆڕین.

بە بۆچوونی مارکس هۆیەکانی بەرهەمهێنان نەک هەر بەدیهێنەری مێژوون، بەڵکو جۆری هەست و نەست و بیروبۆچوونی کۆمەڵیش دیاری دەکەن، مارکس لەوبارەوە گوتوویەتی:

---

(١) (مانیفست) لاپەڕە ٢٨، چاپ١، نووسراوی کارل مارکس، فریدریک ئەنگلز. ئەم (مانیفست)ە بە عارەبی وەرگێڕاوەو ناونراوە: (بیان الحزب الشیوعي).

(لە ژیانی ماددییدا شێوەو جۆری بەرهەمهێنان، پەیداکەری شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ڕۆشنبیرییین، بیروهۆشی مرۆڤ نیە کە بوونی وی دیاری دەکات، بەڵکو شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتیی ویە کە بیروهۆشی دیاریی دەکات.)(١)

مارکس کۆمەڵگا بە خانوویێک دەچووێنێ کە بناغەکەی هۆیەکانی بەرهەمهێنانن و بەبڕوای وی فەلسەفەو ئایین و هونەرو ڕەوشت و..هتد. دیوارێکن لەسەر ئەو بناغەیە هەڵدەچنرێن!!

کەواتە مارکسایەتیی هەموو لایەنەکانی ژیانی ئینسان، پاڵ دەداتە لای هۆیەکانی بەرهەمهێنان و، بۆ هیچ کام لە لایەنەکانی ژیان ڕەسەنایەتیی و سەربەخۆیی دانانێ، مادام وابێ ئایینیش دیاردەیەکی ڕەسەن و سەربەخۆ نیە، بەڵکو ڕەنگدانەوەی جۆری ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەیە کە بەپێی جۆری هۆیەکانی بەرهەمهێنان پەیدا دەبن.

خوێنەری بەڕێز!

لەسەر بنچینەی ئەم جۆرە تێڕوانینەیە کە مارکسییەکان پێیان وایە، چەمک و مەبەستی (ئایین و خوا) هەندێک لە سەرمایەدارو بورژوایەکان پەیدایان کردوە، تاکو لەپەنای ویدا چینە بێبەش و بێهێزەکانی کۆمەڵ بچەوسێننەوەو لێیان بەهرەمەند بن، ئەو چینە ستەمکارەی کە دەیەوێ خێروبێرەکانی کۆمەڵگا هەمووی هی وی بێو، بەس بۆخۆی شەپ و گووپی تێدا لێ بدات، هەڵبەتە بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستە گڵاوەش، حەوجێی چاوبەستکردن و فریودانی گەلە لە زۆر ڕێیانەوە، بەڵام لە هەموان گرنگترو کاریگەرتر، دیاردەی ئایین دۆستیی و خواپەرستییە!!

لینین لەوبارەوە گوتوویەتی:

---

(١) (مارکس ومارکسیزم)، ل٢٤٦.

(ئایین یەکێکە لەشێوەکانی ئازاردان و چەوساندنەوەی چینی ڕەنجدەر، ئەو چینەی کە هەمیشە بۆ خەڵکی خۆی ماندوو دەکات و، بەس ڕەنجدان و کوێرەوەریی پێ دەبڕێ)[١]

مارکسیش گوتوویەتی:

(مرۆڤ ئایینی دروست کردوە، نەک ئایین مرۆڤ دروست بکات)[٢].

کۆتایی ئەو وڕێنانەش بەم دەقە دێنین کە زۆر بەڕوونی هەڵوێستی لایەنگرانی بیردۆزەی ئابووریی کە مارکسییەکان سەرقافڵەیانن، لەبارەی ئایینەوە دەخاتە ڕوو:

(...چینە چەوسێنەرەوەکان ئەم خەسڵەتە-دینداریی- بەکار دێنن؛ چونکە دەیانەوێ زۆرداریی و چەوساندنەوەکەیان لەبەرچاوی چینە رەنج کێشەکان بشارنەوە، ئەو چەوسێنەرەوانە پێویستییان بە کەللەئیشکیی و دواکەوتوویی ئەو ڕەنجدەرە چەوساوانە هەیە، تاکو چەوسێنرانەوەکەیان درێژە بکێشێ، دیسان پێویستییان بەوە هەیە، کە ئەو زەحمەتکێشانە گەردنکەچی قەزاو قەدەرێکی حەتمی بن، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە پێویستە هیواو ئاواتی جەماوەر ڕووی پێ بکرێتە جیهانی دوارۆژ، تاکو هیواو دڵدانەوەیەکی بۆ بێتە دی بەهۆی بەتەمابوونی ژیانی بەهەشتێوە.. کەواتە ئایین لە ڕۆژگاری زۆر زووەوە وەک هێزێکی مەعنەویی بەکارهاتوە بۆ هێشتنەوەی ڕژێم، و وەک تلیاکێک بۆ گەل، بەپێی قسەی مارکس)[٣].

---

(١) (ماتريالسم تأريخي)، ل٦١.

(٢) (ماركس وماركسيزم)، ل٢٣٩.

(٣) (أصول الفلسفة الماركسية)، ب١ ل٢٤٢-٢٤٣، جۆرج پۆلیتزرو چی بیس، موریس کاڤیل، وەرگێڕانی: شعبان بركات، و بڕوانە: (أسس الفلسفة الماركسية) ل١١،١٠، أفانا سييف، وەرگێڕانی عبدالرزاق الصافي.

ئەوە بەکورتی بیروڕاو هەڵوێستی لایەنگرانی بیردۆزەی ئابووری (النظرية الأقتصادية) بوو، دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی ئایین و خواپەرستیی، ئنجا با تەرازووی ژیریی و زانست بەدەستەوە بگرین و، بیردۆزەی گۆرینی پێ بکێشین، داخۆ چەند و چۆن دەردەچێ؟!!

**پووچاندنەوەی بیردۆزەی ئابووریی:**

**یەکەم:** رابەرو پێشەوایانی مارکسایەتیی-کە هەڵگری ئەم بیردۆزەیەن-بەتایبەتی مارکس و ئەنگلز و لینین، هیچ کامیان لە ئاییندا شارەزاو پسپۆڕ نەبوو ون، وەک لەسەرجەمی وتارو نووسراوەکانیاندا دێتە بەرچاو، بێگومان بابایەکیش شارەزایی و پسپۆڕیی لە شتێکدا نەبێ، نەک هەر ڕەخنە لێگرتن، بەڵکو هەر مافی قسەکردنیشی دەربارەی نیە، کەواتە ئەم بیردۆزەیە هەر لە بنەڕەتدا پووچ و بێنێوەڕۆکەو، وەک پارەی قەڵب بەسەر خاوەنیدا دەدرێتەوە.

بێگومان دەشزانم کە کەسانێکی ئاڵقەلەگوێ هەن، دەعوای نەشارەزابوونی ڕابەرانی مارکسایەتیی دەربارەی ئایین، بەهەڵە دەزانن، بەڵام هەر ئەوەندە بەو جۆرە کەسانە دەڵێم، کە نەزان نەزانی بۆ هەڵناسەنگێنرێ، ئێوە کە بۆ خۆتان ئەلیف و بێی ئایین ناناسن، چۆن دەتوانن پەی بەوە بەرن کە مارکس و هاوەڵانی لە ئایین حاڵی نەبوو ون؟! دە وەرن ئازایانە لێکۆڵینەوەیەکی وردو قووڵی قورئان و سوننەت بکەن، داخۆ چۆن تەواو دڵنیا دەبن سەبارەت بە لە ئایین حاڵی نەبوونی خۆتان و ڕابەرانتان و، داخۆ چۆن وەک ئێمە دەڵێن: ڕاستە هەموو زانیاریی و شارەزایی ڕابەرانی مارکسایەتیی لەبارەی ئایینەوە، لە چەند شارەزاییەکی ئەفسانایی عەوامانە تێنەپەڕیوە.[1]

---

(١) لە ئاڵقەی سێیەمی زنجیرەی (ئیسلام و ڕێچکان)دا ئەم مەسەلەیە چاک ڕوون کراوەتەوە، بڕوانە: ل١١٥-١٤١ چ١، ١٩٨٥، شایانی باسە ئەم کتێبە بۆ جاری سێیەمیش لەلایەن نووسینگەی تەفسیرەوە چاپ کراوەتەوە.

**دووەم:** مارکسییەکان لە ئەنجامی دیتنی ستەم و زۆرو کارە ناڕەوایەکانی ڕابەرو ڕدێن سپیانی ئایینی بەناو مەسیحیی کڵێسادا، بەدرێژایی سەدەکانی نێوەڕاست، حوکمێکی گشتی و ناحەزانەیان بەسەر هەموو ئایینێکدا داوە.

**١-** بێگومان ئێمەش دەزانین کە زۆر لەکەشیش و بەناو زانایانی کڵێسا لەژێر دروشمی ئایین و خواپەرستیدا، بەدرێژایی مێژوو قورساییەکی زۆریان خستبۆ سەر شانی خەڵکی و، بەناوی ئایینەوە ئازاریان دەدان و بگرە خوێنیشیان دەمژین، سەرباری ئەمەش هەمیشە دیوارو بەربەستێکی پتەو بوون لەڕێی گۆڕانکاریی و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵ و، گەشەکردنی زانیاریی و ئاوەدانییداو، لەپەنای ئاییندا خراپەیەکی زۆریان لەگەڵ خەڵکی کردو ناوی ئایینیان بەد کرد.

**٢-** هەروەها دەزانین کە زۆر لە پاپاو قەشەکانی سەدەکانی نێوەڕاست، خاوەنی زەوی و زارێکی زۆر بوون و، هەزاران کەسیان بەناوی جوتیارییەوە خستبۆ ژێر نیری سۆغرەو بێگارەوەو، وەک گەنەو قرنوو[١] خوێنیان دەمژین[٢]، وەک خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ (التوبة-٣٤).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان زۆرێک لە حەبرو ڕاهیبەکان ماڵ و سامانی خەڵکی بەناهەق دەخۆن و خەڵکی لەڕێی خوا لادەدەن.

---

(١) دوو زیندەوەری مشەخۆر(طفيلي)ین، بەزۆری بەجەستەی ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزنەوە دەبن.

(٢) لە کتێبی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) و کتێبی (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی..)دا ئەم مەسەلەیان باش ڕوون کردۆتەوە، بڕوانە: چاپی شەشەمی یەکەمیان و چاپی سێیەمی دووەمیان.
هەروەها لەمەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)دا لەژێر ناو و نیشانی: {سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لەڕۆژئاوادا}.

شایانی باسیشە کە (حَبْر، حِبْر) کۆیەکەی (أحبار)ەو بەزاناو پێشەوایانی ئایینی جوولەکەکان دەگوترێ.

(رهبان)یش کۆی (راهب)ەو بە گۆشەنشین و ڕەبەنەکانی نەصرانییەکان دەگوترێت.

٣- دیسان دەزانین کە ئەم پێشەواو ڕابەرە خوانەناسە ئایین فرۆشانە، بەزۆری بڵیندگۆ (مكبرة)ی طاغووتان و ئۆباڵکێشی زۆرداران بوون و، کارە پیس و ناڕەواکانیانیان بۆ ڕەشەرع دەخستن!

٤- دیسان دەزانین کە ئەو پێشەوا ئایینفرۆش و بێ هۆش و گۆشانە، خاوەنی زۆر جۆرە بیروبۆچوونی هەڵەو ئەفسانەیی بوون، کە بەتۆبزیی لە مێشکی خەڵکیان دەئاخنین و، ڕێیان بەکەس نەدەدا کە بەپێچەوانەی بیروبۆچوونەکانی وانەوە بیربکاتەوەو بدوێ؛ چونکە لە حاڵێکی وادا گیران و کوژران و سووتێنران چاوەڕێیان دەکرد!

بەڵێ ئێمەش هەواڵی ئەم قسانە و پتریشمان لەلایە، بەڵام نە مارکس و نە هیچ کەسێکی دیکەش-ئەگەر سەرپێچیی لە فەرمانی ژیریی و زانست نەکەن- بۆیان نیە واقیعێکی ناقۆڵاو نالەباری ئایینێکی شێوێنراوو گۆڕراوی وەک نەصرانییەت، بکەنە تەرازوو و پێوەری کێشان و پێوانی ئایین بە گشتی، دەنا وەبەر حوکمی ئەو نەفامە دەکەون کە هەموو سمێڵ سووران بە هەمزاغا دەزانێ!

**سێیەم:** هەڵەیەکی دیکەی بیردۆزەی گۆڕین ئەوەیە کە بەخراپ بەکارهێنران (إستغلال)ی ئایینیان بەهۆی پەیداکەری ئایین حسێب کردوە، بەڵام بێگومان ئەو دووانە لەبەرچاوی مرۆڤی ژیرو وردبین، جیاوازییان زۆرە، با بزانین چۆن!

ئەوانە واقیعێکیان دیوە کە بریتی بووە لە بەکارهێنرانی ئایین لەلایەن چەوسێنەرو سەرمایەدارانەوە بۆ چاوبەست کردن و فریودانی گەل[1]، ئنجا

---

(١) لەم سەردەمەشدا بەهۆی هەندێک زڕەشێخ و بەناو مەلای دینفرۆشەوە طاغووتەکان

لـه‌وه‌وه گه‌یونـه ئـه‌و ئه‌نجامـه؛ کـه ئـه‌و زۆردارو بێویژدانانـه‌ی به‌هـۆی ئایینـه‌وه گه‌لـی ڕه‌شـوڕووت ده‌چه‌وسێننه‌وه، هـه‌ر بـۆ خۆشیان ئایینیـان دروست کـردوه!

بـه‌ڵام ئـه‌م جۆره بیرکردنه‌وه‌یه وه‌ک بیرکردنـه‌وه‌ی ئـه‌و منداڵه ساده‌و نه‌فامه وایـه، کـه (تاپڕێـک) به‌ده‌ست ڕاوچییه‌کـه‌وه ده‌بینـێ، ئنجا دیترانـی تاپڕه‌کـه‌و به‌کارهێنرانـی به‌ده‌ستی کابرای ڕاوچی، ده‌کاتـه به‌ڵگـه‌ی دروستکرانی تاپـڕی گۆڕیـن هـه‌ر به‌ده‌ستی کابرای ڕاوچی! بـه‌ڵام بێگومـان منداڵه‌کـه‌ش و ئه‌وانه‌ش کـه وه‌ک وی بیرده‌که‌نـه‌وه، ڕاسـت ناکـه‌ن و نه‌یانپێکاوه.

ئنجا ئه‌گـه‌ر ئـه‌و شێوه بیرکردنـه‌وه‌ی وان ڕاست بـێ، ده‌توانیـن بڵێین: که‌واته ئـه‌و که‌سـانه‌ش کـه ئێسـتا بیـردۆزه‌ی مارکسـایه‌تییان کردۆتـه ده‌سـته‌گیره‌ی خۆیـان و خه‌ڵکـی پـێ هه‌ڵده‌فریوێنـن[1]، هـه‌ر بۆخۆیـان بیـردۆزه‌ی ناوبراویـان ڕه‌خسـاندوه و مارکسایه‌تیی له بنه‌ڕه‌ته‌وه به مه‌به‌ستی چاوبه‌ستکردنی خه‌ڵکی دروسـت کـراوه، بـه‌ڵام بێگومـان مارکسـیی و شـیوعییه‌کان لێمـان قه‌ڵـس و لالـووت ده‌بن و ده‌ڵێن: نه‌خێر وانیـه؛ به‌ڵکـو مارکسایه‌تی لـه ئه‌سڵدا به‌نیـازی ڕزگارکردنی گه‌لانـی ژێرده‌سته هاتۆتـه دی، بـه‌ڵام فـلان و فیسـار پێڕو تاقم هه‌لپه‌رستن و بـه‌درۆ مـۆری مارکسایه‌تییان به‌خۆوه نـاوه، تاکـو خه‌ڵکـی پـێ فریـو بـده‌ن.

---

توانیویانه تا ڕاده‌یه‌کی زۆر چاوی گه‌ل ببه‌ستن و فریوی بده‌ن.

تێبینی: ئـه‌وه له‌کاتی خۆیداو له‌سـه‌رده‌می ڕژێمی به‌عسدا نووسراوه، بـه‌ڵام ئێسـتاش هێشتنه‌وه‌یم به پێویست زانی!!

بگره ئێستاش (٢٠١٩/٩/١٩ز) هه‌رپێویسته بهێڵدرێته‌وه.

(١) بێگومـان بـه بـڕوای هـه‌رکام لـه پێڕه مارکسـییه‌کان، غه‌یـری وی لاڕێ (منحرف)یـه، بـۆ وێنـه؛ ڕوسـیاو چیـن هـه‌ر کامیـان ئـه‌وی دیکـه بـه (تحريفي) داده‌نـێ، هه‌روه‌هـا پێڕه مارکسـییه‌کانی نێـو کوردسـتانیش به‌هه‌مـان پێـودان!!

تێبینی: ئه‌مـه‌ش کاتـی خۆی نووسراوه‌و ئێسـتاش هـه‌ر بۆ یادگاریـی بمێنـێ چاکـه! ئه‌گـه‌ر نـا مارکسیزم چ وه‌ک ده‌وڵـه‌ت و ڕژێم و، چ وه‌ک حیزب و تاقم بۆتـه (خبر)ی (كان)!!

جا نازانم بۆچی مارکسایەتی ڕێ بە شوێنکەوتووانی ئایینیش نادات کە پەنا بەرنە بەر هەمان قسە، مەگەر (بانێکەو دوو هەوا)؟!!

**چوارەم:** دیسان بۆمان هەیە بپرسین: باشە ئەگەر ڕاستە ئایین چەک و چاوپێچکی دەستی ستەمکاران بووە، بۆ کەرکردن و خوێن میسینی[1] چەوساوان، ئەدی چما ئەو چینە ستەملێکراوە بۆ ڕزگاربوون لە ستەم و زۆر، ڕۆژێک لەڕۆژان دژی ئایین نەوەستاوەو، خەریکی شۆڕشی دژی ئایینی نەبووە؟![2]

مادام میکرۆبی چەوسێنراوەیی چینی ڕەنجدەر، ئایینە، بۆچی ئەو چینە لە لەنێو بردنی ئەو ئایینە وەخۆ نەکەوتووە؟!

توخوا ماقووڵە شتێک ژیانت بخاتە مەترسییەوەو، بەخوێنی سەرت تینوو بێ، بەڵام تۆ هیچ گوێی نەدەیەو خۆی لێ بێدەنگ بکەی؟!

بەڵێ، ئەگەر بیردۆزەی ئابووریی ڕاستی کردبایە، دەبوو چینی ڕەش و ڕووت و ڕەنجدەر هەمیشە ئایینی وەک دوژمنی بابەکوشتەی خۆی دانابایە، بەڵام ئێمە دەبینین و واقیعی مێژووی کۆن و تازەش شایەدە، کە چینی ماندوو و مجرۆو رەنجدەر هەمیشە هەڵگری مەشخەڵی شۆڕشی ئیمان و دینداریی بووەو، بەردی بناغەی هەموو شۆڕشێکی خوایی بووە، جا بێگومان پشتگیریی ئەو چینە مەزنەش لە ئایین، لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە وێڕای بڕوا هەبوونی بەڕاستیی عەقیدەی خواناسیی و ڕێبازی خواپەرستیی، ئەو عەقیدەو ڕێبازەشی بەتاقە پشتیوان و خەمخۆری خۆی زانیوە، بۆیە لە پێناویدا گیان و سامانی لێ وەچاو[3] نەبووە.[4]

---

(١) میسین: مژین، بەڵام میسین بە مژینێک دەگوترێ کە بە فشار (ضغط)ەوە دەبێ.

(٢) دیارە لێرەدا مەبەستمان ئیسلام و مێژووەکەیەتی و، خەڵکی ڕۆژئاواش لە خودی بەرنامەی مەسیح (علیه السلام) ڕانەپەڕین، بەڵکو لە دژی نەصرانییەت و چینی ئەکلیرۆس ڕاپەڕین، کە ئایینی مەسیحییان گۆڕی بوو.

(٣) لێ وەچاو نەبوو: پێ زۆر نەبووە، پێ کەم بووە، چاوی لەدوای نەبووە.

(٤) لە ئاڵقەی یەکەمی (ئیسلام و ڕێچکان)دا چاپی سێیەم (٢٠٠٦) شتێک لەوبارەوە

یان وا دیارە بەپێی بیروبۆچوونی مارکسایەتیی، دەشێ بگوترێ: (چینی چەوساوەو ڕەنجدەر بۆیە بە ئایینەوە سەرگەرم بووەو شوێنی کەوتوە؛ چونکە زانیویەتی کە بەهۆی ویەوە ستەمی لێ دەکرێو دەچەوسێنرێتەوە)؟!!!

**پێنجەم:** ئەگەر هەڵگرانی بیردۆزەی ئابووریی ڕاست دەکەن، هۆی پەیدابوونی ئایین ئەوەیە کە دەیڵێن، چۆن دەتوانن (بڕوا بەخوا هێنان و ئایین دۆستیی) چینی دەوڵەمەندو خۆشگوزەران کە لە هیچیان کەم نەبووە، تەفسیر بکەن؟!

مادام چینی دەوڵەمەندو ساماندار، ئایینیان بە مەبەستی کەرکردن (استحمار)و گەردن پێ کەچکردنی چەوساوان هێناوەتە دی، ئەدی بۆچی بۆ خۆشیان لەو تلیاکەیان کێشاوەو زۆر بەگرنگیی پێدانەوە پێیەوە سەرگەرم بوو ون؟!

نەک هەر ئەوەندەش، بەڵکو ئەو خۆشگوزەرانیی و دەوڵەمەندییەش کە هەیانبووە، کردوویانەتە قوربانیی و فیدای ئەو ئایینەی کە بە خەیاڵی مارکسایەتیی دەستکردنی خۆیانە بۆ لێدانی چینی ڕەنجدەرو چرۆساو؟!

ئایا بە سەنگ و تەرازووی بیردۆزەی ئابووریی، سامان بەخت کردن و خۆ فیداکردنی ئەبوبەکری سیددیق و عوسمانی کوڕی عەففان و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و موصعەبی کوڕی عومەیر و صوهەیبی ڕۆمیی و عیکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل و...هتد.(رضي الله عنهم) لە پێناوی ئایین و خواپەرستییدا، چۆن تەفسیر دەکرێ، لەکاتێکدا کە هەموویان ساماندارو خۆشگوزەران بوو ون و، دوایی هی وایان هەبووە لە پێناوی ئایینندا بە شێوەیەک نەدارو دەستکورت بووە، کە کفنەکەی ئەو تاقە جل وبەرگەی خۆی بووە کە بەشی نەکردووە، ناچاربوو ون بەشێکی جەستەی شەهید بووی، بە گیاوگۆڵ داپۆشن؟!![(١)]

---

باسکراوە، هەروە لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا (ئیمان) لەباسی دووەمی بەندی پێنجەمیدا (کردنەوەی چەند گرێیەک و لابردنی چەند تەمێک دەربارەی خواناسیی و بڕوابەخوا بوون) لەژێر سەرباسی: (بڕواداریی دژی ستەمە بەڵام بێبڕوایی و ستەم دوو کاڵەکی بڕکێکن) ئەو مەسەلەیە تیشکی باشی خراوەتە سەر.

(١) مەبەست لە ڕووداوی دڵتەزێنی شەهیدبوونی (مصعب بن عمیر)ە، کە لە جەنگی ئوحوددا شەهید کراو، کاتێک ویستیان بینێژن و کفنی بکەن، چونکە شەهید بوو هەر لە بەرگەکەی

بێگومان مارکسایەتی لە ڕاست ئەم پرسیارەو دەیان پرسیاری دیکەی لەم جۆرەدا، سەرسام و دەستەوستان دەبێو دۆش دادەمێنێو هیچی پێ نامێنێ.

**شەشەم:** بیردۆزەی ئابووریی کە هەوڵ دەدات پەیدابوونی ئایین بە بەرهەمی کێشەی چینەکان دابنێ، لووت و بزووت تووشی پرسیارێک دەبێ، کە بێجگە لە زار بوونە تەڵەی تەقیو، هیچ وەڵامی دیکەی پێ نین، لە بەرانبەریدا:

باشە ئەگەر هەموو شتێک لە هونەرو ئایین و ئەدەب و زانست و سیاسەت و...هتد، دوای پەیدابوونی چینەکان پەیدا بووە، ئەدی بۆچی بەر لە دروست بوونی چینەکانیش[1] دیاردەی ئایین و خواپەرستیی هەر هەبووە؟!

هەڵبەتە ئێمە لە باسەکانی داهاتوودا دەیسەلمێنین، کە هیچ چاخ و ڕۆژگارێک نەبووە ئایین و خواناسیی تێدا نەبوبێ.

---

خۆیدا کفن کرا، بەڵام لەبەرئەوەی بەشی نەدەکرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: لای سەرەوەی بە بەرگەکەی داپۆشن و، لای لاقانی بە (إذخر) داپۆشن، کە جۆرە گیایەکە، ئنجا بە خەمناکییەوە سەرنجێکی دایەو فەرمووی: لە شاری مەککەدا دەم دیتی، کەس لەتۆ بەرگی چاکترو نەرمتر نەبوو و، کەس لەتۆ قژی جوانتر نەبوو، ئنجائێستاش ئەوەتای سەرو قژ هاڵۆزی و کراسێکت دەبەردایە!! بڕوانە (رجال حول الرسول) لاپەڕە ٥٣ چاپ٢، خالد محمد خالد.

(١) بێگومان ئێمە لێرەدا بەپێی بیروبۆچوونی خۆیان لەگەڵیان دەدوێین و، بە قسەی خۆیان دەیانگرین، ئەگەرنا بڕوامان بەو وڕێنانە نیەو، هیچ مێژووزانێکی بێلایەنیش بڕوای بەو مێژووە خەیاڵیی و ناواقیعییە نیە، کە مارکسییەکان دەیانەوێ بیناخننە مێژووی مرۆڤایەتییەوە، وەک چۆن زۆر ڕاستیی زانستییان گۆڕیوە بۆ وەڕاست گەڕان و بەدرۆ نەکەوتنەوەی بیردۆزە ئەفسانەیی و خەیاڵییەکەیان، مێژووش (تحریف) بکەن و بیگۆڕن بۆ هەمان مەبەست! واتە ئەگەر هەقیشیان پێ نیە، لانی کەم ملی ڕاستییەکان خوار بکەن و بسووڕێنن بەرەو (باطل) دکەیان، وەک لە (ئیسلام و ڕێچکان)دا وێنەم بۆ مارکسییەکان لەوبارەوە بە (برۆکۆست) جەردەو ڕێگری ناوداری یۆنانی هێناوەتەوە: بڕوانە (ئیسلام و ڕێچکان) لاپەڕە١١٦، چاپی یەکەم.

## دووەم: بیردۆزەی ترسان

یەکی دیکە لەو بیردۆزانەی کە بێبڕوایان، بۆ تەفسیرکردنی پەیدابوونی دیاردەی خواناسیی و دینداریی، پەنایان بردوونە بەر، بیردۆزەی ترسان (الخوف)ە، ئەم بیردۆزەیە دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی ئایین، دەڵێ:

(هەزاران ساڵ پێش ئێستا، مرۆڤ لەترسی لافاوو هەورەتریشقەو برووسکەو گێژەڵووکەو باو باسریشک و باران و بوومەلەرزەو ئاگرپرژێن (برکان) و ژیاندارانی دڕندەو ترسناک، پەنای بردۆتە بەر ئەو دیوی سروشت و دەستەودامێنی بووە، بڕوای وابووە کە خوایەک، یان چەند خوایەک هەن، کە بتوانن ڕزگاری بکەن و چەپاڵەی بدەن).

(فرۆید) یەکێکە لەو کەسانەی کە ترس بەهاندەری مرۆڤ دەزانن بەرەو خواپەرستیی؛ چونکە مرۆڤ لە ئاقار ئەو دیاردە سروشتییە بە سامانەدا، لەبەرئەوەی زانیاریی و شارەزایی نەبوو، ناچار بوو پەنا بەرێتە بەر پاڕانەوەو نەزر[١] و قوربانیی کردن، بۆ خوایەکان، تاکو لە مەترسیی ئەو شتانە بیپارێزن.

(برتراند راسل)یش کە یەکێکە لە دەمڕاستانی ئەم بیردۆزەیە دەڵێ:

(گومانم وایە کە سەرچاوەی ئایین پێش هەموو شتێک (ترسان)ە؛ چونکە مرۆڤ خۆی زۆر بێدەستەڵات دێتە بەرچاوان و، هۆی ترسانەکەشی سێ شتن:

١- ترسان لە کارەساتە سروشتییەکان؛ بوومەلەرزەو هەورەتریشقە.

٢- ترسان لە هاوڕەگەزانی خۆی کە زیانێکی پێ بگەیەنن، وەک ئەوەی لە دەمی جەنگدا بیکوژن.

---

(١) (نذر) واتە: خێر لەخۆگرتن.

٣- ترسان لە هەواو نەفس و ئارەزووەکانی خۆی؛ چونکە مرۆڤ دەزانێ کە دوای ئەنجامدانی کارێکی بەد بەهۆی کارتێکردنی هەواو ئارەزووەکانییەوە، پەشێمان دەبێتەوە.

ئەمانەن هۆیە سەرەکییەکانی ترس، کە ئایین زۆر لە ترسناکییان دادەشکێنێو ئارامیی و ئاسوودەیی بە مرۆڤ دەبەخشێ)[1].

ئەمە پوختەی بیردۆزەی ترسان بوو، ئێستاش با بچینە سەروکاری تێوەڕامان و هەڵسەنگاندنی، بزانین شتێکی ڕاست و بەجێیە، یان ورێنەی نێو نوێنێیەو خەون و خەیاڵی سەرجێیە!!

## پووچاندنەوەی بیردۆزەی ترسان:

بۆ هەڵسەنگاندن و لەبەرێک هەڵوەشاندنی ئەم گومانە، خستنەڕووی چەند خاڵێک پێویستە:

### یەکەم: هۆی پەیدابوونی ترس چییە؟!

گرنگترین مەسەلە کە پێویستە لە سەرەتاوە بتوێژرێتەوە ئەوەیە؛ ئایا هۆی بنەڕەتی سەرهەڵدانی ترس چییە؟! واتە چ هۆیەک دەبێتە پەیداکەری ترس بۆ مرۆڤ؟!

دەروونناسان بڕوایان وایە کە بنچینەی ترس، بریتییە لە هەستکردن بە ڕوودانی مەترسییەک کە بۆ مرۆڤ دێتە دی، واتە ترس بریتییە لە چاوەڕوانکردنی ئازار دیتن.

بە شێوەیەکی گشتی سەرچاوەی پەیدابوونی ترس دوو شتن:

---

(١) (أنگیزە پیدایيش مذاهب)، ل ٢٠٨، ناصر مکارم شیرازی.

١- نەشارەزایی:

بەڵێ گرنگترین هۆی پەیدابوونی ترس و لەرزی مرۆڤ، بێئاگاییە، مرۆڤ لە راست زۆر لەو شتانەدا کە نایانناسێ، هەست بە ترس دەکات، جا هەتا مرۆڤ بە شتە نەناسراوەکان شارەزاتر بێت، ترسی کەمتر دەبێت، بۆ وێنە کاتێک مرۆڤ نەخۆش دەبێو، جۆری نەخۆشییەکەی نازانێ، هەست بە مەترسییەکی زۆر دەکات؛ چونکە ئیحتمالی چەندان نەخۆشی بەدڵدادێ کە شیاوی چارەسەر نین، بەڵام کە چوو بۆ لای پزیشک و لە هۆی پەیدابوونی نەخۆشییەکەی حاڵی بوو و، زانی نەخۆشییەکەی گرنگ نیە، ترس و دڵەڕاوکەی نامێنێ.

٢- بێورەیی و نەساغیی گیان:

دووەمین هۆی پەیدابوونی ترس بێهێزی گیانیی و بێورەییە، بۆ وێنە: کەسانێک کە لە تاریکیی دەترسن، بەگشتی کەسانێکن کە بەمنداڵیی تووشی تەگەرەو نەخۆشییەکی دەروونیی بوو ون و، شوێنەواری ئەو نەخۆشیی و تەگەرەیە لە ئەودیو هۆش (اللاّشعور)یاندا بەجێماوە، بەڵام ئەوانەی کە گیانێکی بەهێزیان هەیەو ساغن، نەک هەر لەتاریکیی ناترسن، بەڵکو لە بەردەم زۆر کارەساتی دژواریشدا دووچاری ترس و ڕاچڵەکین نابن.

کەواتە؛ ئەگەر بێت و مرۆڤ پەی بەو شتانە بەرێ کە جێگەی مەترسینی و، لەرازو نهێنییەکانیان شارەزا بێو، لە هەرجۆرە کۆسپ و تەگەرەیەکی دەروونیی پارێزراو بێ، ئەوە قەت تووشی دڵلەرزین و ترسان نابێ، مەگەر بەدەگمەن.

ئێستا با بەوردیی و لەبەر تیشکی ڕای دەروونناساندا، دەربارەی هۆی پەیدابوونی ترسان، لە قسەی لایەنگرانی بیردۆزەی ترس ڕامێنین:

بەپێی یاسای هۆکاریی (السببیة) هەر کاتێک هۆ (سبب) نەما، پەیدابوو (مسبَّب)یش نامێنێ، بۆ وێنە، نەمانی رووناکیی ڕۆژگار بەهۆی

ئاوابوونی خۆرەوە، جا بەپێی قسەی لایەنگرانی بیردۆزەی ترس، ئایین پەیدابوو (مسبب)ی هۆ (سبب)ێکە کە بریتییە لە ترسان، مادام وابێ دەبێ بە نەمانی ترس ئایینیش نەمێنێ.

جا بەپێی ئەم قسانەی کران، دەبوو کەسانێک کە بە منداڵیی لە گرێ و گرفت و تەگەرەو نەساغییە دەروونییەکان پارێزراو بوون و، ئێستاش سەرەدەرێک لە یاساو دەستوورو ڕازو نهێنییەکانی پەیدابوون و ڕوودانی دیاردەو کارەساتە سروشتییەکان دەکەن، بەکورتی دەبوو کەسانێک، کە نەساغیی دەروونییان نیەو، لە ئاقار دیاردە سروشتییەکاندا هەست بە ڕاچڵەکین و ترسان ناکەن، بڕوایان بە ئایین نەبێو بەلایدا نەچن، بەڵام هەمیشە بەپێچەوانەوە دەبینرێ؛ زۆربەی هەرەزۆری خواناس و ئایین دۆستانی ڕاستەقینە، کەسانێکی تەندروست و دەروون ساغ و ئازاو نەترسن و، زاناو پسپۆڕانی دەروونناس و کۆمەڵناس دەڵێن: مرۆڤی خواناس و دیندار لە هەموو کەسێکی دیکە بەختیارترو دەروون ساغترو ئازاترو خۆڕاگرترە[1].

**دووەم: کاریگەریی ئایین لە نەهێشتنی دیاردەی ترساندا:**

شتێکی بەرچاوو بەڵگەنەویستە، کە ئایین دەورێکی کاریگەرو بەرچاوی هەیە لە نەهێشتنی ترسدا وەک: ترس لە دیاردە سروشتییەکان، یان لە مردنێ، یان لە ئازاری مرۆڤەکان؛ چونکە ئایین لەسەر بنچینەی ڕوو پێ وەرچەرخاندنی مرۆڤ بەرەو یەک خوای بەهێزی دەستەڵاتدار، ڕۆنراوە؛ خوایەک کە هەرکەسێک بیناسێ، هیچ هۆیەکی ترسێنەر کاری تێ ناکات. ئاخر هەر کەسێک خوا بناسێو پشتی پێ ببەستێ، سامناکترین دیاردەی سروشتی لەلا دەبێتە شتێکی ئاسایی و، دیاردەی مردنی لەلا دەبێتە کۆچکردن و گەشتێک بەرەو جیهانێکی فراوانترو خۆشتر، بە

---

(١) لە بەشی چوارەم و پێنجەم و شەشەمی بەرگی یەکەمی (یادی خوا)دا بە تێروتەسەلیی، ئەو مەسەلەیە ڕوونکراوەتەوەو سەلمێنراوە، بڕوانە (یادی خوا، بەرگی یەکەم: گرنگیی یادی خوا لەژیانی مرۆڤدا) چاپی یەکەم ١٩٨٧.

واتایەکی دیکە؛ بڕوا بەخوا بوون و عەقیدەی ئایینی، مرۆڤ دەکاتە خاوەن کەسایەتییەکی زۆر بەهێز و نەبەز، لەئاقار ئەو دیاردانەدا کە هەڕەشەی لێ دەکەن و جێی مەترسینی.

بەڵێ ئەمە شتێکی بەرچاوەو کەس نکووڵیی لێی نیە، بەڵام ئێمە دەڵێین: هیچ کەس بۆی نیە -مادام ڕێزی عەقڵ و ژیربێژیی (العقل والمنطق)ی لەلابێ- شتێک کە بەرهەم و سوودو کەڵکی بڕواو دینداریيە، بیکاتە هۆی پەیدابوونی!

مرۆڤ کە لەکاتی مەترسییدا پەنای بردۆتە بەر خواپەرستیی و دینداریی، لەبەرئەوە بووە، کە زانیویەتی لەو ڕێیەوە ئارامیی و ئاسوودەیی پێ دەبڕێ، ڕوونتر بڵێم: ئەوەی کە پاڵی بە مرۆڤەوە ناوە، لەبەرانبەری ترسدا، پەنا بەرێتە بەر خوا، خودی ترس نەبووە، بەڵکو ئاگاداریی بووە بەو بەرهەم و کەڵکەی کە بەهۆی پەنا بۆ خوا بردنەوە دەستگیری دەبێ، نەک هەر لەخۆڕا پەنا بەرێتە بەر خوا لە کاردانەوەی ترسدا.

کەواتە مرۆڤ کە لەکاتی هەستکردن بە مەترسییدا رووی لەخوا کردووە، دەستەو داوێنی بووەو، لێی پاڕاوەتەوەو، لەبەری لالێوەتەوەو کڕووزاوەتەوە، بەهیچ ڕەنگێک ماقووڵ نیە، ئەو ڕەفتارەی مرۆڤ بکرێتە بەڵگەی ئەوەی کە ترس بنچینەو هاندەری مرۆڤە بەرەو عەقیدەی ئایینیی و خواپەرستیی، چونکە مرۆڤ کە لەکاتی تەنگانەو تێگیراویی و مەترسییدا پەنا دەباتە بەر خواو، داوای یارمەتیی لێ دەکات، حەتمەن پێشتر ئەو زاتەی-کە ئێستا لێی دەپاڕێتەوە- ناسیوەو قەناعەتی وابووە، کە ئەگەر لەدەمی تەنگانەو لێقەوماندا هانای بۆ بەرێ، ڕزگاری دەکات و دەفریای دێ.

**سێیەم: مەسەلەی لەخواترسان:**

کەسێک کە بڵێ: ئەوە نیە لە ئایینێکی وەک ئیسلامیشدا مەسەلەی لەخواترسان هەیەو، کەسێک لەخوا بترسێ، پلەو پایەیەکی بەرزی هەیە، کەواتە: بۆچی ڕاست نیە کە بڵێین: ترسان بنچینەی پەیدابوونی ئایینە؟!!

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دوو خاڵان دەخەینە ڕوو:

أ- لەخواترسان بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە بابای بڕوادار هەر لەبەرایپیدا لە ترسان پەنای بردۆتە بەرخوا، چونکە ئەو کەسەی بڕوای بەخوا نیەو نایناسێ، یەک تۆز لێی ناترسێ و، ئەوەی بڕوای پێی هەیەو چاکی ناناسێ، دیسان کەم لێی دەترسێ و بەڵام ئەوکەسەی کە بەچاکیی لەخوا دەترسێ، بڕوادارێکە کە چاک خوای ناسیوە، خوای زانا لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ۝٢٨﴾ (الفاطر-٢٨).

واتە: بێگومان بەس بەندە زانایەکانی خوا بەڕاستیی لەخوا دەترسن، مادام وابێ، لە قۆناغی یەکەمدا خواناسین و بڕواهێنان دێتە دی، ئنجالەدوای ناسینی خوا، لەخواترسان دێتە دی بە بارتەقای ناسینی، کەواتە لەخواترسان، ئەنجامی بڕوابەخوا بوون و ناسینیەتی، ئاخر ماقووڵ نیە مرۆڤ بڕوای بەهەبوونی شتێک نەبێو لێشی بترسێ!!

ب- چەمکی لەخواترسان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بەو جۆرە نیە کە بابای پرسیارکەر بیری لێکردۆتەوە؛ چونکە لەهیچ دەقێکی ئیسلامییدا، خوا وەک شتێکی ترسناک و مەترسییدار نەخراوەتە ڕوو، بەڵکو لەخواترسان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بریتیە لە ترسان لە ئەنجامی جێبەجێ نەکردنی ئەرکی بەندایەتیی و تاوانبار بوون، چونکە شتێکی بەڵگەنەویستە، کە خوای بەخشندەو کاربەجێ لەخۆوە کەس سزا نادات، مادام گوناح و سەرپێچیی لێنەپشکوێتەوەو خۆی تووشی تاوان و خراپە نەکات.

## سێیەم: بیردۆزەی نەزانیی

یەکی دیکە لەو بیردۆزانەی ناحەزانی ئایین پەنایان بردوونە بەرێ بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری (ئایین چۆن پەیدا بووە؟) بریتییە لە بیردۆزەی نەزانیی، لایەنگرانی ئەم بیردۆزەیە ئاوا بیردۆزەی نەزانانەی نەزانییان ئاڕاستە دەکەن:

{مرۆڤ هەرکاتێک دیاردەیەکی چاو پێکەوت، هەوڵی دۆزینەوەی هۆی پەیدابوونی دەدات، جا کاتێک نەیتوانی هۆی سروشتی ئەو دیاردەیە بدۆزێتەوە، پەنا دەباتە بەر جیهانی ئەودیو سروشت (ما وراء الطبيعة)و چەند شتێک لەو بارەوە لەمێشکی خۆیدا دروست دەکات و، ئنجا هەر شتێک نەیتوانی پەی بەهۆو چۆنیەتی پەیدابوونی بەرێ، پاڵی دەداتە لای ئەو هێزە نەدیتراوەی کە لەنێو منداڵدانی نەزانیی و بێئاگاییدا گووراوەو دروست بووە.

بۆ وێنە؛ کاتێک کە هۆی دروستبوونی ئاورۆچکەی بن سمی ئەسپانی نەدەزانی، بڕوای وابوو کە چەند چرایەکن بەدەست جندۆکانەوەن!

هەروەها بێئاگایی مرۆڤ لە میکرۆبی نەخۆشیی لەرزوتا (مەلاریا) کە مێشوولەی (ئەنۆفیلس) بلێوی دەکاتەوە، بووبوو بەهۆی ئەوەی کە نەخۆشیی ناوبراو لە فیتی جندان (الجن) بزانێو، گومانی وابوو کە هەرکەسێک لە نیزیک زەلکاوێکەوە بنوێ، جندانی نیشتەجێی ئەو زەلکاوە، دێنە سەری و نەخۆشی دەکەن!

هەر بۆیەش کاتێک بەرەبەرە پەی بردن بەهۆی دیاردە سروشتییەکان بەرەوپێش چوو و، مرۆڤ پتر زانیاری پەیداکرد، هێدی هێدی ئایین لەبرەو کەوت و بێرمێن بوو، ئنجاهەر لێرەشدا بوو کە دروشمی دژایەتیی ئایین و زانیاریی سەری هەڵدا!}

هەڵبەتە ئەم بیردۆزەی نەزانییە!! لە بازاڕی بێبڕواییدا کڕیاری زۆرن، بەڵام شیوعی و مارکسییەکان، سەرقافڵەی هەموانن، بۆ وێنە: لە کتێبی (بنچینەکانی فەلسەفەی مارکسایەتیی)دا گوتراوە:

(کەواتە ئایین دژی زانیاریی ماددیی دیالیکتیکییە.. هەروەک ئەنگلز دەڵێت: بنچینەکانی ئایین لەو بیردۆزە تەسکە نەزانانەدا شاردراونەوە، کە لە حاڵەتێکی وەحشییانەدا پەیدا دەبن..

ئنجا لەبەرئەوەی ئایین لە نەزانیی پەیدا دەبێ، جێی لێکدانەوە زانیارییەکان بە لێکدانەوە خەیاڵییەکان دەگرێتەوە، بەمەش پەردەیەکی ڕەش بەسەر هەر تەفسیرێکی زانیاریانەی دیاردەکاندا دەدات، بۆیە پیاوی ئایینی[1] لەسەر خەیاڵەکانی خۆی سوورە)[2].

کەواتە؛ بەپێی ئەو بیردۆزەیە: (لە سۆنگەی ئەوەوە کە مرۆڤ نەزان و دواکەوتوو بووە، لەدەمی دیتنی چەند دیاردەیەکی وەک؛ لافاو، ئاگرپرژێن، بوومەلەرزە، هەورەتریشقە، نەخۆشیی، دڕندە و...هتددا کاتێک نەیتوانیوە پەی بەهۆی سروشتییان بەرێ، پەنای بردۆتە بەر خەیاڵی خۆی و، خوایەک یان چەند خوایەکی داتاشیوە، دروستبوونی ئەو دیاردانەی پاڵداونە لا)!!

بەڵام با بزانین ئەم بیردۆزەیە لە کوورەی تاقیکردنەوەدا لە کلأ دەردێو، لە تاقیگە (مختبر)ی جەربانندا دەردەچێ، یان بە بەراوەژووەوە: لە کوورەدا دەبێتە خۆڵەمێش و، لە تاقیگەدا ڕیسوا دەبێو بۆی دەردەچێ!!

---

(١) زاراوەی (رجال الدین -پیاوانی ئایین) بەرهەمی کارگەی ئیمپریالیزم و نۆکەرە بەزیوو خۆفرۆشەکانییەتی، چونکە بەپێی ئەو زاراوەیە، ئایین تایبەتە بە کۆمەڵێکی دیاریی کراوەوە، بەڵام لە ڕاستیدا وانیەو بەرنامەی ژیانی خەڵکەو هەموویان تێیدا یەکسانن.

(٢) (أصول الفلسفة الماركسية)، ب١، ل٢٤١.

## پووچاندنەوەی بیردۆزەی نەزانیی

پووچاندنەوەی ئەم گومانە ناتەواوە، حەوجێی خستنەڕووی چەند ڕاستییەکە:

**یەکەم:** بەر لە هەموو شتێک ئەم بیردۆزەیە قسەیەکی بێ پشت و پەنایەو پێچەوانەی واقیعە؛ چونکە مادام بیروهۆشی مرۆڤە سەرەتاییەکان بێهۆش و لاواز بووە، دەبوو لە سەرەتادا بۆ هەر شتێک هۆو بنەڕەتێکی سروشتیی بەرهەست دابنێن هەرچەندە هەڵەش بێ؛ چونکە بۆ مرۆڤێکی سەرەتایی کەم هۆش، پەنابردنە بەر هۆیەکی ماددیی و سروشتیی گەلێک ئاسانترو چاوەڕوانکراوترە، لە پەنابردنە بەر هۆیەکی نادیارو ناماددیی، مرۆڤ کە نەتوانێ پەی بە هۆیەکی سروشتیی و بەرچاو بەرێ، حەوجارحەوجار ناتوانێ پەی بەهۆیەکی نادیارو میتافیزیکیی بەرێ، بەڵێ شتێکی یەکجار ناماقووڵ و چاوەڕوان نەکراوە بۆ مرۆڤێکی سادەی سەرەتایی، کە لە ئاقار پەیبردن بە دیاردەیەکی سروشتیی و بەرهەستدا دەستەوستان بێ، بەڵام لەولاوە بتوانێ دیاردەیەکی نابەرهەست لە بیرو خەیاڵی خۆیدا بحەجمێنێ!

ئایا ئەمە ڕاست وەک ئەوە نیە بڵێی: فلێنەکەس ناتوانێ کۆڵێکی پەنجا کیلۆیی هەڵگرێ، بەڵام لە بن کۆڵێکی سەد کیلۆییدا هەر بە فرکە دەڕوات؟!!

ئنجا ڕەنگە یەکێک بپرسێ:

باشە ئەگەر ڕاستە بۆ مرۆڤێکی سادەی سەرەتایی، پەیبردن بە هۆیەکی سروشتیی و بەرهەست، ئاسانتر بووە لە پەی بردن بە شتێکی نابەرهەست، ئەدی مادام نەزانیی دەوری نەبووبێ لەو پەیدابوونی ئایین و عەقیدەی خواناسییدا، چ شتێک دەوری هەبووە؟!!

لە وەڵامدا دەڵێین: سێ هۆی سەرەکیی دەوریان هەبووە:

**١)** بانگەوازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ، چونکە هەر لە سەرەتای نیشتەجێ بوونی مرۆڤەوە لەسەر ئەم زەوییە، خوای میهرەبان و مشوورخۆر لەنێو هەر گەل و تیرەیەکدا پێغەمبەرێکی ناردوە کە خوایان پێ بناسێنێ، وەک دەفەرموێ:

﴿ ... وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾ (فاطر-٢٤).

واتە: هیچ کۆمەڵێک نەبووە کە ئاگادارکەرەوەیەکی تێدا نەبووبێ.

**٢)** زگماک و خوارسک (فطرة)ی ساغی مرۆڤ، چونکە هەموو مرۆڤێک بە زگماک و سروشت خواناس و ئایین خوازە، وەک خوای بەرزو زانا فەرموویەتی:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ... ﴿٣٠﴾ ﴾ (الروم-٣٠).

واتە: ئنجا ڕووی خۆت ڕاست بگرە بەرانبەر بە ئایین-بەرنامەی خوا- لە حاڵێکدا کە وازت لە هەموو ڕێچکەیەکی دیکەی پووچ هێنابێ، ئەو سروشتەی کە خوا خەڵکی لەسەر خوڵقاندوە، دروستکراوی خوا ناگۆڕێ.

وەک دەبینین لەم ئایەتەدا، ئایینی خواو زگماکی ئینسان بە یەک شت دانراون؛ چونکە وشەی (الدین) بە وشەی (فطرة) گیراوەو (فطرة اللە) کراوەتە بریتی (بدل)ی (الدین).

**٣)** عەقڵی مرۆڤ، چونکە چەند یاسایەکی بەڵگەنەویست (بدیهي)ی ژیریی هەن، کە مرۆڤ ناچار دەکەن بڕوا بەخوا بێنێو بیپەرستێ.

بەڵێ، هەر لە سەرەتای مێژووی ژیانی مرۆڤایەتییەوە، ئەم سێ هۆیانە هاندەری مرۆڤ بوون بەرەو خواناسین و دینداریی.[1]

---

(١) لە بەشی یەکەمدا بە تێری لەوبارەوە دواوین و، ڕوونمان کردۆتەوەو سەلماندووشمانە، کە پاڵنەری ڕاستەقینەی مرۆڤ بۆ خواناسیی و دینداریی، فیطرەت و عەقڵن.

**دووەم:** ئەگەر ئەم بیردۆزەیە فرێ بەسەر ڕاستییەوە بووایە، دەبوو لە بەرانبەری بەرەوپێشچوونی زانیاریدا، عەقیدەی خواناسیی و ئایینی لەکورتی دابایەو، بەرەو دوا گەڕابایەوە، واتە دەبوو لە نێوان ئایین و پەیبردن بە هۆو چۆنیەتی ڕوودانی دیاردە سروشتییەکاندا، پەیوەندییەکی پێچەوانەیی(عکسي)ی هەستی پێکرابایە.

هەروەها دەبوو هەرکەسێک بڕوای بە زانیاریی هەبێو سەرەدەرێک لە چۆنیەتی دروستبوونی دیاردە سروشتییەکان بکات، بڕوای بەخوا نەبێت و بەلای ئایینندا نەچێ و، هەرکەسێک پابەندی ئایین بێو بڕوای بە خوا هەبێ، دژی زانیاریی بێو، لێی داخ لەدڵ بێو نەزانیی بەدڵ بێ!

بەڵام ئێمە دەبینین هەمیشە پێش قەڕەوڵ و سەرقافلێنی ڕۆشنبیری (ثقافة)ی مرۆڤایەتیی و لێهاتووترین زانایانی زانیارییە گەردوونیی و سروشتییەکان، کەسانێک بوو ون کە بەوپەڕی دڵنیاییەوە، قەناعەتیان بە بوونی خوا هەبووەو خۆشیان ویستووەو پشتیان پێ بەستووەو لێی پاڕاونەوە، توخوا ماقووڵە سەدان فەیلەسووف و زاناو ڕۆشنبیری وەک (سوقڕاط، ئەفلاطوون، ئەرسطۆ، ابن سینا، ابن رشد، فارابي، غزالي، فخرالدین الرازي، باسکال، دیکارت، مالبرانش، سپینوزا، کانت، نیوتن، گالیلۆ، کلیپەر، هرشل، ماکس پلانک، جیمس جینز، ئاینشتاین، ئەدیسۆن، ئەلکسیس کاریل، کریسی مۆریسۆن، لیکونت دونوئی و...هتد) لەبەر نەزانیی و نەشارەزاییان بە یاساکانی بوونەوەر، دانیان بە بوونی خوادا هێنابێ؟!!

**سێیەم:** گومانی تێدا نیە کە کەسانێک هەبوون و هەن بەناوی ئایینەوە دژایەتی زانیارییان کردووەو دەکەن، بە تایبەتی لەنێو مێژووی ئایینی شێوێنراوی نەصرانیی دا، دژایەتیی کرانی زانیاریی لەلایەن دارو دەستەی کڵێسای کڵێسەوە شتێکی زەق و بەرچاوەو، سووتێنرانی برۆنۆی ئیتاڵیی و تۆبەپێکرانی گالیلۆ دوو دیمەنی زەقن لەوبارەوە، بەڵام نابێ لەم ڕاستییانەش بێهەواڵ بین:

١- ئەو جەنگ و کێشە دژوارەو کارەساتە دڵتەزێنەی کە لەپاش سەدەکانی نێوەڕاست لە ئەورووپا لە نێوان دارودەستەی خۆسەپێنەرو فریودەری کڵێساو زاناو توێژەرەوانی نوێخوازدا، ڕوویدا، ئەنجامی سروشتیی حەتمیی ئایینی شێوێنراوو پڕ هەڵەو پەڵەی کڵێساو بارودۆخی ئەوسای ئەورووپا بوو و، ماقووڵ نیە حوکمێکی گشتی لێ وەربگیرێو، بەسەر ئایینێکی ڕاستەقینەو نەگۆڕراوو دەستکاریی نەکراویی، وەک ئیسلامیشدا بدرێ.

٢- دەزانین کە لەنێو ئێمەی مسوڵمانیشدا ژمارەیەک مرۆڤی بیرتەسک و کەللە ئیشکی بەڕواڵەت پێشەوا هەبوون و هەن، کە بەناوی ئایینەوە دژایەتیی زانیارییە سروشتییەکانیان کردوە[1]، بەڵام وەک زۆرجاری دیکەش گوتوومانە؛ ڕەوا نیە رەفتاری هەڵەی شوێنکەوتووانی ئایین، بخرێتە ئەستۆی ئایین و، ئایین بە تاوانی غەیری خۆی تاوانبار بکرێ!

٣- مەرج نیە پەنابردنە بەر بیری ئەفسانەیی دژی زانیاریی، بەس لەسەر شوێنکەوتووانی ئایین تاپۆ کرابێ، بەڵکو دیاردەیەکی ئینسانیی گشتییەو پەیوەندیی بە هیچ پێرو کۆمەڵێکەوە نیە، مرۆڤ برواداربێ یان بێبڕوا هەوڵی تەفسیرکردنی ئەو دیاردە سروشتیانە هەر دەدات، کە هەستیان پێ دەکات، ئنجا جاری وا هەیە ڕاستی دەپێکێو، جاری واش هەیە بەهەڵەدا دەچێو تووشی بیروبۆچوون و هەڵوێستی ئەفسانەیی دەبێ، هەرکەسێکیش ئەفسانەکانی (ئیکسیر و ئاوی ژیان)ی زانیاریی کیمیای بیستبن و، وڕێنەکانی (بطلیموس)ی لە گەردووناسییدا، خوێندبنەوە، بێ سێ ودوو ئەو قسانەمان لێ دەسەلمێنێ.

---

(١) بەڵام هیچ کاتێک ئەو جۆرە کەسانە زاناو پێشەوای گەورەو ناودار نەبوون و، حاڵەتێکی وەک ئەوەی کە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا بەناوی سانسۆری عەقیدە (محاکم التفتیش) لە ئەورووپاداو، لەلایەن دامودەزگای کڵێساوە بەڕێوەبراوە، هەرگیز لە مێژووی ئیسلام و مسوڵماناندا، شتێکی ئاواو کەمتریش لەوە ڕووی نەداوە.

**چواره‌م:** گه‌وره‌ترین هه‌ڵه‌ی ده‌هۆڵ کوتانی ئه‌فسانه‌ی (دژایه‌تی نێوان ئایین و زانیاریی) ئه‌وه‌یه که پێیان وایه، ئێمه له‌نێوان هه‌ڵبژاردنی یه‌کێک له دوو ڕێیاندا ناچارو ده‌سته‌وستانین؛ یان بڕوا به‌خوا بێنین، یان به یاسا سروشتییه‌کان! ئنجا هیچ کاتێک ئه‌م دوو ڕێیه ناگه‌نه یه‌ک!

ڕوونتر بڵێم: ئه‌وان پێیان وایه، که بڕوا به‌خوا بوون، واته بڕوا بوون به هێزێک که هه‌ر شتێکی بیکات، به‌بێ به‌کارهێنانی هیچ جۆره هۆو یاسایه‌کی سروشتیی ئه‌نجامی ده‌دات! جا به‌م پێیه دۆزینه‌وه‌ی هه‌ر یاسایه‌کی (فیزیایی، کیمیایی، ژیانه‌وه‌ریی) به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر نه‌بوونی خوا!

به بڕوای منیش ئه‌و په‌نده کوردییه‌ی که ده‌ڵێت: (له‌گوێی گادا خه‌وتووه) چاکترین پێناسه‌ی ئه‌وجۆره که‌سانه‌یه.

له‌به‌رئه‌وه‌ی زانایه‌کی خواناس- چونکه خه‌ڵکی عه‌وام سه‌نگی مه‌حه‌ک نین، به‌تایبه‌تی عه‌وامه‌کانی ئێمه که به‌هۆی بێئاگایی له ئیسلام دووچاری هه‌زاران جۆره ئه‌فسانه بوو ون- جیهان و ده‌وروبه‌ری وه‌ک کۆمه‌ڵه یاساو هۆیه‌کی وردو زانیارییانه دێته به‌رچاوو، خوای گه‌وره‌شی وه‌ک سه‌رپه‌رشت و چاودێرو مشورخۆر دێته به‌رنیگا.

که‌واته؛ بابای بڕوادار و خواناس، نه‌ک هه‌ر یاسای هۆکاریی و یاساکانی سروشت ڕه‌فز ناکات، به‌ڵکو ئه‌و یاسای هۆکاریی (قانون السببية)و ئه‌و یاساو ده‌ستوورانه‌ی له بوونه‌وه‌ردا ده‌یانبینێ و، ئه‌و ڕێک وپێکیی و ورده‌کارییه‌ی هه‌ستی پێ ده‌کات، به پته‌وترین و دره‌وشاوه‌ترین به‌ڵگه‌ی سه‌لماندنی بوونی خوای په‌روه‌ردگاریان داده‌نێ، وه‌ک له به‌شی یه‌که‌مدا خستمانه ڕوو.

**پوختەی مەبەست :**

مرۆڤی خواناس لە بابای خوانەناس پتر بڕوای بە زانیاریی و یاساو دەستووورە سروشتییەکان هەیەو، لەنێوان دان پێداهێنان بە بوونی خواو، دان هێنان بە یاسا سروشتییەکاندا، ناکۆکیی و دژایەتیی نیە، چونکە یاساو دەستووورە ڕێک وپێکەکانی بوونەوەر بەرهەمی زانیاریی و دەسەڵات و لێزانیی و میهرەبانیی خوان، واتە خوا بەرنامەڕێژو یاسادانەر و ڕێکخەر (مُنَظِّم)ی بوونەوەرەو، بە بەخشندەیی و میهرەبانیی خۆی چاودێریی دەکاو دەیپارێزێ.

بەهیچ ڕەنگێک بڕوابوون بە ڕێکوپێکیی و وردەکاریی بوونەوەرو پەی بردن بە یاساو دەستوورەکانی، جێی بڕوا بەخوا بوون پڕ ناکاتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، پەی بردن بەوە کە بوونەوەر ڕێکخراو (مُنَظَّم)و پڕ وردەکارییەو، بەگوێرەی یاسا بەڕێوە دەچێ، ناچارمان دەکات کە دان بنێین بە بوونی خوایەکی پەروەدگاری زانای توانای کاربەجێدا، کە ئەو بەرنامەو وردەکاریی و ڕێکوپێکییەی خستۆتە نێو بوونەوەرەوە[1].



١ ) لە بەشی یەکەم (پاڵنەری ڕاستەقینەی مرۆڤ بەرەو خواناسیی)دا، ئەو مەسەلەیە زۆرباش توێژراوەتەوە.

## چوارەم: بیردۆزەی جینسیی

سەرسوڕهێنەرترین بیردۆزە کە لە بابەت پەیدابوونی ئایینەوە، لە کارگەی خەیاڵ و ئەفسانەسازیی بێباوەڕاندا سازکراوە، بیردۆزەی جینسییە کە (زیگموند فرۆید) یەکەمین دەمڕاستیەتی.

فرۆید بڕوای وایە کە هۆی بنچینەیی هەموو دیاردەکانی ژیانی مرۆڤ، بریتیە لە غەریزەی جینسیی؛ واتە: هەروەک چۆن مارکس هەموو دیاردەکانی کۆمەڵگا بە بیردۆزەی ئابووریی تەفسیر دەکات، فرۆیدیش بەهەمان شێوە، بەڵام فرۆید لەجیاتی ئابووری (اقتصاد) غەریزەی جینسیی بەو هاندەرە داناوە.

بەڵام پێویستە بزانین کە فرۆید چەمک و واتایەکی فراوانتر لەوەی زانراوە بۆ غەریزەی جینسیی بڕیار دەدات، فرۆید ئارەزوو و مەیلی جینسیی وەک حاڵەتی برسیەتی و حەوجێبوونی خۆراک حسێب دەکات.

فرۆید دەیەوێ هەموو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ هەر لەکاتی لەدایکبوونییەوە هەتا کاتی خرانە گۆڕی، لە دەلاقەی جینسەوە تەفسیر بکات، منداڵ کە مەمکی دایکی دەمژێ، کوڕو کچ کە دایک و باییان خۆش دەوێن، جوتیار کە بێڵەکەی لە زەوییەوە دەژەنێ، قوتابی کە پێنووسەکەی دەگرێ، نووسەر کە لە گۆشەیەکدا دادەنیشێ و شت دەنووسێ، هونەرمەند کە توانای داهێنانی خۆی لە دروست کردنی تابلۆی جوان جواندا دەخاتە کار... ئەمانە گشتیان هەوڵی ڕازیکردن و تێرکردنی ئارەزووی جینسیی یان ئارەزووە کپکراوەکانی جنسییان دەدەن!

هەڵبەتە هەموو ئەم ئەنجامگیریی (استنتاج)یەش لەسەر بنچینەی جیهانی ئەودیو هۆش (عالم اللاشعور)ە، ئەو دنیایەی کە زۆر لە دنیای

هۆش (عالم الشعور) فراوانترە، بەڵام مرۆڤ لێی ئاگادار نیە؛ دنیایەك كە هەر لە سەرەتای منداڵییەوە بەگوێرەی جۆری ڕەفتارو ئاكارەكانی مرۆڤ دروست دەبێ، ئەو دنیایەی كە جێگەی ئارەزووە كپكراوو تێرنەكراوەكانە.

فرۆید هەوڵی داوە كە مەسەلەی خواناسیی و دینداریش بگێڕێتەوە سەر بنەڕەتێكی جینسیی، ئنجا ئارەزووی تەفسیركردنی دیاردەی ئایین لەسەر بنچینەیەكی جینسیی، پاڵی بە فرۆیدەوە نا كە پەنا بەرێتە بەر ئەفسانەكانی مێژوو و داوای یارمەتی و هاوكارییان لێ بكات لە جێبەجێكردنی كارەكەیدا!!

جا فرۆید یەك ئەفسانەی سەرسامكەر دەگێڕێتەوەو دەیكاتە سەرچاوەی پەیدابوونی گرێی ئۆدیب (عقدة الأوديب)، ئەو گرێی ئۆدیبەی كە بەبۆچوونی فرۆید، هۆ و بنەمای پەیدابوونی ئایین و هونەرو ڕەوشت و هەموو چالاكییە كۆمەڵێیەتییەكانی مرۆڤە.

(گرێی ئۆدیب)یش سەرچاوەكەی ئەفسانەیەكی یۆنانییەو پوختەكەی ئاوایە:

[(ڕائاكل)ی فاڵچیی بە (لایئوس) پادشای (تەبس) دەڵێت: تۆ بەدەستی (ئۆدیب)ی كوڕت دەكوژرێی، پادشاش بۆ پێشگیریكردن لەو كارەساتە، دێتە بیری كوشتنی (ئۆدیب)ی كوڕی كە تازە لەدایك بووە، بەوجۆرە لە درەختێكی دەبەستێو بەجێی دەهێڵێ، بەڵام چەند شوانێك هەڵی دەگرنەوەو بەخێوی دەكەن، ئۆدیب گەورە دەبێو، ڕۆژێك لە هەرەتی لاویدا، چاوی بە (لایئوس) دەكەوێو بێئەوەی بیناسێ، پاش شەڕێكی گەرم دەیكوژێ و، درێژە بە گەشتەكەی دەدات، لەوكاتەدا ئاژەڵێكی سەیر بەناوی ئسفنكس (أبوالهول) لە شاری تەبس پەیدا دەبێو، پادشای ئەوكاتە بەڵێن دەدات كە هەركەسێك بتوانێ بیكوژێ، یان لە شاری وەدەربنێ تەخت و تاجی پاشایەتی دەداتێو، شاژنی لێ مارە دەكات، ئۆدیب لەم كارەدا سەردەكەوێ و، دەبێتە پادشاو شاژنە (ژوكاست) كە دایكیەتی و نایناسێ بە ژن دەگرێ،

دوای ماوه‌یه‌ک فاڵچییان ئۆدیب ئاگادار ده‌که‌نه‌وه‌، دایکی که‌ ئه‌وه‌ ده‌زانێ خۆی به‌ دره‌ختێک هه‌ڵده‌واسێو ئۆدیب و خوشکه‌که‌شی (ئانتیگون) له‌شار ده‌چنه‌ ده‌رێ و له‌ بیشه‌و جه‌نگه‌ڵی (ئه‌میندیس)دا ون ده‌بن..].

ئنجا فرۆید ئاوا له‌م ئه‌فسانه‌یه‌ ئه‌نجامگیریی ده‌کات:[1]

ئۆدیب له‌نێو هه‌ستی ئه‌ودیو هۆش (اللاشعور)ی ڕق و قین و دوژمنایه‌تییه‌کی قووڵی ده‌رباره‌ی بابی حه‌شار داوه‌، له‌ سۆنگه‌ی ئه‌وه‌وه‌ که‌ ڕێی به‌ختیاریی لێ گرتوه‌ له‌گه‌ڵ دایکیدا، ئنجا ئۆدیب بۆ هێنانه‌دی ئه‌و ئاره‌زووه‌ی؛ واته‌ به‌ژن گرتنی دایکی، ئاره‌زووی کوشتنی باوکی په‌یدا بووه‌، له‌ ئه‌نجامی ئه‌مه‌وه‌ بابی (ئۆدیب)یش ئه‌می به‌ دوژمن زانیوه‌، وه‌ک ڕۆڵه‌ی خۆی سه‌یری نه‌کردوه‌.

ئنجا فرۆید ئه‌و ئه‌نجامگیرییه‌ی که‌ له‌م ئه‌فسانه‌ی ئۆدیبه‌ی وه‌رگرتوه‌، کردوویه‌ته‌ حوکمێکی گشتیی، که‌ هه‌موو پیاوان بگرێته‌وه‌.

هه‌ڵبه‌ته‌ وه‌ک گوتمان فرۆید (گرێی ئۆدیب) به‌ بنچینه‌و چاوگی په‌یدابوونی ئایین و ڕه‌وشت و هونه‌رو هه‌موو کاروباره‌ کۆمه‌ڵێه‌تییه‌کان داده‌نێ، به‌ڵام بۆ مه‌سه‌له‌ی په‌یدابوونی ئایین، فرۆید ئه‌فسانه‌یه‌کی دیکه‌شی له‌ مێژووی تیره‌ وه‌حشییه‌کان خواستۆته‌وه‌، که‌ به‌م جۆره‌ ئاراسته‌ی ده‌کات:

(سه‌رده‌می کۆن خێزانێک هه‌بووه‌ که‌ له‌ بابێک و کۆمه‌ڵێک ژن و کوڕو کچ پێکهاتوه‌، بابه‌که‌ هه‌موو خێزانه‌که‌-به‌تایبه‌تی ژن و کچه‌کان- ده‌خاته‌ ژێر ڕکێفی خۆیه‌وه‌، له‌گه‌ڵ کوڕه‌کاندا زۆر دڵڕه‌قانه‌ ڕه‌فتار ده‌کات، به‌ڵام دوای ئه‌وه‌ی بابه‌که‌ پیرو که‌نه‌فت ده‌بێ، کوڕه‌کان ده‌یکوژن و گۆشته‌که‌ی ده‌خۆن، به‌ڵام هیچ کام له‌ کوڕه‌کان ناتوانن جێی بابیان بگرنه‌وه‌، له‌ترسی ئه‌وه‌ی که‌ به‌ مه‌ره‌دی بابیان بچن)[2].

---

(١) له‌کاتی ڕه‌خنه‌و هه‌ڵسه‌نگاندندا باسه‌که‌ باشتر ڕوون ده‌بێته‌وه‌، بۆیه‌ لێره‌ درێژه‌ی نادەمێ.

(٢) ئه‌م به‌سه‌رهاته‌م به‌ هه‌ڵه‌ له‌ کتێبی زنجیره‌ی: (ده‌بەرێک ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان)دا به‌ گرێی ئۆدیب ناوبردوه‌)، بڕوانه‌ ئه‌ڵقه‌ی سێیه‌م، لاپه‌ڕه‌ (١٠٠)، چاپی یه‌که‌م و دووه‌م، به‌ڵام له‌ چاپی سێیه‌م دا ئه‌م هه‌ڵه‌یه‌م ڕاست کردۆته‌وه‌، بڕوانه‌ لاپه‌ڕه‌ (١٠٣و١٠٤)، نووسینگه‌ی ته‌فسیر (٢٠٠٦)

ئنجا فرۆید دوای درێژدادڕییەکی زۆرو چەندەها قۆرت و پێچ، ئەم ئەنجامگیرییە وەدەست دێنێ:

(پەشێمان بوونەوە لە کوشتنی بابەکە، ئنجا ڕێزنواندنێکی تێکەڵ بە ترس بەرانبەر بابەکە، ئنجا قەدەغەکردنی ژنهێنان لە ئافرەتانی ئەو تیرەیە، ئنجالەمەوە ڕەگ و ڕیشەی ئایین و ڕەوشت دروست بوون؛ چونکە لە قەدەغەکرانی بەژنگرتنی ئافرەتانی تیرەکە، ڕەوشت و ئاکار پەیدا بوو و، ئەو ڕێزو ترسەش کە بەرانبەر بە بابەکە پێشان دەدرا، دواتر گۆڕا بۆ پەرستن و، ئنجا پەرسترانی بابەکەش وازی لێهێنراو پەرستنی بەردو ڕووەک و ژیاندار جێی گرتەوە، ئنجا لەدواییدا ئاستی پەرستنەکە ژووریا چوو و بوو بە پەرستنی هێزێکی نابەرهەست بەناوی خوا)!!

ئەمە پوختەی بیروڕاو هەڵوێستی فرۆید-ڕابەری بیردۆزەی جینسیی- بوو لەبابەت چۆنیەتی پەیدابوونی ئایین و بیری خواناسییەوە، بەڵام با بەشێنەیی لە کەوو بێژنگی ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی بدەین، داخۆ هەمووی سەرکوێزر (سەرکۆتەڵ) دەردەچێ یان نا!!

## ڕەخنەو هەڵسەنگاندن:

دوای ئەوەی بیردۆزەی جینسییم لە بێژنگدا، دیتم هەمووی سەرکوێزرەو دەنکێکی کاکڵداریشی تێدا نیە، سەرکوێزربوونی بیردۆزەی ناوبراویش، لەم چەند خاڵەدا دەسەلمێنین:

**یەکەم:** گەورەترین کون و کەلێنی بیردۆزەی جینسیی ئەوەیە کە بەس دەعواو لاف لێدانێکی ڕووتەو، هیچ پشتیوانێکی لە عەقڵ و زانیاریی و مێژوودا نیە، تاقە شتێک کە پشتگیریی ئەو بیردۆزەیە بکات، گێڕانەوەی چەند بەسەرهاتێکی کۆنی تیرە وەحشیی و نیمچە وەحشییەکانە، کە هەموو (نەنک)ێک لەو جۆرە حیکایەتانەدا لە فرۆید کارامەترە!!

جا نازانم بە چ کلۆجێک دەگونجێ دیاردەی خواناسیی و ئایینپەروەریی کە بەدرێژایی مێژوو زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی بڕوای پێ هەبووە و لایەنگیریی کردوە، لەسەر بنچینەی یەک ئەفسانەی بێسەروپێ وەلابنرێ!!

**دووەم:** ئەمڕۆ لەنێو شارەزاو پسپۆڕانی دەروونناسدا - چ مسوڵمان چ نامسوڵمان - بەدەگمەن کەسێک پەیدا دەبێ قسەکانی فرۆید قبووڵ بکات؛ چونکە هەرکەسێک تۆزێک وردبوونەوەی هەبێ، دەزانێ کە وێڕای غەریزەی جینسیی چەندەها ساندەری دیکەش هەن، کاردەکەنە سەر ژیانی مرۆڤ، وەک سروشتی خواناسیی و، غەریزەی شت هەبوون و، هاندەری شت زانین و، خۆدەرخستن و، شەیدایی جوانیی و ڕەوشت بەرزیی.

جا ئێستا ئەم پرسیارە دەکەین:

ئایا ئەگەر - گریمان - غەریزەی جینسیی لە سروشتی مرۆڤدا نەبووایە، مرۆڤ بەدوای خواناسیی و زانیاریی و ڕەوشت بەرزیی و جوانیی و خۆدەرخستن و پلەوپایەدا عەودالْ نەدەبوو؟!!

**سێیەم:** لەم بیردۆزەیەدا عەقڵی مرۆڤ بەجارێک فەرامۆش کراوەو تەنیا دەوری توورەکەیەکی بۆ دانراوە، بەڵام عاقڵمەند و زاناو توێژەرەوانی سەرلەبەری مرۆڤایەتی، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون کە ئینسان بەس بریتی نیە لە تۆپەڵێک هەواو ئارەزوو، کەسێکیش کە سەرنجی مێژووی مرۆڤایەتی بدات لە هەر لایەنێکییەوە، دەبینێ شوێن پەنجەی عەقڵ لە شوێن پەنجەی هەموو شتێک زیاتر بە دیاردەو ڕووداوەکانییەوە دیارە، ئەو کەسەش کە عەقڵ بە سفری پاش فاریزە دادەنێ، وا دیارە لە هەمبانەی خۆیدا گوێزی ژماردوون و، عەقڵی لە گوتەو کردەوەو جموجۆڵیدا هەرهێندەی سفری پاش فاریزە کاریگەر بووە!!

**چوارەم:** فرۆید ئەزموونەکانی خۆی بۆ سەلماندنی ڕاستیی قسەکانی بەس لەنێو چوارچێوەی ئەو تیرە وەحشییانەدا ئەنجام داوە کە بە (طەوطەمیزم)

ناسراون؛ چونکە زانیویەتی بارودۆخی ئەو تیرەو هۆزانە لەگەڵ بیردۆزەکەیدا دەسازێ-هەر کام لەو تیرانە ئاژەڵێک یان ڕووەکێک دەپەرستێو بەبابەگەورەی خۆی دادەنێ-.

دیسان لەنێو هەموو ئایینەکاندا نەصرانییەتی هەڵبژاردوە؛ چونکە نەصرانییەکان -بەهەڵەو نەزانیی- خوا بەناوی (باب) بانگ دەکەن، تەنانەت فرۆید ئایینەکەی خۆیشی-کە جوولەکایەتییە- پشت گوێ خستوە، چونکە زانیویەتی لەگەڵ بیردۆزەکەیدا هەڵناکات!!

کەواتە؛ فرۆید بۆ سەلماندنی قسەکانی بەس بەدوای ئەو دیاردانەدا گەڕاوە کە لەگەڵ بیردۆزەکەیدا دەسازێن، مادام وابێ دەڵێین: فرۆید هەرچەندە لافی زانیاریی لێدەدات، بەڵام بەشێوەیەکی واقیعییانەو زانیارییانە لە ڕاستیی نەکۆڵیوەتەوە، بەڵکو بەدوای بەرژەوەندیی خۆیدا گەڕاوە لەسەر بنچینەی ئارەزووی خۆی!

**پێنجەم:** ئەگەر دامان نا ئەو بەسەرهاتە ئەفسانەییانەی فرۆید کردوونیە تاقە پشتیوانی قسەکانی، ڕاست و تەواویش بن، بە چ بەڵگەیەک دەتوانین بڵێین: بەر لە ڕوودانی ئەو بەسەرهاتانەش بیری خواناسیی و ئایین دۆستیی هەر نەبووە؟! بێگومان ئێمە لە بەشی یەکەمدا سەلماندمان کە لەوەتی مرۆڤ دروست بووە خواناسیی هەر هەبووەو هەتا مرۆڤیش مابێ هەر دەمێنێ.

**شەشەم:** چۆن دەگونجێو چ عەقڵێک پەسندی دەکات کە کوشتنی بابێک لە تیرەیەکدا ببێتە هۆی پەیدابوونی بڕوا بەخوا هێنان لە هەموو چاخ و سەردەمەکانی مێژووی ژیانی مرۆڤایەتیدا؟!!

**حەوتەم:** فرۆید خۆیشی لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا، ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە بیردۆزەی جینسیی یەکێکە لەچەند بۆچوونێک کە لەبابەت چۆنیەتی پەیدابوونی ئایینەوە خراونەتە ڕوو، ئەوەتا لەوبارەوە دەڵێ:

(تاقە مەبەستی من ئەوەیە کە یەک بۆچوونی نوێ ڕەگەڵ ئەو بۆچوونانە بخەم کە دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی ئایین و ڕەوشت و کۆمەڵگا پێشنیار کراون)!![1]

بەڵام بریا سەد بریا-داری بریاش بەرناگرێ- ئێستا فرۆید زیندوو بایە، تاکو بەچاوی خۆی ئەو نیمچە خوێندەوارانەی دیبان، کە گەلێک لەوی فرۆیدترو بێڕەزاترن و، قسەیەک کە فرۆید پەنجا ساڵ[2] پتر پێش ئێستا بە دوودڵیی و گومانەوە کردوویەتی، ئەوان ئێستا وەک زانیارییەکی بەڵگە نەویست خۆی پێوە بادەدەن!

**هەشتەم:** ڕەخنەی دەروونناسان: لە ئەنجامی ئەوەدا کە فرۆید بەس پەیدابوونی دیاردەی خواناسیی و ئایین دۆستیی بە زادەی جینس نازانێ، بەڵکو هەموو چالاکییەکانی ژیان، لە فیتی جینس دەزانێ، لە سۆنگەی ئەوەوە تەنانەت قوتابی و هاوکارانی خۆیشی لێی لالووت بوو ون و، نشتەری ڕەخنەیان لە پۆرگی پڕ لە کێمی ئەفسانەی بیردۆزەکەی وەکار خستوە.

یەکێک لەوانە (دکتۆر کارل گوستاف یونگ)ە کە ناودارترین هاوکاری فرۆیدەو زۆربەی بۆچوونەکانی فرۆیدی پێ ڕاست نین و ڕەخنەی زۆری لێیان هەیە.

یەکێکی دیکە لەوانە (ئالفەر ئادلەر)ە، ئادلەر یەکەمین کەس بوو کە لایەنی کۆمەلێیەتیی ئینسانی دەستنیشان کرد.

یەکی دیکە لەو زانایانەی کە لە دەروونزانییدا پایەیەکی بەرزیان هەیەو ڕەخنەیان لە فرۆید گرتوە (کارن هورنای)یە، هورنای دەڵێت:

---

(١) (توتم وتابو)، ل٢١٥، لە (خدا در أندیشەء بشر)، ل١٣٦، عبداللە نصری.

(٢) لەکاتی نووسینی کتێبەکەوە کە ١٩٨٥ هـ.

(ئـه‌و كۆمه‌ڵـه بیروبۆچوونانـه‌ی فرۆیـد كـه ڕواڵه‌تێكی جوان و بریقه‌داریان هه‌یه، هه‌ڵـه‌ن، به‌تایبه‌تـی ئـه‌و جـۆره بیربۆچوونانـه‌ی كـه په‌یوه‌ندییـان بـه بنچینه‌یه‌كـی میكانیكیـی و ژیانه‌وه‌رزانییـه‌وه هه‌یـه، پێویسـته لاببرێن، تاكـو ده‌روونزانیـی بتوانـێ هه‌مـوو توانای خۆی وه‌ك زانیارییه‌كی ئینسانی بخاتـه گـۆڕێ.

**نۆیــــه‌م: گرێی ئۆدیــب:**

**١)** به‌سـه‌رهاتی په‌یدابوونـی گرێـی ئۆدیب، جێـی په‌سـندیی و ڕه‌زامه‌ندیـی هیـچ كام لـه مه‌كته‌به‌كانـی ده‌روونزانیـی نیـه‌و، ده‌روونناسـان ڕه‌خنـه‌ی زۆریان لێگرتوه:

هورنـای ده‌ڵێـت: (دوژمنایه‌تیـی منـداڵ به‌رانبـه‌ر بـه بابـی كـه فرۆیـد بـه ئه‌نجامـی ئـاره‌زووی جینسـیی ده‌زانـێ، لـه ڕاسـتیدا لـه ئه‌نجامـی توندوتیژیـی و فه‌رمـان و پێشـگیریی (الأمـر والمنـع)ی بابـدا، هاتۆتـه‌دی؛ چونكـه منـداڵ عه‌وداڵـی چێژوه‌رگرتنـه‌و، هه‌ركه‌سـێك پێشـگیریی ڕابـواردن و چێژوه‌رگرتنـی لێبـكات بـه دوژمنـی داده‌نـێ.)

بێگومـان قسـه‌ی هورنـای شتێكی واقیعیـی و ڕاسـته؛ چونكـه ئێمـه ده‌بینیـن ئـه‌و بابانـه‌ی له‌گـه‌ڵ كوڕه‌كانیانـدا دڵـڕه‌ق و توندوتیـژن، بـه‌زۆری كوڕه‌كانیـان لاسـارو سـه‌رپێچییكه‌ر ده‌رده‌چـن.

كـارل یۆنـگ ده‌ڵێـت: (مه‌یلی منداڵ -كوڕ یـان كـچ- بـۆ دایـك و بابـی ته‌نیـا مه‌یلێكـی منداڵێنه‌یـه‌و ناگونجـێ بڵێیـن لـه قۆناغێكـی هێنـده سـه‌ره‌تایی ته‌مه‌نیـدا ئـاره‌زووی جینسـی لـه منداڵـدا هه‌یـه)!!.

دیسـان ده‌ڵـێ: (په‌یوه‌ندیـی خۆشه‌ویسـتیی منـداڵ -ی كـوڕ- به‌رانبـه‌ر بـه دایكـی لـه قۆناغـی سـه‌ره‌تاییدا، ڕه‌گ و ڕیشـه‌یه‌كی جینسـیی نیـه، به‌ڵكـو لـه ئه‌نجامـی ئه‌وه‌دایـه كـه منـداڵ دایكـی بـه سه‌رپه‌رشـت و پارێزه‌ری خـۆی ده‌زانـێ، ئنجـا ئه‌گـه‌ر هه‌سـت بـكات كه‌سێـك دایكـی لـێ داگیـر ده‌كات، هه‌سـت بـه حه‌سـوودیی و ڕژدیـی و په‌رێشـانیی ده‌كات).

**٢)** ئێمە ئەگەر فرۆید هەر بە بیردۆزەکەی خۆی داوەریی (محكمة)ی لەگەڵ بکەین، وەدرۆ دەکەوێتەوەو تاوانبار (محكوم) دەردەچێ!

چونکە بەپێی بیردۆزەی وی کەسانێک کە غەریزەی جینسییان کپ ناکریێ، نەدەبوو بڕوا بەخوا بێنن؛ چونکە گرێی ئۆدیبێک لەودیوی هۆش (لاشعور)یان پەیدا نەبووە، کە دواتر ببێتە پاڵنەری بڕوا بەخوا هێنان، بەڵام واقیع بە پێچەوانەوەیە؛ واتە ئێمە گەلێک کەس دەبینین هیچ شوێنەواری (گرێی ئۆدیب)یان تێدا نیەو، بڕوایەکی زۆر چاکیشیان بەخوا هەیە.

**دەیەم:** بەسەرهاتی خێزانەکە: ئەم بەسەرهاتە وێڕای ئەوەی کە ئەفسانەیەکی کۆنە، بەهیچ شێوەیەک ئەو مەبەستەشی لێ وەرناگیرێ کە فرۆید دەیەوێ؛ چونکە:

فرۆید کە دەڵێ: بابەکە دەستی بەسەر هەموو ئافرەتانی خێزانەکەدا گرتوە، دەبێ پاڵنەرێک هەبووبێ پاڵی پێوەنابێ کە بەوکارەی هەستێ، بەلایەنی کەمەوە دەبێ غەریزەی موڵکایەتیی تاک (الملكية الفردية)و ئێرەیی بردن (حەسودیی)ی تێدا هەبووبن، دیسان کاردانەوەی کوڕەکانیش لانی کەم یەکی لەسەر غەریزەی تۆڵەستاندن (إنتقام) کەوتوە، کەواتە پێویستە هەرکام لەم خەسڵەتانە؛ شت هەبوون، حەسودیی، تۆڵەستاندن، لە دروستکردنی ئەو بەسەرهاتەدا، لەپێش غەریزەی جینسییەوە دابنرێن.

چ بەرژەوەندییەکی جینسیی-ئەگەر فرۆید ڕاست دەکات جینس سەرچاوەی هەموو چالاکییەکانە- پاڵی بەکوڕەکانەوە نا، کە لەپاش مردنی بابیان ئافرەتانی ئەو تیرەیە لەخۆیان قەدەغە بکەن، بۆچی دوای لاچوونی بەربەستی ڕێی غەریزەی جینسییان، سەرچاوەی جینسییان نەتەقییەوەو، ژیانیان نەبوو بە جلێتاوێکی جینسیی؟!!

**یازدەم: پشکنینی کەسایەتیی فرۆید:**

**١-** فرۆید بابایەکی جوولەکە بووە، لەلایەن کڵێساو شوێنکەوتووانییەوە بەردەوام لێشاوی تانەو تەشەرو ڕەخنان ڕووی تێکردوە، بۆیە هەر لە ڕۆژێک گەڕاوە کە دەرفەتێکی گونجاوی دەست بکەوێ و، بوڕکانی ڕق و قینی پەنگ خواردووەوەو پەزمەندەکراوی بەڕووی دامودەزگای کڵێسادا بتەقێنێتەوە.

بەڵێ، بەپێی بنەماکانی زانیاریی دەرونزانیی، ناتوانین باوەڕ بکەین کە ئەو هەموو بە سووک سەیرکران و سەرکۆنەکران و گاڵتەپێکرانەی فرۆید لەلایەن کڵێساوە - بەتاوانی جوولەکایەتیی- کە لەسەرەتای قوتابییەتییەوە تا کۆتایی ژیانی درێژەی کێشاوە، هیچ جۆرە شوێنەوارێکی بەدی لە بەشی ئەو دیو هۆش (لاشعور)ی فرۆیددا بەجێ نەهێشتبێ!!

**٢-** گەلی جوولەکە بە گشتی لە دڵی هەموو گەل و نەتەوەکانی دیکەدا بەدفەڕو ناپەسندن، لە سۆنگەی ئەوەوە کە جوولەکە هەموو گەلانی جیهان دەبوغزێنن و دەڵێن: پێویستە گشت خێروبێرەکانی دنیا لەبەر قەڵەمڕەوی ئێمەدا بن و، گەلانی دیکە وەک ئاژەڵ و ماڵیێت ڕام بکرێن، بۆ هێنانەدی بەرژەوەندییەکانمان!!

جا لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییەدا دەتوانین بڵێین: فرۆیدیش وەک دوو هاوڕەگەزەکەی دیکەی (مارکس و دوڕکایم) ویستوویەتی لەبن شاقەلی بیردۆزەیەکی پووچی بەناو زانیارییانەدا، ڕق و داخی خۆی بە مرۆڤایەتیی بڕێژێو، بەزمانی کردارو حاڵ پێیان بڵێ: ئەوەی ئێوە بەناوی ئایین و خواناسیی و ڕەوشت و ئاکاری پەسندەوە ڕێزی لێدەگرن، ئەو سەرچاوە ڕوون و بێگەردە نیە کە ئێوە گومانتان بۆی چووە، بەڵکو وەک سیپاڵێکی پیس، نۆکەرەتان لە زەلکاوی جینس وەردراوە!!

خوێنەری بەڕێز!

وەک دیتت؛ بیردۆزەی جینسیی دەربارەی پەیدابوونی ئایین[١]، دوای هەڵسەنگێنران و لەبێژنگدرانی، چ سەرکوێرزێکی بێ[٢] فێڵ دەرچوو و، چۆن بە مەرەدی هاوەڵێنی پێشووی چوو!![٣]



---

(١) ئێمە لێرەدا بەس لە گۆشەنیگای (چۆنیەتی پەیدابوونی ئایین)ەوە بیردۆزەی جینسیی و قسەکانی فرۆیدمان لە بێژنگ دا، بەڵام بۆ لەبێژنگدانی سەرلەبەری بیردۆزەی گۆڕین، سەرنجی (فرۆید لە تەرزاووی ژێرییدا) بدە، نووسراوی محمد مەلا صالح شارەزووری.

(٢) بێ فێڵ: بێ خڵتەوساغ.

(٣) بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لەم کتێبانە وەرگرتوە:
(خوا در أندیشەء بشر) عبدالله نصری.
(أنگیزەء پیدایش مذاهب) ناصر مکارم شیرازی.
(دەبەرێک ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان) ئەڵقەی سێیەم. نووسەر.

## پێنجەم: بیردۆزەی داخوازییە دەروونیی و كۆمەڵێیەتییەكان

یەكی دیكە لەو بیردۆزانەی ویستوویانە چۆنیەتی پەیدابوونی خواناسیی و دینداریی تەفسیر بكەن، ئەو بیردۆزەیە كە دەڵێت:

مرۆڤ چەند داخوازییەكی دەروونیی و كۆمەڵێیەتیی هەن، كە بەبێ بڕواهێنان بەهێزێكی دەسەڵاتداری میهرەبان، بەشێوەیەكی تەواو، بۆی تێروتەسەل ناكرێن و داواكارییەكانیانی پێ جێبەجێ ناكرێن.

ئێستاش با لەچەند خاڵێكدا نێوەڕۆك و كاكڵی ئەو بیردۆزەیە بخەینە ڕوو:

**یەكەم:** مرۆڤ لەژیانیدا جۆرەها دەردو ئازارو ئەشكەنجەی گیانیی و جەستەیی تووش دەبن، كە بەهۆی بڕواهێنان بە زاتێكی سەرووی سروشتییەوە، تاوو تینێكی بەرچاو بۆ كەمكردنەوەیان دەرەخسێ، ئنجا هەر هەستكردن بەو تاووتینەش بووە كە پاڵی بە مرۆڤەوە ناوە بڕوا بەخوا بێنێ.

**دووەم:** دیسان مرۆڤ لە ئاقار هێرشی بێ بەزەییانەی گیروگرفت و كۆسپ و تەگەرەكانی ژیانیدا، -ئەو گیروگرفتانەی كە بەتەنێ توانای چارەسەركردنیانی نیە- حەوجێی پشت و پەنایەكی بەهێزترە لەوەی كە لەدنیای بەرهەستدا هەیەتی، ئنجا بڕواهێنان بەو پشتیوانە، داخوازییەكی دەروونی مرۆڤە.

**سێیەم:** مرۆڤ هەمیشە لەدەست تەنیایی ڕادەكاو، حەز لەچارەی ناكات، بەڵام كاروانی نەسرەوتووی ژیان بەردەوام بەرەو تەنیایی دەیبات؛ چونكە دۆست و برادەرو خۆشەویستانی یەك لەدوای یەك بەجێی دەهێڵن و، شوێنی خاڵی بووشیان تین و فشار (ضغط)ێكی زۆر قورسی دەخاتە سەر، ئنجا بڕواهێنان بە زاتێكی بێسەرەتاو كۆتایی كە پارێزگاریی لێ دەكات و، لەگەڵی میهرەبانە، تا ئەندازەیەكی زۆر جێی خاڵی بووی دۆست و

خۆشەویستانی بۆ پڕ دەکاتەوەو، باری قورسی سەرشانی لێ سووک دەکات، بۆیە مرۆڤ بەرەو خواناسیی و ئایین پەروەریی دەچێ.

**چوارەم:** گێرەو کێشەو بەڵێو تێشکان و مەینەتیی و دەردەسەریی و بەئامانج نەگەیشتن، لەژیانی زۆربەی خەڵکیدا هەن، جا بڕوابوون بە خواو بەژیانی پاش مردنێ، کە شوێنی هاتنەدی ئاواتان و پێک شادبوونەوەی مرۆڤانە، سێبووریی هێن و ئۆخژن پەیداکەرێکی یەکجار کاریگەرە.

**پێنجەم:** لە ئەنجامی تاوان کردندا، مرۆڤ دووچاری نارەحەتیی و پەشێمانیی و بێزاریی دەبێ، جا بەهۆی ئیمانداریی و بڕواهێنانەوە بەزاتێکی بەخشندەو تاوانپۆش و بەبەزەیی، ئەو نائاسوودەیی و ویژدان نارەحەت بوون و بێز لەخۆبوونەوەیە نامێنێو لادەچێ، جا مرۆڤ لەژێر فشارو تاووتینی ئەو داخوازییانەدا، پەنا دەباتە بەر ئایین و خواناسیی.

پووچاندنەوەی بیردۆزەی داخوازییە دەروونیی و کۆمەڵێیەتییەکان

لە پووچاندنەوەی ئەم گومانەشدا-کە دوایین گومانە دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی ئایین- چەند ڕاستییەک دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** گومانی تێدا نیە کە ئایینێکی ڕاست و تەواو، توانای وەڵامدانەوەی هەموو پرسیارەکانی مرۆڤ و تێرکردنی هەموو داخوازییەکانی هەیە، جا ئەو داخوازییانە دەروونیی بن یان کۆمەڵێیەتیی، بۆ وێنە هیچ کەس نکووڵیی لەوە نیە کە ئایین چاکترین ساڕێژکەرو شیفاهێنی دڵبریندااران و دەردەداران و بێچارانە؛ چونکە مرۆڤی خواناس، پشت بە خوایەکی هێندە دەستەڵاتدارو بەخشندەو بەدەنگەوەهاتوو و کاربەجێ دەبەستێ، کە هەموو دەمێ دەرگای ڕزگاریی و بەختیاریی و سەرفرازیی بۆ دەخاتە سەر پشتێ.

دیسان کەس لەوەدا دوودڵ نیە کە ڕازو نیازکردن لەگەڵ خواداو، لەبەر خوا پاڕانەوە، ئارامیی و ئۆخژن و دڵنیاییەکی تەواو لە دڵ و دەروونی

مرۆڤدا دەهێنێتە دی و، پەیوەندیی هەبوون لەگەڵ خوادا، لە بەرانبەر تۆفانی گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەو چەرمەسەرییەکانی ژیانداو، لەبەردەم تێشکان و دەسخەڕۆبوون و بە ئامانج نەگەیشتندا، هێزو وزەو تین و گوڕێکی زۆر بۆ مرۆڤ دەرەخسێنێو دێوەزمەی بێهیوایی و بێهێزیی و بەزین ڕاودەنێو دەرەتێنێ.

هەروەها ئاشکرایە کە تۆبەکردن و گەڕانەوەو پەشێمان بوونەوە، دوای تاوان و لادان و سەرپێچیی، هەست کردن بە تاوانباریی و کەمیی و شەرمەزاریی، کەم دەکاتەوەو، جاری واش هەیە هەر نایهێڵێ.

شتێکی ڕوون و بەڵگەنەویستە کە بڕوابوون بە زیندووبوونەوەو ژیانی دواڕۆژ، مردن و کۆچکردن و ماڵئاوایی لەدنیاکردنی دۆست و برادەرو خزم و خۆشەویستان، لەلای مرۆڤ دەکاتە شتێکی ئاسایی و زۆر پێی سەغڵەت و تەنگاوو بێحاڵ نابێ.[١]

**دووەم:** بەڵام کێ دەڵێ هۆی پەیدابوونی ئایین، ئەو هەست و نەست و داخوازییانەن و ئەو سوودو بەرهەمانەن؟!!

ئایا کەسێک وا بیر بکاتەوە، شوێنەوارو ئەنجامی بەهۆو پەیداکەر دانەناوە؟

ئایا ئەمە وەک ئەوە نیە کابرایەکی چاڵ هەڵقەن لەدەمی چاڵ هەڵقەندندا خەزێنەیەک، کووپەزێڕێک بدۆزێتەوەو، دوایی کابرایەکی نەشارەزا کە لە ئەسڵی مەسەلە بێهەواڵە، بڵێ: هۆی هاندەری چاڵ هەڵقەندنەکە هەبوونی کووپەزێڕەکە بووە لەو شوێنەدا؟!!

ئاخر مەسەلەی ئێمەش ڕاست ئاوایە؛ شتێک کە بەرهەم و ئەنجامی خواناسیی و ئایین دۆستییە، بەسەرچاوەو هۆی پەیدابوونی دانراوە!!

---

(١) سوپاس بۆخوا کتێبێکی سەربەخۆمان تەرخان کردوە بۆ ئەو جۆرە باسانە، بەناوی (یادی خودا) بەشی یەکەم (گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا)، چاپی یەکەم ١٩٨٧.

**سێیەم:** لایەنگرانی ئەم بیردۆزەیەش وەک لایەنگرانی بیردۆزەکانی پێشوو، پێش هەمـوو شتێک وەفاداریی خۆیـان بەرانبـەر بـە مەبەستێکی بێبەڵگـە پێشان داوەو، ویستوویانە ئایین پەلکێش بکـەن بۆ نێو جوغـزی ئـەو ئاواتـە لەپێشدا لەدڵگیراوە!!

ئێستاش:

ئێستاش دوای خستنەڕووی ئـەم هەمـوو بەڵگـە بەهێزو بەرهەڵستیی لـە بەرانبەردا نەکراوانە، لەسـەر پووچاندنەوەی ئەم بیروبۆچوون و بیردۆزە خەیاڵییانە، چاوەڕوانی ئەوە لـە لایەنگرانی ئەم بیردۆزانـە دەکەیـن، کـە وازیـان لـێبێنن و خۆیـان لـە چەنگاڵی بـەدی ئەفسانەبازیی قوتـار بکـەن و، وەک مرۆڤێکی ئازادو سەربەست بیـر بکەنـەوەو، هـەوڵ بـدەن هـەق و ڕاستی لـە هـەر جێیـەک بێـو، بەدەسـت هـەر کەسێکەوەبێ، وەری بگـرن و ماچـی بکـەن و، داوای لێبـوردن و چاوپۆشیشیی لێبکـەن، کـە هەتـا ئێستا کەمتەرخـەم بـوون و لێی دوورەپەرێـز بـوو ون!!

خوێنەری بەڕێز!

ئەمانە سـەرجەم ئـەو بیردۆزانـە بـوون کـە بێبڕواو لـە خـواو ئاییـن یاخیبـووان، دەیانـەوێ پەنایـان بەرنـە بـەرێ، لـەو دەمەیدا کـە لەبـەر وەڵامـی ڕاستەقینەی (ئاییـن چۆن پەیدا بـووە؟!) ڕادەکەن-جا لەسۆنگەی هـەر شتێکەوە بێ-، بەڵام وەک دیتمـان ئـەم بیردۆزانـە چاوپۆشیی لـەوە بکـە کـە هەموویـان پێکـەوە دژ و نەگونجاون[1]، نـەک هـەر یـەک یـەک، بەڵکو ئەگـەر هەمووشیان خڕبنـەوە-خڕبوونەوەشـیان مەحاڵـە- ئێستا ناتوانـن تاقـە سـەنگەرو حەشـارگەیەک بـۆ لاڕێـو هەتڵەبـووان فەراهـەم بێنـن، کـە جێـی جەنـگ تێداکـردن نـا، بـەڵام خۆ تێـدا شـاردنەوەو مـات کردنیـش بێـو، بتوانـێ لـە نشتەرو تیـری هـەق و

---

(١) زەقترین نیشانەو دروشمی بیردۆزە هەڵەکان، دژایەتیی و ناکۆکیی نێوانیانە.

هەقخوازان چەپاڵەیان بدات، بەڵکو بابایەک بچێتە نێو سەنگەرێکی ئاوارە، هەر هێندەی بەخۆی دەزانێ بەتیری هەقویستان شڕو دڕ بووەو هەزار کونی تێبووە!

کەواتە:

نەخێر ئایین و خواناسیی، لە بارودۆخی چینایەتی و بەهاندانی چەوسێنەران و، لە ئەنجامی ترسان و، بەهۆی نەزانیینەوەو، لە سۆنگەی غەریزەی جینسییەوەو، بەهۆی داخوازییە دەروونیی و کۆمەڵێیەتییەکانەوە، پەیدا نەبووە، بەڵکو وەک سەلمێنرا ئایین؛ بەرنامەی خوایەو، خوا لە ڕووی لوتف و بەزەیی و چاکەکارییەوە بۆ بەرەی مرۆڤی ڕەوانە کردوە، وە دیاردەی خواناسیی و ئایین پەروەرییش لەژیانی مرۆڤدا شتێکی بێ بنەچەکەو نارەسەن نیەو داخوازییەکی سروشتیی ڕەسەنی مرۆڤەو، ژیریی و ویژدانی وای لێدەکەن ڕێ بەرەو خوا بگرێتە بەرو ژیانی بەپێی ڕێڕوونییەکانی خوا بەرێتەسەر.

ئنجا کاتی ئەوە هاتوە بچینە سەر وەڵامدانەوەی پرسیاری سێیەمی ئەم بەشەو بزانین داخۆ (ئایین بۆچی هاتوە؟)!




# ئایین بۆچی هاتوه ؟!

## دەستپێك

خوێنەری سەنگین!

هەرچەندە لەکاتی وەڵامدانەوەی پرسیاری یەکەمی ئەم بەشە (ئایین[1] چییە؟)دا تا ئەندازەیەک ڕوون بۆوە، داخۆ ئایین و بەرنامەی خوا بۆچی نێرراوە، بەڵام لەبەر زێدەبایەخ و گرنگییەک کە ئەو باسە هەیەتی، لێرەشدا بەسەری دەکەینەوە، جڵەوی ئەسپی قەڵەمی بەکار، دەدەینە دەست شۆڕەسواری عەقڵی چەکدار، بەئایەت و قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری پێشەوای ناودار (صلى الله عليه وسلم)، تاکو لە مەیدانی پان و بەرینی ئەم باسەدا، بیکاتە ڕمبازێن و غار.

جا بێگومان پرسیاری گۆرین دەگونجێ بەزۆر شێوە وەڵام بدرێتەوە؛ چونکە پەیوەندیی بە مەبەست و ئامانجی بەرنامەی خواوە هەیە، هەڵبەتە ئەو ئامانج و مەبەستانەش کە ئایین و بەرنامەی خوا بۆ هێنانەدییان نێرراوە

---

(١) وەک پێشتریش گوتمان: مەبەستمان لە وشەی (ئایین) هەرجارێک کە لێرەدا بەکاری دەهێنین، ئیسلامە.

یەکجار زۆرن؛ لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ئایین بۆ ئەوە هاتووە: ئینسان بەهۆیەوە بتوانێ سەربەرزیی و بەختیاریی دنیاو دوارۆژان دەستگیر بکات، لە جوغزی تاک (فرد) و کۆمەڵ (مجتمع)دا.

بەڵام لەبەر ئەوەی خستنەڕووی هەموو ئەو ئامانج و مەبەستانەی کە بەرنامەی خوا بۆ هێنانەدییان نێرراوە، باسێکی فراوان و قووڵ و، شوێنێکی تەرخانکراوی دەوێ، لێرەدا بەس بە خستنەڕووی ئامانجە سەرەکیی و بنەڕەتییەکانی بەرنامەی خوا لە چەند خاڵێکدا وازدێنین.

**یەکەم:** ئایین بۆیە هاتووە کە مرۆڤ شێوەی ژیان و گوزەرانی و جموجۆڵ و چالاکییەکانی بەپێی زگماک (فطرة)ی بن و، لەنێوان جموجۆڵ و چالاکییەکانی و زگماکیدا، دژایەتیی و ناکۆکیی نەبێ، بێگومان ئەم ئامانجەش بەس لەکاتێکدا دێتە دی، کە ئینسان بەرنامەو ڕێبازی ژیان و بەڕێوەچوونیشی هەر لەو سەرچاوەیەوە بێ کە ئەو جۆرە سروشت و کەسایەتییەی پێ بەخشیوە، کە پێی بۆتە ئینسان.

خوای ئاگادار بەنهێنییەکانی دڵێن فەرموویەتی: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (الروم-٣٠).

واتە: ئنجا ڕووی خۆت ڕاست ڕاگرە بۆ ئایین، لە حاڵێکدا، کە لەسەر ڕێی ڕاستی و دووری لە چەوتی، ئەو سروشتە خواییەی کە خەڵکی لەسەر سروشتاندوە، دروستکراوی خوا گۆڕانی بۆ نیە، ئەوەیە بەرنامەی ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن!

وەک لەم ئایەتەدا دەبینرێ، بەرنامەی خواو سروشتی مرۆڤ پێکەڵپێکن و پڕ بە پێستی یەکن؛ چونکە بە زاراوی ڕێزمان؛ (فطرة) کراوە بە بریتی (بدل)ی ئایین (دین).

**دووەم:** ئایین بۆیە هاتوە، تاکو جوولێن و ئاراستە (الحركة والإتجاه)ی مرۆڤ لەگەڵ هی ئاسمانەکان و زەوی (بوونەوەر)دا هاوئاوازو گونجاو بێو، ئینسان بەهۆی لاڕێبوونییەوە، وەک ئەو ناشێیەی، کە بەدەنگ و سەدای ناڕێکی، ئاوازی دڵگیری کۆڕسێک دەشێوێنێ، ئاوازی دڵڕفێنی بوونەوەر تێک نەدات، کە بریتیە لە ستایش کردن و بەپاک گرتنی خوا، وەک خوای بێهاوەڵ فەرموویەتی:

﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾ (الإسراء-٤٤).

واتە: حەوت ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی تێیاندایە، پاکیی وی ڕادەگەیەنن.

**سێیەم:** ئایین بۆیە هاتوە کە مرۆڤ بەس گەردنکەچیی بۆ خوا بکات و، نەبێتە کۆیلەو خزمەتکاری بت و شەیتان و طاغووتان، وەک خوای بێهاوەڵ فەرموویەتی:
﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾ (النحل-٣٦).

واتە: لەنێو هەر کۆمەڵێکدا پێغەمبەرێکمان ناردوە، کە پێیان ڕابگەیەنێ؛ بەندایەتیی و گەردنکەچیی خوا بکەن و، لە طاغووت[1] دوور بن.

کەواتە: کاکڵ و ئامانجی بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانی خوا (صلی الله علیه وسلم) بریتی بووە لە ڕزگارکردنی خەڵکی لەژێر ڕکێف و نیری طاغووتە خۆ پەرستراوزانەکان و گەردن پێکەچکردنیان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی و بەرنامەکەی، لە هەموو لایەنێکی ژیانیاندا[2].

---

(١) (والطاغوت: عبارة عن كل مُتَعَدٍ وكل معبود من دون الله) واتە: طاغووت بریتیە لە هەر لەسنوور دەرچووێک و هەر پەرستراوێک جگە لە خوا. (معجم مفردات ألفاظ القرآن)، راغب الاصفهاني، ص٣١٤.

(٢) شایانی باسیشە کە بناغەی بەندایەتیی بۆخوا کردن و کاکڵ و جەوهەری دینداریی و مسوڵمانەتییش، بریتیە لە خوا بەیەکگرتن (التوحيد) لە هەرسێک بواری پەروەردگاریتیی و ناوو سیفەتەکان و پەرستراویتیی (الربوبية و الأسماء والصفات والألوهية)دا، جا بێگومان ئەمەش

**چوارەم:** بەرنامەی خوا بۆیە هاتوە، کە ئینسان بتوانێ بەشێوەیەکی ڕێک و ڕاست بژی، لەهەموو لایەنێکی ژیانیدا، وەک خوای زاناو توانا فەرموویەتی:

﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٢٧ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ٢٨ ﴾ (التكوير:٢٧-٢٨).

واتە: ئەم قورئانە بێجگە لە بیرخەرەوە بۆ جیهانییان چیدی نیە، بۆ هەرکەسێک لە ئێوە، کە بیەوێ ڕاست بێ.

**پێنجەم:** ئایین بەمەبەستی ئەوە نێرراوە، کە مرۆڤ بەسەر شەیتاندا زاڵ بێ، ئەو شەیتانەی کە بەخوێنی ئینسان تینوویەو، جەنگی سەرو ماڵی لەگەڵ بەرپا کردوەو، هەر دەرفەتی لێ هەڵکەوێو مرۆڤی بۆ تێ بکەوێ، لەسەرییەوە بازناداو بەبست جەبی نادات، وەک خوای میهرەبان فەرموویەتی:

﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٣٩ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ٤٠ ﴾ (الحجر:٣٩-٤٠).

واتە: شەیتان گوتی: پەروەردگارم، چونکە گومڕات کردم- لەسەر کڕنووش[1] نەبردنم بۆ ئادەم- منیش بێگومان -تاوانیان- بۆ لە زەویدا دەڕازێنمەوە و هەموانیان گومڕا دەکەم، بێجگە لە بەندە هەڵبژاردەکانت.

وەک دەبینین: شەیتانی بەد هۆی گومڕابوونەکەی دەگێڕێتەوە بۆ خواو پاکانە بۆخۆی دەکاو، خوا تاوانبار دەکات!! بەڵام لە ڕاستیدا هۆی گومڕابوونەکەی خۆ بەزلگریی و حەسوودیی خۆی بوو، بە بەڵگەی ئەوە کە فریشتەکان، چونکە ئەو دوو خەسڵەتە بەدەیان تێدا نەبوون، گومڕایی و نەفرین شانی نەگرتن، جا لەمەوە وەردەگیرێ کە هەرکەسێک تاوان و خراپەکانی

---

ڕوونکردنەوەی زۆری پێویستە، هەر بۆیەش ئێمە لەخوا بەزیاد بێت (٢٤) دەرسمان لە زنجیرە دەرسەکانی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی) بۆ تەرخان کردوە، بڕوانە بەرگی (٢)و (٣)ی زنجیرە دەرسی ناوبراو.

(١) مەبەست لە سەجدە بردن، سەجدەبردنی ڕێزو حورمەتە، نەک پەرستن، کە تایبەتە بە خواوە.

بە بەهانەی قەزاوقەدەر بخاتە سەر خوا، ئەوە لاسای شەیتانی کردۆتەوەو ڕچەی وی گرتوە!! شایانی باسیشە کە هاوبەش دانەرانیش هەر لەسەر ئەم ڕچەیەی شەیتانن، وەک خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ ﴾ (الأنعام- ١٤٨).

بەڵێ، ئایین بۆیە هاتوە تاکو مرۆڤەکان خۆیانی پێ بکەنە بەندەی ڕاستەقینەو هەڵبژاردە، بۆ ئەوەی شەیتانی بەد پێیان نەوێرێ[1].

شەشەم: ئایین بۆیە هاتوە تاکو مرۆڤ بتوانێ لە ژیانیدا خۆشی لەخۆی ببینێو سەربەرزو سەرفرازو شادو بەختەوەر بێو، تۆوی ئارامیی و دڵنیایی و ئاسوودەیی بە زەوی دڵ و دەروونی وەربێ، وەک خوای خاوەن لوتف و بەزەیی فەرموویەتی:

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ ﴾ (النحل- ٩٧).

واتە: هەرکەسێک کردەوەی چاک بکات، لە نێر یان مێ و، بڕواداریش بێ، ئەوە لە ژیانێکی خۆشدا دەیژێنین.

بێگومان لێرەدا مەبەست لە (حَيَاةً طَيِّبَةً) ژیانێکی پڕ ئارامیی و دڵنیایی و ئاسوودەییە؛ چونکە:

مەرج نیە هەرچی بڕوادار و کردار چاک بێ، دەوڵەمەند و خۆشگوزەران بێ.

قەت قەت دەوڵەمەندیی و خۆشگوزەرانی نابێتە مایەی ژیانێکی خۆش و پاک و بەتام، بەبێ بڕواداریی و چاک ڕەفتاریی.

---

(١) لەبەرگی یەکەمی مەوسووعەی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا بەدرێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

**حەوتەم:** ئایین بۆیە نێرراوە تاکو بەرەی مرۆڤ بکاتە یەک ڕیزو ڕەش و سپی و سوورو بۆری و، تیرەو گەلانی جۆراوجۆری، لەژێر سێبەری یەک دروشمدا خڕ بکاتەوە، کە بریتیە لە دروشمی (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّـهِ) وەک خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُونِ ﴿٩٢﴾ ﴾ (الأنبياء-٩٢).

واتە: بێگومان ئەم کۆمەڵە-کۆمەڵی خواناسان- کۆمەڵی ئێوەیە، کۆمەڵێکی تاکەو، من پەروەردگارتانم، ئنجا بەس گەردنکەچی من بن.

**هەشتەم:** ئایین بۆیە هاتوە کە مرۆڤەکان لە دووبەرەکیی و پرژو بلێویی و بێسەروبەرەیی و، یەکدی بوغزاندن و یەکدی گەوزاندن، قوتار بکات و، بیانکاتە برای یەک و دەستیان پێ لە گەردنی یەک بکات، وەک خوای بەرزو پاک فەرمووەتی:

﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا ...﴿١٠٣﴾ ﴾ (آل عمران- ١٠٣).

واتە: تێکڕا دەست دەرێسمانی خوا بگرن و پەرتەوازە مەبن و، یادی چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە، کاتێک کە-بەر لەوەی مسوڵمان بن- پێکەوە دوژمن بوون، بەڵام-خوا- دڵەکانتانی پێکەوە جۆش دا، ئنجابەهۆی ئایینی[1] خواوە بوونە برا.

**نۆیەم:** ئایین بۆ ئەوە هاتوە تاکو مرۆڤەکان بتوانن بە دادگەرانە بژیەن و بەڕێوەبچن و، بە پێی بۆلوان وەک یەک و یەکسان بن و، هەموویان بەبێ جیاوازی لە هەل و مەرجەکانی ژیاندا بەشدار بن و، هەموو کەس خێوی دەربڕینی دەنگی بێو، خاوەنی بەرهەمی ڕەنجی بێ، وەک خوای دادگەرو دەستەڵاتدار فەرمووەتی:

---

(١) چونکە ئایین و بەرنامەی خوا گەورەترین و چاکترین چاکەو بەخششی خوایە بەسەر مسوڵمانانەوە، بۆیە ناوی بردوە بە (نعمة).

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ... ﴿٢٥﴾﴾ (الحديد-٢٥).

واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگەگەلی ئاشكراوە ناردوون و، كتێب و تەرازووشمان پێدا ناردوون، بۆ ئەوەی خەڵكی بە دادگەریی بەڕێوەبەرن.

وەک دەبینین حیكمەت و هۆی نێررانی پێغەمبەران (صلی الله علیه وسلم) و هاتنەخوارەوەی كتێبانی لە چەسپاندنی دادگەرییدا كورت هەڵێنراوە.

**دەیەم:** بەرنامەی خوا بۆیە هاتوە كە لە خەڵكی بگەیەنێ؛ نە پلەو پایە، نە سامان و دارایی، نەڕەگەزو ڕەچەڵەک، نە ڕەنگ، نە زمان، نە بنەماڵە و نە هیچ شتێكی دیكەی لەم بابەتانە، تەرازووی هەڵسەنگاندن و سەنگی مەحەک نین بۆ نرخاندنی بەندەكان، بەڵكو تەرازوو و پێوەر بەس پارێزكاریی (تقوی)یە، وەک خوای كاربەجێ فەرموویەتی:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ...﴿١٣﴾﴾ (الحجرات- ١٣).

واتە: ئەی خەڵكینە! ئێمە لە نێر (ئادەم) و مێ (حەووا)یەک دروستمان كردوون و، بەمەبەستی یەكدی ناسین گێڕاومانن بە چەند گەل و تیرەیەک، بێگومان

بەڕێزترتان لەلای خوا پارێزكارترتانە.

**یازدەیەم:** ئایین بۆیە هاتوە كە مافە ڕەواو سروشتییەكانی گەلان دابین بكاو، چارەنووس و قەوارەیان بپارێزێو، هەركەسە لە نیشتمان و خاک و ئاوی خۆیدا ئازادو سەربەخۆ بێو، لە دەستدرێژیی بۆكران و هەڵكوترانە سەر پارێزراو بێ، وەک خوای قسەلەجێو ڕاست فەرموویەتی:

﴿وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ ... ﴿١٣﴾﴾ (الحجرات- ١٣).

واتە: گێڕاومانن بە چەند گەل و تیرەیەک تاکو یەکدی بناسن[١].

وەک دەبینین خوای پەروەردگار بێ پێچ و پەنا ڕای دەگەیەنێ، کە دابەش کردنی مرۆڤایەتی بۆ چەند هۆزو تیرەو گەلێکی جۆیجۆیێ، بە ویستی خوای کاربەجێو زانا بووەو بێ حیکمەتیش نیە.

دوازدەیەم: ئایین بۆ ئەوە هاتوە کە باری کەوتووی چەوسێنراوان ڕاست وەکاو ڕەنجی دزراوو مافی خوراویان بۆ وەستێنێو، تۆڵەیان بۆ لە طاغووتان وەکا، ئەوەتا خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ ﴾ (النساء- ٧٥).

واتە: ئەوە بۆچی لەپێناوی خواو-ڕزگاریی- چەوساواندا ناجەنگن؟!

وەک دەبینین خوای بە بەزەیی بە گلەییەوە بە مسوڵمانان دەفەرموێ: ئەوە بۆچی لەڕێی خواو چەوساوەو بێدەرەتانانـدا ناجەنگن؟! کەواتە جەنگ کردن و خەبات و شۆڕش لەڕێی رزگاریی خەڵکی زۆرلێکراودا، ئەرک و پێویستی سەرشانی هەموو ئینسانێکی خواناس و مسوڵمانەو، دەبێ بابای مسوڵمان خەمی خەڵکی لەبەر بێو، بیری رزگارکردنیانی لەسەر بێو، ترسنۆکانە نەڵێ: (ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە) یان (هەرکەسە دەست بە کلێوی خۆی بگرێ با نەیبات)!!

---

(١) ئەم ئایەتەو هەموو ئەو مەسەلانەی لەسەری هەڵدەستن بە تێروتەسەلی لە کتێبی (سۆزی نەتەوایەتیی) توێژراونەوە کە بەندە نووسیویەتی، بەڵام ئەوە بۆ دوو ساڵێن دەچێ گیرۆدەی داوی (رقابة) بووەو نازانم کەنگآ قوتاری دەبێ!!

تێبینی: ئەم پەڕاوێزە کاتی خۆی نووسراوە کە (سۆزی نەتەوایەتیی) لە دائیرەی ڕەقابە گیری خواردبوو و سەرەنجام هەر (موافقة)ی بۆ نەکراو، دوایی بۆ جاری یەکەم لە شاخ لە بارەگای هێزی حەمزە لە (قەڵێتووکان)ی بناری قەندیل لە ساڵی ١٩٨٨ چاپ کراو، بۆ جاری دووەمیش لە ساڵی ١٩٩٨ لە سلێمانی چاپ کرایەوەو، چەند باس و بابەتێکی گرنگیشی لێ زیادکرا لەژێر سەرباسی (مسوڵمانەتیی و کوردایەتیی لە ڕوانگەی ئیسلامیی و عەلمانییەکانەوە)، جاری سێیەمیش ساڵی ٢٠٠٥ چاپکراوەو، جاری چوارەمیش لەساڵی: (٢٠١٩ز)دا چاپ کراوە پاش ئەوەی زیاتر لەسەر (١٠٠) لاپەڕەی لێ زیاد کرا.

چونکە ئەو بایەی ئەمڕۆ کلێوی برای مسوڵمانم دەبات، سبەینێ کلێوی سەری منیش دەرفێنێ.

**سێزدەیەم:** ئایین بۆیە هاتوە تاکو کۆشک و تەلارو بارەگای ستەمکاری بڕووخێنێ و، چەوسێنەرو زۆردارانی خۆ بەپەروەردگارزان و خۆ بەزلگر بڕەتێنێ و، بنج و ڕیشەی چینایەتیی لە بیخەوە دەربێنێ، ئەوەتا خوای دەستەڵاتدار فەرمووییەتی:

﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾ (الزخرف- ٢٣).

واتە: بەم جۆرە-ی کە بەسەر تۆ هاتوە ئەی موحەممەد! (صلی الله علیه وسلم) لەپێش تۆدا لە هەر ئاوەدانییەکدا هەر وریاکەرەوە -پێغەمبەر- یکمان ناردبێ، خۆشگوزەرانەکانی[1] گوتوویانە؛ ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ڕێبازێک دیوەو بۆخۆشمان هەر شوێن پێی وان هەڵدەگرین.

وەک دەبینین کەسانێک کە بوونە کۆسپ و پەرچی سەر ڕێی ڕاپەڕین و شۆڕشی پێغەمبەرانی خەڵک بێدارکەرەوە (صلی الله علیه وسلم) و بە بیستنی بانگەوازییەکەیان کێچیان کەوتۆتە کەوڵی و مەراقیان هاتۆتە دڵی، ئەو زلەزلە خۆ بە زلگرە بێخێرانە بوونە کە خێرو بێری سەرزەوییان خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوەو، ژیانیان لەسەر چەوساندنەوە (إستغلال)و کەرکردن (إستحمار)ی خەڵکی سادەو چەوساوەو نەحەساوە بەڕێوە چووەو ڕاوەستاوە!!

**چواردەیەم:** ئایین بۆیە هاتوە تاکو ئینسان بتوانێ لە چەنگ چەنگاڵی نەفس و ئارەزووەکانی ڕزگاری بێ و، جڵەوی نەفسی هارو غلوورو سەرکێشی بکەوێتە دەست بیرو هۆشی، نەک بەپێچەوانەوە، خوای تاک و پاک فەرمووییەتی:

---

(١) (طبري) دەربارەی وشەی (مترفوها) دەڵێ: (قادتهم و رؤساؤهم في الشرك) واتە: سەرکردەو سەرۆکەکانیان لە هاوبەشپەرستیدا. بڕوانە (مختصر تفسير الطبري)، ل٥٥٤. جا بێگومان سەرکردەو زلەزلانی کافریش بەزۆری سەرمایەدارو خۆشگوزەرانن.

﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾ (النازعات: ٤٠-٤١).

واتە: بەڵام ئەوەی لە ڕاوەستانی بەر بارەگای پەروەردگاری بترسێ -لە ڕۆژی دواییدا- و جڵەوگیریی نەفسی بكات لە ئارەزووە-ناڕەوایە-كانی، ئەوە ئەو كەسە جێگاو پەنای بەهەشتە.

**پازدەیەم:** ئایین بۆ ئەوە هاتوە كە ڕەوشت و خووی بەرزو پەسند و لایەنی مەعنەویی و فریشتەیی ئینسان، گەشە بكاو پەرە بستێنێو، خوو و خدەی بەدی شەیتانیی و ڕەفتاری دزێوو ئاژەڵیی ریشەكێش بكرێو نەمێنێ.

ئەوەتا پێغەمبەری ئاكار پەسند، ئامانج و مەبەستی پێغەمبەرایەتییەكەی لە پەرەپێدان و تەواوكردنی ڕەوشت و خووی بەرزو ئاكاری پەسنددا كورت هەڵدێنێ: {إِنَّمَا بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ مَكارِمَ الأَخْلاَقِ} (أخرجه الحاكم برقم: ٤٢٢١، وقال: صحيح على شرط مسلم، والبيهقي في الكبرى برقم: ٢٠٥٧٢، الديلمي برقم: ٢٠٩٨، واللفظ للبيهقي) واتە: بێگومان من بۆ تەواوكردنی ڕەوشت و ئاكارە پەسندەكان نێرراوم.

هەڵبەتە ئەو خوو و ڕەوشتە بەرزو دڵگیرانەش كە دوایین پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ هێنانەدی و گەشەپێدانیان هاتوە، بەس لە كاتێكدا لە مرۆڤدا دێنەدی كە پابەندی قورئانی مەزن و بەڕێز بێ، هەر بۆیەش كاتێك پرسیار لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر كرا (خوا لێی ڕازی بێ) دەربارەی ئاكارو ڕەوشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: {كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ} (أخرجه أحمد برقم: ٢٤٦٤٥، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح) خوو وڕەوشتی - پێغەمبەر - قورئان بوو!

شازدەیەم: ئایین بۆیە هاتوە، كە جڵەوی حوكم و سیاسەت بەدەستەوە بگرێ و نەهێڵێ، كەس لەو ڕێیەوە، خۆی لەسەر خەڵكی بكاتە نۆونیوو

بیانچرۆسێنێ، بەواتایەکی دی؛ نەیەڵێ هیچ کەس خۆی بکاتە پەرستراوو بڵێ: من بەرنامەی ژیان و گوزەرانتان بۆ دادەنێم و، پێویستە ئێوە داشی دامە بن بەدەستمەوەو خاوەنی خۆتان نەبن و، لەڕاست مندا هیچتان سەرتان پێوە نەبێ!

ئایین بۆیە نەهاتوە-وەک سادەبیرو فامکالێن دەڵێن- کە لە گۆشەی مزگەوت و تەکیەکاندا خۆی کۆشمەڵە بکاو، ئاوێ لە کەس شلوێ نەکاو، مێشان لەخۆی دەر نەکات، چونکە خوای کاربەجێ زۆر لەوە بەرزترە، کە ئایین و بەرنامەیەک بنێرێ نەتوانێ کاروباری خەڵکی بەڕێوەبەرێو سەرپەرشتییان بکات و، بەندەکانی خوا ناچار بکات بکەونە سواڵ و سەدەقە لەملاولا، بۆ بەرنامەیەک کە ژیان و گوزەرانیان بۆ هەڵسووڕێنێ!

بەڵکو ئایینی خوا (سبحانە وتعالی) بۆ ئەوە هاتوە کە وردو درشتی ژیانی بەندەکان بخاتە ژێر رکێفی دەستەڵات و چاودێری خۆیەوە، تاکو هیچ کەس ڕێی نەبێ خۆی بکاتە فیرعەون و بڵێ:

﴿يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٢٩﴾ (الغافر-٢٩).

واتە ڕێتان پیشان نادەم بێجگە لەوەی کە بەبۆچوونی خۆم بەچاکی دەزانم و بۆ چاکە نەبێ ڕێتان پیشان نادەم، -واتا ئەوەی من دەیڵێم هەمووی ڕاست و باشە-.

بۆیە خوای وردبین و شارەزا فەرموویەتی: ﴿...إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٠﴾ (یوسف-٤٠).

واتە: فەرمانڕەوایەتیی کردن بەس هی خوایە، فەرمانی کردوە کە بێجگە لەوی کەس نەپەرستن، ئەوەیە ئایینی ڕاست و تەواو.

ئنجا لەبەرئەوەی (دین) بە مانای (گەردنکەچیی و فەرمانبەربی) یش هاتوە، ڕستەی: (ذلك الدين القيم) ئەم واتایەش هەڵدەگرێ؛ ئەوەیە گەردنکەچیی تەواو و ڕاست.

جێی سەرنجیشە کە ئەم ئایەتە بەپێزە، هەرکام لە (حكم) و (عبادة) و (دین)ی کردوون بەهاوتا (مرادف)ی یەکدی، واتە: دینداریی راست ئەوەیە کە تەنیا خوا بپەرسترێو، تەنیا خواپەرستنیش کاکڵ و جەوهەرەکەی ئەوەیە کە بەس خوا بە (حاکم) دابنرێ و، جگە لەوی فەرمانبەریی هیچ کەسی دیکە نەکرێ.

**حەڤدەیەم:** ئایین بۆیە هاتوە کە کاروباری ئابووریی ڕێک بخات و، هیچ کەس لەڕێی دەست بەسەرداگرتنی سامان و دارایی و سەرچاوە سروشتییەکانەوە لەخەڵکی نەبێتە ملۆزم و رژێمی سەرمایەداریی و چینایەتیی و قڕیی وبڕیی نەیەتە کایەوە، مرۆڤەکان بە یەکسانیی لەخێرو بێرەکانی سەرزەوی بەهرەمەند بن و، کەس بەری ڕەنجی کەس نەباو، کەس مافی ڕەوای کەس نە خوا و کەس خوێنی جەستەی کەس نەمژێو، کەس بەرهەمی دەستی کەس نەدزێ!!

چونکە خوا هەموو ئادەمیزادەکانی لەیەک ڕەگەزو سروشت خوڵقاندوون و، کەسی نەکردۆتە مسکێن و نیوەکاری کەس و، زەوی و ئەوەی تێشی دایە بۆ تێکڕای خەڵکی ڕەخساندوون؛ وەک فەرموویەتی:

﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾ (الرحمن-١٠).

واتە: -خوا- زەوی بۆ خەڵکی داناوە.

دیسان فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ (البقرة- ٢٩).

واتە: -خوا- ئەو زاتەیە کە ئەوەی لە زەویدایە، بۆ هەموانتانی دروست کردوە.

شایانی گوتنیشە کە ئەم ئایەتە بێجگە لەو واتایەی گوتراوە، واتایەکی دیکەش هەڵدەگرێ، ئەویش بەوە دەبێ کە بڵێین: وشەی (جمیعاً) پەیوەستە بە (في الأرض)یەوە، نەک بە (لکم)ەوە، ماناکەش ئاوایە: هەرچی لەزەویدایە بۆئێوەی دروست کردوە.

دیسان خوای دادگەرو زانا بەرنامەی خۆی ناردوە، تاکو ڕێ بە پەیدابوونی چینێکی پارە پەزمەندەکەری سامان وەسەرێک نەری رژدو چرووک و چەنگ قووچاو، نەدات، وەک دەفەرموێ:

﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ٣٤﴾ (التوبة-٣٤).

واتە: ئەوانەی زێڕوزیو-پارەی نەغدینە- پەزمەندە دەکەن و، لەڕێی خوادا خەرجی ناکەن، ئەوە موژدەی سزایەکی بەئێشیان بدەیە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡ﴾ (الحشر-٧).

واتە: بۆ ئەوەی-ماڵ و سامان- لە جوغزی دەوڵەمەندەکانتاندا خڕ نەبێتەوە.

**هەژدەیەم:** ئایین بۆ ئەوە هاتوە، کە پەردەی سەرچاوو مێشکی ئینسان لابداو لە ئەفسانەسازیی قوتاری بکات و، وای لێ بکات کە پەی بە ڕازو نهێنییەکانی بوونەوەر بەرێو، مەتەڵەکانی هەڵێنێو، لەیاساکانی تێ بگات، وەک خوای زانا فەرموویەتی:

﴿أَفَلَمۡ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوۡقَهُمۡ كَيۡفَ بَنَيۡنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٖ ٦ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ٧ تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ٨﴾ (ق: ٦-٨).

واتە: ئەوە نەیانڕوانیوەتە ئاسمانێ لە سەروویانەوە، چۆن دروستمان کردووە، ڕازاندوومانەتەوە و، هیچ کەلێنی تێدا نین و زەویمان لێک کێشاوەتەوە و شاخە چەسپاوەکانمان تێهاویشتوون و، ئنجا لەڕاستیدا ئەم تەعبیرە، وردترین و ڕاستترین تەعبیرە، بۆ چۆنییەتی چەسپێنرانی شاخەکان لە زەویدا، کە وەک زانایانی زەوی ناسیی (جیۆلۆجیا) دەڵێن: چیاکان چەندیان بەدەرەوەیەو دیارە، دە پازدە (١٠-١٥) هێندەیان بەناخی زەویدا چۆتە خوار، کەواتە وەک چۆن شتێکی ڕەق و پتەو فڕێ دەدرێتە نێو ماددەیەکی شلەوەو تێی دەچەقآ، شاخەکان و زەوییش وان! لە هەرجۆرە ڕووەکێکی جووتی جوان و بەدەومان تێدا ڕواندوە، بۆ ئەوەی ئەوانە هەموویان ببنە مایەی ڕێڕوونیی و پەندوەرگرتن بۆ هەر بەندەیەکی گەڕاوە-بۆ لای خوا-.

دیسان فەرموویەتی: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ (فصلت-٥٣).

واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان پیشان دەدەین لە ئاسۆیەکان-ی بوونەوەر-و لە زاتی خۆیاندا، هەتا بۆیان دەربکەوێ کە ئەو -(خوا) یان (قورئان)ە- ڕاستە.

تەنانەت ئایین دەیەوێ مرۆڤ لەو خواردنەشەوە ڕابمێنێ کە دەیخوات: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ ﴾ (عبس: ٢٤-٣١).

واتە: با ئینسان بڕوانێتە خواردنەکەی، ئێمە ئاومان بەخوڕ هەڵڕشتوە، دوایی زەوییمان بە قەڵێشتن قەڵێشتوە، ئنجا دانەوێڵەمان تێدا ڕواندوە و، ترێ و سەوزە و، زەیتوون و دارخورما و، باغاتی چڕوپڕ و، میوەو لەوەڕ.

**نۆزدەیەم:** ئایین بۆیە هاتوە کە پەیوەندیی نێوان پیاوو ژن و چۆنییەتی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکدا، بەشێوەیەکی دادگەرانەو سروشتییانە دیاریی بکات، بەجۆرێک کە شتاقیان زیانبار نەبن، چونکە زیانبار بوونی هەرکامێکیان ماڵوێرانیی و زیانباریی تێکڕای مرۆڤایەتی تێدایە.

بەڵێ بەرنامەی خوا، ئەم مەسەلە گرنگ و ناسکەی بۆ گومان و ئارەزوو و بیروبۆچوونی مرۆڤ بەجێ نەهێشتوە، نەوەک هەرجارەی تەرازووی نێوانیان بەلایەکدا سەربکاو دابکەوێ، لە ئەنجامیشدا سەرلەبەری مرۆڤایەتی دەستخەڕۆ بێو زیانی لێبکەوێ.

١- بەڵێ ئایین هات، بۆ ئەوەی تەرازووی لاتەڵ و خواری پەیوەندیی نێوان نێرومێ ڕاست بکاتەوەو، بیهێنێتەوە باری خۆی، جارێ پێش هەر شتێکی دیکە ئەو ئەفسانە پووچەی وەدرۆ خستەوە کە دەیگوت: ئافرەت لە مرۆڤایەتییدا لەپیاو نزمترە! ئنجا لە چۆنیەتی ئەو (نزمتر) بوونەشدا، لەنێوان: (نەفسی شەیتانیی) بوون و (ئاژەڵیی) بوونیدا کێشەو بێنەو بەرەیان بوو!!

ئایین بەهەموو خەڵکی ڕاگەیاند، کە پیاوو ئافرەت لە سروشتدا یەکن و جیاوازییان نیە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا ﴾ (النساء- ١).

واتە: ئەی خەڵکینە! خۆتان لە-سزای- ئەو پەروەردگارەتان بپارێزن کە لەیەک نەفس دروستی کردوون و، هەر لەویش هاوسەرەکەی دروست کردوە.

کەواتە: هەمان جۆرە (گیان) کە بابی مرۆڤان (ئادەم)ی لێدروست بووە، دایکی مرۆڤان (حەووا)یشی لێ دروست بووە، بەبێ ئیمتیازو جودایی.

٢- هەروەها ئایین رایگەیاند: کەئەو کەسانەی فەرقی کچ و کوڕان دەکەن و، بەکوڕان دڵخۆش دەبن و بەکچان دڵتەنگ دەبن، نەفام و بەهەڵەدا چوون:

﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ (النحل: ٥٨-٥٩).

واتە: ئەگەر یەکێکیان مزگێنی مێینەی پێ بدرێ، ڕووی ڕەش دادەگەڕێو دڵی پڕ دەبێ لە ڕق و قین، خۆی لە خەڵکەکە دەشارێتەوە لەبەر خراپیی ئەو مزگێنییەی کە پێی دراوە،-نازانێ چی لێبکات!- ئایا سووکیی قبووڵ بکات و بیهێڵێتەوە، یان-بەزیندوویی- لەگڵی بخات؟! ئاگادار بن! خراپترین ڕەفتار ڕەفتاری ئەوانەیە!

٣- دیسان ئایین ڕایگەیاند کە پێویستە پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد لەسەر بنچینەی سۆزو خۆشەویستیی دابمەزرێ: ﴿ وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾ (الروم-٢١)، واتە: سۆزو خۆشەویستیی و بەزەیی لە نێوانتاندا داناوە.

٤- ئایین ڕایگەیاند: کە ژن هەروەک چۆن ئەرکی مێردی لەسەرە، ئەرکیشی لەسەر مێردی هەیە: ﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ (البقرة-٢٢٨).

واتە: وە-ژنان- مافیان هەیە بارتەقای ئەو-ئەرک-ەی لەسەریانە.

کەواتە پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد لە ڕوانگەی ئایینەوە، لەسەر بنچینەی ئەرک و مافی دووسەرە دامەزراوەو، شتاقیان گەورە یان کۆیلەی شتاقیان نین، بەڵکو یاریدەدەرو تەواوکەری یەکدین.

بەڵام بۆ ئەوەی شیرازەی خێزان نەپچڕێو، ژیان و گوزەران تاڵ نەبێو بێسەروبەرەیی پەیدا نەبێ، پێویستە ئاراستەکردن و هەڵسووڕاندنی کاروباری ماڵ و خێزان، مەڵبەند (مرکز)ێکی فەرماندەیی هەبێ، ئنجا لە ڕوانگەی بەرنامەی خواوە، پیاو شایستەی وەرگرتنی ئەو ئەرک و بەرپرسیارییەیە، بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ﴾ (البقرة-٢٢٨)، واتە: پیاوان پلەیەکیان بەسەریانەوە هەیە. (واتە بەسەر ئافرەتانەوە).

بێگومان ئەو پلەیەش پلەی مشوورخۆریی و چاودێریی و کارگێڕایەتییە، وەک لە جێیەکی دیکەدا ڕوونی کردۆتەوەو فەرموویەتی:

﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ﴾ (النساء-٣٤)، واتە: پیاوان مشوورخۆرو جڵەوبەدەستن بەسەر ئافرەتانەوە.

بەڵام وەنەبێ ئەو پلەیەش هەروا بە هەوەنتەو بێهۆ درابێتە پیاوان، بەڵکو: ﴿ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ ﴾(النساء-٣٤).

واتە: لەبەرئەوەی کە خوا هەندێکیانی بەسەر هەندێکیاندا بەرز کردۆتەوە و، لەبەرئەوەی کە پیاوان لە سامانی خۆیانیان خەرج کردوە.

کەواتە: پیاو لە سۆنگەی دوو هۆیانەوە پلەی چاودێرایەتیی و کارگێڕایەتیی بەسەر ئافرەتەوە دراوەتێ:

**یەکەم:** پێکهاتەی دەروونیی و جەستەیی پیاو لەوبارەوە گونجاوترە لەهی ئافرەت.

**دووەم:** پیاو لەسەری پێویستە مەسرەفی خۆی و خێزانی بکێشێ.

جا بێگومان کەسێک دەستی بەخشش و چاکەی بەسەر یەکێکەوە هەبێ، واچاکە قسەشی لە سەروو قسەیەوە بێ، نەک بە پێچەوانەوە، مادام لە هەقێ لانەداو لێوەشاوەش بێ.

لێرەشدا پێویستە بگوترێ کە: تەعبیری: [بِمَا فَضَّلَ اللهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ] چەمک و واتایەکەی تەنیا ئەوەندە نیە، کە پیاو بەسەر ئافرەتدا بەرز کرابێتەوەو ئیمتیازی درابێتێ، بەڵکو وێڕای ئەوە، فەزلاً و ئیمتیازی ئافرەتیش هەر دەگەیەنێ، ئەگەرنا دەیفەرموو: (بِمَا فَضَّلَ اللهُ الرجال عَلَى النساء)، ئنجا لە واقیعیشدا هەروایەو، هەروەک چۆن پیاو جەستەی بەهێزترو دەنگی گڕترو عەقڵ و هۆشی چاکترە، ئافرەتیش جەستەی نەرم و ناسکترو دەنگ و سەدای ناسک و بەجۆشترو سۆزو بەزەیی زیاترە و،

بێگومـان هـەركام لـەو ئیمتیازانـەی پیـاوو ئافـرەت، شـێوەو چۆنیەتـی ئـەرك و كارو جـۆری پەیوەندییشـیان لەگـەڵ یەكتـرو لەنێـو خێزانـدا دیاریـی دەكـەن.

**بیسـتەم:** ئاییـن بـۆ ئـەوە هاتـوە كـە ئینسـان وا لێبـكات: هـەوڵ بـدات چەنـدی پێـی دەكـرێ، سـوود بەخشـتر بـێ بـۆ خەڵكـی.

جـا بێگومـان هێنانـەدی ئـەم مەبەسـتەش، وا لـە مرۆڤـ دەكات كـە هەرچـی تیـن و گـوڕو توانـای هەیەتـی، بیخاتـە كار لـە نیـازو مەبەسـت و قسـەو وتـارو كـردەوەو ڕەفتـاری چـاك و سوودبەخشـداو، هیـچ هـەل و دەرفەتێكـی كـە بـۆی دەڕەخسـێ، لـە قیـس خـۆی نـەدات و نەیەڵـێ لەدەسـتی بچـێ.

بـە واتایەكـی دی؛ ئاییـن بۆیـە هاتـوە، تاكـو مەیدانـی ژیـان بـۆ مرۆڤـەكان بكاتـە گـۆڕەپانـی پێشـبڕكە (مسـابقة) لـە چاكەكاریـی و خزمەتگوزارییـدا، ئەوەتـا پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتـی: {خَـيْرُ النَّـاسِ أَنْفَعُهُـمْ لِلنَّـاسِ} (أخرجـه الطـبراني في (الأوسـط) برقـم: ٥٧٨٧، والبيهقـيُّ في (الشـعب) برقـم: ٧٢٥٢، والقضاعـي في (مسـند الشـهاب) برقـم: ١٢٩، وَصَحَّحَـهُ الألبـاني الصحيحـة برقـم: ٤٢٦) ، واتـە: چاكترینـی خەڵكـی، سـوودبەخش ترینیانـە بـۆ خەڵكـی.

بەڵـێ، ئاییـن بۆیـە هاتـوە كـە كۆمەڵگەیەكـی وا دروسـت بـكات، مەیدانـی خێـرو چاكـەو خزمەتكردنیـان بـۆ بكاتـە مەیدانـی پێشـبڕكە، وەك خـوای بەخشـندەو دادگـەر فەرموویەتـی:

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٢﴾ ﴾ (الملك- ٢).

واتـە: ئەو-خوایـ-ەی كـە مـردن و ژیانـی هێناونـە دی، تاكـو تاقیتـان بكاتـەوە، كامەتـان ڕەفتـاری چاكتـرە..

ئنجـا پـەروەردگاری بـەرزو مـەزن، مـەودای ئـەو مەیدانـی تاقیكردنەوەیـەی هێنـدە پـان و بەریـن كـردوەو، هێنـدەی لێـك كێشـاوەتەوە، كـە جێـی هەمـوو جموجـۆڵ و چالاكییەكانـی ژیانـی مرۆڤـی تێدا ببێتـەوەو، هیـچ بۆشـاییەكی

تێدا نەهێڵێتەوە.

بەڵێ، ئایین دەڵێ: {ك□ل□□ س□لا□م□ى م□ن□ الن□□اس□ ع□ل□ي□ه□ ص□د□ق□ة□، ك□ل□□ ي□و□م□ ت□ط□ل□ع□ ف□يه□ الش□□م□س□} (أخرجه أحمد برقم: ٨١٦٨، والبخاري برقم: ٢٨٢٧، ومسلم برقم: ١٠٠٩، وابن حبان برقم: ٣٣٨١، عن أ□ب□ي ه□ر□ي□ر□ة□ رضي الله عنه)، واتە: هەر جومگەیەک لە جومگەی مرۆڤەکان، چاکەیەکی لەسەرە، لەهەر ڕۆژێکدا کە خۆری تێدا هەڵدێ.

بەڵێ، مرۆڤ بەقەدەر ئەو جومگانەی کە لە لەشیدا هەن، چاکەو خێری لەسەرە لە هەر ڕۆژێکدا، جا بابزانین ژمارەی جومگەکانی ئینسان چەندە، تاکو ژمارەی ئەو خێرو چاکانە بزانین، کە پێویستە لەهەر ڕۆژێکدا جێبەجێ بکرێن:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلاَثِمَائَةِ مَفْصِلٍ} (أخرجه مسلم برقم: ١٠٠٧، وابن حبان برقم: ٣٣٨٠، عن عائشة رضي الله عنها)، واتە: خوا هەر مرۆڤێکی لە وەچەی ئادەم لە سێسەدو شەست (٣٦٠) جومگە پێکهێناوە.

کەواتە: لە هەر ڕۆژێکدا (٣٦٠) چاکە لە هەر مرۆڤێک داواکراوە!

جا بێگومان هەموو ڕۆژێ (٣٦٠) چاکە، زۆر زۆرە، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە مەیدانی خێرو چاکەکاریی لە بەرنامەی خوادا، یەکجار پان و بەرینەو بوار (مجال)ەکانی زۆر زۆرن، ئەنجامدانی ئەوەندە لەخێروچاکە لەهەر ڕۆژێکدا شتێکی ئاسانەو گران نیە، ئێستاش هەندێک لەو بوارانە دەخەینە ڕوو، کە دەگونجێ خێرو چاکەیان تێدا بکرێن:

١- {فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ} (أخرجه مسلم برقم: ٧٢٠)، واتە: جا هەموو (سبحان الله: خوا پاک

و بێگەردە) گوتنێک چاکەیە، و هەموو (الحمدللە: ستایش بۆ خوا) گوتنێک چاکەیە و، هەموو (لا الە الا اللە: چ پەرستراو نین بێجگە لە خوا) گوتنێک چاکەیە و، هەموو (أللە أکبر: خوا گەورەترە) گوتنێک چاکەیە.

٢- {وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ} (أخرجە مسلم برقم: ٧٢٠)، واتە: فەرمان کردن بەچاکە خێرە و، جڵەوگیریی کردن لە خراپە خێرە.

٣- {تَعْدِلُ بَيْنَ الاثْنَينِ صَدَقَةٌ} (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجە البخاري برقم: ٢٦٩٢، ومسلم برقم: ١٠١، عن أبي هريرة)، واتە: دوو-کەس-ان پێک بهێنییەوە چاکەیە.

٤- {وَتُعِينُ الرَّجُلَ فِي دَابَّتِهِ فَتَحْمِلُهُ عَلَيْهَا ، أَوْ تَرْفَعُ لَهُ عَلَيْهَا مَتَاعَهُ صَدَقَةٌ} (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجە البخاري برقم: ٢٦٩٢، ومسلم برقم: ١٠١، عن أبي هريرة)، واتە: یاریدەی پیاوێک دەدەی لەوەدا کە سواری وڵێخەکەی دەکەی و، شمەکەکەی بۆ داوێیە سەرێ، ئەوە چاکەیە.

٥- { وَالكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ } (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجە البخاري برقم: ٢٦٩٢، ومسلم برقم: ١٠١، عن أبي هريرة)، واتە: قسەی خۆش و بەسوود چاکەیە.

٦- {وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ} (أخرجە مسلم برقم: ١٠٠٦ )، واتە: لە جووتبوونی یەکێکتان- لەگەڵ ژنەکەی-دا چاکە هەیە.

٧- {وَبِكُلِّ خَطْوَةٍ تَمْشِيهَا إِلَى الصَّلاةِ صَدَقَةٌ} (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجە البخاري برقم: ٢٦٩٢، ومسلم برقم: ١٠١، عن أبي هريرة)، واتە: بە هەموو شەقاوێک کە بەرەو نوێژی هەڵدێنی، چاکە هەیە.

٨- {وَتُمِيطُ الأَذى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ} (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أخرجە البخاري برقم: ٢٦٩٢، ومسلم برقم: ١٠١، عن أبي هريرة)، واتە: کە شتێکی بەئازار لەسەر ڕێیە لادەبەی، چاکەیە.

٩- {مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا إِلاَّ كَانَ مَا أُكِلَ مِنْهُ لَهُ صَدَقَةٌ} (أخرجه مسلم برقم: ٤٠٥٠، عن جابر)، واتە: هەر مسوڵمانێک نەمامێکی بنێژێ، هەرچی لێی بخورێ، بۆوی چاکەیە.

١٠- {لاَ تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ} (أخرجه مسلم برقم: ٢٦٢٦، عَنْ أَبِي ذَرّ)، واتە: هیچ شتێک لە چاکە بەکەم مەگرە، ئەگەر هەر ئەوەندەش بێ کە بەڕوویەکی گەشەوە بگەیە برایەکەت.

١١- {فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً} (أخرجه البخاري برقم: ٦١٢٦، ومسلم برقم: ١٣١، عن ابن عباس)، واتە: جا هەرکەسێک نیازی دڵی لەسەر کردنی چاکەیەک ساغ بکاتەوە، بەڵام-لەبەر بۆ نەلوان، چونکە ئەگەر لێی ژیوان بێتەوە بۆی نانووسرێ، هەروەها ئەگەر بتوانێ بیکات، بەڵام بە ئەنقەست نەیکات هەر نانووسرێ، بەڵام ئەگەر عەزمی لەسەر کردنی جەزم بوو، ئەمما بەهۆی عوزرو پەرچێکەوە بۆی نەکرا ئەوە بۆی دەنووسرێ.- نەیکات، خوای بەرز لای خۆی بە چاکەیەکی تەواوی دەنووسێ.

١٢- {تَكُفُّ شَرَّكَ عَنِ النَّاسِ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ مِنْكَ عَلَى نَفْسِكَ} (مُتَّفَقٌ عليه: أخرجه البخاري برقم: ٢٥١٨، ومسلم برقم: ٨٤)، واتە: خراپەی خۆت لەخەڵکی بگێڕەوە؛ چونکە ئەوە چاکەیە لەگەڵ خۆتی دەکەی.

وەک دیتمان هەر نیازو مەبەست و قسەو وتارو کردەوەو ڕەفتارێکی چاک و سوودبەخش، کە ئینسان بەرهەمیان دێنێ، ئەوە بۆی بە خێرو چاکە دادەنرێن.

**بیست و یەکەم:** لە کۆتاییدا ئایین بۆ ئەوە هاتوە، کە مرۆڤ بەهۆی ویەوە لەم ژیانەدا، خوای تاک لە خۆی ڕازی بکاو، دۆزەخ لە خۆی بەدوور بکاو، بەهەشت لەخۆی حەڵێڵ بکاو، بەختەوەریی دابین بکات.

جا بێگومان ئەم ئامانجە بەرزترین و گەورەترین و چاکترین بەرهەم و ئامانجی ئایینە، بەڵام ئێمە کە لەدوای هەموو شتێکەوە باسمان کرد، مەبەستمان هەبوو!

مەبەستەکەش ئەوەیە کە ئێمە زۆر کەسی خۆ بە مسوڵمان زان[1] و مسوڵمانۆچکە[2] دەبینین، پێیان وایە: ئەم ئامانجە هەرەبەرزو مەزنە (خوا ڕازی کردن و لە دۆزەخ قوتار بوون و بەبەهەشت گەیشتن) زۆر بە سێنایی دەستگیر دەبێو، هیچ ماندوبوون و ئارەق کردنی پێ ناوآ!!

جا ئێمە کە بەرلەوەی بچینە سەر باسکردنی ئەو ئامانجەی کە یەکەمین و دوایین ئامانج و مەبەستی هاتنی ئایینە، هاتینە سەر ڕانواندنی ئەو ئامانجانەی کە لە بیست خاڵی پێشوودا باسکران و، بەس هۆو وەسیلەی وەدەستهێنانی وین، مەبەستمان ئەوەبوو کە مسوڵمانان بەتێکڕایی و بەتایبەتی خۆ بەمسوڵمان زان و مسوڵمانۆچکەکان بزانن، کە گەیشتن بەو ئامانجە -ئامانجی ژمارە بیس و یەک ٢١- پەیوەستە بە هێنانەدی و جێبەجێکردنی ئەو ئامانج و ئەرکانەی کە لەپێش ویدا باسکران.

بە واتایەکی دی؛ بۆ ئەوەی بزانن کە گەیشتن بە ڕەزامەندیی خواو بەهەشتی بەرین و، قوتاربوون لە ئاگری هەڵیێساوی دۆزەخی بەتین، هەروا ئاسان نیەو، کەسێک بە هیوای ئەمانە بێ، پێویستە لە ژیانیدا، لە هەموو ئەو لایەنانەدا کە لە (٢٠) خاڵاندا خستماننە ڕوو، پابەندو گەردنکەچی ئایین و بەرنامەی خوابێو، شوێنکەوتووی ڕێوشوێنی پێغەمبەری (مصطفى) بێ.

---

(١) خۆ بەمسوڵمان زان ئەو کەسەیە کە هیچ خەسڵەت و کردەوەی مسوڵمانانەی تێدا نین و، بەس بەوەندەی کە بەزار شایەتمانی هێناوە، خۆی بە مسوڵمان لەقەڵەم دەدات، کە ئەوانە بەزۆریی بە موناڤیق دادەنرێن.

(٢) مسوڵمانۆچکە بە کەسێک دەگوترێ کە لە یەکێک یان هەندێک لە لایەنەکانی ئاییندا، فەرمانبەری خوایەو، لە لایەنەکانی دیکەشدا هیچ، کە دەشگونجێ بە (نیمچە مسوڵمان)یش ناوببرێ.

بەڵێ، پەیوەندیی نێوان پابەندیی بەبەرنامەی خواوەو، بە ڕەزامەندیی خوا گەیشتن، وەک پەیوەندیی نێوان بە پەیژەدا سەرکەوتن و چوونە سەربانە، جا بێگومان کەسێکیش بە پەیژەدا سەرنەکەوێ، مەحاڵە بتوانێ بگاتە سەربان.

خوێنەری خۆشەویستم!

هەرکام لەو بیست و یەک وەڵامانەی ڕابردن، دەگونجێ بکرێنە وەڵامی پرسیاری (ئایین بۆچی هاتوە؟!)، بەڵام ئەگەر بمانەوێ وەڵامێکی وا دابنێین کە جێی هەموو ئەو وەڵامانە بگرێتەوە، دەڵێین:

(ئایین بۆیە هاتوە تاکو ئینسان بەس بەندەی خوا بێ و، مسوڵمانی ڕاستەقینە بێ، کە بەختەوەریی دنیاو دوارۆژی تێدایە).

ئێستاش دوای ئەوەی لەم بەشەدا زانیمان:

ئایین چییە؟! بەرنامەی سەرلەبەری ژیانی مرۆڤە، بەتاک و کۆمەڵەوە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

ئایین چۆن پەیدا بووە؟! بەرنامەو پەیامی خوایە لە ئەنجامی لوتف و بەزەیی و کاربەجێیی خۆیەوە بۆ مرۆڤانی ناردوە.

ئایین بۆچی هاتوە؟! بۆیە هاتوە تاکو ئینسان، بەس بەندەی خوا بێ و مسوڵمانی ڕاستەقینە بێ، کە بەختەوەریی دنیاو دوارۆژی تێدایە.

بەڵێ دوای ئەوەی ئەو شتانەمان زانی کە گوتران، دەچینە سەر بەشی سێیەم و کۆتایی ئەم کتێبە، کە تەرخان کراوە بۆ توێژینەوەیەکی وردو قووڵ لە بارەی ئیمانەوە لە هەشت بەندانددا.

# بەشی ٣

## ئیمان

### ئیمان چییەو، چۆنەو، بەچی گەشەو زیاد دەکات؟

### شوێنەوارو بەرهەمی ئیمان بەخواهێنان لە ژیانی تاک و کۆمەڵدا چیە؟!

## ڕێخۆشکردن

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەشی سێیەمە کە لەڕووی قەبارەوە گەورەترین بەشی ئەم کتێبەیە، لە هەشت بەندان پێکهاتون:

بەندی یەکەم: بڕوا (إیمان) چییە؟

بەندی دووەم: پلەو پایەی بڕوا بەخوابوون.

بەندی سێیەم: ڕێگای پەیدابوون و فراژووبوونی بڕوا.

بەندی چوارەم: چاکترین ڕێی بەرەو خواچوون و بەخوا گەیشتن.

بەندی پێنجەم: کردنەوەی چەند گرێ کوێرەیەک و لادانی چەند تەمێک...

بەندی شەشەم: ڕێگای پاکڕاگرتنی دڵ و پاراستنی بڕوا.

بەندی حەوتەم: هەرکەسێک بەڕاستیی بەرەو خوا بڕوات، نائومێدی ناکات.

بەندی هەشتەم: گرنگیی بڕوا بەخوابوون، لەژیانی تاک و کۆمەڵدا.




# بڕوا (إیمـــان[١]) چییە؟!

## دەســـتپێك

**خوێنەری بەڕێز و خۆشەویست!**

ئایینـی ئیسـلام وەک درەختێـک وایـە کـە لـە دوو بەشـان پێـک دێ؛ یەکەم: ڕەگ و ڕیشە، دووەم: قەدو لق و پۆپ، جا بیروبڕوا (عقیدة) لەجێی ڕەگ و ڕیشـانەو، یاسـاو دەستوورەکانیش لەجێی قـەد و لـق و پۆپانـن..

---

(١) سـتایش و شـوکرانە بـۆ خـوای بەخشـەر، ئێمـە لـە زنجیـرە دەرسـی (ئیمـان و عەقیـدەی ئیسـلامیی)دا کـە شـەش بەرگـە، دوازدە (١٢) دەرسـمان تایبـەت کـردوون بـە ڕوونکردنـەوەی چەمـک و واتـای ئیمانـەوەو، هەمـوو ئـەو مەسـەلەو بابەتـە جۆراوجۆرانـەی کـە پێیـەوە پەیوەسـتن، وەک کـەم کـردن و زیادکردنـی ئیمـان، هەڵوەشـێنەرەوەکانی ئیمان پەرێز و بەرهەمـی ئیمـان لـە ژیانـی تـاک و کۆمەڵدا...هتـد. بۆیـە ئەگـەر چەنـد تێبینـی و ڕوونکردنەوەیەکیـش لەبـارەی ئیمانـەوە هەبـن، لێـرەدا نایاننووسـم و خوێنـەری بەڕێـز حەواڵـەی ئـەو زنجیـرە دەرسـە-کە دواییـن بەرهەممـە لـەو بارەوە- دەکـەم و هیواداریشـم ئـەم قسـەیەم ئـەوەی لـێ نەفامرێتـەوە کەئـەوەی لێرەدا لەبارەی ئیمانـەوە نووسـیومانە، ئەگـەر بەهەڵـەو ناتەواویشـی بزانـم گوێـی نادەمـێ!! نـەء مەبەسـتم ئـەوە نیـە، بەڵکـو مەبەسـتم ئەوەیـە کـە دواییـن سـەرنج و قەناعەتـی خۆمـم لـە بارەی ئیمانـەوە بـە تێرو تەسـەلی، لـە زنجیـرە دەرسـی ناوبراودا خسـتۆتە ڕوو، کـە سـوپاس بـۆ خـوا ئێسـتا لـە شـەش بـەرگ دا چـاپ کـراوە لـە لایـەن نووسـینەگەی تەفسـیرەوە.

بەڵێ، بڕوا (إیمان) بنچینەو بنەڕەتی ئایینە، ئنجاهەروەک چۆن دیواری هەر خانووێک بەگوێرەی پتەویی و ناپتەویی بناغەو بنچینەکەی هەڵدەچنرێو، لق و پۆپ و گەڵیی هەر درەختێک، بەپێی زۆریی و پتەویی و قووڵ ڕۆچوویی ڕەگ و ڕیشەکانی زۆر دەبن و هەڵدەچن، ئینسانی بڕواداریش حەتمەن پابەندیی و گەردنکەچیی بە ئایینی خواوەو ڕێژەی جموجووڵ و چالاکیی و کردەوە چاکەکانی، بە ئەندازەو بارتەقای چاک حاڵی بوونی لە بڕواو قووڵیی و پتەویی ئەو بڕوایە دەبێ.

واتە هەروەک چۆن شتێکی ناواقیعی و نەگونجاوە، کە بناغەیەکی خواروخێچ و ڕزیو، بتوانێ دیوارێکی پتەوو بەرز هەڵچووی ڕێک و پێک ڕاگیر بکا، یان ڕەگ و ڕیشەیەکی بێهێزو کەم تین، بتوانێ قەدو لق و پۆپێکی بەرزو چڕوپڕ هەڵگرێ، مەحاڵ و نەگەنجاویشە، کە بڕوایەکی سەرکێڵ و خوارو ناتەواو، بتوانێ جۆرە پابەندیی و گەردنکەچیی و جموجووڵ و چالاکییەکی تێرو تەواو و بەرفراوان بەرهەم بێنێ، چونکە (کاریتە لە کفرێ هەڵناکەوێ) و (گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ).

ئنجا بێگومان یەکەمین هەنگاوی وەدەستهێنانی بڕوای تەواویش، بریتیە لە ناسین و پەیبردن بە (بڕوای تەواو)، ئاخر ماقووڵ نیە مرۆڤ شتێک نەناسێو شارەزایی نەبێ، بشتوانێ وەدەستی بێنێ، هەر بۆیەش گوتراوە (فهم السؤال نصف الجواب) تێگەیشتن لە پرسیار نیوەی وەڵامیەتی.

جا ئێمە خوا پشتیوان بێ لەم بەندەدا هەوڵی شیکردنەوەو پێناسەکردنی (بڕوا) دەدەین، بۆ ئەوەی هەر کەسێک خولیاو کەڵکەڵەی؛ خۆکردن و خەڵک کردنە مسوڵمانێکی چاکی لەسەریدا هەبێ، بەهۆی وەدەستهێنانی (بڕوا)یەکی ڕاستەوە، پێش خۆی ببینێو، بزانێ ئەو ئامانجەی بەدوایدا وێڵە، چییەو چۆنەو بە چ ڕێیەکدا دەیگاتێ؟ نەوەک خوانەکردە، وەک ئەو بابایەی لێ بەسەر بێ کە شاعیر پێی گوتوە:

ترجو النجاة ولم تسلك مسالكها إن السفينة لا تجري على اليبس

واتە: بەتەمای ڕزگاریی، بەڵام ڕێگاکانی ڕزگارییت نەگرتوون، بێگومان کەشتی لەسەر ئیشکانی ناڕوات!

بەڵێ هەر کەسێک بیەوێ رزگاریی وەدەست بێنێو، ڕێی سروشتیی گەیشتنە رزگارییش نەگرێ، وەک ئەو کەسەیە کە بەتەمایە کەشتییەکەی لەسەر ئیشکانیی بئاژوێ!

جا ئێمە پێشەکی وشەی (إیمان) لە گۆشەنیگای زمانەوە دەتوێژینەوە، دوایی لە زاراوەی شەرع (اصطلاح الشرع)داو لە ڕوانگەی زانایانەوەو، ئنجاڕاو لێکۆڵینەوەی خۆشمان لەوبارەوە دەخەینە ڕوو:

هەڵبەتە وشەی (إیمان)یش وشەیەکی عارەبییەو پێویستە بۆ ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی، پەنا بەرینە بەر فەرهەنگەکانی زمانی عارەبی.

**١- چەمک و واتای وشەی (إیمان) لە ئەسڵی زماندا:**

فەرهەنگەکانی زمانی عارەبی تێکڕا لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە وشەی (ایمان) چاوگ (مصدر)ی (آمَنَ یؤمِنُ)یەو بە مانای بەڕاست دانان (تصدیق)ە، بۆ نموونە خاوەنی کتێبی (لسان العرب) دەڵێ:

(الإیمان بمعنى التصدیق، ضد التکذیب، یُقال آمَنَ بە القوم و کذب بە القوم.)[1]، واتە: بڕوا یانی بەڕاست دانان، دژی بە درۆ دانانە، دەگوترێ: کۆمەڵێک بڕوایان پێهێنا-بەڕاستیان زانی- وە کۆمەڵێک بڕوایان پێنەکرد- بەدرۆیان دانا-.

دیسان دەڵێ:

---

(١) (لسان العرب) لابن منظور، ب١٣، ل٢١.

أ- (وفي التنزيـل العزيـز [ومـا أنـت بمؤمـن لنـا] أي بمُصَـدِّق، والإيمـان التصديـق.. فهـو مصـدر آمَـنَ يؤمِـنُ إيمانـاً فهـو مؤمـن، واتفـق أهـل العلـم مـن اللغويـين وغيرهـم أن الإيمـان معنـاه التصديـق)[1]، واتـە: لـە قورئانـی زاڵـدا هاتـوە [ومـا أنـت بمؤمـن لنـا] وە تۆ-ئـەی یەعقـوب (علیـه السلام) بڕوامـان پێ ناکـەی، واتە بەڕاسـتمان نازانـی و، بـڕوا بەڕاسـت زانینـە... چاوگـی (بـڕوای هێنـا، بـڕوا دێنـێ، بڕواهێنـان، ئـەو بڕوادارە)یە، زانایـان لـە زمانەوانـان و ئەوانـی دیکـەش، لەسـەر ئـەوە ڕێککەوتـوون کـە (بـڕوا) یانـی: بەڕاسـت دانـان.

ب- خاوەنـی (أسـاس البلاغـة) گوتوویەتـی: (ومـا أومِـنُ بـشيءٍ مـما يقـول، أي مـا أُصَـدِّق ومـا أَثِـقُ، ومـا أُومـنُ أن أجـد صحابـة، يقولـهُ نـاوي السـفر: أي ماأثـق أن أظفـر بمـن أُرافقـهُ)[2]. واتـە: بـڕوا بەهیـچ شتێک ناکـەم لـەوەی دەیڵـێ، واتـە بەڕاسـتی دانانێـم و بـاوەڕ ناکـەم و، بـڕوام وانیـە کـە هاوڕێـم لـێ هەڵکـەون، بابایـەک ئـەم قسـەیە دەڵـی کـە بەنیـازی سـەفەرێیە: یانـی بـاوەڕ(٣) ناکـەم کـە کەسـم وەدەسـت بکـەوێ، ببمـە هاوەڵـی.

هـەرکام لـە فەرهەنگەکانـی دیکـەش هـەر ئـەم قسـانەیان دووپـات کردوونـەوە، ئەوەنـدە هەیـە بڕەجیاوازییـەک لـە شـێوازی دەربڕینیانـدا دەبینـرێ، بـۆ وێنـە بڕوانـــە هـەرکام لـە:

جـ- (القاموس المحيط)، ب٤، لا١٩٩.

د- (مختار الصحاح)، لا٢٦.

هـ- (معجم مفردات ألفاظ القرآن)، لا٢٢.

و- (دائرة معارف القرن العشرين)، ب١، لا٥٩٨.

ز- (المنجد في اللغة والأعلام)، چاپ٢٢، لا١٨.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ب١٣، ل٢٣.

(٢) (أساس البلاغة) جارالله الزمخشري، ل٢٢.

(٣) لە زمانی کوردیدا هەرچەندە لەبەرامبەر (إیمان)دا هەرکام لە (بڕوا) و (باوەڕ) بەکارهێنراون، بەڵام پەسند وایە (بڕوا) بۆ (إیمان) و (باوەڕ)یش بۆ (ثقة) بێت و من هەروام کردوە.

که‌واته‌: پوخته‌ی مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه‌ که‌ وشه‌ی بڕوا(ایمان) له‌ ئه‌سڵی زماندا یانی: پێلێنان و دان پێداهێنان به‌ ڕاستیی شتێكدا و باوه‌ڕ (ثقة) پێكردن و متمانه‌ پێكردن.

ئنجا كه‌ زانیمان له‌ ئه‌سڵ و بنچینه‌ی زماندا، وشه‌ی بڕوا بۆچی به‌كارهێنراوه‌و چه‌مك و مه‌به‌سته‌كه‌ی چییه‌! با بزانین له‌ زاراوی شه‌رعدا، چ چه‌مك و واتایه‌كی هه‌یه‌!

**٢- چه‌مكی وشه‌ی بڕوا (إیمان) له‌ ڕوانگه‌ی شه‌رعه‌وه‌[١]:**

زاناو شاره‌زایان[٢] تێكڕا له‌سه‌ر ئه‌وه‌ن كه‌ وشه‌ی (بڕوا) پاش خوازرانه‌وه‌و به‌كارهێنانی له‌ زاراوه‌ی شه‌رعدا، واته‌ پێشاندانی گه‌ردنكه‌چیی و قبووڵ كردنی ئه‌و به‌رنامه‌یه‌ی كه‌ پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) له‌خواوه‌ بۆی نێرراوه‌، وێڕای بڕواپێكردنی دڵ و دان پێداهێنانی زمان.

به‌ڵێ پێناسه‌ی ئیمان له‌لای زاناو پێشه‌وایانی پێشین، بریتیه‌ له‌: (قبولأكردن و ملكه‌چ كردن بۆ شه‌ریعه‌تی خواو دان پێداهێنانی ڕاستیی و ته‌واوییه‌كه‌ی) كه‌ ئه‌وان به‌ ڕسته‌ی (الإیمان قول القلب واللسان، وعمل القلب والجوارح) ته‌عبیریان لێكردوه‌.

بۆ وێنه‌: (لسان العرب) ده‌ڵێ:

(الإيمان: إظهار الخضوع والقبول للشريعة ولما أتى به النبّي (صلى الله عليه وسلم) واعتقاده وتصديقه بالقلب)[٣]، واته‌: بڕوا یانی پێشاندانی گه‌ردنكه‌چیی و وه‌رگرتن و ڕازیبوون به‌ به‌رنامه‌ی خوا-و به‌وه‌ی كه‌

---

(١) مه‌به‌ستمان له‌ وشه‌ی (شه‌رع) لێره‌دا به‌رنامه‌و ئایینی خوایه‌ نه‌ك (فقه).

(٢) لێره‌دا مه‌به‌ست زاناو شاره‌زاو پێشه‌وایانی پێشین(سلف)ه‌، ئه‌گه‌رنا وه‌ك دوایی باسی ده‌كه‌ین، دوایی ڕاجیایی (اختلاف) له‌ پێناسه‌ی ئیماندا په‌یدا بووه‌.

(٣) (لسان العرب)، ب١٣، ل٢٣.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەلایەن خواوە هێناویەتی و بڕواپێکردن و بەڕاست دانانی بەدڵ.

ب- (القاموس المحيط) دەڵێ:

(والإيمان الثقة وإظهار الخضوع وقبول الشريعة)[1]، واتە: بڕوا یانی باوەڕو پێشاندانی گەردنکەچیی و ڕازیبوون بە بەرنامە-ی خوا-.

وە (معجم مفردات ألفاظ القرآن) دەڵێ:

(والإيمان يستعمل تارة اسماً للشريعة التي جاء بها محمد عليه الصلاة والسلام.. ويوصف به كل من دخل في شريعته مُقراً بالله و بنبوته.. وتارة يستعمل على سبيل المدح ويراد به إذعان النفس للحق على سبيل التصديق، وذلك باجتماع ثلاثة أشياء؛ تحقيق بالقلب، وإقرار باللسان، وعمل بحسب ذلك بالجوارح، ويقال لكل من الإعتقاد والقول الصدق والعمل الصالح: الإيمان.)[2]، واتە: بڕوا جاری وایە وەک ناوێک بۆو بەرنامەیەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی بەکاردێ و، دەکرێتەوەسف بۆ هەرکەسێک کە دەچێتە ژێر حوکمی بەرنامەکەیەوە، دان بە بوونی خواو پێغەمبەرایەتیی ویدا دێنێ.. جاری واش هەیە-وشەی بڕوا- بەکاردێ لەسەر شێوەی مەدح و مەبەست پێی؛ ملکەچکردنی نەفسە بۆ هەقێ، لەسەر شێوەی دان پێداهێنان، ئەوەش-واتە ئەو دانپێداهێنان و ملکەچییە- بەکۆبوونەوەی سێ شتان دەبێ؛ بڕواهێنان بەدڵ و، دانپێداهێنان بە زمان و، کردەوەش بە ئەندامەکان بە گوێرەی ئەو-بڕواو دانپێداهێنان)ەوە، بەهەرکام لە بڕواو قسەی ڕاست و کرداری چاک دەگوترێ: بڕوا.

کەواتە: پوختەی مەبەست ئەوەیە کە بڕوا لەڕوانگەی ئایینەوە هەر لەسەر بنچینە زمانییەکەی وەرگیراوە، بەڵام (بڕوا) لە زماندا لە لایەکەوە

---

(١) (القاموس المحيط)، ب٤، ل١٩٩.

(٢) (معجم مفردات ألفاظ القرآن) راغب الأصفهاني، ل٢٢.

له‌ بڕوای شه‌رعیی گشتی تروو به‌رفراوانتره‌، چونكه‌ هه‌رجۆره‌ به‌ڕاست دانان (تصدیق)ێک ده‌گرێته‌وه‌، به‌ڵام له‌ شه‌رعدا تایبه‌ته‌ به‌و شتانه‌وه‌ كه‌ ئایین، بڕوا پێکردن و به‌ڕاست دانانیانی به‌مه‌رج گرتوه‌، بۆ به‌ بڕوادار له‌قه‌ڵه‌مدانی ئینسان.

له‌لایه‌كی دیكه‌شه‌وه‌ (بڕوا) له‌ زماندا تایبه‌تییتره‌و بڕوای ئایینی گشتیترو به‌رفراوانتره‌، چونكه‌ بڕوا له‌ ئه‌سڵی زماندا یانی: به‌ڕاست دانانی شتێک به‌ دڵ و به‌ زمان، به‌ڵام له‌ زاراوه‌ی ئاییندا، وێڕای به‌ڕاست دانان به‌ دڵ و زمان، به‌ڕاست دانان به‌ كرده‌وانیشی ڕه‌گه‌ڵ خراوه‌، واته‌: (بڕوا) له‌ ئاییندا بریتیه‌ له‌: به‌ڕاست دانان به‌ دڵ و زمان و ئه‌ندامه‌كان. (التصدیق بالقلب واللسان والجوارح).[1] یانی هه‌روه‌ک چۆن نوێژ (صلاة) له‌ ئه‌سڵ و بنچینه‌ی زمانی عاره‌بیدا، به‌س به‌ مانای پاڕانه‌وه‌ (دعاء) هاتوه‌، به‌ڵام كه‌ ئایین به‌كاری هێناوه‌، ماناو چه‌مكه‌كه‌ی فراوانتر كردوه‌و وێڕای پاڕانه‌وه‌؛ قورئان خوێندن و، چوونه‌ ڕكووع و، كڕنووش بردن و، پاكیی بۆ خوا ده‌ربڕین و، ته‌حییات خوێندن و، سه‌ڵێوات له‌ پێغه‌مبه‌ر دان و، سه‌لام دانه‌وه‌ش، ده‌گرێته‌ نێو خۆی، بڕواش له‌ ئه‌سڵی زمان و ئاییندا به‌هه‌مان شێوه‌.

كه‌واته‌: وه‌ک زانایانی ژیربێژیی (منطق) ده‌ڵێن: وشه‌ی (بڕوا) له‌ ئه‌سڵی زمانداو، وشه‌ی (بڕوا) له‌ ئاییندا (عموم وخصوص من وجه)یان له‌ نێواندا هه‌یه‌، واته‌ هه‌ر كامێكیان له‌لایه‌كه‌وه‌ گشتیتره‌و، له‌لایه‌كی دیكه‌شه‌وه‌ تایبه‌تیتره‌ له‌وی دیكه‌.

ئێستاش نۆره‌ی ڕوونكردنه‌وه‌و لێكۆڵینه‌وه‌ی خۆمانه‌ ده‌رباره‌ی بڕوا:

---

(١) به‌ڵام پێناسه‌ی (الإیمان؛ قول وعمل، قول القلب واللسان، وعمل القلب والجوارح) كه‌ پێناسه‌ی پێشینی چاک (السلف الصالح) مانه‌، ڕاستترو وردتره‌، وه‌ک له‌ زنجیره‌ ده‌رسه‌كانی ئیمان و عه‌قیده‌ی ئیسلامییدا ڕوونمان كردۆته‌وه‌.

### ٣- لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی بڕوا:

خوێنەری سەنگین!

زانایانی[1] ئیسلام بە درێژایی مێژوو كێشەو مشتومڕو بێنەو بەرەی زۆریان دەربارەی (بڕوا) و پێناسەو چۆنیەتی و چییەت (ماهیة)ی بڕوا كردوەو، لەوبارەوە كتێب و نووسراوی زۆرو زەوەندەی هەمەجۆر نووسراون و، زانایان لە بەرانبەر (بڕوا)دا، بوونە چەند دەستە:

أ- دەستەیەك گوتوویانە: (بڕوا) بریتیە لە بەڕاست دانان (تصديق) بە دڵ و پێلێنان (إقرار)ی بەزمان، بەڵام دان پێداهێنانی زمان پلەو پایەو ڕوكنی بڕوا نیەو بەس مەرج (شرط)ی بڕوایە، بۆ بە مسوڵمان لەقەڵەم دانی ئینسان[2]، ئەمانەش بە ئەشعەرییەكان (الأشاعرة) بەناوبانگن، كە پێشەواو دەمڕاستیان (الإمام أبو الحسن الأشعري)یە[3]، هەروەها ماتورێدییەكانیش هەمان ڕایان هەیە.

ب- كۆمەڵێك[4] دەڵێن: (بڕوا) بریتیە لە بەڕاست دانان (تصديق)ی بە دڵ و پێلێنانی بە زمان و، كردەوە بە ئەندامەكان، واتە (التصديق بالجَنان والإقرار

---

(١) دیارە زانایانی پێشین كە لە سێ پشتەكان (الأجيال الثلاثة)دا بوو ون و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شایەدیی چاكتر بوون (خيرية)ی بۆ داون: {خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ} أخرجه البخاري برقم: ٣٤٥٠. وەك پێشتر باسمان كرد، لە پێناسەكردنی ئیماندا یەكدەنگ بوون و لە پشتەكان (الأجيال)ی دواییدا، ڕاجیایی سەری هەڵداوە.

(٢) مەبەست لە (بەڕاست دانان) و (دان پێداهێنان)، بەڕاست دانان و دان پێداهێنانە، بە هەرچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەلایەن خواوە هێناویەتی.

(٣) بڕوانە (شرح العقائد النّسفية) ل٢٠٣. و بڕوانە: (المواقف في علم الكلام) عضدالدين الأيجي، ل٣٨٤، و بڕوانە: (الوسيلة في شرح الفضيلة) الشيخ عبدالكريم المدرس، ل٤٤، چ١.

(٤) دیارە ئەم بۆچوونە لەسەرەتاوە هی تێكڕای زانایانی ئوممەت بوو، بەڵام پاش سەرهەڵدانی قوتابخانە فیكرییەكانی وەك (الأشاعرة) و (الماتريدية) و (المعتزلة) و (المرجئة) و (الشيعة) ئەم بۆچوون و ڕێڕەو(اتجاه)ە گشتییە بوو بە بۆچوونی كۆمەڵێك لەنێو دەستەو كۆمەڵە بیدعەتچییەكاندا، بەڵام كۆمەڵی هەق بوو!!

باللسان والعمل بالأركان)، ئەمەش ڕای زانایانی پێشین (علماء السلف)[(١)] و فەمووودەناسان (محدثين) و (جمهور المتكلمين)[(٢)] و زۆربەی (شيعة)یە[(٣)].

ج ـ دەستەیەک دەڵێن: (بڕوا) بریتیە لە تێکڕای کردەوەی ئەندامەکان، وێڕای بەڕاستزانینی دڵ و دانپێداهێنانی زمان، ئەمانەش (خوارج) و (معتزلة)ەکانن.[(٤)]

د- دەستەیەکیش دەڵێن: (بڕوا) بەس بریتیە لە دان پێداهێنان (إقرار)ی زمان و، نە بەڕاستدانان (تصديق)ی دڵ و، نە کردەوەی ئەندامەکان، بە بەشێک لە بڕوا دانانرێن، ئەمەش ڕای (كرّامية)کانە، واتە ئەوانەی (محمد بن كرام السجستاني) بە ڕابەری خۆیان دەزانن.[(٥)]

ئەمە پوختەو ڕاپازنەراوی بیروڕای زانایانی پێشوو بوو دەربارەی بڕوا، بەڵام ئایا ئێمە کام لەم ڕایانە پەسند دەکەین؟!

---

(١) بڕوانە: کتێبی (فتح المجيد شرح كتاب التوحيد)، ص٣ل، چ٧، نووسینی (الشيخ عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ)

(٢) سەرنجی کتێبی (شرح العقائد النسفية) بدە، ل٢٠٦، و بڕوانە: (المواقف في علم الكلام)، ل٣٨٥، و (دائرة المعارف)، ب١، ل٥٩٨، محمد فريد وجدى.

(٣) بڕوانە: (أصل الشيعة وأصولها) محمد الحسين آل كاشف الغطاء، ط٧، ل١٢٧.

(٤) بڕوانە: (المواقف في علم الكلام)، ل٣٨٥.
تێبینی: ڕەنگە یەکێک بپرسێ: ئەدی جیاوازیی نێوان پێناسەی زاناو پێشەوایانی پێشین کە بە (أهل السنة والجماعة) ناسراون، لەگەڵ هی (معتزلة) و (خوارج)ەکان چییە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: ئەهلی سوننەت دەڵێن ئەسڵی کردەوان مەرجە بۆ دروست بوونی ئیمان، بەڵام تێکڕای کردەوەکان مەرج و پێکهێنەری ئیمان نین، بەڵام (خوارج) و (معتزلة) دەڵێن: ئیمان لە تێکڕای کردەوە چاکەکان پێکدێت و، بە نەبوونی هەر کردەوەیەکی پێویست، یان هەبوونی هەرکردەوەیەکی حەرام، بابای مسوڵمان کافر دەبێت و لەبازنەی ئیسلام دەردەچێ.
لە زنجیرە دەرسەکانی کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا، ئەم مەسەلەیە چاک توێژراوەتەوە، بڕوانە بەرگی یەکەم، دەرسی یەکەم و دووەم.

(٥) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ل٣٨٤، و بڕوانە: (دائرة معارف القرن العشرين)، ب١، ل٥٩٨، محمد فريد وجدى.

لـە وەڵامـدا دەڵێم: ئەوەیـان کـە لـە ڕووحـی قورئـان و سـوننەتەوە نیزیـک تـر بێـو، بەڵگـەو پشـتیوانی بەهێزتـر بـێ، کەواتـە بـا سـەرنج بدەیـن داخـۆ قورئـان و سوننەت چۆن باسـی بڕوایـان کـردوەو چۆنیـان پێنـاس (تعریـف) کـردوە:

## ٤- بڕوا لە ڕوانگـەی قورئان و سوننەتەوە:

**یەکـەم:** لـە قورئانێـدا بـڕوا (إیمـان) بـەس بەڕاسـت دانـان (تصدیـق)ی نێـو دڵ نیـە، بەڵکـو دان پێداهێنانـی زمـان و، کـردەوەی دڵ و، ئەندامەکانیـش بەبەشـێک لـە بـڕوا دانـراون، بەڵگـەش بـۆ سـەلماندنی ئـەم ڕاسـتییە زۆرن، بـەڵام ئێمـە بـەس دووان لـەو بەڵگانـە بـە نموونـە دێنینـەوە:

أ/ خـوای زانـاو میهرەبـان فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ ﴾ (البقـرة- ١٤٣).

واتـە: ئـەو ڕووگـە(قبلة)یـەی کـە لەسـەری بووی-واتـە (بیـت المقـدس)- بڕیارمـان نەدابوو بۆ ئـەوە نەبـێ کـە بزانیـن کـێ بـەدوای پێغەمبـەر دەکـەوێ و، کـێ لەسـەر پاژنەکانی پاشـەوپاش دەگەڕێتـەوە -و لێـک جـوێ بنـەوە- و ئـەو- ڕووکردنـە (بیت المقدس)-ە شـتێکی گـەورەو گـران بـوو لەسـەر ئەوانـە نەبـێ کـە خـوا ڕێڕوونیـی کـردوون و، خـوا قـەت نالـوێ بـڕوا (نوێژە)کەتـان بەزایـە بـدات، بێگومـان خـوا بـە بەزەیـی و میهرەبانـە لەگـەڵ خەڵکـی.

مەبەسـت لـە (إیمانکـم) لـەم ئایەتـەدا، نوێـژە، ئەمـەش ڕای هەمـوو توێژەرەوانـی قورئانـی لەسـەرە[1]، ئنجـا بێگومـان نوێژیـش وێـڕای بیـروڕای نێودڵ

---

(١) بۆ نموونە بڕوانە: (جامع البيـان في تفسير القرآن)، ب٢، ل١٢، ب٢، ابـن جرير، و بڕوانـە: (التفسير الكبير)، ب٢، ب٢، ل١٢ الإمـام فخرالديـن الرازي، و بڕوانـە: (تفسير القرآن العظيم)، ابـن کثير، ب١، ل١٩٣. و بڕوانـە: (غرائـب القرآن و رغائـب الفرقـان)، ب١، ل١٩، لەسـەر پەڕاوێزی (تفسير الطبري) للنيسـابوري، بڕوانە: تەفسیری (الکشـاف)، ب١، ل٢٠١، للزمخشري.

دانپێداهێنانی زمان و، كردەوەی ئەندامەكانیشی بە زەقترین شێوە تێدان، كەواتە ڕاستە (بڕوا)[١]: لە بیروبڕوای نێو دڵ و پێلێنان (اعتراف)ی زمان و كردەوەی ئەندامەكان پێكدێ.

وەك (ابن جرير الطبري) ناودارترین و پێشەوای توێژەرەوانی قورئان، دەربارەی (بڕوا) گوتوویەتی: (لەمەوبەر سەلماندمان كە بڕوا (بەڕاست دانان)ەو، بەراست دانان (تصديق)یش جاری وایە بەدڵ دەبێو، جاری واشە بە كردەوە دەبێو، جاری واش هەیە بە هەردووكیان)[٢].

ب/ دیسان خوا فەرموویەتی: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ (النساء- ٦٥).

واتە: جا نەخێر سوێند بە پەروەردگارت نابنە بڕوادار هەتا تۆ نەكەنە دادوەر (حاكم) لەو شتانەدا، كە دەبنە جێی كێشە لە نێوانیاندا، ئنجالە دەروونیاندا هەست بە هیچ دڵتەنگییەك نەكەن و، حوكمی تۆ قبووڵ بكەن، بە گەردنكەچیی تەواوەوە.

لێرەشدا خوای دادگەرو كاربەجێ سوێند بە زاتی خۆی دەخوات، كە خەڵكی هەتا بە دڵ و بەكردەوە گەردنكەچی حوكمی خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەبن، نابنە مسوڵمان و بڕوادار.

**دووەم:** لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم) بەهەمان شێوە، بڕوا بەهەموو جموجووڵ و چالاكییەكانی ئینسان دانراوە، بۆ وێنە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەكیدا فەرموویەتی: {الإِيمَانُ بِضْعٌ

---

(١) مەبەست لە (بیروباوەڕی نێودڵ) (اعتقاد القلب) هەم بەراست زانین و هەم كردەوەكانی دڵیشە لە خۆشویستن و قبووڵ كردن و ڕازی بوون ...هتد..

(٢) جامع البيان في تفسير القرآن، ب٢، ل١٢.

وَسَبعُونَ أَوْ بِضعٌ وسِتُونَ شُعْبَةً : فَأَفْضَلُهَا قَولُ: لا إلـهَ إلاَّ اللهُ، وَأَدْنَاهَا إمَاطَةُ الأذَى عَنِ الطَّرِيقِ، والحياءُ شُعبَةٌ مِنَ الإيمان )) مُتَّفَقٌ عَلَيهِ أخرجه : البخاري برقم: ٩، ومسلم برقم: ٥٨}، واتە: بڕوا حەفتاو ئەوەندە-یان شەست و ئەوەندە- بەشە، گەورەترینیان: گوتنی (لا إلـهَ إلاَّ اللهُ)یە و، گچکەترینیان لابردنی شتێکی بە ئازارە لەسەر ڕێیە و، شەرمیش بەشێکە لە بڕوا.

دیسان فەرموویەتی: {مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ، فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ} (أخرجه أبو داود برقم: ٤٦٨٣، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، قال الألباني: صحيح)، واتە: هەرکەسێک لەبەر خوا-خەڵکی- خۆشبوێو لەبەر خوا -خەڵکی- ببوغزێنێ، لەبەر خوا-شت- ببەخشێ و لەبەر خوا دەست بگرێتەوە لە-شت- بەخشین، ئەوە بڕوای تەواو کردوە.

کەواتە: کردەوەش «هەم کردەوەی دڵ و، هەم هی ئەندامەکان، چونکە ڕیشەو بنکی کردەوەی ئەندامەکان و کردەوە ڕواڵەتییەکان، کردەوەکانی دڵ و دەروون و خەسڵەتە پەنهانەکانن، هەر بۆیەش لە فەرموودەکەدا (مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ) پێش (أَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ) کەوتوون!» بەشێکە لە بڕوا، چونکە ئەگەر (بڕوا) سەربەخۆ باو لە کردەوە جوێ با، حەوجێی کردەوە نەدەبوو کە خۆی پێ تەواو بکات.

**سێیەم:** بێگومان بڕوا بەشێکە لە ئایین، جا کەسێک کە ئایینی لێ لاببرێ، بەڕێگەی پێشتر (الطریق الأولی) بڕوای لێ لابراوە، چونکە لابردن (نفي)ی هەموو (کل) دەبێتە لابردنی بەش (جزء)ەکانی، بەڵام بەپێچەوانەوە نا، جا خوای پەروەردگار ڕایگەیاندوە کە کەسانێک کە نوێژ ناکەن و زەکات نادەن ئایینیان نیە:

﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ﴾ (التوبة-١١).

واتە: ئنجا ئەگەر گەڕانەوە-لای خوا- و نوێژیان بەرپاکردو زەکاتیان دا، ئەوە براتانن لە ئاییندا.

دیـاره چەمکـی پێچەوانـە (مفهـوم المخالفـة)ی ئـەم ئایەتـە ئاوایـە: ئنجـا ئەگـەر نەگەڕانـەوەو، نوێژیـان بەرپـا نەکـردو، زەکاتیـان نـەدا، ئـەوە براتـان نیـن لـە ئاییـندا.

**چـوارەم:** خوای بەخشـندە بڕوادارانـی بە پشـت و پەنـاو یاریـدەدەری یەکدی دانـاون، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ ﴾ (التوبة-٧١).

واتە: پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکیانن.

بەڵام سـەبارەت بەوانەی کە لەکۆچکردن بەرەو ولێتی ئیسـلام (دار الإسـلام) دواکەوتبوون، فەرموویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ ﴾ (الأنفال-٧٢).

واتـە: ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، بـەڵام کۆچیـان نەکـردوە، هەتـا کـۆچ نەکـەن ئێـوە پشـتیوانییان مەکـەن.

هەڵبەتـە لـە ئایەتـی یەکەمـدا خستیە ڕوو کـە هەرچـی بڕوادار بـێ -چ پیـاو چ ئافـرەت- بـڕواداران پشـتیوانـنی، ئنجـا کـە لێرەدا بەهـۆی نەبوونـی کردەوە-ئـەو کردەوەیـەش لێرەدا لـە کۆچکردنـدا خـۆی دەنوێنـێ- ئـەو جۆرەی بڕوادارانـە لـە هاوکاریـی و پشـتیوانیی بـڕواداران بێبـەش دەکات، دیـارە بڕوایەکەیـان بەهـۆی نەبوونـی کـردەوەوە، کەڵێنـی تێبـووە، کەواتـە کـردەوەش وێـڕای بەڕاسـت دانانـی دڵ و پێلێنانـی زمـان، بەشـێکی بـڕوا پێـک دێنـێ، دەنـا بەهـۆی نەبوونییـەوە بـڕوا کەلێنـی تـێ نەدەبـوو.

ئنجـا وێـڕای ئـەو بەڵگانـەی گوتـران، بـا سـەرنجی ئـەم سـێ بەڵگانـەش بدەیـن:

شـایەتمان کـە یەکەمیـن و بنەڕەتیتریـن پابـەو بنچینـەی ئیسـلامەتییەو کلیلـەی چوونـە نێـو ئیسـلامە، وەک پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) لـە

نوێژدا فێری کردووین، هەم بیروبڕوای نێو دڵ و، هەم گۆ (تلفظ)کردنی زمان و هەم کردەوە (کە لە جوولێندنی قامکی شادەدا خۆی دەنوێنێ)[1]ی تێدا هەن.

لە ڕاستیدا (بڕوا) بریتیە لە هەڵوێستی خۆپیشاندانی مرۆڤ سەبارەت بە خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بەرنامەی خوا، ئنجا مادام (مرۆڤ) بەس لە دڵ و زمان دروست نەبووە، ئەندامەکانی دیکەشی هەن، بە واتایەکی دی؛ مادان ئینسان وێڕای هێزی نیاز لەدڵگرتن و زمان گێڕان، هێزی کردەوە ئەنجام دانیشی هەیە، پێویستە لەو هەڵوێست نواندنەیدا هەموو هێزەکانی بەشدار بن، چونکە وەک گوتمان ئینسان بەس لە دڵ و زمانان پێک نەهاتوە.

وەک لە شارەزایانی زمانەوە نەقڵمان کرد، گوتیان: بڕوا لە زاراوی شەرعدا هەم بەراست دانانی دڵ و، هەم دان پێداهێنانی زمان و، هەم کردەوەی ئەندامەکانە، واتە: (التصديق بالجَنان والإقرار باللسان والعمل بالإركان).[2]

ئنجا لەوبارەوە کە بڕوا بریتیە لە بەراست دانان (تصديق)ی دڵ و زمان و ئەندامەکانی دیکەی لەش، ئەم فەرمودەیەش لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕراوەتەوە: ((الإيمان عقد بالقلب، واقرار باللسان، وعمل بالأركان))[3].

هەڵبەتە ئەم ڕایەی کە ئێمە پەسندمان کرد لەبارەی بڕواوە، ڕای سەرجەم زاناو شارەزایانی پێشین (سلف)و، فەرمووەدەناسان (محدثين) و زۆربەی

---

(١) قامک جوولێندن لە نوێژدا، مسلم وأبو عوانة وأبوداود والنسائي وان خزيمة وابن حبان گێڕاویانەتەوە، بڕوانە (صفة صلاة النبّي) محمد ناصرالدين الألباني، چ٦ ل١٦٩.

(٢) بڕوانە (لسان العرب) ب١٣ ل٢٣، و بڕوانە: (القاموس المحيط) ب٤ ل١٩٩، و بڕوانە: (معجم مفردات الفاظ القرآن) راغب الأصفهاني ل٢٢.
رواه ابن ماجة عن علی بن ابي طالب مرفوعا. (كشف الخفا ومزيل الالباس)، ب١، ل٢١٧.

(٣) رواه ابن ماجة عن علي بن أبي طالب مرفوعا.

زانایانی زانیاری کەلام (علم الكلام) و شەرع زانان (الفقهاء)[١] و پێشەوای تویژەرەوانی قورئان[٢] و ئیبنو حەزمی ئەندەلوسییە[٣]، بەڵام ئێمە لەبەر ئەوە پەسندمان نەکردو هەڵمان نەبژارد، کە ڕای زۆربەی زاناو شارەزایانە، بەڵکو بۆیە پەسندمان کرد[٤] کە تاقە ڕایەکە بتوانێ لەگەڵ هەموو دەقەکانی قورئان و سوننەتدا بگونجێو، لە ڕووحی ئیسلام بوەشێتەوەو بەڵگەی بەهێزو پتەو پشتگیریی بکەن.

شایانی گوتنە کە: ئەوەندی سەرنجی کتێبەکانی (علم الكلام)م داوە، دوو قسەم کەوتوونە بەرچاو کە وەک بەڵگان بچن، لە ڕەخنەی ئەوانەدا کە دەڵێن: کردەوەی ئەندامان بەشێک نیە لە بڕوا:

١- ئەوەیە کە دەڵێ: هەموو جارێ بڕواو کردەوەی چاک (الإيمان والعمل الصالح) لە قورئانێدا بەشێوەی (عطف) بەدوای یەکدا هاتوون، (عطف)یش نیشانەی جیاوازیی نێوان (معطوف) و (معطوف عليه) یە، کەواتە بڕواو کردەوە لێک جودان.

---

(١) بڕوانە: (شرح العقائد النسفية) ل٢٠٦، و بڕوانە: (دائرة معارف القرن العشرين) محمد فريد وجدي، ب١، ل٥٩٨. و بڕوانە: (المواقف من علم الكلام)، ل٣٨٤.

(٢) بڕوانە: (جامع البيان في تفسير القرآن)، ب٢، ل١٢، ابن جرير الطبري.

(٣) بڕوانە: (دائرة معارف القرن العشرون)، ب١، ل٦٠٠.
تێبینی: ئەو ڕایە پەسندکراوی زۆربەی (شيعة)کانیشە، بڕوانە (أصل الشيعة وأصولها) محمد الحسين آل كاشف الغطاء، چ٧، ل١٢٧، هەروەها ڕای تێکڕای (معتزلة)و (خوارج)ەکانیشە، بڕوانە (دائره المعارف)، ب١، ل٥٩٨.

(٤) دەڵێم: ئەی خوای بەخشەرو بەخشندەو بێنیازو جێی نیاز! پڕاوپڕی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوەو، هەر شتێکی دیکە کە خۆت پێی زانای، ستایش و شوکرانە بۆتۆ، کە هەر لە زووەوە بەچاکەو فەزڵی بێسنووری خۆت هیدایەتت داوم، لەو مەسەلە گەورەو گرنگەدا پێکاومە، کە بێگومان بێجگە لە بەزەیی و بەخشندەیی خۆت هۆکارێکی دیکەم پێ شک نایەت.

**٢**- ئه‌و قسه‌یه كه ده‌ڵێ: له قورئانی به‌ڕێزو فه‌رمووده‌ی به‌پێزدا، به‌س (دڵ) به‌جێگه‌و شوێنی بڕوا دانراوه، كه‌واته بڕوا ته‌نیا ئه‌وه‌یه كه له دڵدا جێگیر ده‌بێ.

له وه‌ڵامی قسه‌ی یه‌كه‌مدا ده‌ڵێین:

**یه‌كه‌م:** ڕاسته (عطف)كردنی شتێك بۆ سه‌ر شتێكی دیكه، جیاوازیی ئه‌و دوو شته ده‌گه‌یه‌نێ، به‌ڵام هه‌موو ده‌مێش وانیه، به‌ڵكو گه‌لێك جار وا ده‌بێ شتێك باس ده‌كرێ، ئنجا دوایی به‌شێك له‌و شته دوابه‌دوای وی باس ده‌كرێته‌وه‌و (عطف) ده‌كرێته سه‌ری بۆ خستنه‌ڕووی گرنگیی ئه‌و به‌شه‌ی كه به‌جوێ باس ده‌كرێته‌وه دوای ئه‌وه‌ی كه له‌گه‌ڵ به‌شه‌كانی دیكه‌ی ئه‌و شته‌دا باسكراوه، له‌و باره‌شه‌وه نموونه زۆرن، بۆ وێنه:

خوای زانا فه‌رموویه‌تی: ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبۡرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوّٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ ٩٨﴾ (البقرة-٩٨).

لێره‌دا ده‌بینین كه (جبریل) و (میكال) كه دوو فریشته‌ن (عطف) كراونه‌وه سه‌ر (ملائكة) كه هه‌موو فریشته‌كان ده‌گرێته‌وه.

ئنجا له‌به‌رئه‌وه‌ی (كرده‌وه) به‌شێكی بڕوایه‌و ره‌نج و زه‌حمه‌تیشی زۆر ده‌وێ، مه‌گه‌ر چۆنه‌كایی ده‌نا هه‌موو ده‌مێ دوای (بڕوا) دووباره باسكراوه‌ته‌وه، تاكو خه‌ڵك بزانێ كه هه‌روه‌ك چۆن به‌راست دانان (تصدیق)ی دڵ و زمان پێكهێنه‌ری بڕوان، كرده‌وه‌ش به‌راست دانان (تصدیق)ی باقی ئه‌ندامه‌كانه‌و، ته‌واوكه‌رو پێكهێنه‌ری بڕوایه.

**دووه‌م:** له وه‌ڵامی دووه‌میشدا ده‌ڵێین:

ڕاسته (دڵ) به جێگه‌و نشینگه‌ی بڕوا دانراوه، به‌ڵام ئه‌وه ناشێ بكرێته به‌ڵگه‌ی ئه‌و قسه‌یه، چونكه وه‌ك پێشتر گوتمان بڕوا هه‌روه‌ك چۆن به قه‌ناعه‌تی نێو دڵ ده‌گوترێ، دانپێداهێنانی زمان و شایه‌دیدانی ئه‌ندامانیش

دەگرێتـەوە، هۆی تایبەتکردنـی دڵیش بـە بڕواوە ئەوەیە کە قەناعەت و بەڕاست دانـان (تصدیـق)ی نێـو دڵ، ڕەگ و ڕیشـەو بنچینـەی بڕوایـە، دانپێداهێنـان و کردەوەکانیـش لق و پۆپ و تەواوکەرنی، هـەروەک چۆن (پایتەخت) جێگەی سـەرۆکی ولێتـە، بەڵام ناوچەکانی دیکـەش تەواوکـەری سـەرۆکایەتینی.

ئنجا لـە ڕاستیدا ئەگـەر بێت و چـاک سـەرنج بدەیـن، دەزانیـن کـە ئەگـەر گریمـان کـردەوە پێکهێنـەری بڕواش نەبێـو، بڕوا بـەس ئـەو قەناعـەت و بەڕاست دانانـە بێ کـە لـە دڵ و دەروونـدا جێگیـر دەبێ، ئێمە بۆ سـەلماندنی هەبوونـی بڕوا، حەوجێی کـردەوە هـەر دەبیـن و سـەرمان هـەر تێی دەوەستێ، دەزانی بۆ؟

چونکـە کـردەوەو ڕەفتارکـردن بەپێـی بـڕوا، ئەگـەر بەشـێکی پێکهێنـەری بـڕواش نەبێ-وەک هەندێـک دەڵێـن و قسـەکەشیان پووچێنـراوە-، کـەس ناتوانـێ نکووڵیـی و لاملیـی لـەوە بـکات، کـە بەرهـەم و شـوێنەواری بڕوایـەو، بەڵگـەو نیشـانەی بـوون (وجود)ییەتـی، واتـە هـەروەک چـۆن میـوەو بـەری درەختێـک، بەرهـەم و شـوێنەواری ئـەو درەختەیـەو نیشـانەو بەڵگـەی بوونییەتـی، کـردەوەش بـۆ بـڕوا بەهەمـان شـێوەیە، کەواتـە هـەروەک چـۆن دارتووێکـی بێبـەرو (توو)نەگر، بـە درەختێکـی (زڕ)و بێخێر دادەنرێ، بڕوایەکی بێکـرداروو ڕەفتـاری بڕوادارانـەش، بـە بڕوایەکـی زڕ و (هـەر بەنـاو بـڕوا) دادەنـرێ.

ئەمـەش کـە گوتمـان ئەنجامگیریـی (استنتاج)ێکە لـە دەقەکانـی قورئـان و سـوننەت دەفامرێتـەوە، چونکـە ئێمـە دەبینیـن کاتێـک خـوای زانـاو قسـەلەجێ دەیـەوێ پێناسـی بـڕوادارو خواناسـان بـکات، وێـڕای بـڕوای نێـو دڵ، ئـەو سیفەت و چالاکییانـەش بـاس دەکات کـە لـە قاڵبـی کـردەوەو جموجووڵـی ئەندامەکانـدا خۆتـان دەنوێنـن، واتـە ئـەو پێناسـەیەی کـە خـواو پێغەمبەرەکـەی (صلى الله عليـه وسـلم) بـۆ ناسـاندنی ئینسـانی بـڕواداری دادەنێـن، لـە بەڕاسـت دانـان (تصدیـق)ی دڵ و زمـان و، ئەندامـەکان پێکهاتـوە، بـۆ وێنـە:

١- خوای بەخشندە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾﴾ (الحجرات-١٥).

واتە: بێگومان بڕواداران بەس ئەوانەن کە بڕوایان بەخواو پێغەمبەرەکەی هێناوە، ئنجا هیچ گومان و دوودڵییان نیەو، بە ماڵ و گیانیان لەڕێی خوادا تێدەکۆشن، ئەوانە خۆیانن-بڕوا- ڕاستان.

وەک دەبینین خوای کاربەجێ، وێڕای قەناعەت و بڕوایەکی دوور لە گومان، تێکۆشان لەڕێی خوادا بەماڵ و گیانیش، بە خەسڵەتی بنچینەیی ئینسانی بڕوادار لەقەڵەم دەدات، نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو ڕاشی دەگەیەنێ کە بڕوادارانی ڕاستەقینە هەر ئەو جۆرە کەسانەن(١)و، هەرچی وانەبێ، دیارە بەناو بڕوادارێکی ناڕاست و بێکاکڵە.

٢- دیسان فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ (الأنفال: ٢-٤).

واتە: بێگومان بڕواداران بەس ئەوانەن کە ئەگەر یادی خوا کرا دڵیان ڕادەچەنێ و، ئەگەر ئایەتەکانیان بەسەردا خوێندرانەوە، بڕوایان زیاد دەکات و، پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن. ئەوانەی نوێژێ بەرپادەکەن و لەوەی پێمان بەخشیون - لەڕێی خوادا - سەرف دەکەن، ئەوانە خۆیانن بڕواداری ڕاستەقینە.

٣- پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا، أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا} (أخرجه أبو داود برقم: ٤٦٨٢، وأحمد برقم: ٧٣٩٦، وابن

---

(١) چونکە (إنّما) وەک ڕێزمانزانان دەڵێن؛ ئامرازی کورت هەڵێنان و چەسپاندن (أداة الحصر والإثبات)ی حوکمێکە لە شتێکی دیاریکراودا.

حبان برقم: ٤٧٩، والبيهقي في شعب الإيمان برقم ٧٩٧٦)، واتە: بڕوا کامڵترین بڕوادار، ڕەوشت چاکترینیانە.

کەواتە: ڕەوشتی پەسندو چاک، مەرجە بۆ کامڵ بوونی بڕوا، یانی بڕوا بەبێ ڕەوشت و ئاکاری چاک (کە بەشێکە لە کردەوە) کامڵ و تەواو نابێ.

هەروەها فەرموویەتی: {الْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ} (أخرجه إبن ماجه برقم: ٣٩٣٤، قال الألباني: صحيح)، واتە بڕوادار ئەو کەسەیە کە خەڵکی-متمانەی پێبکەن و- بیکەنە ئەمیندار لەسەر ماڵ و نەفسیان.

کەواتە: بەڵێ ڕاستە کردەوەی ئەندامەکان، ئەگەر گریمان بەشێکی پێکهێنەری بڕواش نەبێ، بەرهەم و شوێنەواریەتی و، هەرچۆنێکی بێ، هەبوونی مەرجە بۆ سەلماندنی بوونی بڕوا، چونکە بەپێی بنچینەی؛ دەعواچیی شایەدو بەڵگەی لەسەرە (البينة على المدَّعي)[١] هەروەک چۆن کەسێک بەزمان دانی پێدا نەهێنێ کە بڕوادارە، بە بڕوادار لە قەڵەم نادرێ وەک پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {أُمِرْتُ أَنْ أُقاتِلَ النَّاسَ حَتّى يَشْهَدوا أَنْ لا إِلهَ إِلاّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ} (أخرجه أحمد برقم: ١٠٥٢٥، والبخاري برقم: ١٣٣٥، ومسلم برقم: ٢١)، خوالێخۆشبوو-إن شاء الله- (عبدالرحيم)ی مەولەویی لە کتێبی: (الفضيلة)دا لەوبارەوە فەرموویەتی: (تلقّظ القادر بالشهادة شرط كما رجّح جُل السادة)[٢]، کەسێکیش کە دەعوای بڕواداریی بکات لە دادگا (محكمة)ی ئیسلامییدا ئەو دەعوایەی لێ وەرناگیرێ، هەتا بەڵگەو شایەدی کردەوەکانی پێ نەبن، بۆ پاڵپشتی دەعواکەی.

---

(١) متفق عليه، قال النووي في أربعينه حديث حسن رواه البيهقي وغيره هكذا. (كشف الخفا ومزيل الألباس)، ب١، ص٣٤٢-٣٤٣، اسماعيل بن محمد العجلوني.

(٢) (الوسيلة في شرح الفضيلة)، ل٤٥، الشيخ عبدالكريم المدرس.

لە کتێبی (العقائد النسفية)شدا گوتراوە: (الإيمان: هو التصديق بما جاء به النبي (صلى الله عليه وسلم) من عند الله والإقرار به)، بڕوانە: (شرح العقائد)، ل٢٠٠، ٢٠٣.

هەڵبەتە بێهەواڵ نیم لە ڕووداوی کوژرانی (مرداس بن نهیک) لەکاتی گوتنی (لا إله إلا الله)دا بەدەستی (اسامه بن زید) و، سەرزەنشت کرانی (أسامة) لەسەر ئەو کارە لەلایەن پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، وەک لە (سیره ابن هشام)دا[1] گێڕراوەتەوە، هەروەها (بخاري ومسلم)یش گێڕاویانەتەوە، بەڵام دەڵێم: بابایەکی کافر کە شیری لەسەر سەر ڕاگیراوە، هەر فریای ئەوەندە دەکەوێ و، لەو دەمەیدا هەر ئەوەی لێ داوا دەکرێ، بەڵام کوا چ دەقێک دەڵێ: دوایەش ئەوەندە بەتەنێ قبووڵ کراوە؟!

ئێستاش دوای خستنەڕووی چوار تێبینی گرنگ، کۆتایی بەم باسە دێنم:

تێبینی یەکەم:

ئەو[2] فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە تێیدا وەڵامی چوار پرسیارەکەی (جوبرائیل) (علیه السلام) دەداتەوە، دەربارەی؛ ئیسلام و ئیمان و ئیحسان و نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، ئاوا پێناسی بڕوای کردوە: {أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ} (أخرجه مسلم برقم: ١٠٢).

لێرەدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە پێناسەی بڕوای کردوە- هەروەها کە پێناسەی ئیسلام و ئیحسانیشی کردوە- بەس دروشم و پایە سەرەکیی و بنەڕەتییەکانی خستونە ڕوو، نەک هەموو پێکهێنەرەکانیان، کەواتە ئەو فەرموودەیەو هەر فەرموودەیەکی دیکەی لەم بابەتە، نابنە بەڵگەی دەستی ئەوانەی (بڕوا) لە چوارچێوەی تەسکی نێو دڵدا کورت هەڵدێنن.

---

(١) ب٢، ل٦٢٣.

(٢) ئەو فەرمودەیە (بخاري و مسلم و ترمذي و أبوداود ونسائي) گێڕاویانەتەوە.

**تێبینی دووەم:**

وشـەی (إیمـان) و وشـەی (إسـلام) لـە هەندێـک شـوێنی قورئانێـدا، بـە دوو مانـای لێـک جـوێ بەکارهێنـراون، لەهەندێـک شـوێنیشـدا، وەک دوو وشـەی هاوواتـا (مـرادف) بەکارهاتـوون.

بـۆ وێنـە لـەم ئایەتـەدا، دوو وشـەی ناوبـراو، بـەدوو مانـای لێـک جـوێ بەکارهێنـراون: ﴿ ۞ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَـٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ﴾ (الحجـرات-١٤).

واتـە: عارەبـە دەشـتەکییەکان گوتیـان: بڕوامـان هێنـا، بڵـێ: بڕواتـان نەهێنـاوە، بـەڵام بڵێـن مسـوڵمان بوویـن و، جـاریٚ بڕواتـان نەچۆتـە نێـو دڵـەوە.

دیـارە لێرەشـدا (بـڕوا) بـە گـەردنکەچیی و مسـوڵمانەتی دەروودەروون (ظاهـر و باطـن) دانـراوە، و (ئیسـلام) بـە گـەردنکەچییەکی ڕواڵەتیی و ناچاریی.

بـەڵام لـەم دوو ئایەتـەدا بـە پێچەوانـەوە (إیمـان) و (إسـلام) بـە هـاو واتـای یـەک لەقەڵـەم دراون: ﴿ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾ (الذاریـات: ٣٥-٣٦).

واتـە: جا هەرکەسێـک کـە تێیدابـوو لـە بڕواداران وەدەرێمـان نـا، بـەڵام بـەس ماڵێکمـان لـە مسـوڵمانان تێدا دیتەوە.

لەمـەوە دەردەکـەوێ کـە هەمـوو بڕوادارێـک[1] مسـوڵمانە، بـەڵام مـەرج نیـە هەمـوو موسـڵمانێک بـڕوادار بـێ، کەواتـە لەنێـوان (بـڕوا) و (ئیسـلام)دا بـە زاراوی ژێربێژی (عمـوم وخصـوص مطلـق) هەیـە، ئنجا ئەم مەسـەلەیە بەهێزترین

---

(١) بۆ ڕوونکردنـەوەی چۆنیەتـی و جیاوازیـی نێوان ئیمـان و ئیسـلام، یەکێـک لـە دەرسـەکانی (ئیمـان و عەقیـدەی ئیسـلامیی)مان تەرخان کـردووە بەتێروتەسـەلی قسـەمان لەسـەر کـردووە، بڕوانـە بەرگـی یەکـەم.

بەڵگەی ڕاستیی ئەو ڕایەیە کە ئێمە پەسندمان کرد دەربارەی بڕوا، چونکە بە دەقی ئایەت (ئیسلام) بریتیە لە فەرمانبەریی و گەردنکەچیی پێشاندانی ڕواڵەتیی و بەرچاو، ئنجا کە (بڕوا) مانای (ئیسلام)یش لەنێو خۆی بگرێو جێی بکاتەوە، مانای وایە (بڕوا) بەس پەیوەندیی بەدڵەوە نیەو، هەموو جموجووڵ و چالاکییەکانی ئینسان دەگرێتەوە، چ مەعنەویی و دەروونیی بن، چ کردەیی و بەرچاو[1].

تێبینی سێیەم:

ئێمە بۆیە درێژەمان بە توێژینەوەی ئەم باسەدا، چونکە ئاگادارم تا چ ڕاددەیەک مسوڵمانانی دنیا بەگشتی و گەلی کوردمان بەتایبەتی، لە کاکڵ و نێوەڕۆکی (بڕوا) دوورکەوتوونەوە و، ئاگاداریشم کە ئەو دوورکەوتنەوەو لێ حاڵی نەبوونە، چەند کارێکی گەورەی لە بەرەو پاش بردن و دواخستنی مسوڵمانان کردوە!!

بەڵێ لەڕاستیدا ئێمەی مسوڵمان زۆر هۆ بوونە ئاگری بن کای سەرلێشێوان و بەجێمان و، ولێت خاپوور کران و، ماف زەوت کران، وەبن پێ دران و، نیر لەسەرشان دانرانمان، بەڵام سەرەکییترین و بنەڕەتییترین هۆ، بریتیە لە دوورکەوتنەوەمان لە ئایین و بەرنامەی خوا، چونکە لە واقیعدا هۆیەکانی دیکەش هەر ئەم هۆیە دەرفەتی سەرهەڵدان و گەشەکردنی بۆ ڕەخساندوون، ئنجا یەکەمین هۆی دوورکەوتنەوەشمان لە بەرنامەی خوا، بێهەواڵیی و بێئاگاییمانە لە کاکڵ و نێوەڕۆکی ئەو بەرنامەیە.

ئنجا بێگومان حاڵێ نەبوون و بێئاگایی لە (بڕوا) لە هەموو جۆرە بێهەواڵیی و بێئاگاییەکانی دیکە، پتر دەوری هەبووە لە دوورخستنەوەمان لە ئایینی خوا، چونکە مرۆڤ چۆن بیر بکاتەوە، ئاواش دەژی، ئنجا خوار یان

---

(١) بۆ پتر شارەزایی دەربارەی چەمکی وشەی (إیمان) و (إسلام) چاک وایە سەرنجی (لسان العرب) بدرێ، ب١٣، ل( ٢٣-٢٥).

ڕاست و، مرۆڤ چەندە هەست بە بەرپرسیاریی (مسئولیة)و بارگرانیی بکات، هەر بارتەقای ئەو هەستکردنەش، تەکان دەداتە خۆی و دەجووڵێ، جا ئەگەر کەم بێ کەم و، زۆریش بێ زۆر.

دە جا پێم بڵێ: کەسێک پێی وابێ هەموو باری بەرپرسیاریی و هەموو ئەرکی بەندایەتیی سەبارەت بە خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بەرنامەی ئیسلام، ئەوەیە کە بەدڵ-بەس بەدڵ- قەناعەت و بڕوای وابێ، کە هەق و ڕاستن و، ئەگەر وێراش بە زمان دان بەوەدا بێنێ کە لەنێو دڵی دایە، دەنا لێی بگەڕێ و، دەستی لێ وەبن سەری بدات و، لۆکەی لە گوێیان بئاخنێ، بەڵێ کەسێکی ئاوا، دەبێ جموجووڵ و چالاکیی و تێکۆشانەکەی چی بێ و چۆن بێ و چەند بێ؟!

**تێبینی چوارەم:**

هەندێک کەس، کە بە کاکڵی ئیسلام ئاشنا نین و، سەرپێیی لەشتی دەفکرن و، هەر لە بەهانەیەک دەگەڕێن بۆ پاڵدانەوەو هەڵخزان و پشتێند لێکردنەوەو خۆ کەرکردن، چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکەنە دەستەگیرەی خۆیان، کە بەرواڵەت لەگەڵ مەبەستی واندا دەگونجێن و یەکن، بەڵام لەڕاستیدا چاوی درشت بین و زەینی سەرکێڵی خۆیان، تووشی ئەو چۆرتمەی[1] کردوون و بەو دەردەی بردوون، ئەگەرنا ئەوجۆرە فەرموودانەش وەک هەموو دەقەکانی دیکە، ئەو ڕایە دەسەلمێنن کە ئێمە هەڵمانبژارد-دەربارەی بڕوا-.

ئنجا یەکێک لەو فەرموودانە ئەم فەرموودەیە، کە دەڵێ: {مَنْ قَالَ لاَ إلـه إلاَّ الله مُخْلِصاً دَخَلَ الْجَنَّةَ}[2]، واتە: هەرکەسێک بە ساغیی بڵێ:

---

(١) چۆرتم: گرفت، کێشە، مەینەتیی.

(٢) أخرجه البزار عن أبي سعيد، وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم: ٦٤٣٣.
وقال في «الصحيحة» برقم: (٢٣٥٥)، وورد عن جابر بلفظ: أن معاذا لما حضرته الوفاة قال:

بێجگە لەخوا هیچ پەرستراو نین (لا الـه الا اللـه) دەچێتە بەهەشتێ.

جا ئەوانەی کە ئاسوودەیی خوازن و بەدوای بروبەهانەیەکدا دەگەڕێن بۆ دانیشتن و هەڵخزان، ئەم فەرموودەیە دەگۆڕن و لای دەدەن و ئاوا مانای لێدەدەنەوە: پێغەمبەر (صلى اللـه عليـه وسلم) فەرموویەتی: هەرکەسێک بڵێ (لاَ إلـه إلاَّ اللـه) دەچێتە بەهەشتێ! واتە وشەی (مُخلِصاً) کە پارسەنگی تەرازووی فەرموودەکەیەو وەک جەرگ و هەناویەتی، دەقرتێنن، ڕاست وەک ئەو کۆلکە میرزا فێڵبازەی لەگەڵ مەلایەکی فەقیرحاڵدا دەبێتە دم بەدمەی و دەڵێ: جا خۆ مامۆستا! خوا بە دەقی ئایەت فەرموویەتی: نوێژێ مەکەن، ئەوەتا فەرموویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ... ﴾ (النساء-٤٣).

واتە ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! نیزیکی نوێژێ مەبن! دیارە کۆلکەمیرزای جامباز وشەی [وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ]، واتە (لەحاڵێکدا کە سەرخۆش بوون)ی لە ئایەتەکە قرتاندوە، بۆیە مانای ئایەتەکە سەرەوبن بووەو هەڵگەڕاوەتەوە.

بەڵام بێگومان ئەم وردە فێڵێنە، مەگەر لەلای خەڵکێکی سادەو نەفام، دەنا کەس فلسێکی قەڵبیان پێنادات و، خۆیان پێ دەستخەڕۆ ناکات.

بەڵێ کەسێک کە دەڵێ: (لاَ إلـه إلاَّ اللـه)، ئەگەر خۆی بۆ خوا یەکلا کردبێتەوەو ڕاست بکات لەو (لاَ إلـه إلاَّ اللـه) گوتنەیدا، دەچێتە بەهەشتێ، بەڵام ئاگاداربە بەس بە گوتنی بەتەنێ نا! بەڵکو دەبێ ئەوکەسەی دەڵێ: (لاَ إلـه إلاَّ اللـه) (مخلص) بێ، ئنجا پێی دەچێتە بەهەشتێ، واتە ئەو کەسەی کە بەزار دەڵێ (لاَ إلـه إلاَّ اللـه)، ئەم دەعوایەی بەڕووتیی لێ وەرناگیرێ و، پێویستە شایەدی (یەکلابوونەوە) (إخلاص)[1] شایەدیی بۆ بدات، جا

---

اكشفوا عني سجف القبة سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول : من شهد أن لا إله إلا الله مخلصا من قلبه دخل الجنة . وإسناده صحيح على شرط الشيخين.

(١) فحقيقة الإخلاص: التبري عن كل ما دون الله تعالى (معجم مفردات ألفاظ القرآن)

بێگومـان (یەکلابوونـەوەش) لەبـواری کـردەوەو جموجـۆڵ و چالاکییەکانـدا، خۆی دەنوێنـێ، مـادام وابـێ بەپێـآ ئـەم فەرمـوودە بـەرزەی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) بـەس (لا إلـه إلا اللـه) گوتنێـک مرۆڤ دەباتـە بەهەشتێ کـە خاوەنەکـەی ڕەفتـاری پـێ کردبێـو، شایەدی کـردەوان گەواهیـی بـۆ دابـێ.

یەکـی دیکـەش لـەو جـۆرە فەرمـوودانـەی ئـەو جـۆرە کەسـانە بەگومانـی ناتـەواوی خۆیـان بەدەستەگیرەیان دەزانـن، بـەڵام لەڕاستیدا بـە بـەراوەژووەوەن، ئـەم فەرموودەیـە کـە دەڵـێ: {مَـا مِـنْ أَحَـدٍ يَشْـهَدُ أَنْ لا إِلَـهَ إِلاَّ اللـهُ وَأَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُـولُ اللـهِ صِدْقًـا مِـنْ قَلْبِـهِ إِلاَّ حَرَّمَـهُ اللـهُ عَلى النَّـارِ} (أخرجه البخاري برقم: ١٢٨، ومسلم برقم: ٥٣)، واتـە: هەرکەسێـک ڕاسـت بـکات و لـە دڵییـەوە شـایەدیی بـدات کـە بێجگـە لـە خـوا هیـچ پەرستراو نیـن و، کـە موحەممـەد پێغەمبـەری خوایـە، حەتمـەن خـوا لـە ئاگـر-ی دۆزەخ-ی قەدەغـە دەکات.

جـا بێگومـان ئـەم فەرموودەیـەش وەک هـی پێشـوو، ئەگـەر هیچـی لـێ نەقرتێنرێـو کـەچ و کـرووچ نەکـرێ، پتەوتریـن بەڵگـەی سـەلمێنەری ڕاسـتی ئـەو رایەیـە کـە پەسـندمان کـردو هەڵمانبـژارد، بـەڵام شـکی تێدانیـە ئەگـەر بـێ و (صِدْقًـا مِـنْ قَلْبِـهِ) لـێ بقرتێنرێ، سـەرلەبەری ماناکـەی دەگۆڕێـو تێـک دەچـێ.

بەڵـێ ڕاسـتە هەرکەسێـک ڕاسـت بـکات و لـە دڵییـەوە دان بـە بوونـی خـواو ڕاستیی پێغەمبـەردا (صلى اللـه عليـه وسـلم) بێنـێ، خـوا ئاگـری دۆزەخـی لـێ حەرام دەکات، بـەڵام پێـم بڵـێ؛ کەسێـک بەڕاسـتیی و بـەدڵ خـواو پێغەمبـەران بناسێـو شـادەیان پێبهێنـێ، چ جـۆرە ئینسـانێک دەبـێ!؟ ئایـا بـەس بـەدڵ و زمـان لەگەڵیـان دەبـێ، یـان هەمـوو جموجـۆڵ و چالاکیـی و کـردەوەو ئاکارەکانـی، بەپێـی بەرنامـەی خـواو بـەرەو ڕەزامەندیـی خـوا (تبـارك وتعالـى) دەبـن!!

---

ل١٥٥،١٥٦. واتـە: جـا کاکڵـی ئیخـلاص؛ دوورکەوتنـەوەو وازهێنانـە لـە هەمـوو شـتێک جگـە لەخـوای بـەرز.

ئاخر کەسێک بە دڵ و بەڕاستیی، شادە (شایەتمان) بەخواو پێغەمبەرەکەی بهێنیٚ، دیارە زۆر چاکیان دەناسێو بڕوای پێیانە، کەسێکیش زۆر چاک خواو پێغەمبەران بناسیٚ و بڕوای پێیان بیٚ، دیارە لە خۆی و باب و دایکی و هەموو خەڵکی دنیای خۆشتر دەوێن، وەک پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە فەرموویەتی: {لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ والِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ} (أخرجه البخاري برقم: ١٥)، هەروەها فەرموویەتی: {ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاوَةَ الإيمانِ، أَنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمّا سِواهُما} (أخرجه الطيالسي برقم: ١٩٥٩، وأحمد برقم: ١٢٠٢١، والبخاري برقم: ١٦، ومسلم برقم: ٤٣)، جا بێگومان بابایەکیش خواو پێغەمبەری هێندە خۆش بوێن مەحاڵە هەموو لەگەڵ خوابوون و بەرەوخواچوون و تێکۆشانەکەی بریتی بیٚ لە پەیوەندییەکی دەروونی ڕووتی بێبەڵگەو شایەد، چونکە ئینسان ئەگەر بێت و نەک خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەر ئینسانێکی-نەک زۆریش هەر بڕێک- خۆش بویٚ، بەس بەوەندە دڵی دانامرکیٚ کە بەدڵ خۆشی بوێو لەگەڵی بیٚ، بەڵکو هەموو ئەندامەکانیشی دەکەونە جموجۆڵ نواندن لە پێناویداو، لە خۆشیی و ناخۆشییەکانیدا بەشدار دەبیٚ و، بەپێی تواناو بۆ لوان هاوکاریی دەکات، خۆ ئەگەر واش نەکات ئەو ئینسانە پێی دەڵیٚ: بڕۆ هەی درۆزن! نە برادەرمی و نە خۆشت دەوێم، ئەگەر خۆشەویستیی و ڕێزی منت لە دڵدا هەبووایە، بەرهەم و شوێنەواری لە کردەوەو ڕەفتارەکانتدا دەبینرا!!

یەکی دیکە لەو فەرموودانە ئەمەیە کە دەفەرمویٚ: {مِفْتَاحُ الْجَنَّةِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ}، واتە: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه) کلیلی بەهەشتێیە.

جا ئەوکەسانەی کە گوتمان سەرکێڵ و درشت بینن و، هەر لە بەهانە دەگەڕێن بۆ پاساودانەوەی (تبرير) کردنی هەڵوێستی هەڵخزاوانەو تەپلۆسانەیان، هەر لە خۆوە وشەی (گوتنی) بۆ ئەم فەرمودیە زیاد دەکەن و ئاوای لیٚ دەکەن:

(گوتنی لاَ إِلَـه إِلاَّ اللَّـه کلیلی بەهەشتێیە)!! واتە: کە سەبارەت بە فەرموودەی یەکەم و دووەم (سیاسەتی قرتاندن)یان ڕەچاو دەکرد، لە ئاقار ئەم فەرموودەیەدا (سیاسەتی لێزیادکردن و هاویشتنەسەر)یان گرتۆتە پێش، بەڵام بێگومان ئەم هەوڵەشیان وەک هی پێشوو نەزۆک و بێبەرهەمە، چونکە هەرکام لە (لێکەچکردن) و (هاویشتنەسەر) دوو ڕووی دراوی قەڵبی گۆڕین و لادان (تغییر وتحریف)ی دەقەکانی ئایینن!

ئەگەرنا، ئێمەش دەڵێین (لاَ إِلَـه إِلاَّ اللَّـه) کلیلی دەرگای بەهەشتێیەو لە هەموو بوونەوەر سەنگ و قورسایی پترە وەک پێغەمبەری خوا «صلی الله علیه وسلم» فەرموویەتی خوا بە مووسای فەرمووە: { لَـوْ أَنَّ السَّـمَاوَاتِ السَّبْعِ ، وَعَامِرُهُـنَّ غَـيْرِي، وَالأَرَضِينَ السَّبْعِ فِي كِفَّـةٍ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ فِي كِفَّـةٍ ، مَالَـتْ بِهِـنَّ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ} (أخرجه أبو يعلى برقم: ١٣٣٩، قال حسين سليم أسد : إسناده ضعيف، والنَّسَائِي، في «عمل اليوم والليلة» ٨٣٤ و١١٤١).

بەڵام (لا إله إلا الله)یەک کە دڵ و دەروونی ئینسان لەنێوخۆی دەگرێ و، زمان دانی پێدا دێنێ و بێترس و بیم دەری دەبڕێ و، ئەندامەکانیش دەست دەکەن بە جموجۆڵ و چالاکیی بۆ ڕەفتارکردن بەپێی ئەو (لا إله إلا الله)یە.

بەڵێ (لا إله إلا الله) کلیلەیەکە دەرگای بەهەشتی پێ دەکرێتەوەو دەخرێتە سەر پشت، بەڵام وەک زانایەک گوتوویەتی: هەر کلیلەیەک کە دەرگای پێ بکرێتەوە، ددانی هەن و، کلیلەی بێددان دەرگای پێ ناکرێتەوە، جا ددانی کلیلەی (لا إله إلا الله)ش ڕەفتارکردنە بەپێی وی[1].

---

(١) لەمەوسووعەی: کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا دەرسێکمان تەرخان کردوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیەو دە (١٠) مەرجمان لەبەر تیشکی دەقەکانی قورئان و سوننەتدا بۆ وشەی شایەتمان (أشهد أن لا إله إلاّ الله وأشهد أن محمداً رسول الله) دیاریی کردوون، بڕوانە بەرگی یەکەم.

## کاکڵ و ئەنجامی ئەم باسە:

وای بەچاک دەزانم لەچەند دێڕێکدا ئەنجام و نێوەڕۆکی ئەم باسە بخەمە ڕوو:

١- بڕوا (إیمان) لە زماندا یانی: بەڕاست دانان (تصدیق).

٢- هەروەها (بڕوا) لەڕوانگەی شەرعەوە یانی: بەڕاستدانانی خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بەرنامەی خوا.

٣- ئنجا ئینسانیش سێ هێزی هەن؛ هێزی دڵ و دەروون، هێزی زمان، هێزی ئەندامەکان، کەواتە بڕوا وەک پێویست نایەتەدی، هەتا ئینسان بە هەرسێک هێزەکانی، خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بەرنامەی خوا بەڕاست دانەنێ.

٤- بەپێی پێناسەی زانایانی پێشین (علماء السلف) کە گوتوویانە: (الإیمان قول وعمل، قول القلب واللسان وعمل القلب والجوارح)، ئیمان چوار پێکهێنەری هەن:

١- قسەی دڵ، کە مەبەست پێی زانین و بەڕاست دانان (معرفة وتصدیق)ی دڵە.
٢- قسەی زمان، کە مەبەست پێی دان پێداهێنان (إقرار)ی زمانە.
٣- کردەوەی دڵ، کە مەبەست پێی خۆشویستن و پەسندکردن و تەسلیم بوونی دڵە.
٤- کردەوەی ئەندامەکان، کە مەبەست پێی جێبەجێکردنی ئاشکراو ڕواڵەتییە.

٥- بەڵام بڕوا بەخوا پلەپلەیەو زیادو کەمیی هەیە، جا تەواوترین و کامڵترین بڕوا ئەوەیە کە ئینسان ئەوپەڕی دڵدامەزرانی هەبێ سەبارەت بە خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هەرچی فەرموویانەو، بە زمان ئەوپەڕی هەوڵ و ڕەنج بخاتە کار بۆ دان پێداهێنان و بەرگریی لێکردن و خستنەڕووی پاکیی و بەرزیی خواو، ڕاستیی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و تێرو

ته‌واویـی ئیسـلام و بەکـردەوەش ئەوپـەڕی توانـاو بڕسـتی خـەرج بـکات بـۆ ڕازیکردنـی خـواو پێغەمبەرەکـەی و، جێبەجێکردنـی هەرچـی فەرموویانـە.

نزمتریـن پلـەی بـڕواش ئەوەیـە کـە مرۆڤـ لای کەمـی دڵ دامـەزران و، لای کەمـی دانپێداهێنانـی زمـان و، لای کەمـی کردەوانـی، هەبێ سـەبارەت بەخـواو پێغەمبـەرو بەرنامـەی خـوا، بـەڵام کەسێـک لای کەمـی هـەرکام لـەم سێیانەی نەبێ، ئـەوە بەبـڕوادار دانانـرێ و، لەئاگـری دۆزەخـآ قوتـار نابێ.

شـایانی باسیشـە کـە جەمـاوەری زانایـان ئیمانیـان بـۆ سـێ پلـە (رتبـة) دابـەش کـردوە:

١- ئەسڵی ئیمان یـان موتڵەقـی ئیمـان (أصـل الإيمـان، أو مطلق الإيمـان) یـان وەک مـن نـاوم نـاوە (لای کەمـی ئیمـان) کـە بریتییـە لـەو جۆرە ئیمانـەی کـە خاوەنەکـەی لـە گوناحەگـەورەکان ناگێڕێتـەوە، بۆیـە لـە دوارۆژیشدا لـە ئاگری دۆزەخ ناپارێزێ، بـەڵام پاش سزادان قوتـاری دەبێ و دەچێتـە بەهەشتێ.

٢- ئیمانی پێویسـت (الإيمـان الواجب) کـە بریتیـە لـەو ئیمانەی کـە خاوەنەکەی لە دنیادا لە گوناح و سـەرپێچیی و، لە دوارۆژیشـدا لە چوونە دۆزەخ دەپارێزێ.

٣- ئیمانـی پەسـند (الإيمـان المسـتحب) کـە بریتییـە لـەو ئیمانـەی کـە وێـڕای گوناحـی گـەورە، خاوەنەکـەی لـە دنیـادا لـە گوناحـی گچکـەو تەرکـی سوننەتەکان (تـرك المسـنونات) دەپارێزێ و، لـە دوارۆژیـش دا پلە بەرزەکانـی بەهەشـتی بـۆ مسـۆگەر دەکات.

ئـەم فەرموودەیـەش یەکێکـە لـە بەڵگەکانـی زۆربـەی زانایـان لەسـەر ئـەوە کـە بـۆ چوونـە بەهەشـت کـردەوەی دڵ و ئەندامـەکان هـەر مەرجـەو، هیـچ کـەس بەبێ کـردەوەی چـاک ناچێتـە بەهەشـتێ:

پێغەمبـەر (صلـى اللـه عليـه وسـلم) فەرموویەتـی: {يَخْـرُجُ مِـنَ النَّـارِ مَـنْ قَـالَ : لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَفِي قَلْبِـهِ وَزْنُ شَـعِيرَةٍ مِـنْ خَـيْرٍ، وَيَخْـرُجُ مِـنَ النَّـارِ مَـنْ قَـالَ :

لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَفِي قَلْبِـهِ وَزْنُ بُـرَّةٍ مِـنْ خَـيْرٍ، وَيَخْـرُجُ مِـنَ النَّـارِ مَـنْ قَـالَ: لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ ، وَفِي قَلْبِـهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ مِـنْ خَـيْرٍ} (أخرجه البخاري برقم: ٤٤)[1].

واتـە: هەرکەسێک گوتبـی (لا إِلَـهَ إِلاَّ اللـهُ) و هێنـدەی دەنکەجۆیـەک بـڕوای لەدڵـدا هەبـێ لـە ئاگری دەچێتـە دەرێ و، هەرکەسێک گوتبـی (لا إِلَـهَ إِلاَّ اللـهُ) و هێندەی دەنکەگەنمێک بڕوای لەدڵدا هەبێ لەئاگری دەچێتە دەرێ و، هەرکەسێک گوتبـی (لا إِلَـهَ إِلاَّ اللـهُ) و هێنـدەی مێرووڵەیەکـی گچکـە بـڕوای لەدڵـدا هەبـێ لەئاگری دەچێتـە دەرێ.

هەڵبەتـە مەبەسـت لـە (هێنـدەی دەنکەجـۆو، دەنکەگەنـم و، مێروولـە لـە بـڕوا) کـردەوەی چاکـە، چونکـە ڕۆژی دوایـی کـردەوە دەکێشـرێن، نـەک بـڕوا، بۆیـەش کـردەوە پاڵدراوەتـە لای (دڵ) چونکـە کـردەوە زادەو بەرهەمـی قەناعەتـی نێـو دڵـە، ئنجا ئـەم فەرموودەیـەش کـە گەلێک کـەس، وەک زۆر فەرموودەی دیکـە، بەهەڵـە لێیـان حاڵـی دەبن، بەهێزترین بەڵگـەی ڕاستیی ئەو ڕایەیـە کـە ئێمـە دەربـارەی بـڕوا هەڵمانبـژارد، چونکـە فەرموویەتـی: هەرکەسێک لای کـەم (حد اقل)ی کردەوانـی هەبـێ، لـە دۆزەخـی قوتـار دەبـێ، بـەڵام کەسێک هیچـی نەبـێ بـە قوتاربـووی لەقەڵـەم نـەداوە[2].

---

(١) قـال أبـو عبـد اللـه قـال أبـان حدثنـا قتـادة حدثنـا أنـس عـن النبـي صلـى اللـه عليـه و سـلم (مـن إيمـان) مـكان (مـن خيـر).

(٢) بـۆ زێـدە دڵنیایـی بڕوانـە: (تـاج الأصـول)یـش، ب١، ل٣٢، و بڕوانـە کتێبـی (فتـح المجيـد فـي شـرح كتـاب التوحيـد)، ل٤٨.




# پلـە و پایەی بـڕوا بەخوا بوون

## دەسـتپێك

خوێنەری سەنگین!

خوا (جل جلالـه) پشتیوان بێ، لـەم بەندەدا پلەوپایـەی بڕوابەخوا بـوون لـە بیروبـڕوای (عقیـدة)ی ئیسـلامییداو دوایـی لـە ئاییـندا بەگشـتی دەخەینـە ڕوو.

بـڕوا بەخوابوون لـە بیروبـڕوای ئیسـلامییدا، وەک قـەد و لاسکی درەخت وایـە سـەبارەت بـە لـق و پۆپەکانـی، واتـە هـەروەک چـۆن قـەدی درەخـت سـەرچاوەی پەیدابـوون و سـەرهەڵدان و گەشـەکردن و فـراژوو بوونـی لـق و چـڵ و پۆپەکانیەتـی و، بـوون و نەبـوون و بەهێزیـی و بێهێزییـان بەویـەوە بەسـتراوە، بـڕوا بەخوابوون (الإيمان بالله)یش لەنێـو سـەرجەمی لـق و پۆپەکانـی بیروبـڕوادا هەمـان پلەوپایـەی هەیـە.

بەڵـێ، بـڕوا بەخـوا بـوون، کانـی و سـەرچاوەی هەڵقوڵیـن و لێـوە هەڵبەسـترانی هەمـوو ئـەو جۆگەلانەیـە کـە پـاش یەکگرتـن و تێکـەڵ بوونەوەیـان، ڕووبـاری بیروبـڕوای بـەرزو پیرۆزو بەهێزو خـاوەن پێـزی ئیسـلامیی پێکدێنـن.

بێگومـان هـەر لەبەرئـەوەش بـووە کـە هەڵگرانـی پەیامـی خـوا پێغەمبەرانـی پایەبـەرزو بەڕێـز (علیهـم الصلاة والسـلام) هەموویـان، لـە ئـادەم هەتـا خاتـەم،

سەرەتای بانگەوازەکەیان بریتی بووە لە چریکەی (لا إلە إلا اللە) خوا بەیەکگرتن، چونکە دەردی هەمـوو دەردان و، ماکی هەمـوو نەخۆشییان، بریتیە لەو هاوبەش پەیداکردن (الشرک)ەی کە لە بتپەرستیی و خۆپەرستییدا خۆی دەنوێنێ، یانی بوونە کۆیلە و داردەستی هەواو ئارەزووی غەیر، یان هەواو ئارەزووی خۆ.

ئنجا ئەم بژاری بتپەرستیی و خۆپەرستییەش، بژاربڕی خوابەیەکگرتن (توحید) نەبێ هیچ شتێکی دیکە توانای بڕینی ڕەگ و ڕیشەکانی نیە، چونکە بێجگە لە عەقیدەی خواپەرستیی هەر بیرێکی دیکە بیگریی لە ئاکام و بنج و بنەواندا، هەر دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لەو دووانە، واتە بتپەرستیی یان خۆپەرستیی.

بەڵێ، هەمـوو دەردو گیروگرفتە دەریی و دەروونیی (الظاهري والباطني) یەکانی ئینسان، لە شێوەی تاک و کۆمەڵدا، گەراو میکرۆبێکن کە طاغووت و خۆبەزلزانەکان لەنێو زبڵدانی (بتپەرستیی)دا، دەیان تروو کێنن و، دەیان پەروەرێنن، جا ئەو بتە چ دەرەکیی (خارجي) بێ، کە شێوەی جۆێجۆیی هەن، وەک: شت پەرستیی[1] (عبادة الأشیاء)و، پارەپەرستیی (عبادة المال)و، طاغووت پەرستیی[2] و، شەیتان پەرستیی و، ماددەپەرستیی و، سروشت پەرستیی و، ڕێکەوت پەرستیی[3]و، نەتەوەپەرستیی[4]و، حیزب

---

(١) وەک ئەوانەی کە هەمـوو توانایان لە پەیداکردنی ئامێرو کەلوپەل و مۆدێل گۆڕیندا بەخت دەکەن و، لە جیاتی ئەوەی ئامێرو کەلوپەلەکانیان بیان حەسێننەوە، بوونەتە مایەی کات کوشتن و ماندوبوون و پلە داشکان (تنازل)ی سیاسی و کۆمەڵێیەتییان.

(٢) وەک ئەوانەی کە بابایەکی طاغووت دەپەرستن و خزمەتی دەکەن.

(٣) وەک ئەوانەی کە لەجیاتی خوا، دروستکرانی بوونەوەرو بەڕێوەبرانی لەسایەو نێوچاوانی ماددەی هەربوو و سروشتی دەستەوستان و ڕێکەوتی بێنێو، دەزانن.

(٤) وەک ئەوانەی کە (سۆزی نەتەوایەتیی) دەکەنە (بیری نەتەوایەتیی) و گەل و نیشتمانەکەیان وەک خوا دادەنێن و سوێندیان پێ دەخۆن و دەیانپەرستن.

پەرستیی[1]و، بیردۆزە پەرستیی و، زانست پەرستیی[2]و،....هتد.

چ نێوخۆیی (داخلي) بێ کە ئەمیش دیسان شێوەی جۆراوجۆری هەن، وەک عەقڵ پەرستیی[3] (عبادة عقل)و، گەدەپەرستیی، گیرفان پەرستیی و، شەهوەت پەرستیی و، و...هتد.

بەڵێ بێجگە لە عەقیدەی خواپەرستیی، هیچ بیروبۆچوونێکی دیکە، توانای ئەوەی نیە کە مرۆڤ لە چەنگی بتپەرستیی دەرێنێو، ژەنگ و ژاری خۆپەرستیی لە دڵ و دەروون بشۆرێنێ، هەر بۆیەش چریکەی (لا إله إلا الله) سەرەتاو بنچینەی بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانی شۆڕشگێڕو ئازادی هێن و طاغووت ڕەتێن و بت شکێن و گەل ڕاپەڕێن بووە، وەک خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ (النحل-٣٦).

واتە: بێگومان لە هەر کۆمەڵێکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردوە کە- پێیان بڵێ- خوا بپەرستن و خۆتان لە-پەرستنی- طاغووت بپارێزن.

دیسان فەرموویەتی: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾ (الأنبياء-٢٥).

واتە: لەپێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە کە پێمان ڕانەگەیاندبێ؛ کە بێگومان جگە لەمن هیچ پەرستراو نین، دەجا بمپەرستن.

---

(١) وەک ئەوانەی کە وەدوا ئەو حیزب و کۆمەڵەو پێڕانە دەکەون، کە بەرنامەکەیان دژی قورئانەو بە(کوفر) دادەنرێ و، بۆیان تێدەکۆشن و خەڵکیان بۆ دەکوژن و، خۆیان بۆ بەکوشت دەدەن.

(٢) وەک ئەوانەی کە بیردۆزە بەناو زانیارییەکان و زانیاریی دەکەنە پەرستراوو، هەرچی لەگەڵ واندا نەگونجێ و، بە تەرازووی وان ڕاست دەرنەچێ، ڕەفزی دەکەن، بێئەوەی ڕاستیی و هەڵەیی، یان سنووری توانایانیان لەبەرچاو بگرن.

(٣) وەک ئەوانەی کە هەرچی لە هەگبەی تەسکی ژیرییانەوە نەچێ، بڕوای پێ ناکەن.

ئێستاش با لەبەر تیشکی چەند ئایەتێکدا، پێشەکی پلەوپایەو شوێنی بڕوا بەخوا بوون لە بیروبڕوای ئیسلامییداو، پاشان لە بەرنامەی خوادا بەگشتیی، بخەینە ڕوو:

خوای قسەلەجێ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾ (آل عمران: ١٩٠-١٩٤).

واتە بێگومان لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و هاتن و چوون-و جێگۆڕکە-ی شەوو ڕۆژدا، نیشانەی زۆر هەن بۆ خاوەن هۆشان، ئەوانەی بەپێوەو بەدانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خوا دەکەن و، بیر لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە-و دەڵێن:- پەروەردگارمان! ئەم-بوونەوەر-ەت بە خۆڕایی نەخوڵقاندوە، پاکیی بۆ تۆ-کە کاری بێهوودە بکەی-، لە ئازارو جەزرەبەی ئاگر چەپاڵەمان بدە. ئەی پەروەردگارمان! بێگومان تۆ هەرکەسێک بخەیتە ئاگر-ی دۆزەخ-ەوە، ئەوە بەڕاستی ڕیسوات کردوە، ستەمکاران هیچ یاریدەدەریان نین. ئەی پەروەردگارمان! بێگومان ئێمە گوێبیستی بانگکەرێک بووین بانگی دەکرد بۆ برواهێنان کە-دەیگوت- بڕوا بە پەروەردگارتان بێنن، ئێمەش بڕوامان هێنا، ئنجا پەروەردگارمان! تاوانەکانمان بۆ بپۆشەو خراپەکانمان لێ بسڕەوە، لەگەڵ چاکەکاراندا بمانمرێنە، ئەی پەروەردگارمان! پێمان ببەخشە ئەو-شتان-ەی کە لەسەر

زمانی پێغەمبەرانت بەڵێنت پێ دابووین و، ڕۆژی قیامەتێ ڕیسوامان مەکە، بێگومان تۆ گفتت دەگەیەنیە جێ.

ئێستا با سەرنج بدەین داخۆ بڕوا بەخوا بوون، چ پلەو پایەیەکی هەیەو، چ دەورێکی هەیە لە دروست بوونی بیروبڕوای ئیسلامییدا:

دوای ئەوەی خاوەن هۆش و عاقڵمەندان لە ئەنجامی تێوەڕامانی نیشانە ڕێک وپێکەکانی بوونەوەرەوە گەیشتنە قەناعەتی بڕواهێنان بە بوونی خواو، دوایی لە ئەنجامی بەکارهێنانی هێزی دڵ و دەروون و یادی خوادا، بڕواکەیان فراژوو بوو و بوو بە خۆشەویستیی و سۆزێکی دەروونییش، سەرەڕای قەناعەتی ژیریی و، لە سایەی لەگەڵ خوا تێکەڵ بوون و خوا خۆشویستندا، چوونە قۆناغی هەرەبەرزی خواناسییەوەو، توانیان هەست بەهۆو حیکمەتی دروستکرانی بوونەوەر بکەن، دوای ئەوە یەکسەر گوتیان؛ لە ئازاری ئاگر بمانپارێزە (فقنا عذاب النار)، لەمەوە دەفامرێتەوە کە هەرکەسێک بەڕاستیی خوا بناسێ، ئەو خواناسینە تێی دەگەیەنێ کە ئەم بوونەوەرە بە هەوەنتەو گۆترەکاریی و بێحیکمەت ساز نەکراوەو، ئینسانیش هەر لەخۆوە بەبێ هۆ لەسەر زەوی ڕۆنەنراوە، چونکە خوایەک خاوەنی زانیاری و توانایەکی هێندە زۆربێ و گەردوونێکی ئاوا گەورەو فراوان بڕەخسێنێ و هەڵسووڕێنێ، حەتمەن دەبێ خاوەنی ئەوپەڕی حیکمەت و (لێزانیی)یش بێ، ئنجا یەکەمین مەرجی لێزانیی و حیکمەتیش ئەوەیە کە کاری بێجێو گۆترەکاریی لێ نەپشکوێتەوە.

ئنجا ئەو خاوەن هۆشانە لە ئەنجامی خواناسینەوە زانیان، کە خوای کاربەجێو زانا ئەم بوونەوەرەی بە گشتی و ئینسانی بە تایبەتیی، بێهوودە و بە بەلاش نەخولڵقاندوە، ئیدی لەمەوە گەیشتنە ئەو قەناعەتەی، کە دەبێ ئینسان لە بەرانبەر ئەو کردەوانەی، کە لەم ژیانەدا دەیانکات، لێپرسینەوەو سزاو پاداشتێکی بۆ بڕیار درابێ، بۆیە یەکسەر پاش دانهێنان بە حیکمەت

و لێزانیی خوا لە دروستکردنی بوونەوەرداو، پاکیی دەربڕین سەبارەت بەخوای کاربەجێو پاک و بێخەوش، داوایان لە خوا کرد کە لە سزاو جەزرەبەی ڕۆژی لێپرسینەوە بیانپارێزێو پەنایان بدات.

ئنجا لە ئایەتی دوایی-ئایەتی سێیەم-دا بەترس و لەرزەوە، ڕوو دەکەنە پەروەردگاریان و دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! بەراستی ڕووزەردو شەرمەزار و ریسوا ئەو کەسەیە کە-بەهۆی دەرنەچوونی لەتاقیکردنەوەی ژیانی دنیا-تۆ بە چونە نێو ئاگری دۆزەخ سزای دەدەی و، ستەمکاران-ئەوانەی کە لە دنیادا ستەمیان لە خۆیان و لە کۆمەڵ و لە بەرنامەی خوا کردوە، بەهۆی لاڕێبوونیان لەو بەرنامەو ئایینەی، کە پڕ بەپێستی مرۆڤەو، لەگەڵ سروشتی ئینسان و بوونەوەردا پێکەڵپێکە- هیچ یارمەتیدەرێکیان نیە، کە دەفریایان بێ، چونکە کەسێک لە ئایینی خوا لابدات لە بەرنامەی گشتی بوونەوەر لایداوەو، هەرکەسێکیش لە ڕچەو ڕێڕەو (خِطـة واِتجـاه)ی بوونەوەر لابدات، هەموو بوونەوەر دژی دەوەستێو، حەتمەن دۆڕان و تێشکان و دەست بە هیچ پچکانەوە نەمانیش، بەش و چارەنووسی کەسێکی ئاوا بێخێرو بەدفەڕە.

کەواتە هەتا ئێرە بڕوا بەخوا بوون، توانی وەک ئەنجامێکی سروشتیی و ژیربێژییانە، لقی (بڕوا بە دوارۆژ بوون - الإيمـان باليـوم الآخـر) دەر بکات و، بەرهەم بێنێ، هەڵبەتە گەورەترین پایەو بنچینەی (بیرو بڕوای ئیسلامیی)یش دوای بڕوابەخوا بوون، بڕوا بە دوارۆژ بوونە، بەڵگەش زۆرن لەسەر ئەوە، کە بڕوا بەدوارۆژ بوون، دوای بڕوا بەخوا بوون، گەورەترین بنچینەی بیروبڕوای ئیسلامییە، بەڵام لێرەدا بەس یەک لەو بەڵگانە بە نموونە دێنینەوە:

لە قورئانێدا (٢٥) جاران بڕوا بە دوارۆژ بوون، یەکسەر دوای بڕوا بە خوا بوون[1]، باسکراوە.

---

(١) بڕوانە: (المعجم المفهرس لألفاظ القرآن الكريم) ل٧٧٥-٧٨٠، چ١.

ئنجا لـه ئایەتـی دواتر-ئایەتـی چـوارەم-دا جارێکـی دیکـه بـه ملکەچـی و نـزاو پاڕانـەوەوە ڕوو دەکەنـه خـوای پەروەردگاریـان و دەڵێـن: ئـەی پەروەردگارمـان بێگومـان ئێمه-دەنگـی زولێڵـی- بانگکەرێکمـان بیسـت کـه بانگـی-خەڵکـی- دەکـرد بـڕوا بـه پەروەردگارتـان بێنـن، جـا ئێمـەش بڕوامـان هێنـا...

وەک دەبینیـن لـەم ئایەتەشـدا بڕوا بەخـوا بـوون و خواناسیی توانـی لقی (بڕوا بـه پێغەمبـەر بـوون- الإیمـان بالرسـول)یش دەربـکات و بپەروەرێنـێ، بێگومـان (پێغەمبەرناسـیی-یش سـێیەمین بـەردی سـێکوچکەی بیروبـاوەڕی ئیسـلامییە، چونکـه هەرچەنـدە بیروباوەڕی ئیسـلامیی لـه شـەش بنچینـان پێکدێ، بەڵام سـێیان لـەو شەشـانە لـه هەمـوان بنەڕەتیتـرو سـەرەکیترن و سـێیەکەی دیکـەش دەنێوخۆ دەگـرن، بەڵێ بنچینـەو سـێکوچکەی بیروبـاوەڕی ئیسـلامیی کە بریتیە لـه بڕوابـوون بـه (یەکتایـی خـوا، پێغەمبەرایەتـی، ڕۆژی دوایـی)، هەرکـام لـه بڕوابـوون بـه (فریشـتەکان، کتێبـەکان، قەزاوقـەدەر) دەنێـو دەگـرێ.

ئێسـتاش لەبـەر تیشـکی چەنـد ئایەتێکـدا پلەوپایـەی بـڕوا بەخـوا بـوون و دەوری بـڕوا بەخـوا بوونمـان لـه دروسـتکردنی بیروبـاوەڕی ئیسـلامییدا خسـتە ڕوو و زانیمـان چـۆن بـڕوا بەخـوا بـوون بـۆ پایـەو بنچینەکانـی دیکـەی بیروبـاوەڕ، وەک قـەدی درەخـت وایـه بـۆ لـق و پۆپەکانـی، بـەڵام بەپێویسـتی دەزانـم بەرلـەوەی ئـەم باسـه بەجێبهێڵیـن و بچینـه سـەر باسـی پلەوپایـەی بـڕوا بـه خـوا بـوون لـه ئاییـن و بەرنامـەی خـوادا، چۆنیەتـی فامرانـەوەو وەرگیرانـی، بـڕوا بـه دواڕۆژبـوون و، بـڕوا بـه پێغەمبەرایەتیـی بـوون، لـه بنچینـەی بـڕوا بـه خـوا بـوون بتوێژینـەوە:

مرۆڤ کاتێـک بەهـۆی تێوەرامـان و سـەرنجدانی نیشـانەکانی بوونـەوەرەوە، گەیشـتە قەناعەتـی دان هێنـان بـه بوونـی خـواداو، بەهـۆی بێداربوونـەوەی دڵ و شـوعلەوەر بوونیـەوە بـه تیشـکی بیرکردنـەوەو ڕامـان و، بـه ئاگـری بەتینـی خۆشەویسـتی خـوا هەمـوو ئـەو تاریکیـی و پەردانـەی لابـردن و سـووتاندن، کـه نەفـس و شـەیتان و وەهـم و خەیـاڵ لـه دڵ و دەروون و بیروهۆشـییانەوە

پێچابوویانن و، لەو خوا مەزن و میهرەبانەیان وەدوور خستبوو کە لە ڕەگی مل لێی نیزیک ترە، وەک خوای زانا فەرموویەتی:

﴿...وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ ١٦﴾ (ق-١٦).

لە هەموو شتێک پێی ئاشناترە[١] و، لە باب و دایکی بۆی چاکترە، وەک لەم فەرموودەیەی پێغەمبەرەوە، دیارە: (عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کۆمەڵە دیلێکی هێنان، جا ئافرەتێک لە دیلەکان دەگەڕا، منداڵێکی لەنێو دیلەکاندا دی، گرتی و بەزگی خۆیەوە نووساندو مەمکی دایە، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئایا پێتان وایە ئەم ئافرەتە منداڵەکەی دە ئاگری بهاوێ؟ گوتمان نە بەخوا، فەرمووی: دە جا خوا لەم-ئافرەت-ە بە منداڵەکەی بەبەزەیی ترە سەبارەت بە بەندەکانی)، متفق علیه.

دوای ئەوە (واتە دوای ناسینی خواو بڕوا پێهێنانی) وەک ئەنجامێکی سروشتیی و حەتمیی، زانییان کە دەبێ ژیان بەس ئەم پێنج و دوو ڕۆژەی دنیا نەبێو، ژیانێکی دیکەی داهاتوو هەبێ کە تەواوکەری ئەم ژیانە دنیاییە بێ، چونکە:

١- ماقووڵ نیە بەخشندەیی و بەزەیی خوا، هەر ئەم ئەندازە ژیانە کەم و کورت و پڕ ئەرک و ئازارو ئێش و ژانەی لێهەڵوەرێ، بەڵکو مادام خوا خاوەنی بەزەیی و بەخشندەییەکی بێسنوورە، دەبێ ئەو چاکەو بەخششەی لێشیەوە دێ، هەر بێسنوور بێ، دەنا-پەنا بەخوا- یان ڕژدیی، یان بێحیکمەتیی، پاڵ دەدرێتە لای خوا.

---

(١) بەڵێ هەروەک چۆن مرۆڤ بەو باب و دایکەی لێیان بووەو، بەو شارو دێیەی تێدا گەورەبووەو، بەو نیشتمانەی فرچکی بە ئاوو خاکەکەیەوە گرتوە، لە هەموو باب و دایک و، شارو دێ و، نیشتمانێکی دیکە ئاشناو شارەزاترەو، بەو خوایەش کە بوونی لەوەوە سەرچاوەی گرتوە، لە هەموو کەسێکی دی ئاشناترە، بەمەرجێک دەروونی ژەنگی نەگرتبێو، نەفامیی مێشکی دانەگرتبێو، سپڵەیی و بێنمەکیی نەکردبێ.

٢- ئەم ژیانە دنیایی یە، هەزار بەسەرهاتی دڵتەزێن و، هەزاران چیرۆکی دوایی نەهاتووی وای تێدا ڕابردوون و ڕوودەدەن، کە ئەگەر قۆناغێکی دیکەی ژیان نەبێ، کە تەواوکەری ئەم ژیانە بێ، ئەو بەسەرهات و چیرۆکە دڵتەزێن و دوایی نەهاتووانە، وەک شانۆگەریی (مسرحية)یەکی بێ ئەنجام و، ڕۆمانێکی بێتام دێنە بەرچاو، بەڵام خوا(جل جلالە) زات و سیفەتەکانی پاک و بێپەڵەن و، ئەو کردەوانەش کە بەرهەمی ئەو زات و سیفەتانەن، حەتمەن دەبێ تەواوو بێهەڵە بن، مادام وابێ، ژیریی و ویژدان حوکم دەکەن: بەپێویستیی هەبوونی (دوارۆژێک) کە کۆتایی و ئەنجامی ئەو ڕووداوو بەسەرهاتە تەواونەبووانەی تێدا بێ.

٣- لەم ژیانەدا چەندان ئینسانی کامڵ و تەواو هەن، کە ئامانجیان ڕازیکردنی خواو سوودمەندبوون و ئاسوودەکردنی خەڵکییە، بەڵام بەزۆریی وا دەبێ، دەمرن یان دەکوژرێن و،ماڵئاوایی لە خەڵک و ژیان دەکەن، بێئەوەی هیچ کەس-وەک پێویست- ڕێزیان بگرێ و پاداشتیان بداتەوە، دیسان چەندان کەسی بەدکارو خوار هەن، کە ئاواتیان تووڕەکردنی خواو، زیان لە خەڵک دان و خراپەو تاوانە، بەڵام بەدەگمەن ڕێ دەکەوێ، ئەوانە بەسزای پڕ بەپێستی خۆیان بگەن و، بگرە زۆر جاران خەلێتیش دەکرێن و، ئافەرین و چەپڵەی زۆریش وەدەست دەخەن، تەنانەت هەیانە پاش مردنیشی، لاشەی ڕەشی تاوانباری لەلایەن خەڵکێکی بێئاگاو بەستەزمانەوە دەپەرسترێ و، وەک خوای بەرز کڕنووشی کۆیلایەتیی بۆ دەبەن.

جا بێگومان ژیریی ساغ و ویژدانی پاک، دەڵێن: دەبێ ڕۆژێک هەبێ چاکەکاران بە پاداشتی چاکیان بگەن و، بەدکارو تاوانبارانیش تۆڵەیان لێ وەستێنرێ و، لە دۆزەخی بڵێسەداردا بارو بارخانەیان بخەن.

کەواتە ڕاستە بڕوا بوون بە دواڕۆژ، ئەنجامێکی سروشتیی و ژیربێژییانەی، بڕوا بەخوا بوونەو، ژیریی و ویژدانی ڕاست و ساغ داخوازیی دەکەن.

ئنجا نۆرەی شیکردنەوەی چۆنیەتی فامرانەوەی بنچینەی پێغەمبەرایەتییە:

پاش ئەوەی مرۆڤ لەسەر بنچینەی خواناسیی و بڕوا بەخوا هێنان، لە ئەنجامی لێکدانەوەو بیرکردنەوەو، بەراورد و پێکگرتنی پاک و بێخەوشیی و بێهەڵەو پەڵەیی زات و سیفەت و کردەوەکانی خواو، واقیعی بێسەرەو بەرەو نالەبەرچاوی ژیانی دنیادا، گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە دەبێ ڕۆژی دوایی، ڕۆژی لێپرسینەوەو پاداشت و سزا، ڕۆژی چەسپاندنی دادگەریی خوا، ڕۆژی بەئەنجام گەیاندنی چیرۆکەکانی ژیانی دنیا، هەبێ، دوای ئەوە یەکسەر وەک ئەنجامێکی حەتمیی و سروشتیی گەیشتە قەناعەتی بڕوا بە پێغەمبەرایەتیی بوون، چونکە:

١- مادام ژیانی دنیا بە مەبەستی تێدا تاقیکرانەوەی ئینسان ساز کرابێ.

٢- مادام ئینسانیش بۆ دەرچوون و دەرنەچوونێ بشێ و، وێڕای لایەنی فریشتەیی و خێرخوازیی، لایەنی شەیتانیی و بەدخوازیشی تێدا بێ.

٣- مادام خوای پەروەردگاریش ئەوپەڕی سۆزو بەزەیی لەلا بێ، دەبێ[1] حەتمەن خوای خاوەن بەزەیی (لە ئەنجامی چاکەکاریی خۆیەوە) بەزەیی بە مرۆڤ دابێو قایل نەبێ، وەک ئاژەڵێکی پشتگوێخراو بەرهەڵدابێو، لە بیابانی قاقڕو ئیشکی بیروبۆچوون و هەواو ئارەزووە ئینسانییەکانی خۆی و خەڵکیدا سەرگەردان و هەڵوەداو بێسەلێ بێ و، وەک خاولی گەرماوو داشی دامە، هەر ڕۆژە لەدەست فیرعەون و طاغووتێکدا بێ!!

بەڵێ ڕەوانەکردنی بەرنامە (شریعة)و نێررانی (پێغەمبەر) لەلایەن خواوە ئەنجامێکی دیکەی ژێربێژییانەی بڕوا بەخوا بوون و خواناسییە، چونکە

---

(١) بێگومان هیچ شتێک لەسەر خوای پاک و تاک فەرز نیە، بەڵام بۆ خۆی بەخشش و بەزەیی پێداهاتنەوەی لەسەر خۆی پێویست کردوە [كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ] (الأنعام-٥٤)، چونکە بێگومان بەبێ بەخشش و بەزەیی وی، هیچ دروستکراوێک نە پەیدا دەبێو دەخولقآ و، نە بەردەوامیش دەبێ لە بوون (وجود) و ژیاندا.

بەبێ بڕواهێنان بە پێغەمبەرایەتیی، ناچار دەبین کە لە (خوا بە بێبەزەیی دانان) و (خوا بەبێ حیکمەت دانان) و (ئینسان بە فریشتە دانان)، یەکیان هەڵبژێرین، بێگومان ئەوەشیان کە لە هەمووان چاکترە، دژی واقیع و ژیریی و ویژدانی ئینسانە[1]، هەر بۆیەش خوای دادگەرو میهرەبان، لەبارەی ئەوانەوە کە گوتوویانەو دەڵێن: خوا هیچ کتێب و بەرنامەو پێغەمبەری نەناردوون و ڕەوان نەکردوون، فەرموویەتی:

﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖ﴾ (الأنعام- ٩١).

واتە: وەک بۆی شایستەیە ڕێزی خوایان نەگرت، کە گوتیان: خوا هیچ شتێکی نەناردۆتە سەر هیچ کەسێک.

ئێستاش کە لە ڕوونکردنەوەی پلەو پایەی بڕوا بەخوا بوون لە بیروبڕوای ئیسلامییدا بووینەوەو، خستمانە ڕوو کە چۆن بڕوا بەخوا بوون ئەسڵ و بنەچەکەو سەرچاوەی بیروبڕوایە، بابچینە سەر باسی پلەو پایەو شوێنی بڕوا بەخوا بوون لە ئایین و بەرنامەی خوادا بەگشتی:

ئێمە بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی پەیوەندیی (بڕوا بەخوا بوون) بە بیروبڕواوە، پەنامان بردە بەر درەختێک و، بڕوا بەخوا بوونمان بە قەدەکەی چواندو، بەشەکانی دیکەی بیروبڕواشمان لەجێی لق و پۆپەکانی دانا، ئنجا ئێستاش کە بە یارمەتی خوای وەلامگۆی میهرەبان، دەمانەوێ چۆنیەتی پەیوەندیی بڕوا بە خوا بوون بە سەرلەبەری ئایینی ئیسلامەوە، بخەینە ڕوو، دیسان پەنا دەبەینە بەر وێچواندن (تشبیە)، چونکە وێچواندن باشترین هۆی ڕوونکردنەوەی مەبەست و حاڵی کردنی مرۆڤە، دەڵێین:

دەتوانین ئایینی ئیسلام بەگشتی بەدەنکە تەسبیحێک بچوێنینەو، بڕوا بەخوا بوونیش بەو دەزو و داوەی کە هەموو دەنکەکانی تەسبیحەکە خڕ

---

(١) واتە: هەرسێکیان پێچەوانەی واقیع و عەقڵ و فیطرەتی ئینسانن.

دەکاتـەوەو پاڵیـان پـێ وێـک دەدات و، شـانیان پـێ لێـک دەدات و، لەپـرژو بلێوییـان قوتـار دەکات و، ئـەو دیمەنـە ڕێـک وپێکەیـان لـێ سـاز دەکات، کـە پێـی دەگوتـرێ (تەسـبێح).

چونکە هەروەک چۆن دەزووی تەسـبێحەکە پەیوەندییەکی کاریگەرو بەتین و ڕاسـتەوخۆی بە هەریـەک لـە دەنکەکانـی تەسـبیحەکەوە هەیـەو، ئەگـەر ئـەو نەبووایـە ئـەو دەنکانـە کـۆ نەدەبوونـەوەو دیمەنـی تەسـبیحیان پێـک نەدەهێنـا، بـڕوا بـە خـوا بوونیـش بـە هەمـان شـێوە پەیوەندییەکـی بەتیـن و کاریگـەرو ڕاسـتەوخۆی، بـە یـەک بەیەکـی یاسـاو دەسـتوورە گیانیـی و ڕۆشـنبیریی و پەروەردەیی و سیاسـیی و سـەربازیی و ئابووریـی و کۆمەڵێیەتییەکانـەوە هەیـەو، هـەر ئـەو کارێکـی وای کـردوە کـە ئایینـی ئیسـلام، لـەو یاسـاو دەسـتوورانە پێـک بـێ.

دیسـان دەتوانیـن بـڕوا بەخـوا بـوون، بـە دینەمـۆو سـەرچاوەیەکی کارەبـا بچوێنیـن و، یاسـاو دەسـتوورەکانی ئیسـلامیش بـەو گڵۆپانـە بچوێنیـن، کـە بەهـۆی ئـەو دینەمۆیـەوە ڕووناک دادێـن و، بەبـێ وی خامـۆش دەبـن و تاریـک دەبـن.

هەروەها دەتوانیـن بـڕوا بـە خـوا بـوون و خواناسـیی، بـە ڕۆژێ بچوێنیـن و، یاسـاو دەسـتوورەکانی ئیسـلامیش بـەو دارو درەخـت و ڕووەکانـە بچوێنیـن کـە بـە تیشـکی وی دەژیـن و گەشـە دەکـەن و، کـە تیشـکی وییـان لێبـڕا سـیس و زەرد دەبـن و لـە شـاری ژیـن بـار دەکـەن.

وە دەتوانیـن بـڕوا بـە خـوا بـوون، وە (دڵ) بچوێنیـن، وە یاسـاو دەسـتوورەکانی ئیسـلامیش، بـەو ئەنـدام و کۆئەنـدام (عضـو و جهاز)انـە بچوێنیـن کـە بـەو خوێنـە کار دەکـەن و دەژیـن، کـە دڵ بۆیـان بـەڕێ دەکاو، ساغیی و نەسـاغیی و مـان و نەمانیـان، بـە سـاغیی و مـان و نەمانـی وییـەوە بەسـتراوە.

بەڵێ لەڕاستیدا ئیمان بەخواو خواناسیی و، یاساکانی ئیسلام، پەیوەندیی نێوان کارەباو گڵۆپ و، ڕۆژ و ڕووەک و، دڵ و ئەندامەکانی لەشیان لەنێواندا هەیە، چونکە ئەو ژیان و جوانیی و ڕەونەقەی کە لە یاساکانی ئیسلامدا دەبینرێ، لە دینەمۆی بڕوا بەخوا بوون و، ڕۆژی خواناسیی و، دڵی خوا، خۆشویستنەوە وەریانگرتوە، ئاخر بێجگە لە سەرچاوەی بەهێزو خاوەن پیت و پێزی ئیمان بەخوا چ شتێکی دیکە وا لە مرۆڤی خواناس و مسوڵمان دەکات، کە هەموو چالاکییەکانی ژیانی-لە سیاسیی و سوپایی و کۆمەڵێیەتیی و پەروەردەیی و ئابووریی- بە عیبادەت و خواپەرستیی لەقەڵەم بدات؟!!

هەڵبەتە ئاشکراشە کە: هەروەک چۆن بڕوا بەخوا بوون، وا لە جموجووڵ و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ دەکات، کە بۆی بەخواپەرستیی (عبادة) لەقەڵەم بدرێن، بە پێچەوانەشەوە: بڕوا بەخوا نەبوون، دەبێتە هۆی بێئەنجامیی و قبووڵ نەبوونی هەر کردەوەیەک، وەک خوای زانا فەرموویەتی:

﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْۖ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَرَمَادٍ ٱشۡتَدَّتۡ بِهِ ٱلرِّيحُ فِي يَوۡمٍ عَاصِفٍ ﴾ (ابراهيم-١٨).

واتە: وێنەی کردەوەی ئەوانە، کە بڕوایان بە پەروەردگاریان نیە، وەک خۆڵەمێشێک وایە کە لە ڕۆژێکی گێژەڵووکاوییدا، دەکەوێتە بەر تەوژمی بایەکی توندو ڕای دەماڵێ.

(جێی سەرنج ئەوەیە کە کردەوەی بێبڕوایان بە خۆڵەمێش چوێنراوە! جا من پێم وایە حیکمەتی ئەو وێچواندنە ئەوەیە؛ کە هەروەک چۆن خۆڵەمێش لە ئەسڵدا شتێکی چاک-دارو سووتەمەنی- بووە، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە سووتێنراوە، بێ کەڵک بووە، کردەوەی چاکی کافرانیش لە خودی خۆیدا چاک و پەسندە، بەڵام چونکە کافرەکان بە ئاگری بێبڕوایی سووتاندوویانە، بۆتە خۆڵەمێش).

ئنجا ئێمە تا ئێستا لە گۆشەنیگای کاریگەریی و تاووتینی بڕوا بەخوا بوونەوە بۆ سەر یاساکانی ئیسلام، سەرنجی پەیوەندیی نێوان بڕوابەخوا بوون و بەرنامەی ئیسلامماندا، بەڵام ئەمجار با لە گۆشەنیگایەکی دیکەوە لەو مەسەلەوە ڕابمێنین:

هەروەک چۆن گڵۆپی بێ کارەبا، خامۆشەو، ڕووەکی بێ ڕۆژ، زەردو سیس و ئیشکەو، جەستەی بێدڵ، کەلەشێکی ساردو سڕە، دینەمۆیەکیش گڵۆپی پێ ڕۆشن نەکرێ و، ڕۆژێک ڕووەکی پێ سەوز نەکرێ و، دڵێکیش خوێنی پێ دابەش نەکرێ، بە دینەمۆو، ڕۆژو، دڵ، دانانرێن.

بەڵێ، هەروەک چۆن یاساو دەستوورەکانی ئیسلام، بەبێ بڕوا بەخوا بوون، وەک کەلەشێکی بێگیان و مردوون، بڕوا بەخوا بوونیش، بەبێ بەڕێوەبردنی یاساو چالاکییەکانی بەرنامەی خوا، وەک گیانێکی ڕووتی بێ جەستە وایە، ئنجا بێگومان هەروەک چۆن جەستەی بێگیان، بەتەنێ داری پێ لەسەر بەردی ڕۆنانرێ، گیانی بێجەستەش بەتەنێ، مێشی پێ لەخۆ دەرناکرێ!

بەڵێ هەروەک چۆن ئینسانێکی تێرو تەواوو واقیعیی و زیندوو، لە گیان و جەستە پێکدێ، ئیسلامێکی کامڵ و تەواوو واقیعیی و زیندووش، لە بڕواو کردەوە (الإیمان والعمل) پێکدێ، هەر بۆیەش لە زۆربەی ئایەتەکانی قورئانی بەڕێزدا، هەرجارێک باسی بڕوا کرابێ، بەدوایدا باسی کردەوەش کراوەو، ئەو ئایەتانەی کە دەقی وشەی (بڕواو کردەوەی چاک - الإیمان والعمل الصالح)یان پێکەوە تێدا باسکراوە، دەوری (٦٨) ئایەتن.[١]

بەڵێ بڕوا بەخوا بوونێک لەلای خوا سەنگ و ڕێزی هەیەو نرخی بۆ دادەنرێ، کە ئینسان ڕابچەڵەکێنێ و، بەرەو خوا ڕازی کردن و سوود بەخەڵک گەیاندن ڕاپێچی بکات و بیجووڵێنێ، ئەگەرنا بڕوا بەخوابوونێک

---

(١) بڕوانە (المعجم المفهرس لألفاظ القرآن الكريم)، ل٤٨٣-٤٨٤.

کردەوەی چاکی بەدوادا نەیەت، لە تەرازووی ئایین و بەرنامەی خوادا سەنگی نیە.

بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەش، چەندان بەڵگە هەن، بەڵام چونکە ئێرە بۆ توێژینەوەی ئەو مەسەلەیە تەرخان نەکراوە، بەنموونەیەک لە قورئان و نموونەیەکیش لە فەرمووده (حدیث)ی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) واز دێنین:

خوای دادگەرو کاربەجێ پاش ئەو تێوەڕامان و خوا یادکردن و رازو نیازو لالێنەوەو پاڕانەوەو کڕووزانەوە پڕ کوڵی دڵ و بەجۆش و خرۆشەی، کە مرۆڤە هۆشیارو دڵ بێدارەکان کردیان-کە لە ئایەتی ژمارە ١٩٠-١٩٤ی سورەتی (آل عمران)[1]دا باسکراوە- لە ئایەتی ژمارە ١٩٥ی هەمان سوورەتدا، ئاوا وەڵامی دانەوە:

﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥﴾.

واتە: جا پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە: کە بێگومان من کردەوەی هیچ ئیشکەرێک لە ئێوە زایە ناکەم، لە نێر یان مآ، هەندێکتان لە هەندێکتانن (واتە لە رەگەزو سروشت دا وەک یەکن)، جا ئەوانەی-لە ڕێی خوادا- کۆچیان کردوەو لە خانوو بەرەیان وەدەرێ نراون و، لەپێناوی مندا ئازار دراون و، جەنگاون و کوژراون،-ئەوانە- شکی تێدا نیە خراپەکانیان لێ دەسڕمەوە،

---

(١) لە بەرگی یەکەمی (یادی خودا) دا لە بەشی هەشتەم، لەژێر سەرباسی: (پەیوەندیی نێوان یادی خواو تێکۆشان)دا (١١) ئایەتی کۆتایی سوورەتی (آل عمران) بە درێژیی توێژراونەوە، بۆیە لێرە بەکورتی دەدوێین و، خوێنەر حەواڵەی وێ دەکەم. بڕوانە چاپی یەکەم، ١٩٨٧.

حەتمـەن دەیانخەمـە نێـو چەنـد بەهەشـتێکەوە کـە ڕووباریـان بەژێـردا دەڕۆن، (ئـەوە) پاداشـتە لەلایـەن خواوەو، خـوا پاداشـتی چاکـی لەلایـە.

وەک دەبینیـن خـوای پـەروەردگار لـە وەڵامـی ئـەو خـاوەن هۆشـە، خـوا لەیادە، دڵ بـە کولێنـەدا دەفەرمـوێ: مـن کـردەوەی هیـچ خاوەن کردەوەیـەک لەئێوە، بەزایـە نـادەم [أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم] یانـی: هـۆ عاقڵمەندانـی خـوا لـە یادو دڵ پـڕ لـە جـۆش! ئەگـەر دەتانـەوێ ئاواتتـان بێتـەدی و، خـوا لێتـان ڕازی بـێ و تاوانەکانتـان بپۆشـێ و خراپەکانتـان بسـڕێ و، لەگـەڵ چاکەکارانـدا بتانمرێنـێ و، ئـەو گفـت و بەڵێنـەی کـە لەسـەر زمانـی پێغەمبەرانـی پێـی داون، بۆتـان بێنێتـە دی؛ ئـەوە زۆر بـاش بزانـن! تاقـە شـتێک کـە خـوا وەک نـرخ و قیمەتـی ئـەو ئاواتانـە قبووڵـی دەکات، کـردەوەو جووڵێـن و ئیـش کردنەو هیچی دی!

ئنجـا دوایـی بـۆ ئـەوەی زەیـن و گومانیـان خلیسکەیان پێنەبـاو بەسـەهوویان نەبـاو، وایـان حاڵـێ نـەکات: کـە مەبەسـت لـە کـردەوە (عمـل) بـەس ئـەو جموجـووڵ و چالاکییانـەن کـە لەبـواری تاکیـی و کەسـییدا بەڕێـوە دەبرێـن و، هیچـی دیکـە، پێنـج جـۆرە کـردەوەی گرنگیـان دەخاتـە بەرچـاو، کـە هەموویـان لـە جوغـزی تێکۆشـان (جهـاد)دا کۆدەبنـەوە:

١- کۆچکردن. ٢- دەربەدەریی. ٣- ئازاردران. ٤- جەنگ کردن. ٥- کوژران.

ئنجـا دوایـی دەفەرمـوێ: هەرکەسـێک ئـەم مەرجانـەی تێـدا بێنـە دی و، خاوەنـی ئـەم کردەوانـە بـێ، ئەوە-ئاواتـی دێنمـە دی و دووعـای وەردەگـرم و- خراپەکانـی لـێ دەسـڕمەوەو، دەیخەمـە نێـو چەنـد باغێکـەوە کـە ڕووباریـان بەبنـدا دەڕۆن..

کەواتـە: بەڵـێ ڕاسـتە؛ بـڕوای بێکـردەوەو، یادکـردن و ڕازو نیـازو پاڕانـەوەو کڕووزانـەوەی، بـێ جموجـووڵ و تێکۆشـان، لەتـەرازووی بەرنامـەی خـوادا، دەعـوای بـێ شـایەدەو، دەعـوای بـێ بەڵگـەو شـایەدیش، لـە دادگادا نرخـی نیـە.

ئنجا با بچینـه خزمـەت پێغەمبـەری خوا (صلی الله علیـه وسـلم) و لـه بـاغ و گوڵـزاری فەرمـوودە بەپێـزە پیرۆزەکانـی گوڵێکـی دڵگیـرو بۆنخۆش بچنیـن:

پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووبەتـی: {أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ} (أخرجه أحمد برقم: ١٨٣٩٨، والبخاري برقم ٥٢، ومسلم برقم ١٥٩٩)، واتـه: بێگومان لـه لـەش-ی ئینسـان-دا پارچـه گۆشتێک هەیـه، ئەگـەر چـاک بێ هەمـوو-ئەندامەکانی- لـەش چـاک دەبن و، ئەگـەر خراپ بێ هەموو-ئەندامەکانی- لـەش خراپ دەبـن، ئـاگادار بـن! ئەویش دڵـه.

بەرلـەوەی دەست بـه تـوێژینـەوەی ئـەم فەرمـوودەیـه بکـەم، حـەز دەکـەم هـۆی هەڵبژاردنـی بـۆ خوێنـەر ڕوون بکەمـەوە:

ئەم فەرمـوودەیه زۆر کـەس بـه بەراوەژووی لێ حاڵێ دەبن!

بەڵـێ زۆر کـەس ئـەم فەرمـوودەیە-کـه بەهێزتریـن بەڵگـەی یەکبوویـی و پێکـەوە جۆشـدراویی بـڕواو کردەوەیـە- بـه بەڵگـه دێنێتـەوە لەسـەر ئـەوەی کـه مـەرج (دڵ)ەو هەرکەسـێک دڵێکـی پـڕ لـه بـڕوای هەبـێ، نەبوونـی کـردەوان، زیانـی لێنـادات، چونکـه پێغەمبـەر (صلی الله علیـه وسـلم) فەرمووبەتـی: (پارچـه گۆشـتێک لـه جەسـتەدا هەیـه کـه ئـەو چـاک بـوو جەسـتە هەمـووی چـاک دەبـێ)، کەواتـه گرنـگ دڵـه، هەرکەسـێک خاوەنـی دڵێکـی سـاغ و سـەلیم و بـڕوادار بـێ، کاری تـەواوەو بەرەی خـۆی لـه ئـاوێ دەرێنـاوە، هەرچەنـدە هەمـوو ئەندامەکانیشـی لـه زەلـکاوی تـاوان و خراپـەدا نوقـم بووبـن!!

بەڵـێ، ئێمـه بۆیـه ئـەم فەرموودەیەمـان، بـۆ سـەلماندنی یەکبوویـی بـڕواو کـردەوە هەڵبـژارد، چونکـه زۆر کـەس ئـاوا بـه هەڵـەو بـەرەواژووی لـێ حاڵـی بـووە، ئەگـەرنا لەوبـارەوە فەرمـوودە زۆرن، بـۆ نموونـه: {مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ

لِلَّـهِ، وَأَعْطَـى لِلَّـهِ، وَمَنَـعَ لِلَّـهِ، فَقَـدِ اسْـتَكْمَلَ الإِيمَـانَ} (أخرجه أبـو داود برقـم: ٤٦٨٣، عَـنْ أَبِي أُمَامَـةَ، قـال الألباني: صحيـح).

ئێستاش دەچینە سەر شیکردنەوەو توێژینەوەی:

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەم فەرموودەیەیدا، ساغیی و چاکیی دڵ-کە شوێنی تێدا جێگیربوونی بڕواو خواناسییە-یان نەساغیی و خراپیی، بەهۆی ساغیی و چاکیی یان نەخۆشیی و خراپیی ئەندامەکانی لەش-کەهۆکاری جێبەجێکردنی کردەوانن- دادەنێ!

کەواتە ساغیی و چاکیی و بڕواداریی دڵ و دەروون، کاتێک دەبێتە شتێکی بەڵگەدارو سەلمێنراو، کە چاکیی و ساغیی و پابەندیی ئەندامەکانی لەش، ببنە شایەدو بەڵگەو پشتیوانی بۆی، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەیفەرمووە: (بەس دڵ مەرجە) بەڵکو فەرموویەتی: چاکبوونی دڵ بنچینەو مەرج و هۆی چاکیی و ساغیی ئەندامەکانی لەشە، واتە؛ ئەندامەکانی لەش، لە چاکیی و خراپیدا وەدوای دڵ دەکەون.

مادام وابێ، هەروەک چۆن دینەمۆیەکی کارەبا، کە ئەو گڵۆپانەی پێیەوە پەیوەستن نەیتوانی دایان بگیرسێنێو، بە دینەمۆیەکی خراپ و لەکارکەتوو دادەنرێ، دڵێکیش کە ئەو ئەندامانەی پێیەوە بەستراون و لەژێر ڕکێفی دان، نەتوانێ بەتیشکی بڕواو خواناسیی ڕووناکیان بکاتەوەو، وەک خۆی ڕوویان پێ بکاتە خواو گەردنکەچ و فەرمانبەری بەرنامەکەیان بکات، بەدڵێکی نەخۆش و لەکارکەوتوو و بەتاڵ و حەتاڵ دادەنرێ!!

بەڵێ بە حوکمی ڕوون و ڕاشکاوی ئەم فەرموودە بەپێزەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەر دڵ و دەروونێک ئەندامەکانی جەستە بەلای خوادا نەکێشێ، دیارە دڵێکی خوایی و بڕوادار نیەو، هەر دڵێک نەتوانێ چاوو گوێو زمان و گەدەو داوێن و...هتد. بکاتە مسوڵمان و گەردنکەچی ئایینی خوا، دیارە بۆ خۆشی مسوڵمان نیەو گەردنکەچی ئایینی خوا نیە.

بەکورتیی: بەپێی ئەم فەرموودەیە (دڵ) فەرمانڕەوای شاری لەشەو، ئەندامەکانیش کاربەدەست و سەربازنی، ئنجا دیارە سەربازیش بەپێی فەرمانی سەرۆکیان بەڕێوە دەچن، چاک بێ یان خراپ، ئنجا هەروەک چۆن چاکیی و خراپیی سەربازان نیشانەو شایەدی چاکیی و خراپیی سەرۆکیانە، چاکیی و خراپیی ئەندامەکانی لەشیش، سەبارەت بە دڵ بەهەمان شێوە.

وەک گوتیشمان: دڵ نشینگەو بارەگای بڕواو خواناسییەو، ئەندامەکانیش هۆو ئامرازی کردەوەکانن، جا چ حوکمێک دڵ و ئەندامەکان بگرێتەوە، بڕواو کردەوەکانیش دەگرێتەوە، کەواتە؛ بڕوایەک نەبێتە هۆی هێنانەدی کردەوان و خاوەنەکەی بەرەو خوا نەجوولێنێ، بەبڕوایەکی (هەر بەناو بڕوا) دادەنرێ و، وەک گوتمان لە تەرازووی بەرنامەی خوادا سەنگ و کێشی نیە.[1]

بەم ئەندازەیەش واز لەم باسی (پلەو پایەی بڕوا بەخوا بوون) دێنین و دەچینە سەر باسی سێیەم.



---

(١) لەکتێبی: (پوختەیەک دەربارەی ئیسلام)یشدا لەوبارەوە شتێک باسکراوە، بڕوانە: (تەفسیری ئایەتی پێنجەم) گەوهەری شەشەم (بڕواو کردەوە لێک جوێ نابنەوە) لاپەڕە ١٩٦-٢٠٤ چاپی یەکەم، شایانی باسیشە کە ئەم کتێبە چاپی دووەمیشی کراوەتەوە لە لایەن نووسینگەی تەفسیرەوە ساڵی (٢٠٠٦).




# ڕێگەی پەیدابوون و فراژوو بوونی بڕوا

## دەستپێك

**خوێنەری خۆشەویست!**

هەرچەندە بڕوا بەخوا بوون و خواناسیی، شتێکی خوارِسک و چەسپاوە لە سروشتی ئینسانداو، حەوجێی پەیداکران نیەو، خوای پەروەردگار بە لوتف و بەزەیی خۆی هەروەک چۆن هەرکام لە هەستی (ڕاستیی خوازیی)و (جوانیی خوازیی)و (چاکەخوازیی) لەگەڵ سروشت و کەسایەتی (شخصية)یدا تێک هەڵشێلاون، (هەستی ئایین خوازیی و خواویستیی)یشی بەهەمان شێوەو بگرە قووڵتریش، کردۆتە یەکێک لە بنچینەو شادەمارەکانی سروشت و کەسایەتیی ئینسان[1].

هەڵبەتە هەرواش لە خوای کاربەجێو میهرەبان چاوەڕوان دەکرێ و، هیچ ڕێی تێناچێ خوای دادگەرو بەخشندە، بەندەکانی بە شێوەیەک بخوڵقێنێ کە نەتوانن بە سێنایی پەی پێ بەرن و بیناسن، بەڵێ جا هەرچەندە بڕوا بە خوا بوون، شتێکی خوارِسک و داخوازییەکی بنەڕەتی و ڕەسەنی سروشت و

---

(١) لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا، ئەم باسە بە فراوانی توێژراوەتەوە لەژێر سەرباسی {سروشت (فطرة) یەکەمین پاڵنەری مرۆڤە بەرەو خواناسیی}دا.

دڵ و دەروونی ئینسانە، بەڵام خوای کاربەجێ بە مەبەستی پێ تاقیکرانەوەی مرۆڤ، ئەم هەستە مەعنەوییە پاکەو داخوازییە دەروونییە چاکەی، وا خوڵقاندوە کە باردودۆخە نەگونجاوەکان و، هەل و مەرجە ناتەواوەکان، بتوانن کاری تێ بکەن و لە گەشەو فراژووبوونی بخەن و، تەنانەت هەندێک جاران تەواو کپی بکەن و پەکی بخەن.

جا ئێمە کە دەمانەوێ لەم بەندەدا سەبارەت بە ڕێگاو چۆنیەتی پەیدابوون و گەشەکردن و فراژووبوونی بڕوا بە خوا بوون، بدوێین، مەبەستمان لە (پەیدابوون)ی بڕوا بە خوا بوون، ئەوە نیە کە لە نەبوون (عدم) ەوە پەیدا دەبێو سەر هەڵدەدات، چونکە وەک گوتمان بڕوا بەخوا بوون، پێکهێنەرو داخوازییەکی سروشتی و بنەڕەتییە لە کەسایەتی ئینساندا، بەڵکو مەبەستمان پەیدابوونێکی واقیعیی و کاریگەرو بەرهەمدارە، پەیدابوونێک کە دڵ و دەروونی مرۆڤ، وەک گۆمێکی مەندو وەستاو دەشڵەقێنێ و، بەرەو پەرستن و یادکردن و فەرمانبەریی پەروەردگار دەیحووڵێنێ، بە واتایەکی دیکە: مەبەستمان لەو (پەیدابوون)ە، بەجێهێشتنی قۆناغی کپکراویی و پەککەوتەییە، بۆ قۆناغی جووڵێویی و کردەوەیی و گەشەکردوویی.

چونکە لەڕاستییدا بڕوا بە خوا بوونێک مرۆڤ ڕانەتەکێنێ و، لەخەوی هەڵخزاویی و بێئاگایی وەخەبەری نەهێنێ و، لە بیابانی گەرم و ئیشکی تاوانباری و لە دەشتی قاقڕوبێڕوونی بەد ئاکاریی دەرینەهێنێ و، بە لەباری دەستی نەگرێ و بەرەو کانیاوو سەرچاوەی ڕوون و سازگاری گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی نەیهێنێ، هەر بە ناوو بە ڕواڵەت، بڕوا بە خوا بوونەو، لە واقیعدا نەبوو (معدوم)ێکی هەڵگری دروشمی بوونە.

ئێستاش دەچینە لای قورئانی بەپێزو خاوەن ڕێز و، لەبەر تیشکی چەند ئایەتێکیدا (ڕێگای پەیدابوون و فراژوو بوونی بڕوا بەخوا بوون) دەتوێژینەوە:

خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾﴾ (آل عمران: ١٩٠-١٩١).

واتە: بەڕاستی لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی-بوونەوەر- و هاتن و چوونی شەوو ڕۆژاندا، نیشانەی زۆر هەن-لەسەر بوونی خوا- بۆ خاوەن عەقڵێن، ئەوانەی بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خوا دەکەن و، بیر لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوەو، دەڵێن: پەروەردگارمان! ئەم-بوونەوەر-ەت بەبەلاش نەخوڵقاندوە، پاکیی بۆ تۆ، جا لە سزای ئاگر چەپاڵەمان بدە.

جا ئێستا با وێکڕا سەرنجێکی وردو ژیرانە لەم دوو ئایەتە بدەین:

وەک دەبینین خوای بێوێنە لە ئایەتی یەکەمدا، بێپێچ و پەنا ڕای دەگەیەنێ، کە هاتنەدی و دروستکرانی بوونەوەر، نیشانەو بەڵگەی زۆری تێدا هەن لەسەر ئیسپاتی بوونی خوا، بەڵام بۆ هەموو کەس نا، بەڵکو بەس بۆ خاوەن عەقڵێنی هۆشیار.

ئەم ئایەتە بەهێزە بە سێنایی لێی دەفامرێتەوە کە ئەگەر گریمان کەسێک هەبێ، تەڕایی بڕوا بە خوا بوونی لە دەروون و هۆشدا نەبێ، ئەگەر بێت و خاوەنی ژیریی و لێکدانەوە بێ، یەکسەر دروستکرانی بوونەوەر ناچاری دەکات بڕوا بە بوونی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاری بهێنێ[1]، واتە؛ سەرنجدانی بوونەوەر بە ژیرانە، ڕێگەی پەیدابوونی بڕوا بە خوا بوونەو، نیشانەکانی بوونەوەر-واتە دیاردە ڕێک وپێکە سەرسام کەرەکانی- سەرچاوەی هەڵقوڵینی بیری (خواناسیی)ین.

---

(١) لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا لەژێر سەرباسی (عەقڵ دووەمین پاڵنەری مرۆڤە بەرەو خواناسیی)دا، بە تێروتەسەلی ئەو باسە توێژراوەتەوە.

ئنجا لە ئایەتی دووەمدا ڕاگەیەندراوە، کە هەر کاتێک بەهۆی سەرنجدان و تێوەڕامانی دیاردە ڕێک وپێک و پڕ وردەکارییەکانی بوونەوەرەوە، خواناسیی و بڕوا بە خوا بوون لە دڵ و مێشکی ئینساندا چەسپا، وەک بەرهەمێکی سروشتی و ئەنجامێکی ژیربێژییانە، یادکردن و لەگەڵ خوا بوون لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا پەیدا دەبێت، بە واتایەکی دیکە؛ یادکردن و ڕازو نیاز لەگەڵ خوا دەربڕین و پاڕانەوە، ئاوی زوڵێڵ و شیرینی سەرچاوەی بیری بەرزو پیرۆزی بڕوا بەخوا بوونە، واتە؛ مەحاڵە ئینسان بەڕاستی خوای بەرزی ناسیبێ و بڕوای پێی بێو، لە هەموو حاڵەتە جۆراو جۆرەکانی ژیانیشیدا بە دڵ و زمان یادی نەکاو داوای لێنەکات و لێی نەپاڕێتەوە.

ئنجا دوای ئەوەی ڕایگەیاند کە کەسانێک کە لەڕێی تێوەڕامان و سەرنجدانی نیشانەکانی بوونی خواوە، گەیشتوونە ناسینی خوا، یادی ئەو خوایە دەکەن و ڕازو نیازی بەندایەتی لەگەڵ دەکەن، ڕایدەگەیەنێ کە ئەمجارە لە ئەنجامی یادی خوا کردن و لەگەڵ خوا تێکەڵ بووندا[1]، پەردەی سەر مێشک و دڵیان پتر لادەچێو، وردەوردە خوای بەرزیان زیاتر خۆش دەوێ و، شیرنایەتییان پێیدا دەچێ.

بەڵێ کە لە ئایەتی یەکەمدا بەس فەرمووی: خاوەن هۆش و عاقڵەکان نیشانەو بەڵگەکانی بوونی خوا لە بوونەوەردا دەبینن، ئەمجارە دەیخاتە ڕوو؛ کە هەتا ئێستا بەس خاوەن عەقڵ بوون، بەڵام ئەمجار لەسایەی یادی خواوە بوونە خاوەن دڵیش و، بە چاوی دڵی ڕێژراو بە کلی یادی خوا، لە بوونەوەر ڕادەمێنن و سەرنجی دەدەن، بەڵام تێوەڕامان و بیرکردنەوەی ئەمجارەیان وەک هی پێشوو، بەمەبەستی سەلماندنی بوونی خوا نیە، چونکە لە ئەنجامی

---

(١) ئاشکراشە کە مەبەست لە (لەگەڵ خوا تێکەڵ بوون) زۆر لەخوا نیزیک کەوتنەوەو سەرگەرم بوونی بەندایەتیی بۆکردنی و فەرمانبەریی بۆ کردنیەتی، نەک شتێکی دیکەی وەک ئەو قسە پووچ و (شطحات)ە نەفامانانەیەی کە هەندێک لە ئەهلی تەصەووف بەناوی (وحدة الوجود)ەوە دەیانکەن، بۆ وێنە (حلاج)و (ابن عربي) و (ابن سبعين).

بیرکردنەوەو تێفکرینی جاری پێشوودا، بونی خوای بەدیهێنەریان لەلا بوو بە شتێکی ڕوون و سەلمێنراو، بەڵکو تێوەڕامان و سەرنجدانی ئەمجارەیان، بە مەبەستی پتر ناسینی خواو لێ نیزیک بوونەوەیەتی.

بەڵێ جاری یەکەم بەهۆی بەکارهێنانی ژیرییەوە، گەیشتنە ئەنجامی (دان بە بوونی خوادا هێنان)، ئنجا ئەو بڕوا بەخوا بوونە «مەبەستم لە وشەی (بڕوا بەخوا بوون) لە هەموو ئەو شوێنانەدا ئیمانی شەرعیی نیە، بەڵکو مەبەستم دان هێنانە بە بوونی خواو بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی خوادا» پاڵی پێوەنان کە پەیوەندییەکی گەرم و بەتین لەگەڵ خوادا ببەستن، بەهۆی یادکردنییەوەو، لە جاری دووەمدا لەڕێی بەکارهێنانی دڵ (قلب)ەوە (ئەو دڵەی کە بەیادی خوا ڕووناک و شوعلەوەر بووە) دەیانەوێ بگەنە ئەنجامی (خواناسین) بەهۆی پەی بردن بە هۆو حیکمەتی دروستکراوەکانەوە.

ئێستاش خوێنەری خۆشەویستم!

وەک دیتمان قورئانی بەپێزو خاوەن ڕێز، بەس لەنێو دوو توێی دوو ئایەتاندا توانی هەم ڕێگەی بڕوا بەخوا بوون و، هەم ڕێگەی پێهەڵیچوون و فراژووبوونی بڕوا بخاتە ڕوو.

بەڵێ لە ئایەتی یەکەمدا ڕوونی کردەوە، کە مرۆڤ دەتوانێ لەڕێی تێوەڕامان و سەرنجدانی دیاردەکانی بوونەوەرەوە، کە هەر یەکێکیان نیشانە (آية)یەکە لەسەر ئیسپاتی بوونی خوا، بگاتە ئەنجامی (بڕوا بە خوا هێنان).

لە ئایەتی دووەمیشدا خستیە ڕوو، کە یادی خواو تێکەڵ بوون لەگەڵ خوا بەرهەمی بڕوا بە خوا بوونەو، ڕوونی کردەوە: کە ئینسان بەهۆی یادی خواوە-واتە بەهۆی بەسەر دڵ و زماندا هێنانی ناوو سیفەتە بەرزەکانی-و بەهۆی تێوەڕامان و وردبوونەوەوە لە بوونەوەر، دەتوانێ بڕوایەکەی فراژوو بکات و پێهەڵیی بەرێ و بگاتە پلەی خواناسین (معرفة الله).

پوختەی قسان ئەوەیە کە لەڕێی ژیرییەوە (ژیرییەک کە ئەرکی سروشتیی خۆی کە تێوەڕامان و سەرنجدانە ئەنجام بدات) ئینسان دەتوانێ پەی بە بوونی خوای بەدیهێنەر بەرێو، بڕوای پێ بهێنێو بگاتە قۆناغی بڕوا بەخوا بوون (الإیمان بالله)[1]و، لەڕێی دڵەوە (دڵێک کە ئەرکی سروشتیی خۆی کە یادی خواو لەگەڵ خوا بوونە جێبەجی بکات) ئینسان دەتوانێ لە قۆناغی بڕوا بەخوا بوونی ڕووتەوە هەڵکشی بۆ قۆناغی ناسینی خوا (معرفة الله).

بەڵام ئەوەندە هەیە بەکارهێنانی دڵیش بۆ ناسینی خوا (عز وجل) واتە یادی خوا کردن و ڕازو نیاز دەربڕین و پاڕانەوەو، لەگەڵ خوا تێکەڵ بوونەکەش، نابێ بە شێوەیەکی هەڕەمەکیی و لام سەللایی بێ، بەڵکو پێویستە ژیریی (عقل)و لێکدانەوەو بیرکردنەوە لە میشدا دەستی هەبێو، دەوری چاودێرو مشورخۆر ببینێ، دەنا ئەو یادی خوا (ذکر الله)یەی کە لەژێر تیشکی ژیریی و بیرکردنەوەیەکی ڕاستدا بەڕێوە ناچێ، چاوپۆشیی لەوە بکە کە هیچ بەرهەمێکی باشی نابێ، بەڵکو (وەک مێژوو و بەسەرهاتی دەیان فەیلەسووف و سۆفیی و دنیا بەکەمزان شایەدە) ئینسان بەرەو هەڵدێری هەزار بەهەزاری چەندان تێڕوانین و بیروبۆچوونی هەڵەو خەیاڵیی و ئەفسانەیی دەبات، هەر بۆیەش لە ئایەتی دووەمدا دوای ئەوەی باسی ئەوە کراوە، کە ئەوانەی لەئەنجامی سەرنجدانی بوونەوەرەوە گەیشتوونە قەناعەتی بڕوا بە خوا بوون، بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خوا دەکەن، دوای ئەوە یەکسەر فەرموویەتی: [وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ].

---

(١) وەک پێشتریش گوتم، مەبەست لە بڕوا بە خوا هێنان (الإیمان بالله) لێرەدا بڕواهێنانە بە بوون و پەروەردگاریتیی خوا، واتە مەبەستم دان هێنانە بە بوونی خوادا، بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی بوونەوەرو کائینات.

ئنجا لێرەدا تێبینییەکی گرنگ هەیە نابێ لێی بێهەواڵ بین:

هەرچەندە بۆ پەی بردن بە بوونی خوا، بەس پێویستیمان بە عەقڵێکی ساغ هەیە، کە ئەرکی سەرنجدان و بیرکردنەوە بەڕێوەبەرێ و، هیچ حەوجێی ئایین نین، بەڵام بۆ ناسینی خوا، بەپێچەوانەوە، بەبێ گوێبیست بوون و پابەندیی بە ڕێڕوونییەکانی ئایینەوە، ڕیسەکەمان لێ دەبێتەوە خوریی و، هیچمان بۆ بەهیچ ناکرێ[1].

بەڵێ لە قۆناغی پەیبردن بە بوونی خوادا، ژیریی بەسە، چونکە لەم قۆناغەدا ئینسان لەگەڵ شتێکدا ڕەفتار دەکات، کە لە سروشتییەوە نزیکەو پێی ئاشنایە، چونکە هەرکام لە ئینسان و بوونەوەر دروستکراوو بەرهەستن، بەڵام لە قۆناغی ناسینی خوادا، ژیریی، دەستەوستانەو ناچارە پەنا بەرێتە بەر دڵ، وێڕای ئەمەش هەرکام لە دڵ و ژیریش، ئەگەر بێت و پابەندی ئایین نەبن و، بەپێی ئامۆژگاریی و ڕێڕوونییەکانی بەڕێوە نەچن، زوو بۆیان دەردەچێ و، سەریان بە فەتارەت دەچێ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ژیریی هەرچەندە توانادار بێ، تواناو دەستەڵاتەکەی لە جوغزی جیهانی ماددە بەولاوە نیەو، دڵ و گیانیش هەرچەندە شتێکی مەعنەویی و ناماددیی بێو لەسەرووی ماددەوە بێ، لە ئاکامدا هەر یەکێکە لە دروستکراوانی خوا، قەت قەت دروستکراویش توانای وەک پێویست ناسینی خوای بەدیهێنەری نیە، لەبەرئەوەی سنووردار (محدود)ە، خواش لە هەموو ڕوویەکەوە بێسنوور

---

(١) لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتدا) لە پێنج دەرساندا بە درێژیی و بە تێرو تەسەلیی، مەسەلەی تیۆری زانین (نظرية المعرفة)مان ڕوون کردۆتەوە، سنوورو توانای پەیبردن و شت زانینی هەرکام لە پێنج هەستەکان (الحواس الخمس) و عەقڵ و دڵ و، پاشان وەحییمان زۆر چاک خستۆتە ڕوو، بڕوانە بەرگی دووەم، {خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریتی دا}.

هەروەها لە مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا) کتێبی یەکەم و، لەمەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)یشدا قسەی باشمان لەوبارەوە کردووە.

(لا محدود)ە، شتی سنوورداریش، توانای وەخۆگرتنی شتی بێسنووری نیە، بۆ وێنە: قەت پەرداخێک ناتوانێ هەموو ئاوی دەریایەک لەنێوخۆیدا بحەجمێنێو جێی بکاتەوە.[1]

کەواتە هەرکەسێک بیەوێ خوا بناسێ، واتە بیەوێ پەی بە سیفەتە بەرزو بێسنوورەکانی خوا بەرێو، لە حیکمەت و هۆی دروستکرانی بوونەوەر سەر دەربەرێ، دەبێ بیروهۆشی بە تێوەڕامان و سەرنجدانی بوونەوەرو، دڵ و زمانی بە یادی خواوە سەرگەرم بکات، بەڵام لەبەر تیشکی ڕێڕوونییەکانی بەرنامەی خوادا، نەک بە شێوەیەکی بەرهەڵدایی و بێسەروبەر.

ئێستاش بەر لەوەی ئەم باسە بەجێ بهێڵین، وای بەچاک دەزانم لە چەند خاڵێکدا بەکورتیی نێوەڕۆکەکەی دووبارە بکەمەوە:

١- چاکترین و گشتیترین ڕێی بڕواهێنان بە بوونی خوا، بریتیە لە بەکارهێنانی ژیریی، لە سەرنج دان و تێوەڕامانی دیاردە ڕێک وپێکەکانی بوونەوەردا.

بۆیەش دەڵێم: (گشتیترین) چونکە ئینسان دەتوانێ لە ڕێی کتێبی خوێنراوە (الکتاب المقروء)شەوە، کە قورئانی بەڕێزە، پەی بەبوونی خوا بەرێ، بەڵام:

١- کتێبی بینراو (الکتاب المنظور)ی بوونەوەر، بەرچاوترو سەرنج ڕاکێشترە.

٢- کتێبی بوونەوەر هەموو کەس دەتوانێ بیخوێنێتەوە، بەڵام کتێبی قورئان، تایبەتە بەکۆمەڵێکی دیاری کراوەوە، کە خوێندەوارو شارەزایانن.

٣- بەدەگمەن ڕێ دەکەوێ کەسێک بڕوای بەخوا نەبێ (قورئان) سەرنجی ڕابکێشێ، چونکە لە سۆنگەی ئەوەوە کە بە زادەی خوای نازانێ، هیچی گرنگی پێوە شک نابات، بەڵام (بوونەوەر) سەرنجی هەموو کەس ڕادەکێشێ، جا کەم یان زۆر.

---

(١) دیارە لێرەدا مەبەست وێچواندن (تشبیە) نیەو، تەنیا نیزیکخستنەوە(تقریب)مان مەبەستە، گوتراویشە (المثل یضرب ولا یقاس).

کەواتە ڕاستە کتێبی بوونەوەرو خوێندنەوەو پێئاشنابوونی، ڕێیەکی گشتیترە بۆ خواناسیی.

٢- هەر بیروهۆشێک بەراستی گەیبێتە قەناعەتی تەواو، لە بڕواهێنان بەبوونی خوادا، خاوەنەکەی هان دەدات کە پەیوەندیی خۆشەویستیی و بەندایەتیی لەگەڵ خوادا پەیدا بکات و، لێی وەپاڕێو یادی بکات و بیپەرستێ.

٣- کە تێوەڕامان و وردبوونەوە لە نیشانەکان (آیات)ی بوونەوەر، ڕێگای پەیدابوونی بڕوا بە خوا بوونە، ئەو پەیوەندییە دڵییەش، کە بەرهەم و ئەنجامی بڕوا بەخوا بوونە، لەزۆر شتاندا خۆی دەنوێنێ، بەڵام یادی خوا، زەقترین دروشم و نیشانەیەتی، تاقە ڕێی فراژوو بوون و پێهەڵچوونییەتی.

٤- دوای ئەوەی ئینسان لەژێر چاودێریی ژیرییدا، دڵ و دەروونی و زمانی سەرگەرمی یادی خواو، بیروهۆشیشی سەرگەرمی موتالێو تێفکرینی بوونەوەر دەکات، دەتوانێ لە قۆناغی بڕوا بەخوا بوونەوە، بگوازێتەوە بۆ قۆناغی ناسینی خوا، واتە قۆناغی ناسینی سیفەتە بەرزو بێسنوورەکانی، کە پەیبردن بەوەی؛ خوا ئەم بوونەوەرەی بێحیکمەت و هۆ نەخوڵقاندوە، لە هەموو شتێک پتر ئەو خواناسینەی تێدا دەدرەوشێتەوە: [رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا].

٥- کەواتە ژیریی لەهەردووک قۆناغەکەی بەرەوخوا چووندا، شوێنپەنجەی دیارە، ئەوەندە هەیە لە قۆناغی یەکەمدا، بەتەنیایە، بەڵام لە قۆناغی دووەمدا پلەی پێشڕەوایەتیی، دەداتە ئەو دڵەی کە بە یادی خوا بێداربۆتەوەو شوعلەوەر بووە، چونکە ژیریی لە سنووری قۆناغی یەکەم بەولاوە، مەودای ڕۆیشتنی نیەو، ناچارە ئەرکی پێشڕەوایەتیی لە گۆڕەپانی بەرەوخوا چوون (السیر إلی الله)دا، بە ڕابەرێکی لەخۆی لێهاتووترو چاوساغتر بسپێرێ، کە دڵەو، بۆ خۆی ببێتە شوێنکەوتوو (تابع)ی وی و، دەوری یارمەتیدەر ببینێ.

٦- هەرچەندە ئینسان لە قۆناغی پەیبردن بە بوونی خوادا سەری لە ئایین ناوەستێو پەکی لەسەری نەکەوتوە، بەڵام لە قۆناغی فراژووکردن و پێهەڵێبردنی بڕواو، گەیشتن بە پلەی خواناسین (معرفة الله)دا، نە ژیریی و نەدڵ، بەبێ گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی ڕێڕوونییەکانی خوا، ناتوانن بەهیچ ئەنجامێکی چاک بگەن.

٧- کەواتە ئەگەر ئینسان بیەوێ بگاتە قەناعەت و دڵنیایی، لەوەدا کە ئەم بوونەوەرە بەدیهێنەرو پەروەردگارێکی زاناو توانای هەیە، ژیریی بە تەنێ دەتوانێ ئەو ئامانجەی بۆ وەدەست بهێنێ، بەڵام ئەگەر بیەوێ بڕوایەکەی پێهەڵێتر بەرێو گەشەی پێ بدات و، لە قۆناغی قەناعەتی ژیرییانەی ئیشک و ڕووت بیگوازێتەوە، بۆ قۆناغی خۆشەویستیی و بەندایەتیی و فەرمانبەریی و پەیوەندییەکی دەروونیی پڕ سۆزی گەرم و بەتین، وێڕای ژیریی حەوجێی دڵیش و ڕێڕوونیی خوای پەروەردگاریشە.

کەواتە کاکڵی مەبەست ئەوەیە کە؛ عەقڵ ناتوانێ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوادا ببەستێ و بیناسێ، چونکە عەقڵ زیاتر ئاشنایەتی لەگەڵ دیاردە بەرهەستەکاندا هەیە، بەڵام عەقڵ دەتوانێ لەرێی شوێنەوارەکانی خواوە، پەی بە بوونی بەرێ و پەیوەندییەکی ناڕاستەوخۆ (غیر مباشر) لەگەڵ خوادا ببەستێ، بەڵام ئینسان دەتوانێ لە ڕێی دڵ و دەروونەوە، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ (مباشر) لەگەڵ خوادا پەیدا بکات، بەمەرجێک یارمەتی لە عەقڵ وەربگرێ و خۆ بەسەر نەبێ و، بەگوێرەی ڕێوشوێن بۆ دانانی خواش بەرێوە بچێ، هەربۆیەش دەبینین مرۆڤ دەتوانێ پڕ بەدڵ، خوای خۆی خۆش بوێو، بەچاوی دڵ و گیان لە جوانیی و هەیبەت (جمال وهیبة)ی خواوە ڕابمێنێو، بە هەموو بوون (وجود)ی تام و چێژێکی مەعنەویی بەرز لە پەرستن و یادکردنی وەربگرێ، وەک خوای خۆشەویست و بێوێنە فەرمووویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾ (البقرة- ١٦٥).

واتە: ئەوانەی بڕوایان -بەخوا- هێناوە، خۆشەویستییان زیاترە سەبارەت بە خوا-ی خۆیان لە خۆشەویستیی هەرکەسێکی دیکە، سەبارەت بە پەرستراوەکەی-.

بەڵێ خۆشەویستیی هەبوونی بەندە دەربارەی خوا، لە چەندان ئایەت و فەرمووددەدا بێپەردە ڕاگەیەنراوە، بێگومان خۆشەویستی (محبّة)یش کارێکە دڵ و دەروون پێی هەڵدەستێو، یەکسەر پەیوەندییشی بەخواوە هەیە، کەواتە مرۆڤ بەدڵ و دەروون دەتوانێ یەکسەرو ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بەخواوە ببەستێ.

بەڵام ئەوپەڕی توانای عەقڵ ئەوەیە کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، لەڕێی شوێنەوارو دروستکراوەکانەوە پەیوەندی لەگەڵ خوا ببەستێ، دە فەرموو سەرنجی جیاوازیی نێوان ئەم دوو ڕستەیە بکە:

[وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبّٗا لِّلَّهِۗ] [وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ].

لە یەکەمیاندا ڕاستەوخۆ خۆشەویستیی-کە بەرهەمی دڵە- بەخواوە بەستراوە، بەڵام لە دووەمیاندا بیرکردنەوە-کە بەرهەمی ژیرییە- بە دروستکراوەکانی خواوە بەستراوە، هەر لەبەر ئەوەشە (لەبەر ئەوەی عەقڵ ناتوانێ ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بەخواوە ببەستێ).

کەواتە: ئینسان دەتوانێ لەڕێی عەقڵەوە بڕوایەکی بەڵگەیی (إيمان بُرهاني) وەدەست بێنێ، بەڵام ئەگەر بیەوێ ئاستی بڕوایەکەی بەرز بکاتەوەو فراژووی بکات و، بیکاتە بڕوایەکی وا کە هەست بە دیتن و ئامادەبوونی خوا بکات، واتە بڕوایەکەی ببێتە بڕوایەکی دیتەنیی (إيمان شهودي) دەبێ لەڕێی دڵ و دەروونەوە هەوڵی وەدەست هێنانی ئەم جۆرە بڕوایە بدات.

جا دیارە ئەم باسە هەویرێکی ئاو هەڵگرەو، لە باسی داهاتوومان دا بەناوی (چاکترین ڕێی بەرەو خوا چوون و بەخوا گەیشتن) تەواوی دەکەین- إن شاء الله-.




# چاکترین ڕێی بەرەو خواچوون و بەخوا گەیشتن

## دەستپێك

خوێنەری خۆشەویست!

لە کۆتایی باسی (ڕێگای پەیدابوون و فراژوو بوونی بڕوا)دا گفتمان دا، کە ئەگەر خوا (جل جلالە) بیەوێ، پتر تیشکی لێکۆڵینەوە باوێینە سەر ئەو باسەو، زیاتر بیتوێژینەوە، جا وا ئێستا بە یارمەتی خوا گفتەکەمان دەبەینە سەرێ:

هەر لەکۆنەوە ئینسان لە بەرەو خوا چوون و بەخوا گەیشتنیدا، دوو ڕێی گرتوون؛ ڕێی یەکەمیان کە فەیلەسووفەکان سەرقافڵەنی، بریتیە لە ڕێی عەقڵ، جا ژیریی (عەقڵ) پێنج هەستەکانی کردوونە تۆڕو شەداوو، لەڕاوکردن و گرتنی نێچیری ڕێک وپێکی و وردەکاریی نێو بوونەوەری خستوونە کار.

واتە: لەم ڕێی یەکەمەدا، ژیریی وەک شاژنەهەنگ (ملکة النحل) مێشەهەنگوینەی پێنج هەستەکانی لە باغی ڕازاوەی گوڵزاری سەرسوڕهێن و پڕ وردەکاریی بوونەوەر بەرداون، ئەوانیش لەهەر گوڵێک کە وەبەر پەلیان

کەوتبێو دەستیان وێڕا گەیبیێ، تام و بۆن و شیلەیەکی خۆشیان مژیوەو، دوایی هێناویانەتەوە نێو شانەی مێشک، شاژنی ئاوەزیش(١) بە یارمەتی بەردەست و دەست و پێوەندەکانی، چەندان شانە هەنگوین-بەڵگە-ی لێ دروست کردوە، کە شیفاو چارەی سەدان دەردی گومان و دوودڵیی پێوەیە.

ڕێی دووەمیشیان کە عاریف و سۆفییە لێهاتوو و ڕەسەنەکان سەرقافڵەنی، بریتیە لە ڕێی دڵ، ئنجا دڵ (قلب) لەڕێی یادی خواو ڕازو نیازو لێپاڕانەوەو، بۆ لا گەڕانەوەو کڕنووش بردن و چەمانەوەو، پاککردنەوەی دەروون لە سیفەتە بەدە ئاژەڵیی و شەیتانییەکان و، ڕازاندنەوەی بە خەسڵەتە بەرزە فریشتەییەکانەوە، کارێکی وای کردوە، کە بتوانێ ببێتە ئاوێنەیەکی سپی و ساف و بێگەرد و، تیشکی پرشنگداری زاتی بێوێنەو سیفەتە بەرزو بێسنوورەکانی خوای بەرزو پاک و چاکی تێدا دەربکەون و، هەورو تەم و مژی گومان و دوودڵیی لەسەر بڕەوێو، لە بن باڵی بەزەیی و میهرەبانیی خوای خۆیدا، ئۆخژنی بێو دابمرکێو بسرەوێ.

ئنجا ئێمە خوای بەرزو مەزن ڕاست بێنێو، لوتف و بەزەیی بنوێنێو، بارانی (فیض)ی برژێنێ، پێشەکی بە شێوەیەکی گشتی باسی سروشت و چۆنییەتی و جیاوازیی، نێوان هەردووک ڕێیەکان دەکەین، دوایی بەشێوەیەکی جوداو سەربەخۆ باسی هەرکام لەو دوو ڕێیە دەکەین و، لەکۆتایی خستنەڕووی هەرکامێکیشیاندا، لە بێژنگ دان و ڕەخنەو هەڵسەنگاندنی خۆمان دەخەینە ڕوو، ئنجا لە کۆتاییدا چاکترین و ڕاسترین ڕێ-کە پەسندی دەکەین و هەڵیدەبژێرین، لەبارەی بەرەو خوا چوون و خواناسییەوە- ڕوون دەکەینەوە.

(ئیمام غەززالیی) خوا لێی ڕازی بێ، سەبارەت بە سروشت و چۆنیەتیی و جیاوازیی نێوان ڕێی عەقڵ و ڕێی دڵ بەرەو ناسینی خوا، وێنەیەکی دڵگیری هێناوەتەوە، ئێمەش بە نەختە دەستکارییەکەوە لێی دەخوازینەوە، دەڵێ:

---

(١) ئاوەز؛ عەقڵ: بیروهۆش.

ئەگەر بمانەوێ چاڵێکی هەڵقەندراو پڕ بکەین لە ئاو، دوو ڕێ هەن:

١- یەکێکیـان ئەوەیـە کـە لـە ڕێگای جۆگەیەکەوە ئـاوی بـۆ هەڵبەستین و پـڕی بکەیـن.

٢- دووەمیـان ئەوەیـە کـە چاڵەکە قووڵتر بکەیـن، هەتـا ئەو ئاوەی کـە لەچینی بنـەوەی زەوی دایـە هەڵدەقوڵێ و پڕ دەبێ.

هەڵبەتـە ئـەو ئاوەی کـە بـەم ڕێگای دووەمیـان دەستگیر دەبێت، سـاف و بێگەردتـر دەبێـو، جـاری وایـە پتریـش و بـەردەوام تریـش دەبێ.

ئنجـا (دڵ) وەک چاڵەکـە وایـەو، زانیارییـش وەک ئاوەکەیـە، پێنـج هەستەکانیش وەک جۆگەکە وان، ئنجا دەتوانیـن حـەوزی دڵ، لەڕێـی جۆگەی هەسـتەکانەوە، پـڕ بکەیـن لـە زانیاریـی و، دەشـتوانین لەڕێـی پاککردنـەوەو خاوێنکردنـەوەی حـەوزی دڵـەوە، لـە قـوڕو قـاڵ و خشـپ و خـاڵ و ژەنـگ و ژاری خەسـڵەتە بـەدە ئاژەڵیـی و شـەیتانییەکان، کارێکـی وا بکەیـن، کـە دڵ ببێتـە کانگـەی کانیـاوو سـەرچاوەی زانیاریـی هەمەجۆر[١].

دەتوانیـن خـوای بێوێنـەو میهرەبان، بـە ڕۆژێکی تیشکدەر دابنێنین (بێگومان بـە مەبەسـتی لـێ حاڵـی بـوون)و دڵـی مرۆڤیـش بـە ئاوێنەیـەک بچوێنیـن، هەڵبەتـە هەتـا ئاوێنەکـە سـاف و ڕوونتـر و بێگەردتـر بـێ، چاکتـر دەتوانـێ تیشـکی ڕۆژەکـە لەخۆیـدا عەکـس بکاتـەوە، بەهـۆی ئەوەشـەوە شـوعلەوەرو دروشـاوە بێ، بەڵام ئەگەر بێت و ئاوێنەکە، تۆزو خۆڵێویـی و تەڵخ و چڵکـن بـێ، دیـارە خۆرەکـەی تێـدا دەرناکـەوێ و، ئەگـەر گریمـان دەریـش کـەوت، بەشـێوەیەکی کـەم وکـورت و ناتـەواوو شـێواوو گەچلێـو دەردەکـەوێ، خـۆ ئەگـەر بێـت و ئینسـان زۆر پشـتی لـە خـوا کردبـێ و، شـەیتان بـە دەروونـی فێربووبـێ و بـە تیـری دنیاپەرستیی، چـاوی دڵـی کوێـر بووبـێ، ئـەوە دڵـی لـەوە

---

(١) بڕوانە: (إحياء علوم الدين) ب٣ ل٢٠،٢٢ أبي حامد الغزالي.

دەشۆرێ کە بە ئاوێنە بچوێنرێ، چونکە لە حاڵێکی وادا، دڵ و دەروونی ئەو جۆرە ئینسانە، وەک کەستەکە گڵێک، یان لەتکە سواڵکێکی لێدێ و، ناتوانێ تروسکاییەک لە تیشکی ئەو ڕۆژە مەزن و بەرزە، لەخۆیدا عەکس بکاتەوەو، خۆی پێ شوعلەوەر بکات.[1]

بەڵێ دڵ و دەروونی ئینسان و گیان (روح)ی ئینسان، بەو سەرچاوەیە ئاشنایە کە لێیەوە هاتووە، ئەو پەروەردگارە دەناسێ کە خوڵقاندوویەتی، بەڵام دڵ و دەروونێک خاوەنەکەی لە قەفەزی شوێنکەوتنی شەیتان و پەرستنی هەواو ئارەزووەکانیدا، دیلی کردبێو، چاوی ڕوونی بە چەنگە خۆڵی دنیاپەرستیی پڕ کردبێ، سووچ و تاوانی چییە، کە توانای ناسین و دیتنی خوای پەروەردگاری نەبێ؟!

ئنجا بۆ پتر ناسینی هەر کام لە ڕێی عەقڵ و ڕێی دڵ و، ڕوونبوونەوەی چۆنیەتیی و چییەتی هەرکامیان و جیاوازیی نێوانیان، با نەختێکیش گوێ بۆ کەڵە شاعیری ئیسلامی کوردی زمان (مەولەویی) تاوگۆزیی ڕادێرین، داخۆ لە کتێبی (الفضیلة)دا چ دەڵێ:[2]

| | |
|---|---|
| مِمَّن به لـمن عليـــه يُسْــتَدَلّ | مسافةٌ لا تستظِلّ لا تُســتَزَلّ |
| عـــــليك بالحـــركة السريعة | مِن ذي لذي المرتبة الرفيعة |
| واختر من الصّفّيـن أي صـــفّ | شئتَ ففيه فكّرَنْ أو صَــفِّ |
| فاحفظْ تَفَهَّمْ، ثـم أُنْظُـرْ صَدِّق | علماً فَعَيـناً، ثــم حقاً حَقِّقْ |

واتە:

١) ئەو ڕێیەی کە خوا دەکاتە بەڵگەی بوونی بوونەوەر، {کە ڕێی خاوەن دڵێنە} ماوەیەکی زۆر لە پلەو پایەدا بەرزترە، لەو ڕێیەی کە بوونەوەر

---

(١) لە کۆتایی باسی (ڕێگەی پاک ڕاگرتنی دڵ و پاراستنی بڕوا)دا، بەچەند شێوە تەعبیرێکی جۆراوجۆر ئەو مەسەلەیە ڕوون کراوەتەوە.

(٢) بڕوانە (الوسيلة في شرح الفضيلة)، ل٧٢، الشيخ عبدالكريم المدرس، چ١.

دەکاتە بەڵگەی بوونی خوا، {کە ڕێی شوێنکەوتووانی ژیرییە} مادام وابێ تۆ لەژێر سێبەری درەختی ڕێڕەوانی ڕێبازی ژیرییدا مەسرەوەو، لە ڕێبازی خاوەن دڵێن تەلاسا مەبە[1].

٢) دەی زوو بەخێراییی بڕۆ لەو پلەی نزمی ڕێبازی عەقڵ، بەرەو ئەو پلەی بەرزو بڵێندی ڕێبازی خاوەن دڵێن.

٣) {ئەگەر بەقسەم ناکەی} بۆ خۆت لەو دوو ڕیزانە، ڕیزی عاقڵمەندان و ڕیزی خاوەن دڵێن، کام ڕیزت بەدڵە هەڵبژێرە، ئنجا ئەگەر ڕێبازی ژیریی و بەڵگەهێنانەوە (إستدلال)ت پەسند کرد، ئەوە دەست بکە بە بیرکردنەوە تێوەڕامان، یاخود دەست بکە بە پاک کردنەوەی دەروون و وەشۆق هێنانی دڵ، {ئەگەر ڕێبازی دڵ و یادی خوات پەسند کرد}.

ئنجا شاعیری پایەبەرز ڕووەدەکاتە خوێنەرو داوای لێ دەکات، کە هەردووک ڕێیەکان بکاتە یەک و، پێیان بگاتە پلەکانی یەقین (درجات الیقین)، دەڵێ:

٤) ئنجا ئەو بەڵگانە لە زەینتدا هەڵگرە، کە ڕێڕەوانی ڕێی بەڵگەهێنانەوەو بیرکردنەوە، بۆ ئیسپاتی بوونی خوا بەکاریان دێنن و، لێیان حاڵیی بە، ئنجا بۆ خۆت ڕامێنەو ئەو بەڵگانە بکە بە پەیژەی بەرەوخوا چوونەو، لە ئەنجامدا سەرەتا بڕوا بێنەو، پاشان (علم الیقین) و، دواتر (عین الیقین) و سەرەنجامیش (حق الیقین) وەدەست بێنە!.

کەواتە: (مەولەویی) سەرەتا هەردوو ڕێیەکانی خواناسین باس دەکات، پاشان ڕوو لە خوێنەر دەکات کە بە گرتنی هەردووک ڕێیەکان، هەرسێک پلەکانی یەقین دەستگیر بکات، و دەڵێ:

ئنجا پلەی (علم الیقین) و (عین الیقین) و (حق الیقین) بهێنە دی.

---

(١) تەلاسا مەبە: لامەدە، مەترازێ.

پێناسەی کورت و پوختی ئەوسێ جۆرە زانیارییەش بەم شێوەیە:

(علم اليقين) بریتیە لە زانیاریی هەبوون بە شت، وەک لە واقیعدا هەیە بەهۆی بەڵگەوە.

(عين اليقين) بریتیە لە دیتن و بۆ ئاشکرابوونی شت.

(حق اليقين) بریتیە لەوەی کە ئینسان بەڕاددەیەک بڕوای بە شتێک بێت و بەچاوی دڵ بیبینێ، کە هەمیشە لەبەرچاوی بێ، بەبێ ویستی خۆی وێنەیەک بۆ ڕوونکردنەوەی (علم اليقين و عين اليقين و حق اليقين):

بڕوابوونمان بە بوونی مردن (علم اليقين)ە، دیتنی فریشتەی گیانکێشان (قابج الروح) (عين اليقين)ە، چێژتنی مردن (حق اليقين)ە. بڕوانە (كتاب التعريفات) للجرجاني، ل٤٠، ٦٧، ٦٩.

(ابن البنّا السرّقسطي)یش لە کتێبی (المباحث الأصلية)دا، لەوبارەوە چەند شیعرێکی یەکجار دڵگیری هەن، بۆ پتر ڕوون بوونەوەی مەبەست، دەیانخەینە ڕوو و کورتە شەرحێکیان لەسەر دەکەین:

دەربارەی ڕێی خاوەن دڵێن گوتموویەتی: [1]

| | |
|---|---|
| والقوم في هذا على فرقين | وحكمهم فيه على ضربين |
| ففرقة طـــــريقهم مبنية | على العقائد وحسن النيّة |
| قالوا فإن النفــس كالمِرآة | ينطبع الـماضـي بها والآت |
| وإنما يعوقها أشــــــياء | ترك الـمــحاذاةِ أو الصَّداء |
| قالوا وإن العين قَدْ تغور | وإنما يُخْـــــــرِجُها الحَفيرَ |
| وأجمعوا أن علاج الأصل | أقرب للبئر مـعـــاً والنيل |

---

(١) بڕوانە: (الفتوحات الألهية شرح المباحث الأصلية) للعارف بالله أحمد بن محمد عجيبة، ج١، ص١٢١، ١٢٣، ١٢٤، ١٢٥، کە لەگەڵ کتێبی (ايقاظ الهمم في شرح الحكم) پێکەوە چاپ کراون و (الفتوحات المكية) لەسەر پەراوێزەکەیەتی.

فما إليه أبداً نشـــير    هو علاج النفس والتطهـــير
وهذه طريقة الإشْراقِ    كانت وتبقى ما الوجود باقي

واتە:

**١)** کۆمەڵی خوا ویستان و بەرەو خوا چووان لەڕێی بەخوا گەیشتندا،[١] دوو دەستەن و، لەوبارەوە دوو جۆرە هەڵوێستیان هەن.

**٢)** جا دەستەیەکیان ڕێگەیان لەسەر بنچینەی بیروبڕواو نیازو چاکیی و دڵخاوێنیی دامەزراوە {واتە: بڕوایان وایە کە مرۆڤ بە سروشت خواناس و چاک و پاکە}.

**٣)** ئەم دەستەیە دەڵێن: نەفس وەک ئاوێنەیەک وایە کە دەگونجێ ڕابردوو و داهاتووی تێدا دەربکەوێو نەخش ببەستێ. {واتە: دەتوانێ ببێتە جێی تێدا دەرکەوتنی هەموو شتێک، چ پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەبێ، چ بە داهاتووەوە}[٢].

**٤)** بەڵام ئەوەی کە دەبێتە کۆسپ لەڕێیداو، پێشگیریی لێ دەکات، لە ناسینی خوا دوو شتن؛ یان ڕوو لەخوا وەرگێڕان و لەخوا بێئاگابوونە، یان چڵکن بوون و ژەنگ گرتنییەتی. {واتە: (دڵ) لە سۆنگەی دوو هۆیانەوە لە خوای بەرز دوور دەکەوێتەوە؛ یەکیان هۆیەکی زاتییە، کە بریتییە لە ڕوو وەرگێڕان و بێئاگایی، ئەوی دیکەشیان هۆیەکی دەرەکییە، کە بریتییە لە چڵکن بوون و پیس بوونی بەهۆی زاڵ بوونی شەیتان و نوقم بوون لە ئارەزووەکاندا}.

---

(١) مەبەست لە بەخوا گەیشتن (الوصول إلى الله) گەیشتنە بە ناسینی و پەیبردن بە ناوو سیفەتە بەرزو بێوێنەکانی و یاساو حوکمەکانی شەریعەتەکەی و، ڕازو نهێنییەکانی ئایینەکەی و، وردەکاریی و حیکمەتەکانی گەردوونەکەی.

(٢) هەرچەندە صاف و ڕوون بوونەوەی دڵ و دەروون کاریگەریی زۆری هەیە لە بواری خواناسیی (معرفة الله)دا، بەڵام ئەوە کە بەو هۆیەوە رابردوو و داهاتووی تێدا دەردەکەون، ڕاست نیەو زیادەڕۆیی زۆری تێدایە.

٥) دەڵێن: سەرچاوەش گەلێک جاران پڕ دەبێتەوەو ئاوەکەی ون دەبێت، بەڵام چاڵ هەڵقەن دەری دەدات و پاکی دەکاتەوە، {واتە دڵ و دەروونی مرۆڤیش وەک کانی و سەرچاوەیەک، کە بەهۆی پڕبوونەوەوە کوێر دەبێتەوەو چۆڕەبڕ دەبێ، بەڵام بە دەردان و پاککردنەوە دەژێیتەوە، هەرچەندە بە چڵک و چەپەری تاوان و لادان داپۆشرابێو هیچی لێ دیار نەمابێ، بەڵام مرۆڤ لەڕێی تێکۆشان و خاوێنکردنەوەیەوە، دەتوانێ سەرلەنوێ ئاوی ڕوون و سازگاری خواناسیی لێ پەیدا بکاتەوەو هەڵی بقوڵێنێ}.

٦) خاوەن دڵێن تێکڕا لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە چارەسەرکردنی ئەسڵی ئینسان و چاک بوونەوەی، نیزیکترو سێناترە لە چارەسەرکردنی جەستەی، {واتە دەردو نەخۆشییەکانی دڵ و گیان، کە ئەسڵ و بنچینەی مرۆڤە، زووتر و ئاسانتر چارەسەر دەکرێن و، مرۆڤ خێراتر لێیان قوتار دەبێ، لەچاو دەردە جەستەییەکان، کەواتە: خاوێنکردنەوەی دەروون و چارەکردنی، کارێکی قورس و بەزەحمەت نیەو ئاسانە)[1].

---

(١) هەرچەندە (ابن عجيبة) بەو جۆرە کە نووسیومە، ئەو دێڕە شیعرەی مانا کردوە، بەڵام پێم وایە نەیپێکاوەو شاعیر مەبەستی ئەوە نەبووە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە؛ لەکاتی ڕۆچوونی ئاوی سەرچاوەو کانییدا، ئاسانتر ئەوەیە کە هەر ئەو سەرچاوەیە بەهۆی پاککردنەوەو دەردان و قووڵکردنییەوە، چارەسەر بکرێ، نەک دووبارە بیرێکی دیکە لێبدرێ و، بگەیەنرێتە ئاوو ئاوی لێدەربهێنرێ.

هەرچەندە ئەو قسەیەی (إبن عجيبة) کە چارەسەری دەردو نەخۆشییە ڕووحی و مەعنەوییەکان بەگشتی ئاسانترە لە هی دەردو نەخۆشییە جەستەییەکان، ڕاستە، بەڵام وا پێ ناچێ شاعیر ئەوەی مەبەست بووبێ و لە شیعرەکەدا ئەوە دەرناکەوێ، ئەگەر کاتی خۆیشی ئەوەم زانیبایە شەرحەکەی (إبن عجيبة)م هەر نەدەهێناو، ئەمەی خۆمم نەدەخستە پەراوێزەوە، بەڵام ئێستا (٢٠٠٠/٦/٢٢) کە خەریکی پێداچوونەوەو ڕێکخستن و ئامادەکردنی ئەم کتێبەم بۆ چاپ، ئەو ڕاستییەم بۆ دەرکەوت، شایانی باسە کە ئەم جۆرە شەرح و لێکدانەوەیەی شیعری ناوبراو، لەگەڵ نێوەڕۆکی وێنەی یەکەمیش کە لە غەززالییەوە-خوا لێی خۆش بێ- هێنامانەوە دەگونجێ.

٧) ئه‌م ده‌سته‌یه ده‌ڵێن: ئنجا ئه‌وه‌ی هه‌میشه‌و دایم و ده‌رده‌م ئێمه خه‌ڵکی پێ ڕاده‌سپێرین، بریتیه له چاره‌سه‌رکردنی نه‌فس و پاککردنه‌وه‌ی. {واته ئه‌وه‌ی که ئامۆژگاریی که‌سانێکی پێ ده‌که‌ین، که ئامانجیان خواناسینه، ئه‌وه‌یه که نه‌خۆشییه‌كانی ده‌روونیان چاره بکه‌ن و، پاکی بکه‌نه‌وه له خه‌سڵه‌ته به‌ده‌كان و بیرازێننه‌وه به خه‌سڵه‌ته پاک و چاکه‌کان}.

٨) ئنجا شاعیر خوا پاداشتی بداته‌وه، له کۆتاییدا ده‌ڵێ: ئه‌م ڕێیه ڕێبازی دره‌وشانه‌وه (الإشراق)یه، هه‌ر له‌کۆنه‌وه هه‌بووه‌و هه‌تا دنیاش دنیابێ ده‌مێنێ. {(أحمد بن محمد بن عجيبة) له شه‌رح و لێکدانه‌وه‌ی ئه‌م دێڕه‌دا گوتوویه‌تی: ئه‌م ڕێیه پێشی ده‌گوترێ ڕێگه‌ی سپی بوونه‌وه (طريق الجلاء) و پالێوتن (التصفية)، چونکه له‌سه‌ر پالێوتنی دڵ و ده‌روونان دامه‌زراوه، به‌هۆی پاککردنه‌وه‌ی له سیفه‌ته په‌سته‌کان (الرذائل) و ڕازاندنه‌وه‌ی به سیفه‌ته چاکه‌کان (الفضائل)، ئنجا هه‌رکاتێک ده‌روون له ڕووکردنه غه‌یری خوا خاڵیی بوو و، له لێلێییه‌کان پاک بۆوه، ڕۆژی خواناسیی تێدا هه‌ڵدێ..[1]}.

ئنجا دوایی شاعیری خواناس (ابن البنّا السرقسطي) دێته سه‌ر باسی ڕێی دووه‌م، ڕێی خواناسین به‌هۆی به‌ڵگه‌و زانیاریی وه‌ده‌ستهێنراو (کسبي)ه‌وه‌ ده‌ڵێ:[2]

| | |
|---|---|
| وفرقـــة قالت بأن العِلمـــا | من الخارج بالإكتساب أَسْما |
| وشرطوا العلوم في اصطلاحه | إذ لا غنىً للباب عن مفتاحه |
| فليس للطامع فـــيه مطمع | ما لم تكن فيه علوم أربـــع |
| وهي علوم الذات والصفات | والفقه والحديث والحـــالات |
| وهذه طريقة البـرهــــان | وهي لكل حــــازم يقظان |

---

(١) بڕوانه سه‌رچاوه‌ی پێشوو ل١٢٥.
تێبینی: کتێبی ناوبراو له‌په‌راوێز (حاشية)ی کتێبی (إيقاظ الهمم في شرح الحكم)دا چاپ کراوه، که هه‌ردووکیان (ابن عجيبة) شه‌رحی کردوون.
(٢) سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل١٢٩.

واتە:

**١)** هەروەها دەستەیەک-دەستەی دووەم- دەڵێن: بۆ خواناسین، وەدەستهێنانی زانیاریی لە دەرەوە بەرزترو چاکترە-وەک لەدەروونەوە-. {واتە: ئەم دەستەیە دەڵێن: پێویستە مرۆڤ پێشەکیی دەست بکات بە چاککردنی ڕواڵەت و دیوی دەرێی، لە ڕێی وەدەستهێنانی زانیاریی و شارەزاییەوە لە ئایینـدا}.

**٢)** ئەم دەستەیە هەبوونی زانیارییان بە مەرج گرتوە بۆ چاکبوون و بەرهەمدار بوونی ڕێبازی خۆیان، چونکە حەتمەن دەرگا بەبێ کلیل ناکرێتەوە. {واتە: ئەم دەستەیە دەڵێن: دەرگای بەرەو خوا چوون و خواناسیی، بە کلیلی زانیاریی نەبێ ناکرێتەوە، مادام وابێ، پێویستە بابای بەرەو خوا چوو ئەو کلیلەی پێبێ، ئینجا بکەوێتە ڕێ}.

**٣)** جا مادام وابێ، هیچ تەمادارێک لەڕێی بەرەو خوا چووندا بە ئاوات ناگات، هەتا پێش وەڕێ کەوتن خاوەنی چوار جۆرە زانیارییان نەبێ. {واتە: کە دەڵێن: مرۆڤ نابی بەبێ زانیاریی پێبوون، دەست بکات بە بڕینی ڕێی بەرەوخوا چوون، مەبەستمان لەچوارجۆرە زانیارییە، نەک هەموو جۆرە زانیارییەک، چونکە ئەوە مەحاڵە}.

**٤)** ئەو چوار جۆرە زانیارییەش ئەمانەن؛ زانیاری هەبوون بە زات و سیفەتەکانی خواو، شارەزابوون لە شەرع و، شارەزابوون لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، -دیارە فەرموودەش ڕوونکردنەوەی جێبەجێکردنی قورئانە، کەواتە ئەویش، هەروەها شارەزابوون لەو حاڵ و مەقامانەی[1] کە ئینسان

---

(١) حاڵ (الحال) لە زاراوەی تەزکیەو تەصەووفدا، بەو حاڵەتە دەروونییە دەگوترێ کە بەبێ ئەوەی ئینسان بیەوێو هەوڵی وەدەستهێنانی بدات، بەسەر دڵیدا دێ، وەک دڵخۆشیی و دڵتەنگیی و، دڵگوشران (قبض) و دڵکرانەوە (بسط)، نیشانەو جیاوازیی حاڵیش لە مەقام، ئەوەیە کە:
١- حاڵ بەدەست مرۆڤ نیە.
٢- دێو دەڕوا، واتە بەردەوام نابێ. بەڵام مەقام (المقام) بەو پلەو پایەیە دەگوترێ کە مرۆڤ لە ئەنجامی تێکۆشان (مجاهدة)و بەرەوخوا چووندا دەیگاتێو، بە یارمەتی خوا

لە بەرەو خوا چوون (السَّير إلى الله)ی دا تووشی دێن و پێیاندا ڕەت دەبیٚ.
{دەڵێم: وێڕای ئەم چوار زانیارییە زانیاریی دیکەش هەن، کە زۆر پێویستن بۆ بابای بەرەوخواچوو (سالک) کە دەتوانین بەپێی زاراوەی قورئان لە دوو بواراندا کورتیان بکەینەوە؛ یەکەم: نەفسی خۆمان، دووەم: ئاسۆیەکان (الآفاق)، وەک خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ (فصلت-٥٣).

بەڵێ خۆ چەکدار کردنی ئینسانی بەرەو خوا چوو، بەو زانیارییانەی کە لە ئاسۆیەکان دەکۆڵنەوە، لەهەر لایەنێکیداو، بەو زانیارییانەی کە لەئینسان دەکۆڵنەوە، شتێکی یەکجار گرنگ و پێویستە، چونکە ئینسان کتێبی گچکەی خوایەو، بوونەوەریش کتێبی گەورەیەتی، بێگومان دانەری هەر کتێبێکیش، چاکترین و ئاسانترین ڕێی پێ ئاشنابوونی، موتالێو خوێندنەوەی کتێبەکەیەتی}.

٥) ئنجا شاعیر دەڵێ: ئەم ڕێیەش پێی دەگوترێ: ڕێبازی بەڵگەیی، بەڵام ئەم ڕێیە بۆ هەموو کەس دەست نادات و، هەر کەسێک بیەوێ بیگرێتە بەر، دەبێ زۆر گورج و گۆڵ و وریا بێ.

---

وەدەستی دێنیٚ، ئنجا مەقام بە پێچەوانەی حاڵەوە:
بەرهەمی هەوڵدان و تێکۆشانی ئینسانە.

چەسپاوو نەگۆڕەو، ئینسان لە مەقامێکەوە ناچێتە یەکی دیکە، هەتا مەرجەکانی مەقامی پێشوو تەواو نەکات، مەقامەکانیش وەک: (تۆبەکردن، ئیخلاص، ڕاستیی، دنیا بەکەم گرتن، قەناعەت، شوکر،...هتد).

بڕوانە: (التعريفات) للجرجاني، ل٣٦ ،١٠٠.. و بڕوانە: (إصطلاحات الصوفية) كمال الدين القاشاني، ل٥٧، ٨٧، ٨٨). و بڕوانە: (معجم مصطلحات الصوفية) دكتور عبدالمنعم الحنفي، لا٧٣، ٢٤٨.. و بڕوانە: (إحياء علوم الدين) ب٤، و بڕوانە: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، چاپی چواردم، ٢٠٠٦).

ئێستاش دوای ئه‌وه‌ی تاڕاده‌یه‌ك ڕێی بیركردنه‌وه‌و تێوه‌ڕامان و، ڕێی یادی خواو پاككردنه‌وه‌ی ده‌روونمان، به‌شێوه‌یه‌كی گشتی ڕوون كردنه‌وه‌و، جیاوازیی نێوانیانمان خسته ڕوو، ده‌چینه سه‌ر خستنه‌ڕووی هه‌ركامێكیان به‌شێوه‌یه‌كی جوداو سه‌ربه‌خۆو، چ تێبینی و ڕه‌خنه‌یه‌كیشمان هه‌بێ، ڕایده‌گه‌یه‌نین:

## یه‌كه‌م: ڕێبازی عه‌قڵ:

ڕێبوارانی ئه‌م ڕێبازه ده‌ڵێن: ئه‌م بوونه‌وه‌ره مه‌زن و سه‌رسامكه‌ره‌ی كه ده‌یبینین، په‌رێزو شوێنه‌واری خوایه‌، هه‌ڵبه‌ته خواش (جل جلاله) ناگونجێ له‌ڕێی پێنج هه‌سته‌كانه‌وه په‌ی پێ به‌رین، چونكه پێنج هه‌سته‌كان تۆڕو قولابێكن، بێجگه له نێچیره ماددیی و به‌رهه‌سته‌كان هیچی دیكه‌یان پێ ڕاو ناكرێ، بێگومان خوای مه‌زنیش به‌دیهێنه‌ری مادده‌یه‌و، حه‌تمه‌ت ده‌بێ به‌دیهێنه‌ریش له دروستكراوه‌كه‌ی جوێ بێو له‌سه‌رووییه‌وه بێ، كه‌واته ناچارین كه له‌ڕێی ئه‌و په‌رێزو شوێنه‌واره‌یه‌وه، په‌ی پێ به‌رین كه ئاوێنه‌ی تێدا دره‌وشانه‌وه‌ی سیفه‌ته به‌رزه‌كانیه‌تی، له زانیاریی و تواناو میهره‌بانیی و وردبینی و كاربه‌جێیی و...هتد.

ئنجا خوای به‌رزو زاناو خاوه‌ن به‌زه‌یی و حیكمه‌تیش، به لوتف و میهره‌بانی خۆی چه‌ند یاسایه‌كی نكووڵیی لێنه‌كراویی له عه‌قڵ و هۆشی ئینساندا ڕۆناون و، له‌گه‌ڵ سروشتیدا تێكی هه‌ڵشێلاون، كه مرۆڤ بتوانێ ڕێبازی ژیریی بگرێته به‌ر، ئه‌و یاسا ڕوون و به‌هێزو نكووڵیی لێنه‌كراوانه، بكاته ده‌سته‌گیره‌و مه‌شخه‌ڵی ڕێگای به‌ره‌و خوا چوون و به‌خوا گه‌یشتن، ئه‌و یاسایانه‌ش گرنگترینیان ئه‌مانه‌ن:

١- یاسای هۆكاریی (قانون السببية).

٢- یاسای ڕێك وپێكیی (قانون النظام).

**٣**- یاسای زاڵ نەبوونی هیچ کام لە بوون و نەبوونی شتێکی بوون و نەبوون لەباراندا هەبوو (ممکن)، بەبێ زاڵکەر، (قانون إستحالة ترجيح أحد طرفي الممكن بدون مرجِّح)[1].

ئنجا ئێمە کە لەڕێی بەکارهێنانی ئەم یاسایانەوە، بوونی خوامان سەلماند، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەم یاسایانە، لە بیروهۆشی هەموو ئینسانێکدا هەن، دەتوانین بە ئاسانیی بوونی خوا، بە هەرکەسێک بسەلمێنین، کە گوێ بۆ حوکمی ژیریی و یاسایەکانی دەگرێ.

ئەمە پوختەی دەنگوباسی ڕێبوارانی ڕێبازی ژیرییە، لەبارەی ئەو ڕێبازەوە کە پەسندیان کردوە، بۆ بەرەو خوا چوون و بەخوا گەیشتن.

جا بێگومان ئێمەش لەهەموو ئەو قسانەدا کە کردیانن، پشتگیرییان دەکەین و لەگەڵیانین، بەڵام سێ تێبینیی و ڕەخنەی گرنگیشمان، لەبارەی ڕێبازی ژیرییەوە هەن:

**یەکەم:** ڕاستە مرۆڤ دەتوانێ لەڕێی عەقڵ و تێوەڕامان و بیرکردنەوەوە، پەی بە ڕێک وپێکیی و ڕازو نهێنیی بوونەوەر بەرێ-لە سنووری توانای خۆیدا-و بە هۆی ئەوەشەوە، بگاتە قەناعەت و دڵنیایی لە بوونی خوای پەروەردگاردا،

---

(١) سوپاس بۆ خوا لەکتێبی (پوختەیەک دەربارەی ئیسلام)دا، هەرکام لەم سێ یاسایانە توێژراونەوە، بڕوانە: (تەفسیری ئایەتی یەکەم- گەوهەری یەکەم) لاپەڕە (٣٩-٧٨) چاپی یەکەم... هەروەها لەم کتێبە (خواناسیی...)دا لە بەشی یەکەمدا، بە تێرو تەسەلیی یاسای (هۆکاریی)و یاسای (ڕێک وپێکیی) توێژراونەوە.

هەروەها لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا، ئەم یاسایانەو چەند یاسایەکی دیکەی ژیرییش خراونە ڕوو، لە باسی یەکتایی خوا لە پەروەردگاریێتیی داو، ئیسپاتی بوونی خوا لە ڕوانگەی زانست و فیطرەت و وەحییەوە، بڕوانە بەرگی دووەم، {خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی دا}.

ئێستاش (٢٠١٩/٩/٢١ز) دەڵێم: بەڵام لەمەوسووعەی: {درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد لەبەر تیشکی زگماک و عەقڵ و زانست و وەحییدا} زۆر بەوردی لەوبارەوە قسەمان کردوە.

بەڵام ئینسان وێڕای عەقڵ، هەواو ئارەزووی نەفسی بەدو، شەیتانی نەگریسیش حوکمی بەسەردا دەکەن، ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا عەقڵ و بیروهۆشی مرۆڤ هەموو دەمێ ئاوێنەیەکی سپی و ساف و بێخەوش نابێ، کە هەرچی کەوتە ئاقاری وەک خۆی، بێ گۆڕین و دەستکاریی، عەکسی بکاتەوەو بیخاتە ڕوو، بەڵکو زۆرجاران نەفس و شەیتان و ئارەزووە پەستەکان، ئەو ئاوێنەیە لێڵ و تەماویی و ژەنگدار دەکەن و، وای لێدەکەن: ڕاست بە هەڵەو، چاک بەخراپ بەدی بکات! ڕاسترین بەڵگەش بۆ سەلماندنی ڕاستیی و تەواویی ئەم قسەیە ئەوەیە کە دەبینین: هەندێک لەوانەی بۆ پەی بردن بە بوونی خوا، بەس پشتیان بە ژیریی و بیرکردنەوەی خۆیان بەستوە، لە ئاکامدا سەریان بە بێڕوایی (الحاد) گەیوە[1] و، زۆربەشیان -بگرە هەموویان- لە ناسینی خوادا بە هەڵەدا چوون و ڕێیان ون کردوە.

**دووەم:** لەبەر ئەوەی عەقل لەڕێی پێنج هەستەکانەوە، پەیوەندیی بە جیهان و دەوروبەریەوە دەبەستێو، بەس توانای ناسینی دیاردە بەرهەستەکانی هەیە، ئەوپەڕی کارێک بتوانێ ئەنجامی بدات، لە مەسەلەی ناسینی خوادا، بریتیە لەوە: کە حوکمی دروستکراویی بەسەر بوونەوەردا بدات و، بەدیهێنەرێکی زاناو توانای بۆ بڕیار بدات، بەڵام لەو سنوورە بەولاوە، هەرچی دەربارەی ئەو بەدیهێنەرە بیڵێ، بەس قسەی بێبەڵگەو گومانەو، تفەنگ بە تاریکییەوە نانەو هیچی دی، چونکە عەقڵ بەتەنێ -واتە عەقڵی ڕووت- بەس لەگەڵ جیهانی بەرهەستدا ئاشنایەو، تەنیا لەوێدا شارەزایە، بەڵام لە جیهانی ئەو دیو سروشت (عالم ما وراء الطبيعة- ميتافيزيك)دا بەگشتی و، لە ئاقار ناسینی زاتی بێوێنەو سیفەتە بێسنوورەکانی خوادا، بەتایبەتی، یەکجار کۆڵەوارو

---

(١) لەو فەیلەسووفانەی کە بەهۆی بەس پشت بەژیریی بەستنەوە، لە لێکۆڵینەوەیاندا لەبارەی خواوە، سەریان بە بێڕوایی گەیوە: ١- (ديموكريت)، ٢- (ئەبيقور)، ٣- (دافيد هيوم)، بڕوانە: (قصة الإيمان) الشيخ نديم الجسر، ل٤٨، ١٦٠. و بڕوانە: (دائرة معارف القرن العشرين) ب٧، ل٤٧١-٤٧٢، محمد فريد وجدي.

بێئاگایەو، هیچی تێ[١] بڕ ناکاو، چ سەرەداوانی لێ[٢] هەڵناکاو، بێجگە لە سەرسامیی و حەپەسان و دۆش دامان، چیدی لەدەست نایەت.

چاکترین بەڵگەش کە ئەم ڕاستییە بە ئیسپات دەگەیەنێ، بەهەڵەدا چوون و ڕێ لێ ونبوونی زۆربەی هەرە زۆری ئەو زاناو فەیلەسووفانەیە، کە ویستوویانە: بەس لەڕێی ژیرییەوە، خوای بەرزو بێوێنە بناسن و، پەی بە زات و سیفەتەکانی و چۆنیەتییان بەرن.[٣]

واتە ئەو زاناو فەیلەسووفانە کە زیاد لە توانای ژیریی، داوایان لە ژیریی کردوە، هەر بەوەندە وازیان نەهێناوە کە عەقڵ بوونی خوای بۆ ئیسپات کردوون، بەڵکو ویستوویانە: لەو سنوورەش واوەتر بچن و، لەڕێی ژیرییەوە خوای بێهاوەڵ و بێوێنەو بەرزو پاک، بناسن و بزانن چییەو چۆنە!

**سێیەم:** ئەو بڕوایەی کە بەس لەڕێی عەقڵەوەو تێوەڕامانی عەقڵییەوە پەیدا دەبێ و، تێکەڵ بە دڵ و دەروونان نابێ و، وێڕای قەناعەتی بیروهۆش، سۆزو گەرمیی و گوڕو تینی نێو هەناوانیشی تێکەڵ نابێ، بڕوایەکی ئیشک و ڕەق و تەق و بێزەوق و ڕەونەق دەبێو، نابێتە هۆی ڕاچڵەکاندن و جوولێندنی ئینسان، سەربارەش ئەم جۆرە بڕوایە، بەزۆریی بڕوایەکی کزو لاوازو لەق دەردەچێ.

---

(١) هیچی تێبڕ ناکات: هیچ نابڕێ، هیچی لەدەست نایەت.

(٢) گلۆڵە کە ئاڵۆز دەبێ، بەبێ دۆزینەوەی سەرەداوەکەی، چاک نابێ.

(٣) بۆ نموونە: ١- (أفلوطین) خوای بە ژیری ڕووت (العقل المطلق) داناوە!!
٢- (فیثاغورس)یش بە ژمارە (عدد)ی تێگەیوە!!
٣- (هرقلیط)یش بە ئاگری لەقەڵەم داوە!!
٤-(أمبدوقلیس)یش بە چوار توخمەکان!!
بڕوانە: (قصة الإیمان) الشیخ ندیم الجسر، (ل٥٢، ٣٠، ٣٣) چاپ ٣.
ئیغریقییەکانیش بۆ هەر یەک لە ئاوو هەورو ئاگرو جوانیی و هونەرو برووسکەو...هتد، خوایەکی تایبەتییان داناوە!! بڕوانە: (جاهلیة القرن العشرین) محمد قطب، (ل٢٥-٣٢) چ١٩٧٥.
ئێستاش: (٢٠١٩/٩/٢١ز) دەڵێم: لەمەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد) زۆر بەوردیی و ڕوونیی باسی هەڵوێست و بیروڕای فەلسەفەو فەیلەسووفەکانمان کردوە، لەوبارەوە.

ئێستاش نۆرەی تویژینەوەو خستنەڕووی ڕێی دووەمە.

## دووەم: ڕێبـــازی دڵ:

ڕێبوارانـی ئـەم ڕێبـازە دەڵێـن: خوای کاربەجێ چەنـد ئەندامێکی لە ئینسـاندا خوڵقانـدوون، کـە هـەر کامێکیـان ئەرکێکـی دیارییکـراوی پـێ سـپاردوون و، بەبێ ئەنجـام دانـی ئـەو ئەرکـە، ئـەو ئەندامـە ئۆقـرە ناگرێـو دانامرکـێ و، هەسـت بـە تێریـی و ئاسـوودەیی نـاکات، بۆ نموونـە:

١- چـاو ئەرکـی دیتنـی پـێ سـپێرراوەو لـەززەت و خۆشـیی و ئاسـوودەیی خۆی لـە دیتنـدا دەبینـێ.

٢- هەروا بەو شێوەیە؛ گوێ ئەرکی بیستن.

٣- زمان ئەرکی چێژتن و قسەکردن.

٤- لووت ئەرکی بۆنکردن.

٥- ژیریی ئەرکی بیرکردنەوەو تێوەڕامان.

٦- دەست ئەرکی گرتن و...هتد.

ئنجـا دڵ (قلب)[1]یـش کـە یەکێکـە لـە ئەندامەکانـی ئینسـان-بەڵام گرنگترینیانە- ئەمیش ئەرکێکـی تایبەتیـی بۆ تەرخـان کـراوەو پێـی سـپێرراوە،

---

(١) وشـەی (دڵ) لـە ڕوانگـەی زانسـتی تەزکیـەی نەفسـەوە: سۆفیایەتییەوە، مەبەسـت پێی ئەو پارچـە گۆشـتە هەرمـآ بیچمـە نیـە کـە دەکەوێتـە لای چەپـی سـینەوەو، خوێـن بەسـەر لەشـدا دابـەش دەکات، بەڵکـو مەبەسـتیان پێـی شـتێکی لەتیـف و نابەرهەسـت و مەعنەوییـە، کـە چییەتـی ئینسـانەو جۆرە پەیوەندییەکی پتەویشی لەگەڵ دڵی گۆشتیندا هەیـە، کـە بیروهۆشـی زۆربـەی خەڵکـی لـە چۆنیەتـی ئـەو پەیوەندییـەدا، مـات و دەستەوەسـتانە، ئنجـا ئـەو (دڵ)ەی گوتمـان، جاری وا هەیـە گیـان (روح)ی پـێ دەگوترێـو، جاری وایـە ئاوەز (عقـل) و، جاری وایـە دەروون (نفـس)، و (دڵ) پەیوەندیـی لەگـەڵ هەمـوو جەسـتەدا هەیـە، بـەڵام پەیوەندیـی بـە دڵـی گۆشـتین و سـینەوە زیاتـرە. بڕوانـە: (إحیـاء علـوم الدیـن) ب٣، ل(٣-٥) الإمـام محمـد أبـي حامـد الغزالـي، و بڕوانـە: (معجـم مصطلحـات الصوفیـة)، ل٢١٨-٢١٩. و (التعریفـات) ل٧٧.

کە بەختیاریی و ئاسوودەیی و ئارامیی و ئۆخژنی خۆی، لە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەدا چنگ دەکەوێ، ئەو ئەرکە پیرۆزو پڕ پیت و پێزەش، ناسینی خواو پەیوەندیی هەبوونە لەگەڵ خوادا.

بەڵێ دڵ و دەروونی مرۆڤ وەک منداڵێکی فامیدە (مُمیِّز)ی دایک و باب ون کردوو شێت و شەیداو عەودالی خوایەو، بەبێ ناسین و پەیوەندی پێوەبەستن و ڕازو نیاز لەگەڵ کردن و بەندایەتی بۆ کردنی و پەرستنی، ناسرەوێو دانامرکێ.

چونکە ئەگەر خۆراک و بژێوی چاو، دیتنی دیمەنەکانەو، هی گوێ، بیستنی دەنگەکانەو... هی ژیریی، دۆزینەوەی ڕازو نهێنییەکانە؛ خۆراک و بژێوی دڵیش: خواناسیی و پەرستنی و لەبەر پاڕانەوەو، بۆ لای خوا گەڕانەوەو، کڕنووش بۆ بردن و داوا لێکردن و، فەرمانبەریی و گەردن بۆ کەچ کردنیەتی.

ئنجا ئێمە دەڵێین: چاکترین و ئاسانترین ڕێگای ناسینی خوا بریتیە لە پاککردنەوەو بژارکردن و ژەنگ لەسەر لابردنی ئاوێنەی دڵ، ئەو دڵەی کە لە هەموو شتێک پتر ئاشنای خوایەو، بەوی نەبێ داناسەکنێو[1] ئۆخژن و ئارامیی بۆ نایە، ئەو بژارو پاککردنەوەو پالێوتنەش، لەڕێی یادی خواو پاڕانەوەو پەرستن و گەردنکەچیی و، جەنگ کردن لەگەڵ نەفسدا، بە مەبەستی لابردن و هەڵوێژارتنی[2] خەسڵەتە پەست و بەدە شەیتانیی و ئاژەڵییەکانی و، ڕازاندنەوەی بە خەسڵەتە چاک و بەرزە فریشتەییەکانە.

ئەمەش پوختەو ڕاپازنەراوی بیروڕای خاوەن دڵێن بوو، لەبارەی مەسەلەی چۆنیەتیی و جۆری بەرەو خوا چوون و بەخوا گەیشتنەوە.

ئێمەش لە ڕاست ئەم هەڵوێست و بیروبۆچوونەدا، دەڵێین:

---

(١) داناسەکنێ: بێدەنگ نابێ، ناوەستێ، تێرنابێ.

(٢) هەڵوێژارتن: ژوورەکەی هەڵوێژارت: پاکی کردەوە، ڕێک و پێکی کرد، ئالۆزیی تێدا نەهێشت.

هەرچی گوتتان، ئێمەش دەیڵێین و بەڕاستی دەزانین و لەگەڵتانین، بەڵێ ڕاستە ئینسان هەتا دڵ و دەروونی خاوێن نەکاتەوە، بژاری نەکات و ئامادەی نەکات، ڕۆژی خواناسیی تێدا هەڵنایەت و، کاری بۆ پێک نایەت، وەک خواناسی لێهاتوو و زمان پاراو (عطاء الله الأسكندري) گوتوویەتی:

(كيف يُشرِق قلبٌ صُور الأكوان منطبعة في مرئيته! أم كيف يرحل الى الله وهو مُكبّل بشهواته!، أم كيف يطمع أن يدخل حضرة الله، وهو لم يتطهر من جنابة غفلاته! أم كيف يرجو أن يفهم دقائق الأسرار وهو لم يتب من هفواته؟!)[1]

واتە: چۆن دڵێک دەدرەوشێتەوە کە وێنەو دیمەنی دروستکراوەکان لە ئاوێنەکەیدا چەسپابێ! (واتە: دڵ وەک ئاوێنەیەکی یەک ڕوویە، ڕووی لەچی بێ، ئەو شتەی تێدا دەردەکەوێ و، ئەو شتە ڕێگا بە دەرکەوتنی شتەکانی دیکە نادات، ئەدی چۆن دڵێک ڕۆژی خواناسیی تێدا هەڵدێ، کە ڕووی پێکراوەتە دروستکراوەکانی خواو بە غەیری خواوە سەرگەرم کراوە؟!).

---

(١) بڕوانە (إيقاظ الهمم في شرح الحكم) ابن عجيبة، ج٢ ل٤٦٢.
تێبینی: هەتا ئێستا کتێبی (تصوف)م زۆر دیون و موتالێکردون، بەڵام هیچیان هێندەی ئەم کتێبە سەرنجیان ڕانەکێشاوم، کێ (تصوف)ێکی بێ خڵتەی دەوێ با ئەم کتێبەو کتێبی (المباحث الأصلية) کە پێکەوە چاپ کراون بخوێنێتەوە.
بێگومان کتێبی دیکەی چاک لەوبارەوە زۆرن، وەک (إحياء علوم الدين) و (عوارف المعارف) و (الرسالة القشيرية) و (قوت القلوب)، بەڵام بۆ هەموو کەس دەست نادەن، چونکە خڵتەیان هەیەو، دەبێ لە مەحەک بدرێن، دەنا لەراستیدا (إحياء علوم الدين) بە گەورەترین و دەوڵەمەندترین کتێبی (تصوف) دادەنرێ، بەڵام وەک گوتم، خڵتەشی پێوەیە.
تێبینی: ئەوەی رابرد قسەی پێشوو (القول القديم)مەو ئێستا (٢٠٠٠/٦/٢٢) بەرانبەر بە (٢٠ ربيع الاول ١٤٢١) دەڵێم: دەق (متن)ی کتێبی (ايقلظ الهمم) کە بە (الحكم العطائية) ناسراوەو هی (عطاء الله السكندري)یە، مەگەر چۆن دەنا تێبینیم لەسەری نیە، بەڵام شەرحەکەی کە هی (ابن عجيبه)یە چەند تێبینییەکم لەسەری هەن، هەروەها کتێبی (المباحث الأصلية)ش کە شیعری (ابن البنا السرقسطي)ین تێبینی و سەرنجم لەسەری هەن، بەڵام لەسەر شەرحەکەی کە هی (ابن عجيبة) زیاترم هەن.
ئێستاش (٢٠٠٨/٤/١٣) کە بۆ چاپی دووەم بە کتێبەدا دەچمەوە دەڵێم: مەحاڵە جگە لە کتێبی خوا هیچ کتێبێکی دیکە لە هەڵەو کەم وکووڕی خاڵیی بێ، جا چ کەم ، چ زۆر.

یان چۆن دڵێک دەتوانێ بەرەو خوا کۆچ بکات، لە حاڵێکدا کە بە داخوازیی و ئارەزووە-دەروونیی-ەکانی کۆت و زنجیر کراوە! {بەڵێ دڵ و دەروونێک بووبێتە کۆیلەو خزمەتچیی هەواو ئارەزووە دنیاییەکان، چ ماددیی بن، وەک خواردن و خواردنەوەو پۆشاک و جینس، چ مەعنەویی بن، وەک پلەوپایە خوازیی و خۆدەرخستن و پێهەڵێگوتران، ناتوانێ بەرەو خوا بچێ و پێهەڵێ بڕوا، هەروەک چۆن بابایەکی کۆتکراو ناتوانێ بڕوات}.

یان چۆن -دڵێکی ئاوا- تەمای هەیە کە بچێتە خزمەت خوا، لەحاڵێکدا کە لە لەش پیسیی بێئاگاییەکانی پاک نەبۆتەوە! {بەڵێ هەروەک چۆن جووت بوون (جماع) دەبێتە هۆی لەشپیسیی (جنابة)ی جەستە، -زیاد لە پێویست- لەگەڵ دنیا تێکەڵ بوون و لەخوا بێئاگابوونیش، دەبێتە هۆی لەشپیسیی دڵ و پێویستە-ئەگەر بیەوێ بگاتە خزمەت خوا- بەئاوی تۆبەو گەڕانەوە، خۆی بشواو لەشپیسیی لەخۆی دەربکات}.

یاخود چۆن-دڵێکی ئاوا- ئومێدی وایە کە لە وردەنهێنییەکان-ی خواناسیی- حاڵی بێ، کە جارێ تۆبەی نەکردوەو وازی لە هەڵەو تاوانە گچکەکان نەهێناوە! {بەڵێ هەروەک چۆن کەسێک مەلەوانێکی زۆر کارامەو لێهاتوو نەبێ، ناتوانێ بەدەریادا بچێتە خوارێ و، ئەو گەوهەرو مرواریی‌یانە بهێنێتە دەرێ، کە لە بنەوەی دەریا قووڵەکان دان، بابایەکیش دەتوانێ ڕازو نێهنییەکانی دەریای قووڵ و بێسنوری خواناسیی بدۆزێتەوە، کە خاوەنی دڵێکی ئازاد و چاوکراوەو پاک و بێخەوش بێو، بتوانێ بێت و بچێو قووڵ ڕۆبچێ}.

بەڵێ ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا ڕێککەوتووین، کە لەڕێی دڵەوە نەبێ ئینسان ناتوانێ وەک پێویست خوا بناسێو، هەتا دەروونیش نەپاڵێورێو خاوێن نەکرێتەوەو بژار نەکرێ، ئاوێنەی دڵ ڕوون نابێتەوەو، ئامادەی دیتنی خوا (جل جلاله) نابێ، بەلام دیسان (دڵ)یش بەتەنێ ناتوانێ لەڕێگەی

خواناسییدا بە ئامانج بگات و، ئەوەی عەقڵ پێی دەستگیر نەبوو دەستگیری بکات، چونکە:

**یەکەم:** ئەگەر بێت و دڵ و دەروون بە جڵەوی ئایین و ژیریی جڵەو نەکرێو، لەلایەن وانەوە ڕێڕوونی نەکرێ، زوو زوو ئینسان بە هەڵەدا دەبات و تووشی چۆرتمانی[1] دەکات، چونکە وەک عەقڵ نیە نەتوانێ لە جوغزی ماددەو ڕواڵەتە بەرهەستەکانی بچێتە دەرێ، بەڵکو توانای پترەو لە جیهانێکی بەرفراوان و بێسنووردا دەجووڵێ، هەربۆیەش لەنێو ئەهلی عیرفان و تەصەووفدا، زیادەڕەویی کردن و قسەی بێجێو ناماقووڵ (کە بۆخۆیان پێی دەڵێن (شطحات)[2]) زۆر بووە، بەتایبەتی لە (حلاّج) و (محي الدين بن عربي الطائي)و (أبو يزيد البسطامي)و (شهاب الدين السهروردي-القتيل) شتی بێجێو سەیرو سەمەرە دەگێڕدرێتەوە[3].

**دووەم:** شوێنکەوتووانی ڕێبازی دڵ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە پشت بە عەقڵ و بیرکردنەوەو بەڵگەهێنانەوە (استدلال) نابەستن، کە بنچینەیەکی ئەوتۆیە بڕوادار و تێیدا بەشدار بن، ئەو بڕواو قەناعەتە دەروونییەی کە پێی دەگەن، کەمتر وایە بێجگە لەخۆیان کەسی دیکە لێی بەهرەمەند بێو، بتوانن بیگەیەننە غەیری خۆیان، بەڵکو ڕەنگە زۆرجاران بە شتێکی نامۆو سەیریش بێتە بەر نیگای خەڵکی.

کەواتە؛ ئەو بڕواو خواناسییەی کە بەس لەڕێی دڵ و دەروونەوە دەستگیر دەبێو، ژیریی و بەڵگەهێنانەوە دەوری تێدا نابینێ، لە جوغزێکی تەسکی کەسییدا کورت هەڵدێ و، ناتوانرێ بخرێتە بەرچاوی خەڵکی دیکە.

---

(١) چۆرتمان: کۆی (چۆرتم)ە، یانی: هەڵەو گرفت و لەمپەر.

(٢) (شطح) بە قسەیەک دەگوترێ کە لەکاتی حاڵ لێهاتن و دڵگەرم بووندا، بەبێ ویستی ئینسان، یان بە ویستی خۆی، بەسەر زماندا دێ و، بۆنی ناماقووڵیی و دەعواکردنی لێدێ و، بەزۆریی لەزۆر ڕۆچووەکان ڕوودەدات. بڕوانە: (التعريفات)، ل٥٥-٥٦، و (ومعجم مصطلحات الصوفية).

(٣) بڕوانە: (تأريخ التصوف الإسلامي) عبدالرحمن بدوی، ل٣٣٢-٣٣٥.

سێیەم: ئنجا (دڵ)یش وەک عەقڵ لە ئاکامدا هەر یەکێکە لە هێزەکانی مرۆڤ، هەڵبەتە مرۆڤیش لەهەر لایەنێکەوە بیگری، سنووردار (محدود)ەو بێگومان، شتی سنورداریش، توانای پەی پێبردنی تەواوو دەورەدانی خوای بەرزو پاک و بێوێنەی نیە، چونکە بە پێچەوانەی ئینسان و هەموو دروستکراوێکی دیکەشییەوە، خوا لە هەموو لایەنێکییەوە بێوێنە و بێسنوور (لامحدود)ە.

مادام وابێ، دڵیش وەک عەقڵ لە مەودایەکی تایبەتی و دیارییکراودا، کە دەستی دەڕوات، لەناسینی خوادا پشتی پێ دەبەسترێ و پرسی پێدەکرێ، بەڵام بەتەنێ بەس نیە.

## تـاکـە ڕێـی ڕاسـت و هـەڵبژاردەی خوانـاسیی:

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە کە ئەو ڕێیەی پەسندی دەکەین و، بەچاکترین ڕێگای بەرەو خوا چوون و بەخوا گەیشتنی دەزانین، بخەینە ڕوو:

وەک لە هەڵسەنگاندن و لەبێژنگ دانی ڕێی ژیریی و ڕێی دڵدا خستمانە ڕوو، هەرچەندە ئینسان دەتوانێ لە هەرکام لەو دوو ڕێیەوە، ماوەیەکی چاک لە ڕێی بەرەو خوا چوون و خواناسیی ببڕێو، چەند ئەنجامێکی چاک وەدەست بهێنێ، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەر یەکەیان چەند کون و کەلێنێکی تێدا هەن، شتاقیان بۆ بڕینی سەرانسەری ڕێی بەرەو خوا چوون و، بەئامانج گەیشتنی تەواوو یەکجاریی، بەس نین.

کەواتە دەبێ بەدوای ڕێیەکدا بگەڕێین، کە بتوانین پێیدا بگەینە ئامانجی تەواوو لووتکەی هەرەبەرزی خواناسیی، هەڵبەتە ئەو ڕێیەش دەبێ ڕێیەکی ئەوتۆ بێ، هیچ کام لەو ناتەواویی و کەلێنانەی تێدا نەبن، کە لەڕێی ژیریی و ڕێی دڵدا هەبوون.

بە واتایەکی دی؛ ئەو ڕێیەی کە هەڵی دەبژێرین و پەسندی دەکەین بۆ بە ئامانج گەیشتن، لە مەسەلەی بەرەو خوا چوون و خواناسییدا، دەبێ ڕێیەک بێ چاکیی (إيجابي)یەکانی هەردووک ڕێیەکانی پێشووی تێدا بن و، لە خراپیی (سلبي)یەکانی هەردووکیان دوور بێ.

ئنجا دەبێ ئەو ڕێیە چی بێو چۆن بێ؟

لە وەڵامدا دەڵێم:

ئەو ڕێیە بریتیە لە پێکەوە جۆشدانی هەرکام لە ژیریی و دڵ و، خستنەکاریان لەبەر ڕۆشنایی ڕێڕوونیی و ئاڕاستەکردنی قورئان و سوننەتدا، واتە: وەحیی خوا.

کەواتە: ئەو ڕێیە کە ئێمە پەسندی دەکەین و هەڵی دەبژێرین و، بڕوامان وایە کە تاقەڕێو چاکترین ڕێی بەرەوخوا چوون و بەخوا گەیشتنە، ڕێیەکە لەسێ بەشان پێک هاتوە:

١- عەقڵ.

٢- دڵ.

٣- سروش (وحي).

بەڵێ مرۆڤ کە بیەوێ ڕێیەکی ئەوتۆ بگرێتە بەر کە پێیدا بگاتە خواناسیی تەواوو بێ پەڵە، بە هیچ کام لە عەقڵ و دڵ، ئەو کارەی بۆ پێک هەڵنایەت، بگرە بەتەنێ بە هەردووکیشیان دیسان ئەوەی مەبەستیەتی بۆی وەدی نایەت، بەڵکو دەبێ پێشەکی پشت بە عەقڵ ببەستێو، لەدەریای قووڵی بیرکردنەوەو تێوەڕاماندا بیخاتە کار، ئنجا پشت بە دڵ و دەروونیش ببەستێو، لە شۆردن و پالێوتن و پاککردنەوەو سپیکردنەوەی وەخۆ بکەوێ، ئنجا دەبێ لە ئیش پێکردنی هەرکام لە عەقڵ و دڵدا، پشت بە دەقەکانی دوو سەرچاوەی ڕوونی ئیسلام (قورئان و سوننەت) ببەستێو، لەبەر تیشکی ڕێڕوونییەکانیاندا، بەرێوە بچێ.

کەواتە: ڕێبازی پەسند و هەڵبژاردە، لەڕوانگەی ئێمەوە بۆ ناسینی خوا:

١- لەلایەکەوە لەسەر بنچینەی ژیریی و بیرکردنەوە دامەزراوە.

٢- لەلایەکی دیکەوە پشت بە دڵ و دەروونێکی شۆڕاوو بژارکراوو پالێوتە دەبەستێ.

٣- لەلایەکی دیکەشەوە مرۆڤ تێیدا خۆ بەسەرو بێپرس وڕا نیەو، بەپێی ڕێپیشاندان و بەگوێرەی فەرمانی ئایین بەرێوە دەچێو، لەبەر ڕۆشنایی و زانیاریی بێهەڵەو پەڵەی وەحییدا هەنگاو دەنێ.

دەتوانین نیشانەو جوێکەرەوەکانی ئەم ڕێبازە پەسندو هەڵبژاردەیە، لەم شەش خاڵانەدا بخەینە ڕوو:

١- سەرەتا بەهۆی پشت بەستن بە شۆردن و پاککردنەوەی دڵ و دەروون و سپی و سافکردنەوەیەوە، هەواو ئارەزووەکان، مەودای زاڵبوون و چڵکن و پیسکردنی دڵ و تەماویکردنی ئاوێنەی دڵیان نامێنێ و، شەیتانی بەد، لە سنووری دەروون دەردەکرێ و، ڕێی خراپەکاریی و وەسوەسەکردنی لێ دەبەسترێ.

٢- ئنجا بەهۆی پشت بەستنەوە بەدڵ، دوای تێپەڕ بوون لە سنووری تواناو دەسەڵێتی عەقڵ، مرۆڤ لە بڕینی پاشماوەی ڕێی بەرەو خوا چووندا، سەر لەنوێ دەست بەکار دەبێتەوەو، مەحتەل و دەستەوستان نابێ و، هەر بەردەوام دەبێ.

٣- لەبەرئەوەی وێڕای عەقڵ، دڵیش بەشدار دەبێ، بڕوایەکی ئیشک و ڕەق و تەق و فەلسەفییانە دروست نابێو، بڕوایەک دێتە دی، کە بنچینەکەی تێفکرین و تێوەڕامانی عەقڵەو بەئاوی سەرچاوەی یادی خواو خۆشەویستیی خوا ئاوڕشێن کراوەو، سەرەنجام: لە تێوەڕامان و یادی خوا (فکر ذکر) بڕوایەکی پتەوو شیرین و دڵگیر دروست دەبێ.

٤- ئەو جۆرە بڕواو خواناسییە، چونکە لەسەر بنچینەی یاساکانی ژیریی دامەزراوە، دەگونجێ بۆ هەموو کەس بخرێتە ڕوو و، ئەوانەی کە گوێیان بۆ فەرمانی عەقڵ شلەو، گەردنکەچی یاساکاننی، بڕوای پێ دێنن.

٥- هەروەها بەهۆی لغاوکرانی دڵەوە، بە لغاوی ژیریی، لە بەرهەڵدایی و سنوور شکاندن دەپارێزرێ و، لە: ڕێ ون کردن و، قسەو دەعوای بێجێ (شطح) دوور دەبێ.

٦- دیسان لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەرکام لە ژیریی و دڵ، پشت بە ئایین و وەحیی دەبەستن و، خۆ بەسەر نین و، بەپێی ڕێڕوونیی خواو پێغەمبەر (صلی

الله عليه وسلم) بەڕێوە دەچن، سەریان لێ تێک ناچێو، هەر شتێک بۆ خۆیان سەریان لێ دەرنەچێ، پەنا نابەنە بەر گومان و بۆچوونی خۆیان و، پرس بە قورئان و سوننەت دەکەن.

بێگومان ئەم ڕێبازەش کە پەسندمان کردو هەڵمانبژارد، شتێک نیە داهێنراوو دۆزراوەی خۆمان بێ، بەڵکو ڕێبازێکە خوای پەروەردگاری زانا لە قورئانی قسەلەجێو بەپێزدا خستوویەتە ڕوو، بۆ هەرکەسێک کە بیەوێ بەشێوەیەکی ڕاست و دروست و بێگرێ و گۆڵ، خوای خۆی پێ بناسێ و، پێی بگات، « پێشتریش باسمان کرد: کە مەبەست لەو جۆرە تەعبیرانە، ڕواڵەتەکانیان نیەو لە قورئان و سوننەتیشدا شتی وا زۆرە، بۆ وێنە: [فَفِرُّوا إِلَى اللهِ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ] (الذاريات-٥٠). {...فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِيْ يَسْمَعُ بِهِ وَبَصَرَهُ الَّذِيْ يُبْصِرُ بِهِ....الخ} (أخرجه البخاري برقم: ٦١٣٧).

لە زۆر جێی قورئانی بەپێزیشدا، کەم و زۆر باسی ئەم ڕێبازە کراوە، بەڵام بەجوانترین و تەواوترین شێوە لە ئایەتەکانی ژمارە: (١٩٠ تا ١٩٦)ی سووڕەتی (آل عمران)دا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە لە جێیەکی دیکەدا بە تێروتەسەلیی باسی ئەم ئایەتەمان کردوە، لێرە دووبارەی ناکەینەوەو خوێنەر حەواڵەی وێ دەکەین.

کەواتە: کاکڵی مەبەست ئەوەیە کە چاکترین و ڕاستترین ڕێی بەرەو خوا چوون و بەخوا گەیشتن، بریتیە لە بیرکردنەوەو تێوەڕامان و سەرنجدان لە شوێنەوارو پەرێزی خوا (ئینسان و گەردوون)و، پاککردنەوەو شۆردنی دڵ و دەروون، لەڕێی یادی خواو پاڕانەوەو کڕنووش بردن و، لابردنی خەسڵەتە بەدەکان و گەشەپێدانی خەسڵەتە چاکەکانەوە، بەڵام ئەمانە هەموویان لەبەر تیشکی ڕێڕوونیی و ئاڕاستەکردنی قورئانی مەزن و بێسنوورو، لە ڕەخنەو ناتەواویی دوور و، سوننەتی خاوەن ڕێزو حورمەت و پڕ پیت و بەرەکەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دا.

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە: نوێژ چونکە هەرکام لەم سێیانەی تێدان- واتە بیرکردنەوەو، یادی خواو، پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە- بۆیە بە کۆڵەکەی ئایین[1] و، ڕووناکیی مرۆڤی خواناس[2] و، هۆی لە خوا وەنیزک خستنی دانراوە.[3]



---

(١) رواه البيهقي والطبراني والديلمي عن علي رفعه.

(٢) (والصَّلاةُ نُورٌ) أخرجه مسلم برقم: ٢٢٣.

(٣) (الصلاة قربان كل تقي) رواه القضاعي عن علي (رضي الله عنه)، ورواه عبو يعلي عن جابر بلفظ (الصلاة قربان) بڕوانە (كشف الخفا) ب٢، ص٣٧-٣٩ .




# کردنەوەی چەند گرێکوێرەیەک و لابردنی چەند تەمێک دەربارەی خواناسیی و بڕوا بە خوا بوون

## دەستپێك

خوێنەری خۆشەویستم!

دوای ئەوەی زانیمان بڕوا چییەو، لە بیروبڕوادا بەتایبەتیی و لە بەرنامەی ئیسلامدا بەگشتیی، چ پلەو پایەیەکی هەیەو، ڕێی پەیدابوون و فراژوو بوونی بڕوا چۆنەو، چاکترین ڕێی بەرەو خوا چوون چییە؟! دێینە سەر باسی کردنەوەی چەند گرێکوێرەیەک:

## یەك: كۆسپی گەورەی ڕێی خواناسیی و خواپەرستیی، هاوبەش پەرستییە، نەك بێبڕوایی:

زۆرکەس وا دەزانن گیروگرفت و کۆسپی گەورەو سەرەکیی سەر ڕێی بڕوا بەخوا بوون و خواناسیی، بریتیە لە بێبڕوایی (إلحاد)! بەڵام لە ڕاستییدا، کۆسپ و لەمپەری گەورەی سەر ڕێی بڕواداریی و خواناسین، نەک هەر ئێستا، لە هیچ چاخێکی دیکەی مێژووشدا بێبڕوایی نەبووە، چونکە قەت بیری بێبڕوایی ئەو توانایەی نەبووە، کە لەڕووی بیری خواناسییدا-بەو هێزو پێزەیەوە- خۆی ڕابگرێو بەرهەڵستیی (مقاومة)ی بکات، چونکە-وەک لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا سەلمێنرا- بیری بێبڕوایی (إلحاد) نە لە سروشتی مرۆڤداو نە لە سروشتی بوونەوەردا، ڕەگ و ڕیشەو جێپێیەکی نیەو، دیاردەیەکی بیژۆک و ڕیزپەڕ (شاذ)ەو، وەک دەنگ و سەدایەکی بۆڕو نەگونجاوو ناسازی نێو کۆڕسێکی ڕێک وپێک و دەنگ پێکەوە گونجاو وایە، لەنێو سروودی مسوڵمانەتیی دەربڕین و، بەرەو خوا چوونی بوونەوەردا، چونکە هەموو وردو درشتی بوونەوەر سروودی:

(بە قسەی خوا بەڕێوە دەچین          بۆ فەرمانی گەردن کەچین) دەڵێن.

بەڵکو ئەوەی کە بە کۆسپ و تەگەرەی سەرەکیی سەر ڕێی بڕواداریی و خوا بەیەکگرتن دادەنرێ، بریتیە لە بیری هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا (الشرك بالله)، واتە؛ پەرستن و بەندایەتیی کردن بۆ شتێکی دیکەش، وێڕای خوا، ئنجا جاری وایە ئەو هاوبەش پەرستیی (شرک)ە، هێندە خەست دەبێتەوە، ئەو شتەی کە لە سەرەتاوە کرابوو بەهاوبەش و هاوەڵی خوا لە پەرستراندا، لەدواییدا دەکرێ بە پەرستراوێکی تاک و سەربەخۆو، پەرستراوی ڕاستەقینە هەر دادەپۆشێ!

ئنجا هۆی ئەوەش کە هاوبەش پەرستیی ئیمتیازی توانای بەرەنگاریی و بەرهەڵستیی کردنی عەقیدەی خواناسیی هەبووەو هەیە، بەسەر بیری بێبڕواییدا، ئەوەیە کە سروشت و عەقڵی ئینسان، ئینسان ناچار دەکەن و لەسەری پێویست دەکەن، کە دەبێ خواو بەدیهێنەرێکی پەرستراو (معبود) هەر هەبێ، بەڵام وەک گوتمان؛ بڕوابوون بە نەبوونی خواو پەرستراوێک، هەڵوێستێکی نامۆ (غریب) و ناماقووڵ و نەگونجاوو ناسروشتییەو، یەکسەر ئینسان ڕەفزی دەکات، بەڵێ شەیتان و شەیتانییەکان لە ڕێی بێبڕوایی (الحاد)یەوە، زەفەر بە ئینسان نابەن -مەگەر بەدەگمەن- کە لە خواپەرستیی و یەکتایی خوا دووری بخەنەوە، چونکە بێبڕوایی دەنگێکی ناسازو نەگونجاوە، لەگەڵ سروشتی مرۆڤداو، جێپێیەکی چنگ ناکەوێ لەنێو زەوی بیرو هۆش و دڵ و دەروونی ئینسان و سروشتی بوونەوەردا، بەڵام لەڕێی گۆڕین و لادان (تغییر وتحریف)ی خواناسیی و خوا بەیەکگرتنەوە، بەهۆی تێکەڵ کردنی هاوبەش پەرستیی (الشرک)، توانیویانەو دەتوانن، زەفەری پێبەرن و ڕێی تێبەرن و لە خشتەی بەرن.

بەڵێ، هیچ کەس ناتوانێ سەرچاوەی سازگارو ڕوونی خواناسیی و خواپەرستیی لە دڵ و دوورونی ئینساندا، ئیشک و چۆڕەبڕ بکات و، کوێری بکاتەوەو شوێنەواری نەهێڵێ، بەڵام شەیتان و داروودەستەکەی لە طاغووت و زۆردارانی دنیاخۆرو بەزەبرو زۆر، توانیویانەو دەتوانن لە ڕێی لێڵکردن و شلوێکردنی، ئاوی سازگارو ڕوونی سەرچاوەی خواناسییەوە، بەهۆی تێفڕێدانی چەنگە خۆڵی هاوبەش پەیداکردن، کە لە ئینسان پەرستیی و، شت پەرستیی و، ئارەزووپەرستییدا خۆی دەنوێنێ، زەفەر بە ئینسان بەرن.

چاکترین بەڵگەی سەلمێنەری ڕاستیی ئەم قسەیەشمان، واقیعی خوێنراوەو بەرچاوی مێژووی کۆن و نوێی دەبەرێک ڕاچوونی بڕواو کوفر (صراع الإیمان والکفر)ە.

ئەوەتا طاغووتێکی وەک فیرعەون کە گوتوویەتی: ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٢٤﴾ (النازعات- ٢٤)، واتە: من پەروەردگاری هەرەبەرزتانم و، بە مووسا (علیه السلام)ی گوتوە:

﴿قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ۝٢٩﴾ (الشعراء-٢٩).

واتە: بێگومان ئەگەر بێجگە لەمن پەرستراوێکی دیکە بگری، ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم، بەڵێ فیرعەونێکی ئاوا وەک قورئان فەرموویەتی و مێژووش پشتگیریی کردوە، چەند بتێکی هەبوو ون پەرستوونی:

﴿وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ ۝١٢٧﴾ (الأعراف-١٢٧).

واتە: زلەزلانی گەلی فیرعەون-بە فیرعەونیان- گوت: ئایا واز لە مووساو گەلەکەی دێنی خراپە لە زەویدا بکەن و، خۆت و پەرستراوەکانت وێڵ بکەن؟!

کەواتە: فیرعەونیش کە داوای پەروەردگارێتیشی کردوە، نەیتوانیوە نکووڵیی لە ئەسڵی بڕوا بەخوا بووندا بکات، بەڵام لەڕێی خۆ بە پەرستراو دانان و، هاوبەش (شریک) بۆ خوا پەیداکردنەوە، عەقیدەی خواپەرستیی تێکداوەو شێواندوەو، بەهۆی ئەوەشەوە خەڵکەکەی خەڵەتاندوە.

دیسان طاغووت و فیرعەونەکانی ئەم سەردەمەش، هەرچەندە بە کردەوە لافی پەروەردگارێتیی لێ دەدەن و، ناهێڵن بەرنامەی خوا حوکم بکات و، ڕێچکەیەکی لەولاو لاڕا هێنراو، یان خۆکردیان، کردۆتە بەرنامەی ژیانی خەڵکی و، دژی تایبەتییترین[1] مافی خوایەتی (حق الألوهیة) وەستاون، لەهەمان کاتیشدا بەدەگمەن ڕێدەکەوێ، لێیان ببیستری بێبڕوایی دەربڕن و،

---

(١) کە بریتییە لە یاسادانان (التشریع) و دادوەریی و حوکمڕانیی کردنی موتڵەق، بەسەر بەندەکانی خوادا.

ده‌بینی خۆیان به‌ بڕوادار پیشان ده‌ده‌ن و، ڕه‌نگه‌ هه‌ندێک جاران، بۆ زیاتر فریودان و خه‌ڵه‌تاندنی خه‌ڵکی، دوو ڕکات نوێژی ڕیابازانه‌ش بکه‌ن!

به‌ڵێ طاغووته‌ خۆ به‌زل زانه‌کانی ئه‌م ڕۆژگاره‌ش، وه‌ک فیرعه‌ونه‌ کۆنه‌کان، ناتوانن و زات ناکه‌ن بڵێن: خوا نیه‌و دان به‌ بوونی خوادا دێنن، به‌ڵام ئه‌وه‌نده‌ هه‌یه‌ خۆشیان به‌ هاوتای ده‌زانن!!

ئنجا دوایی دێن بۆ چاوبه‌ستنی خه‌ڵکی، مه‌ودایه‌کی زۆر که‌مبه‌رو گچکه‌ له‌ ژیانی ڕۆژانه‌ی خه‌ڵکی، بۆ ئایین و به‌رنامه‌ی خوای په‌روه‌ردگار ده‌هێڵنه‌وه‌ (که‌ بریتیه‌ له‌و لایه‌نه‌ گیانییه‌ ته‌سکه‌ی که‌ خۆی له‌ به‌ڕێوه‌بردنی[1] پێنج دروشمه‌کاندا ده‌نوێنێ) و هه‌موو بواره‌کانی دیکه‌ی ژیانی تاک و کۆمه‌ڵ، وه‌ک په‌روه‌رده‌و فێرکردن و سیاسه‌ت و ئابووریی و کۆمه‌ڵێیه‌تیی، به‌پێی ڕێچکه‌و بیردۆزه‌یه‌کی له‌ملاو لاڕا هێنراو، یان خۆکرد، به‌ڕێوه‌ ده‌به‌ن.

هه‌ڵبه‌ته‌ هه‌ر بۆیه‌ش ده‌بینین له‌ ئایه‌ته‌ به‌پێزه‌کانی قورئانی به‌ڕێزدا، به‌ده‌گمه‌ن نه‌بێ، مه‌سه‌له‌ی بێبڕوایی (إلحاد) نه‌خراوه‌ته‌ سه‌ر خوانی باس و لێکۆڵینه‌وه‌وه‌و ئه‌وه‌ی که‌ زۆر پێداگیریی له‌سه‌ر کراوه‌، بریتیه‌ له‌ پاککردنه‌وه‌ی بیروبڕوای خوا به‌یه‌کگرتن (عقیدة التوحید) له‌ خشپ و خاڵ و لیته‌ولاڵی هاوبه‌ش په‌یداکردن، چونکه‌ وه‌ک گوتمان: بێبڕوایی خۆی له‌خۆیدا، پووچاوه‌و بێ پشت و په‌نایه‌.

ئنجا منیش له‌ سۆنگه‌ی ئه‌وه‌وه‌ که‌ هه‌ستم به‌م ڕاستییه‌ ده‌کردو، ده‌مزانی که‌ هۆی ده‌ردی بێبڕوایان له‌خودی (بڕوا به‌خوا بوون)دا نیه‌و، له‌و هۆیانه‌ دایه‌، که‌ ڕووی بیری خواناسیی و خوا به‌یه‌کگرتن دزێوو ناشیرین ده‌که‌ن و،

---

(١) دیاره‌ ئه‌میش به‌شێوه‌یه‌کی زۆر ناته‌واوو نیوه‌چڵ، ئه‌گه‌رنا وه‌ک له‌ مه‌وسووعه‌ی: (خواپه‌رستیی ئیسلامیی)دا، ڕوونمان کردۆته‌وه‌، ئه‌و پێنج دروشمانه‌، ئه‌گه‌ر وه‌ک خۆیان فام بکرێن و ئه‌نجام بدرێن، یه‌کجار گه‌وره‌و گرنگ و کاریگه‌رن..
شایانی باسیشه‌ مه‌وسووعه‌ی: ناوبراو له‌چاپی دووه‌میدا به‌چوار به‌رگ چاپ کراوه‌ته‌وه‌.

لەبەرچاوانـی دەبیژێنـن و، خەڵکـی بـەرەو بتپەرسـتیی و هاوبـەش پەیدا کـردن، هـان دەدەن، بەڵـێ لـە سۆنگەی ئـەوەوە هەرچەنـدە لـە ڕاسـتییدا ئـەم کتێبـە بـە نیـازی پووچاندنـەوەی بیـری بێبـڕوایی دانـراوە، بـەڵام خـودی پووچاندنـەوەو بەدرۆخستنەوەی بیری بێبـڕوایی، نیزیکەی سێیەکی کتێبەکەی گرتوە، بەشـی زۆری بۆ ڕوونکردنـەوەی چەمکـی ئاییـن و، چۆنیەتـی پەیدابوونـی و حیکمەتـی نێررانـی و، ڕەسـەنایەتیی بیری خواناسیی و، گرنگیی و پێویستیی خواناسیی و، دینداریـی و...هتـد، تەرخـان کـراوە.

## دوو: بڕواداریی دژی ستەمە، بەڵام بێبڕوایی و ستەم، دوو کاڵەکی بڕکێکن

لەنێو چینی نیمچە ڕۆشنبیرو خۆ بە ڕۆشنبیرزانی لە ئایین بێهەواڵی فەقیرحاڵدا وا باوە، کە هەموو دەمێ هێزو دەستەڵات-یان رژێم و حوکم- لەگەڵ بیری ئایینیدا: شان بەشان و دەستەملانی یەکدی بوو ون و، پشتگیریی یەکدییان کردوە! ئنجا لەم تێڕوانین (تصور)ە هەڵەو خواروخێچەوە، گەلێک قسەو قسەلۆکی بێکاکڵ و نێوەڕۆکی وەک (ئایین چەکی دەستی زۆردارانە بۆ چەوساندنەوەی هەژاران)، (پیاوانی ئایین داردەست و نۆکەری چینی ستەمکارو خوێنمژن)، (ئایین تلیاکی گەلانە)، لە وتارو کتێب و نووسراوانیاندا ڕیز دەکەن.[1]

بەڵام مەگەر ئەو پەندە کوردییەی دەڵێ: (کەسێک کەسێکی خۆش نەوێ خەونی گولییەی[2] پێوە دەبینێ) ئەم هەڵوێستەی ئەو نیمچە ڕۆشنبیرو خۆ بە ڕۆشنبیرزانانەمان بۆ تەفسیر بکات!

دەفەرموون سەرنج بدەن!

سەرنجی مێژوو بدەن! بزانن چۆن بە بەراوەژووەوە: هەموو دەمێ هێزی زۆردارو طاغووت و خوێنمژان، کۆسپ و تەگەرەی سەر ڕێی کاروانی بڕواو خواناسین بووەو، دژی بەرەی ئایین دۆست و خواپەرست بووە:

(نەمروود) کە داوای پەروەردگارێتیی بەسەر خەڵکیدا دەکرد، بوو بە چەپەرو لەمپەری سەر ڕێی شوڕشگێڕێکی خواناسیی وەک (إبراهیم (علیه السلام)) و کاتێک ئیبراهیم پەیامی خوای پێڕاگەیاند و تێی گەیاند،

---

(١) بۆ وێنە سەرنجی: (أصول الفلسفة الماركسية) بدە، ب١، ل٢٤٢-٢٤٣، و سەرنجی (أسس الفلسفة الماركسية) بدە، ل١٠-١١ نووسینی ف. افاناسییف.

(٢) گولیی: گەڕیی، کە نەخۆشییەکی زۆر پیس و خراپە.

کـه بـه‌س خـوای به‌دیهێنـه‌رو پـه‌روه‌ردگار لـه پەروه‌ردگارێتیـی ده‌وه‌شـێته‌وه‌و، شـایانی په‌رسـترانه‌و، هیـچ کـه‌س و هیـچ شـتێک بـۆی نیـه‌و نالـوێ بکرێتـه پـه‌روه‌ردگارو په‌رسـتراو، نه‌مـروود پـاش به‌زیـن و وه‌بـن که‌وتنـی لـه مه‌یدانـی وتووێژو ملانـه‌ی[١] دم به‌دمـه‌دا، وه‌ک عاده‌تـی هه‌میشـه‌یی طاغووتـه خۆ بـه زل زانـه‌کان، په‌نـای بـرده بـه‌ر زه‌بـرو زۆرو هه‌ڕه‌شـه‌و گوڕه‌شـان و، ئاگرێکـی نێڵ[٢] دراوی سـازکردو ئیبراهیمـی خه‌باتگێڕو کۆڵنـه‌ده‌ری خواناسـیی تێهاویشـت!

وه‌ک خـوای زانـا فه‌رموویه‌تـی: ﴿ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ (الأنبيـاء: ٦٦-٦٨).

واته:-ئیبراهیـم- گوتـی: ئایا چۆن بێجگـه له‌خوا شتێکی وا ده‌په‌رستن کـه هیـچ قازانـج و زیانێکتـان پـێ ناگه‌یه‌نـێ؟ بێزارم لـه خۆتـان و لـه‌وه‌ی بێجگـه له‌خـوا ده‌یپه‌رسـتن، ئـه‌وه بۆچـی نافامـن؟! -ده‌سـت و پێوه‌نده‌کانـی نه‌مـروود- گوتیـان: بیسـووتێنن و په‌رسـتراوه‌کانتان سـه‌رخه‌ن، ئه‌گـه‌ر ده‌تانـه‌وێ شـتێک بکه‌ن-کـه چاره‌یه‌کـی تێدا بـێ-.

فیرعه‌ونیـش کـه نـه‌ک هـه‌ر داوای په‌روه‌ردگارێتیـی به‌سـه‌ر خه‌ڵکیـدا ده‌کرد، به‌ڵکـو ده‌یگـوت: ﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾ مـن پـه‌روه‌ردگاری هه‌ره‌به‌رزتانـم! کاتێـک مووسـای خواپه‌رسـت و تێکۆشـه‌ر بـوو بـه پێغه‌مبـه‌ری خـوا (علیـه السـلام) و، هه‌ڵگرتـن و به‌رزکردنـه‌وه‌ی مه‌شـخه‌ڵی بڕواداری و یه‌کتاپه‌رسـتیی پـێ سـپێرراو، له‌گـه‌ڵ فیرعه‌ونـی نه‌زانـی خۆ پـێ زۆردا، تێـک گیـراو، داوای لێکـرد کـه چیـدی گه‌لـی چه‌وساوه‌ی (بنـي إسـرائیل) نه‌چه‌وسـێنێته‌وه‌و ئازادیـان بـکات؛ ﴿ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ﴾ (طـه-٤٧)، فیرعه‌ونیـش

---

(١) ملانه: زۆران، مصارعة.

(٢) نێڵ دراو: چاک داگیرسێنراو و کڵپه‌سه‌ندوو کراو.

نەمروود ئاسا: پێشەکی لە مەیدانی وتوێژدا لە مووسا (علیه السلام) هاتە پێش، بەڵام کاتێک لەو مەیدانەدا باریێ[1] بنەوەی پێ بڕواو، قسەی نەما، پەنای بردە بەر تاقە ڕێی چارەسەرو، دەستی کرد بە خۆ هەڵسووڕاندن و چاو سوورکردنەوەو گەف کردن و گوتی:

﴿ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (الشعراء-٢٩).

بێگومان ئەگەر بێجگە لەمن پەرستراوێکی دیکە بگری، ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم!! واتە تۆش دەگرم وەک زۆر گیراوی دیکە.

دیسان هەرکام لە (نوح) و (هود) و (صالح) و (شعیب)یش کاتێک خوا کردنیە نێرراوی خۆی و، پەیامی بەندایەتیی بۆ خوا کردن و لە کۆیلایەتیی رزگاربوونی پێدا ناردن، (ملأ)ی (کافر) و (مستکبر)ی گەلەکانیان بەرەنگاریان بوون و کەوتنە دژایەتیی و بەرهەڵستیکردنی بانگەوازەکەیان، وەک خوا فەرموویەتی:

١- ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥٩﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٦٠﴾ ﴾ (الأعراف: ٥٩-٦٠).

واتە: بێگومان نووحمان ڕەوانە کرد بۆ لای گەلەکەی، ئنجا گوتی: ئەی گەلی من! بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، جگە لەوی چ پەرستراوتان نین... زلەزلانی[2] گەلەکەی گوتیان:

---

(١) باریێ بنەوەی پێبڕا: ژێرکەوت، بەزیی

(٢) (الملأ: الرؤساء... وقیل أشراف القوم ووجوههم ورؤساؤهم، ومُقدَّموهم الذین یُرجع إلی قولهم)، واتە: (ملأ) یانی: سەرۆکەکان.. هەروەها گوتراوە: یانی زلەزلەکانی کۆمەڵ و سەران و سەرکردەو پێشڕەوانیان، ئەوانەی قسەڕۆیشتوون و پرسیان پێدەکرێ. بڕوانە: فەرهەنگی (لسان العرب)، ب١، ل١٥٧ نووسراوی: ابن منظور.

٢- بەڕاستی ئێمە دەتبینین و پێمان وایە لە گومڕاییەکی ئاشکرادای.

﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ (الأعراف: ٦٥-٦٦).

واتە: هەروەها ناردمانە لای گەلی عاد، هوودی برایان، گوتی: ئەی گەلەکەم! بەندایەتیی خوا بکەن، جگە لەوی چ پەرستراوتان نین... زلەزلە کافرەکانی گەلەکەی گوتیان: بەڕاستی ئێمە لە نەفامییدا دەتبینین و، ئێمە گومانمان وایە لە درۆزنانی.

٣- ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ... ﴿٧٣﴾ قَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا مِن قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ ۚ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا بِالَّذِي آمَنتُم بِهِ كَافِرُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾ (الأعراف:٧٣، ٧٥، ٧٦).

واتە: هەروەها بۆ لای گەلی (ثمود) صالحی برایانمان نارد، گوتی: ئەی گەلی خۆم! خوا بپەرستن، جگە لەوی چ خواتان نین.. زلەزلە خۆ بە زلگرەکانی گەلەکەی بەوانەیان گوت کە لە چەوساوەکان بڕوایان هێنابوو: ئایا دەزانن کە صالح لەلایەن پەروەردگارییەوە ڕەوانە کراوە؟ گوتیان:-بەڵێ- ئێمە بڕوامان بەو-ئایین-ە هەیە کە پێی نێردراوە، خۆبەزلگرەکان گوتیان: ئێمە بێبڕواین سەبارەت بەو-ئایین-ەی بڕواتان پێیەتی.

٤- ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ... ﴿٨٥﴾ ۞ قَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا مِن قَوْمِهِ لَنُخْرِجَنَّكَ يَا شُعَيْبُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ... ﴿٨٨﴾ ﴾ (الأعراف: ٨٥، ٨٨).

واتە: هەروەها بۆ لای گەلی (مەدیەن) شوعەیبی برایانمان نارد، گوتی: ئەی گەلی خۆم! خوا بپەرستن، جگە لەوی چ پەرستراوتان نین... زلەزلە خۆ بە زلگرەکانی گەلەکەی گوتیان: ئەی شوعەیب! یان تۆو ئەوانەی لەگەڵ تۆ بڕوایان-بە خوا- هێناوە، لە ئاوەدانیی خۆمان دەرتان دەکەین، یان حەتمەن دەبێ بگەڕێنەوە نێو ئایینەکەمان.

وەک دەبینین: هەڵوێستی هەڵگرانی پەیام و بانگەوازی خوا، بەدرێژایی مێژوو یەک جۆرە هەڵوێستە؛ ڕاپەڕین دژی طاغووت و زۆردارانی خۆبە پەرستراوزان و بانگەوازکردن بۆ گەردن کەچیی و بەندایەتیی بۆ خوای تاک و بێهاوەڵ، هەروەها دەبینین: هەڵوێستی بێبڕوایان-کە بە درێژایی مێژوو لە چینی ستەمکارو خۆ بەزلگردا خۆی ڕانواندوە- لە هەموو قۆناغەکانی مێژوودا یەک جۆرە؛ ڕەفزکردنی بانگەوازی خوا بەیەکگرتن (توحید)و گاڵتەکردن بە هەڵگرانی پەیامی خواو، پەنابردنەبەر هەڕەشەو گوڕەشەو چاو سوورکررنەوەو خۆ ڕاپسکاندن[1]!!

هەروا بەم شێوەیە کاروانی چەوسێنراوانی خواناس و تێکۆشەرو شۆڕشگێڕ، بەڕێی پڕ دڕک و داڵ و بە ئێش و ژانی یەکتاپەرستییدا دەڕوات و، چینی زلەزلان (ملأ)ی بێبڕوا (کافر) و خۆبەزلگر (مستکبر)، دەبێتە کۆسپ و لەمپەری سەر ڕێگای و بەربینگی[2] پێ دەگرێو شەڕی پێ دەفرۆشێ، لەبەر هیچ نا لەبەر ئەوەی نەبێ کە بە هاتنی هەق، بەرەی ناهەق بەرژەوەندییان لێ تێک دەچێو، بە چریکەی (الله أکبر و لا إله إلا الله) کۆشکی ستەم و بێدادییان دەڕووخآو، بەچەکوچی دەستی بەرەی بڕوای ڕەش و ڕووت و چەوساوە، مێشکی ئایین و ڕێبازی بەتاڵیان دەپڕژێ...

هەتا نۆرە گەیشتە سەر دوایین هەڵگری پەیامی خوا (محمد)ی پێشەوا (صلی الله علیه وسلم) ، ئەویش بە دەستووری پێشوو، لەگەڵ

---

(١) خۆڕاپسکاندن: ڕاسان، پەلاماردان.

(٢) بەربینگی پێدەگرێ: یەخەی پێدەگرێ، ڕێی پێدەگرێ.

چینی زلەزلانی بێبڕواو خۆبەزلگردا، بە خۆی و بەو کۆمەڵە چەوساوەو بەشخوراوەی لەگەڵی دا بوو، ڕووبەڕوو بۆوە.

بەڵێ پێغەمبەری کۆتایی (صلی الله علیه وسلم) لەو ڕۆژەوە کە دروشمی ((قولوا لا إله إلا الله تفلحوا)) ی هەڵگرت، لەگەڵ بەرەی[1] کوفر دەبەرێک ڕاچوو، ئەوە بەرەیەی طاغووت و خۆبەزلگرو چەوسێنەرو، دەست تا ئانیشکان بە خوێنی چەوساوان سووری وەک ئەبووجەهل و ئەبوو سوفیان[2] و نەضری کوڕی حاریث و ئومەییەی کوڕی خەلەف و وەلیدی کوڕی موغەییرەو عوتبەو شەیبەی کوڕانی ڕەبیعەو ...هتد. پێکیان هێنابوو، ئنجا پێغەمبەری نەخوێندەواریش (صلی الله علیه وسلم) وەک برایانی پێشووی و بگرە لەوانیش خەستتر، کەوتە بەر لووزەوی تانەو تەشەرو ڕەخنان و کەوتە نێو تەندووری چەندان جۆرە ئازارو ئەشکەنجەی جەستەیی گیانیی، لە گاڵتەپێکران و قسەپێگوتران و، بوختان بۆ هەڵبەستران و، بەشێت و جادووگەرو فاڵچیی و شاعیر لەقەڵەم دران و، گەف و لاف لێکران و، خۆڵ بەسەر سەری داکران و، ڕیخ و ڕیخۆڵە لەسەر ملی داندران و، بەردباران کران و، بەرۆک گیران و، برسیی کران و، ترسێنران و، هەوڵی کوشتن دران و، دەربەدەر کران!!

هەڵبەتە لە هەموو ئەم جۆرە ئەشکەنجە جەستەیی و گیانییانەدا، یان لە زۆربەیاندا، ئەو چەوسێنراوەو ڕەش و ڕووتانەشی لەگەڵدا بوون، کە هەڵگرتنی مەشخەلی خوابەیەکگرتن و هاوەڵێیەتیی پێغەمبەریان، بەسەر دنیاو ئارەزووەکانیدا هەڵبژاردو، بە دنیایان سەلماند: کە ئەو فیداکارو، سەربازەی

---

(١) {أَيُّهَا النَّاسُ! قُولُوا: لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ تُفْلِحُوا} (أخرجه أحمد برقم: ١٦٦٥٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين)، واتە: هۆ خەڵکینە! بڵێن: جگە لەخوا چ پەرستراو نین، سەرفرازو بەختەوەر دەبن.

(٢) دیارە دوایی (أبو سفیان) مسوڵمان بووە، بەڵام بە ناچاریی وەک لە بەسەرهاتی مسوڵمان بوونەکەیدا هاتوە، پاشانیش دەوری چاکیشی بینیوە، بەتایبەت لە بواری جەنگ و هاندانی مسوڵماناندا.

عەقیدەی ئایینی و خواناسیی دەیڕەخسێنێو باری دێنێ، شوێنکەوتووی هیچ بەرنامەو ڕێبازێکی دیکە، نەک هەر شان لەشانی نادات، تۆزی ڕێیەشی ناشکێنێ.

بەڵێ بەرەی کوفری زۆردارو خوێنمژ، ئەوەی لەدەستیان هات، لەگەڵیاندا کردن و دوا تیری تیردانی خۆیانیان پێوە نان، هەتا لە ئەنجامی سەدان جۆرە فێڵ و پیلاندا، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، پاش ئەوەی زۆر بە جیددیی لە تەگبیرێکی نوێ خەفتان و وآکەوتن[1]، کە لە سێ کاران یەکیان ئەنجام بدەن، سەبارەت بە پێغەمبەری تێکۆشەر:

یان گرتن.

یان کوشتن.

یان دەرکردن.

وەک خوای دەسەلێتدار فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ﴾ (الأنفال-٣٠).

واتە: هەروەها یادی ئەو کاتە بکەوە، کە ئەوانەی کافر بوون پیلانیان بۆ دادەنای، تاکو بتگرن، یان بتکوژن، یان دەرت بکەن.

بەڵام -بە ویستی خوای پەروەردگار- لە ئاکامدا، ئەمامی ڕەنج و خەبات و شۆڕشگێڕیی پێغەمبەرانە، بە ئارەق و خوێنی سەربازانی ڕێی خوا، فراژوو بوو و بوو بە درەخت و بەری گرت و، کۆمەڵگەی خوا بەیەکگر (مُوَحِّد) پێک هێنراو، دەوڵەتی بڕوا دامەزراو، دەرگای بتخانان داخراو، کۆشکی طاغووتان ڕووخێنراو، چینی زلەزلانی کافرو لاڕێو خۆبەزلگر، بە زەبوونیی و شەرمەزاریی بەخۆیان و بە ستەم و بێدادیی و خراپەو تاوانەوە، بەرەو زبڵدانی مێژوو بەڕێکراو، سەد تف و لەعنەتی لێکرا.

---

(١) وێکەوتن: تەگبیریان کردو نەخشەیان دانا.

ئنجا ئێستاش ئەو سروودەی (لا إله إلا الله والله أكبر) لە هەرکات و جێیەکدا بەو چەمک و ئامانجەوە کە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) پێی بەگژ طاغووت و زۆردارانـدا دەچوون، بۆ گەل دەربخرێو بەگوێی طاغووتانـدا بـدرێ، هـەم گەلیش وەخەبەر دێو، هـەم هەمـان هەڵوێستیش کە بەدرێژایی مێژوو لە نەمروود و فیرعەون و ئەبووجەهلەکان بینراوە، لە طاغووتەکانی سەردەمیش دەبینرێ!

بەڵام کە ئەمڕۆ دەبینین بە ڕواڵەت هەمان دروشمی (لا إله إلا الله والله أكبر) لەسەر مینبەرو بڵیندگۆیەکان، بەدەنگی بەرز دەگوترێ! ئەمما کەس نابینین نێوچاوانی پێ گرژ بێو، کێچی پێ بکەوێتە کەوڵی و قەڵس بێ، لەبەر ئەوە نیە کە سروشتی طاغووتەکانی سەردەم گۆڕاوەو، وازیان لە ستەم و خراپەو بێدادیی و خۆ بەپەرستراو زانین هێناوە! دیسان لەبەرئەوەش نیە کە سروشتی ئایینی خوا، وەک خۆی نەماوەو لە زۆردارو طاغووت ڕەتێنییەوە، بۆتە تووک نەرمیلەو بەهیچ کەس نالْی برۆ دواوە! بەڵکو وا دیارە گۆڕین و لادان (تغيير وتحريف) لە چەمک و مەبەست و ئامانجی دروشمی ناوبراودا ڕووی داوە!

بەڵێ بە دەردی پێشینان دەڵێن؛ ئەو ماستە بێ موو نیە! وا دیارە ئەو ماناو مەبەست و ئامانجەی کە نەمروود و فیرعەون و ئەبووجەهل لە: (لا إله إلا الله والله أكبر)ی ئیبراهیم و مووساو موحەممەددا (عليهم الصلاة والسلام) دەیاندی، طاغووتەکانی ئێستا لە: (لا إله إلا الله والله أكبر) ی بەناو پێشەوایەکانی ئێستای ئاییندا[1]، هەستی پێ ناکەن و، دەزانن کە چەمک و ئامانجی ئەم دروشمەی ئێستا لە ڕێی بڵیندگۆیەکانەوە، بە دەنگی بەرز لەسەر مینبەرو منارەکان دەگوترێ، هێندە شتێکی گچکەو نابووت و بێکاکڵە، ئەگەر هەزارساڵی دیکەش بەم شێوە بگوترێ زیانیان

---

(١) بێگومان هەموو دەمێ ئایینی خوا پێشەوایانی ڕێک و ڕاستیشی هەر هەن، واتە ئێمە لێرەدا بەس مەبەستمان لەناو پێشەوایانی ئایین فرۆشە، نەک هەموو پێشەوایەک.

لێ نادات و، بەرژەوەندیی و کورسیی و سەروسامانیان ناخاتە هیچ جۆرە مەترسییەکەوە!

خوێنەری خۆشەویست!

ئێستاش پاش ئەم کورتە لێکۆڵینەوەو سەرنج لە مێژوودان و ڕامانە، ڕاستیی ئەو قسەیەی کە کردمانە سەرباسی ئەم مەسەلەیە، وەک ڕۆژی ڕوون ئاشکرا بوو و سەلمێنرا کە: (بڕواداریی دژی ستەم و طاغووتە[١]، بەڵام بێبڕوایی و ستەمکاریی، دوو کاڵەکی بڕ کێکن).

بەڵێ ستایش بۆ خوا سەلمێنرا: کە بە درێژایی مێژوو عەقیدەی بڕواداریی و خواناسیی، نەک هەر هەرگیز لەگەڵ طاغووت و ستەمکاراندا دانووی[٢] نەکوڵیون و پێکەوە نەژیون، بەڵکو لەهەر کات و شوێنێکدا ئەو دووانە- ئایین و طاغووت- بەڕاستیی و واقیعیی هەبووبن، حەتمەن دەبەرێک ڕاچوون و[٣]، دەستەویەخەی یەکدی بوو ون و، لە ئەنجامدا هەریەکیان بوو وەو ئەوی دیکەیان لە بەین چووە.

هەروەها سەلمێنراش: کە بە پێچەوانەی خەیاڵی خاوو قسەی بزڕ کاوو گومانی ناتەواوی خۆ بە ڕۆشنبیرزانانەوە، ئەوەی کە هەموو دەمێ نۆکەرو کوڵکەرو[٤] جلشۆری طاغووت و ستەمکارانی بەزەبرو زۆرو دنیاخۆر بووەو، هەموو دەمێ تلیاکێک بووە بیروهۆشی گەلانی پێ تەزێنراوەو، چاوپێچکێک بووەو چاوی چەوساوانی پێ بەستراوەو، تەڵەیەک بووە

---

(١) (الطاغووت: كل ما عبد من دون الله (عليه السلام) وكل رأس في الضلال طاغوت). واتە: طاغووت هەر شتێکە کە بێجگە لەخوای دەستەڵاتدارو پایەدار دەپەرسترێ و، هەرکەسێک سەرۆک و پێشەوای گومڕایی بێ طاغووتە. (لسان العرب)، ب٨، ل٤٤٤.

(٢) دانووی نەکوڵیون: نەگونجاوە، مەداری نەکردوە، پێکەوەنەسازان.

(٣) دەبەرێک ڕاچوون: بەگژیەکداچوون، بەرەنگاری یەکدی بوون.

(٤) کۆڵکەرو جلشۆر: کۆڵکردن، خۆشۆردن، بەرگ و پۆشاک شۆردن.

خەڵکی ڕەش و ڕووتی پێ گیراوەو، فێڵێک بووە لە چینی زەحمەتکێش کراوەو پێی لە خشتەبراوەو، گازێک[1] بووە دەماری عیززەت و مەردایەتیی پێ لە خەڵکی دەرکێشراوەو خەسێنراوە: بیری هاوبەش پەرستیی و بێبڕوایی و دوور لەخوایی بووە، چونکە بابای طاغووت و زۆردار هەتا خوا بە یەکگرتن- بەڵام بەشێوەیەکی ڕاست- لەنێو گەلدا هەبێ، مەودای نابێ داوای پەرستراوێتیی بکات و بڵێ: بمپەرستن، بەڵام کاتێک دڵ و دەروونی گەل لە بڕوا خاڵیی دەبێو، دەبێتە شاری بێساحێب، بابای طاغووت، هەل و دەرفەتی لێ هەڵدەکەوێ کە بڵێ: جا مادام چ پەرستراو نەبن، ئەوە من پەرستراوتانم و بمپەرستن! بەو پێیە دەبێتە طاغووت و ستەمکار بەسەریانەوە.



---

(١) گاز: ئامێرێکە وەک پلایز شتی پێ دەگیرێ.

سێ: بڕواو زانیاریی و، بێبڕوایی و نەزانیی، پێكەوە جۆشدراون:

یەكی دیكە لەو قسە بێسەروپێو هەڵێنەی، كە لەنێو كەسانێكی خۆ بە ڕۆشنبیرزان و لە واقیعدا نەفام و كاڵفامدا، باون و، خۆیان پێوە بادەدەن و كۆڕو كۆبوونەوە بێخێرەكانیان پێ گەرم دادێنن و، دڵی خۆیانیان پێ خۆش دەكەن و كەسانێكی خۆیان ئاسای نەفام و بێتامی پێ جۆش دادێنن و، گۆش دەكەن، ئەو قسە قرپۆك و پووچەیە كە دەڵێ: بڕوا بەخوا بوون و خواناسیی، لەگەڵ بەرەوپێش چوونی زانیاریی و شارەزاییدا، پەیوەندییەكی پێچەوانەیی (علاقة عكسیة)ی هەیە، واتە: هەتا زانیاری گەشە بكات و نهێنییەكانی بوونەوەر پەردەیان لەسەر لابچێو مرۆڤ پتر چاوی بكرێنەوە، بیری خواناسیی لە كورتیی دەدات و پاشەكشە دەكات!![1].

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم مەسەلەیەش، وەك مەسەلەی پێشوو، چاوی تەماویی و زەیینی شێواوی بێبڕواو لە ئایین بێهەواڵێن، سەرەوبن و لینگەو قووچی دیوەو ڕاست بەراوەژووەوەیە، واتە؛ ئایین و خواناسیی وا لە ئینسان دەكات بیربكاتەوەو ڕامێنێو سەرنج بدات و، هەوڵی دۆزینەوەی یاساكانی بوونەوەرو پەی بردن بە ڕازو نهێنییەكانی بدات، بەڵام هەروەك چۆن ستەم و زۆر و چەوساندنەوەو بیری چەوتی بێبڕوایی، دوو ڕۆڵەی دایك و بابێك و، دوو كاڵەكی برِكێك بوون، نەزانیی و بێئاگایی و دواكەوتووییش، لەگەڵ بیری بێبڕواییدا هەمان جۆرە پەیوەندییان هەیە.

بەڵێ هەروەك چۆن طاغووت و زۆردارەكان بەدرێژایی مێژوو، بیری بێبڕواییان كردوە بە چەك و چاوپێچكی خۆیان؛ چەك بۆ لێدانی بەرەی بڕواو، چاوپێچك بۆ چاوبەستی گەل، بیری بێبڕواییش بە درێژایی مێژوو،

---

(١) بۆ وێنە بڕوانە: (أصول الفلسفة الماركسیة)، ب١، ل٢٣٧،٢٤١. و بڕوانە كتێبی: (أسس الفلسفة الماركسیة)، ل١٠ ط٤.

نەزانیـی و بێئاگایـی و بەجێماویـی بـە تاقـە پاڵپشـت و دەسـتەگیرەی خـۆی دانـاوە[1]!

بـە واتایەکـی دی؛ هـەروەک چـۆن بـە درێژایـی مێـژوو سـتەم و بێبـڕوایی (الظـلم والکفـر) پێکـەوە، وەک دوو دەمـی مقەسـتێک بـوو ون، بـۆ بڕیـن و پارچەپارچەکردنـی گـەل، بێبـڕوایی و نەزانییـش بـە هەمـان شـێوە.

ئنجـا هەڵبەتـە پێکـەوە گونجـان و ئاشـنابوونی خواناسـیی و زانیاریـی لەلایەکـەوەو، بێبـڕوایی و نەزانییـش لەلایەکـی دیکـەوە، شـتێکی ئاسـایی و چـاوەڕوان کـراوەو، هەڵقولێـوی جـۆرو چۆنیەتـی سروشـتی هەردووکیانـە.

چونکـە بیرکردنـەوەو ڕامـان و پشـکنین و لێکۆڵینـەوە، دەربـارەی بوونـەوەرو شـارەزابوون لـە یاسـاو دەسـتووره خواییەکانـی، دەبێتـە هـۆی زیاتـر ئاشـنابوون بـە پەرێزو موڵکـی خـواو، پتر پەی بردن بە نازو نیعمەتە بێسنوورەو نەژمێرراوەکانی، بێگومـان لـە ئەنجامـی ئەمەشـدا، مرۆڤ باشـتر سیفەتە بەرزەکانـی خـوای بـۆ دەردەکـەون و چاکتـری دەناسـێ.

بەڵام بە پێچەوانەوە: نەزانیی و نەشـارەزایی سـەبارەت بە سروشـت و دەوروبەرو بێئاگایـی لـە یاسـاو ڕازو نهێنییەکانـی موڵکـی خـواو، پـەی نەبـردن بـە نـازو نیعمەتەکانـی، سـەردەکێشـێ بـۆ لـە خـوا بێهەواڵیـی و، ئەمیـش سەردەکێشـێ بـۆ دوودڵیـی و گومـان و...هتـد.

بەڵێ: وەک مێژووی کۆن و نوێو واقیعی ئێستا دەری خستوە، نەزانیی و بیرکورتیی و زەین کوێریی، چاکترین هۆی ڕێخۆشکەرو زەمینە سازکەری بلێوبوونەوەو پەرەستاندنی ئەو بیرە بێبـڕواییە بووە، کە وەک گوتمان: هەموو دەمێ نۆکەرو کوڵکەرو جلشۆرو، چەک و چاوپێچکی[2] طاغووتانی چەوسێنەرو فریودەر بووە!!

---

(١) لەمەوسوعەی: (ئیمـان و ئیلحـاد)دا بەدرێژیـی و بەڕوونیـی بەرپەرچـی ئـەو قسـەیەی بێبڕوایان دراوەتەوە.

(٢) چاوپێچک: هەرشتێک چاوی مرۆڤی پێ ببەسترێ.

ئێستاش: چونکە ئێمە وەک هەڵگرانی دروشمی دژ ئایینی و بێبڕوایی کەیفمان بە قسەو دەعوای بێبەڵگە نایەت با چەند وێنەیەک بە نموونە لە مێژووی کۆن و نوێ و، واقیعی ئێستای دەبەرێک ڕاچوونی بڕواو کوفر، بێنینەوە:

## وێنەی یەکەم: نەمروود و ئیبڕاهیم (علیه السلام)

لە کاتێکدا ئیبڕاهیم (علیه السلام) پەیامی خوای پێ سپێررا، وەک هەموو هەڵگرانی پەیامی خوا، بەرەو کۆشک و باڵەخانەی طاغووتی ئەو ڕۆژگارە (نەمروود) ڕۆیی و پێی ڕاگەیاندو تێی گەیاند، کە بەس خوا (جل جلالە) لە خوایەتیی و پەرستران و گەردن بۆ کەچکران دەوەشێتەوەو، کەسی دیکە ڕێی ناکەوێ، لافی پەروەردگارێتی لێبکات،

نەمروود ئاوا - وەک قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە - لەگەڵ ئیبراهیمدا کەوتە گفتوگۆ:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ ﴾ (البقرة- ٢٥٨).

واتە: ئایا تەماشای ئەو کەسە ناکەی کە لەگەڵ ئیبڕاهیمدا دەربارەی پەروەردگاری وتوێژی کرد، لەبەرئەوەی خوا موڵک و دەستەڵاتی دابۆیە، کە ئیبڕاهیم - بۆ سەلماندنی پەروەردگاری - گوتی: پەروەردگارم ئەوەیە کە مرۆڤ دەژیەنێ و دەمرێنێ،-ئەوش- گوتی: منیش دەژیەنم و دەمرێنم، ئیبراهیم گوتی: دەجا خوا-هەموو ڕۆژێ - لە ڕۆژهەڵێتەوە خۆر هەڵدێنێ،- تۆش هەر جارێکی - لە ڕۆژئاواوە هەڵی بهێنە! ئنجا ئەوەی بێبڕوابوو سەرسام و دەستەوستان بووەو، خواش ڕێڕوونیی کۆمەڵێ زۆرداران ناکات.

وەک دەبینین: ئیبراهیم-کە نوێنەری بڕوایە- بۆ سەلماندنی پەروەردگارێتیی خوا، دیاردەی ژیان ومردن (الحیاة والموت) بە بەڵگە دێنێتەوە، بێگومان ژیان و گەشەکردن و مردن و لەنێوچوونی ژیاندارانیش، پڕ وردەکارترین و سەرنجڕاکێش ترین دیاردەی سروشتییە لە بوونەوەرداو، لە هەموو شتێک پتر گۆمی مەندو ڕاوەستاوی بیری مرۆڤ دەشڵەقێنێو، لە هەموو شتێکی دی زیاتر هەست و نەست و زەین وهۆشی دەجووڵێنێ، کەواتە ئیبراهیم (علیه السلام) بۆ سەلماندنی پەروەردگارێتیی خوا، پەنای بردەبەر بیرکردنەوەو تێوەڕامانی سروشت و، سەرنجدانی لە دەوڵەمەندترین و بەپیت و پیزترین لایەنیدا.

بەڵام بابای طاغووت و زۆرداری خوانەناس-وەک عادەتی سروشتیی و بنچینەیی بێبڕوایان- لە بەرانبەر ئەو بەڵگە بەهێزو پیزە ژیریی و زانیارییەی ئیبراهیمدا، دەستی لە هەموو پچکان بڕاو چی پێ نەما، ئەوە نەبێ کە هانا بەرێتە بەر تاکە پشتیوانی بیری بێبڕوایی؛ سەفسەطەو فیسق و گەوەو خۆگێل کردن و چاوبەستەکێ! بەڵێ وەک توێژەرەوەو مێژووزانان[1] دەڵێن-نوێنەری کوفر- فەرمانی دا دوو کەسیان هێنان، یەکیانی کوشت و، ئەوی دیکەشی هێشتەوەو، ئنجا گوتی: منیش پەروەردگارم، چونکە دەتوانم هەندێک کەس بمرێنم و، هەندێکانیش بهێڵمەوەو بژیەنم!!

بەڵێ ئەمە هەموو بەڵگەی نەمروود بوو، لەسەر ڕاستیی داوای پەروەردگارێتیی کردنی! جا هەرچەندە پووچەڵیی و ساکاریی ئەم قسەیەی نوینەری کوفر، شتێکی ئاشکراو بەرچاوە، بەڵام ئیبراهیم (علیه السلام) ویستی ئەم تاکە دەرفەتەی یاریی بە وشان کردنەش بەدەست نەمروودەوە نەهێڵێو، مەودای نەدات لەو ڕێیەوە خەڵککە، هەڵخەڵەتێنێ و، وێنەیەکی دیکەی زەقتری لە دیاردە سروشتییە ڕێک وپێکەکانی بوونەوەری خواکرد، بۆ هێنایەوە، کە بریتیە لە دیاردەی گەڕان و سووڕانی خۆر بەپێی یاسایەکی

---

(١) بڕوانە: (تفسیر جامع البیان) الطبري-ب٣، ل١٨،و بڕوانە: (الکامل في التأریخ) لابن الأثیر، ب١، ل٩٨.

چه‌سپاوو نه‌گۆڕه‌و، بۆ پووچكردنـه‌وه‌ی ده‌عـوای پێشووشـی-ده‌عوای ژیانـدن و مراندن- داوای لێكرد كـه ئه‌ویش-ئه‌گـه‌ر داوای وا ده‌كات- بـا هـه‌ر جارێـك ده‌ست لـه كاروبـاری ڕۆژێ وه‌ربداو، به‌ پێچه‌وانـه‌ی یاسـای خـواوه‌، لـه ڕۆژئاواوه‌ بـه‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵێتـی به‌رێـ!! بـه‌ڵام وه‌ك ئه‌نجامێكـی حه‌تمیـی و سروشـتیی، ده‌به‌رێـك ڕاچوون و دم به‌ده‌مـه‌ی كوفـرو بڕوا، بابـای كافـری خۆ بـه‌ زلـزان، لـه ئاقار ئـه‌و به‌ڵگـه‌ ئاشكراو زه‌قـه‌دا، كـه‌ ئیدی چیدی هه‌لـی یارییكـردن به‌ وشان و، خۆ گێلكـردن و سـه‌ر لـه‌ لمـی نانـی به‌ده‌سته‌وه‌ ناهێڵێ، بـه‌ ناچاریـی ملـی بۆ چاره‌نووسـی ڕه‌شی؛ حه‌په‌سـان و هیـچ پێنه‌مـان و ده‌سته‌وسـتان مـان، ڕاكێشـا!!

## وێنه‌ی دووه‌م: فیرعه‌ون و مووسا (علیه السلام)

دیسـان (فیرعـه‌ون)یش-نوێنـه‌ری كوفـری ڕۆژگاری خـۆی- له‌بـه‌رده‌م بانگـه‌وازی خوایـی شۆڕشـگێڕانه‌و ئازادیخوازانـه‌ی (مووسـا)دا (علیـه السـلام) هه‌مـان هه‌ڵوێستی په‌نـا بردنه‌بـه‌ر كه‌ركـردن (استحمار) و فریودانـی نه‌مـرووده‌ی دووبـاره‌ كردۆتـه‌وه‌، خـوای زانـا له‌وبـاره‌وه‌ فه‌رموویه‌تـی:

﴿ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ ﴾ (الشعراء: ١٠-١١).

﴿ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ ﴾ (الشعراء: ١٦-١٧).

﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَـٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ

عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓاْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ (الشعراء: ٢٣-٣٨).

واتە: هەروەها یادی ئەو کاتە بکەوە کە پەروەردگارت بانگی مووسای کرد: کە بچۆ لای کۆمەڵی ستەمکاران، کۆمەڵی فیرعەون، ئایا پارێزکاریی (تقوی) ناکەنە پیشە!.. تۆو هاڕوونی برات- بچنە لای فیرعەون پێی بڵێن: ئێمە نێردراو (پێغەمبەر)ی پەروەردگاری جیهانەکانین، -هاتووین- کە گەلی (بەنی ئیسرائیل)مان لەگەڵ بنێری... فیرعەون گوتی: ئنجا ئایا پەروەردگاری جیهانەکان چییە؟!

-مووسا- گوتی: پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیان دایە، ئەگەر ئێوە لە بڕوا پتەوانن-بە بوونی خوا-، -فیرعەون- بەوانەی گوت کە لە دەوری بوون: ئەوە گوێتان لێ نیە!

-مووسا- گوتی: پەروەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باب و باپیرانی پێشووتان...

-فیرعەون- گوتی: ئەو پێغەمبەرەتان کە بۆ لاتان نێرراوە، بێگومان شێتە.

-مووسا- گوتی: پەروەردگاری ڕۆژهەڵێت و ڕۆژئاواو ئەوەی لەنێوانیان دایە، ئەگەر بفامن.

-فیرعەون- گوتی: بێگومان ئەگەر جگە لە من چ پەرستراوی دیکە بگری، ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم.

-مووسا- گوتی: ئەدی ئەگەر شت —موعجیزە-یکی ئاشکرام بۆ هێنابی!

-فیرعەون- گوتی: ئەگەر لە ڕاستگۆیانی بیهێنە ڕوو.

جا -مووسا- گۆچانه‌که‌ی فڕێداو ده‌ستبه‌جێ بوو به‌ مارێکی به‌رچاوه‌، ده‌ستی -له‌بن هه‌نگڵی- ده‌رێنا، یه‌کسه‌ر بوو به‌ شتێکی سپی بۆ بینه‌ران.

-فیرعه‌ون- به‌ زله‌زلانی ده‌وروبه‌ری گوت: بێگومان ئه‌مه‌ جادووگه‌رێکی زانایه‌، ده‌یه‌وێ به‌هۆی جادووه‌که‌یه‌وه‌ له‌ نیشتمانی خۆتان ده‌رتان بکات، جا فه‌رمانتان له‌سه‌ر چییه‌؟!

گوتیان خۆی و برایه‌که‌ی بهێڵه‌وه‌ -جادووگه‌ر- کۆکه‌ره‌وان بنێره‌ بۆ شاره‌کان، با هه‌موو جادووگه‌رێکی شاره‌زات بۆ بێنن، ئنجا جادووگه‌ره‌کان له‌ به‌ڵێنگه‌ی[1] ڕۆژێکی دیارییکراودا کۆکرانه‌وه‌.

وه‌ک ده‌بینین: مووساش وه‌ک هه‌موو هه‌ڵگرانی مه‌شخه‌ڵی شۆڕشی بڕوا، به‌ فه‌رمانی خوا ده‌نێردرێ بۆ لای کۆمه‌ڵی زۆرداران (القوم الظالمین)، ده‌چێ بۆ لای فیرعه‌ون و کۆمه‌ڵه‌که‌ی، که‌ بانگی خوا به‌یه‌ککگرتن (التوحید) یان به‌گوێ دابدات، هه‌روه‌ها ده‌چێ -به‌ خۆی و به‌ هاڕوونی برای- که‌ گه‌لی چه‌وساوه‌ (مستضعف)ی به‌نی ئیسرائیل، له‌ چه‌نگی فیرعه‌ون و داروده‌سته‌که‌ی ده‌رێنێو، نیری خۆبه‌زلگر (مستکبر)انیان له‌سه‌ر شانی لاباو، له‌ کۆیلایه‌تییان قوتار بکات. به‌ڵام فیرعه‌ونی طاغووت، زۆر بێ شه‌رمانه‌ له‌گه‌ڵی ده‌دوێ و، ته‌نانه‌ت که‌ ده‌رباره‌ی خوای په‌روه‌ردگاری جیهانه‌کان پرسیار له‌ مووسا ده‌کات، ڕاناو (ضمیر)ی ناعاقڵمه‌ندان (غیر عقلاء) بۆ خوای په‌روه‌ردگار به‌کاردێنێ، یانی: من تا ئێستا په‌روه‌ردگاری تۆ ناناسم و، ته‌نانه‌ت نازانم داخۆ له‌ڕیزی عاقڵمه‌ندان (عقلاء)ه‌، یان نا!!

ئنجا مووساش وه‌ک خواپه‌رستێکی ژیرو تێگه‌یشتوو، سه‌رنجیان ڕاده‌کێشێ بۆ موڵکی ئاسمانه‌کان و زه‌وی و ئه‌وه‌ی له‌نێوانیان دایه‌، واته‌؛ مووسا له‌ به‌رانبه‌ر پرسیاری (وما رب العالمین)ی فیرعه‌وندا، په‌نا ده‌باته‌ به‌ر بوونه‌وه‌ری پڕ ورده‌کاریی و یاساداره‌، ده‌یکاته‌ به‌ڵگه‌ی بوونی په‌روه‌ردگاری جیهانه‌کان!

---

(١) میقات: به‌کات و شوێنێکی دیاریکراوو به‌ڵێن له‌سه‌ر دراو ده‌گوترێ.

بەڵام فیرعەون وەک هەر بێبڕوایەکی بێبەڵگەو دەست بەتاڵ و فامکالأ و بێ کەماڵ، پەنا دەباتە بەر گاڵتە پێکردن و، ڕوو لەو دەست و پێوەندانەی دەکات کە بێجگە لە - بەڵێ قوربان و ئاغاگیان و دەست بە سینگەوەنان- چیدی نازانن، پێیان دەڵێ: گوێتان لەم قسە سەیرەی مووسا نەبوو!!

بەڵام مووسا وەک هەر خواناسێکی خۆڕاگرو سینگ فراوان و، پشوودرێژ و ڕەوشت بەرزو بە ئەدەب، گوێ ناداتە نەفامێتیی و بێئەدەبیی فیرعەون و، لەسەر ڕچەی خۆی دەڕواو، دیمەنێکی دیکەیان لە شوێنەوارو پەرێزی خوا (عزّ وجلّ) دەخاتە بەرچاوان و سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ دیاردەی دروست بوونی خۆیان و باب و باپیرانی ڕابردوویان، بەڵام فیرعەون لە جیاتی ئەوەی لە بەرانبەر ئەو هەموو ئەدەب و ڕەوشتە بەرزەی مووسادا، نەختێک لە ڕێشمەی بێشەرمیی خۆی توند بکات، پتر شوولی لێ هەڵدەکێشێ، چونکە (وإن أكرمت اللئيم تمرّدا)!، بەڵێ ئەوجار فیرعەون لە پلەی گاڵتە پێکردنەوە، هەڵدەکشێ بۆ پلەی تۆمەتی شێتیی وەپاڵ دان!

بەهەرحاڵ مووسا خۆی تێک نادا، چونکە کەسێک خۆی ناسیبێ، قسەی خەڵکی کاری تێ ناکات و، بۆ جاری سێیەم یەکی دیکە لە دیمەنە دڵبزوێنەکانی شوێنەواری خوای پەروەردگار، دەکاتە بەڵگەی ئیسپاتی دەعواکەی، بەڵام فیرعەون، وەک هەموو زۆردارێکی تەنگە پرێسکەو دەمار توند، کە لە جاری یەکەمدا —واتە لە بەرانبەر یەکەمین قسەی مووسادا- دەوری ئاژەڵێکی نەفامی دی، بە هۆی خۆ گێل کردنیەوە لە ڕاست مانای وشەی (رب العالمين) داو، لە جاری دووەم و سێیەمدا بەهۆی گاڵتە پێکردن و، بەشێت لەقەڵەمدانی مووساوە، دەوری شەیتانێکی زۆرزان و بەدکاری دی، ئەمجار دەوری دڕندەیەک دەبینێو، هەڕەشەی گرتن و کوشتن و بڕین لە مووسا دەکات!

بێگومان مووسا لەبەردەم ئەم هەڵوێستەی فیرعەوندا، وەک هەڵوێستەکانی پێشووی، هیچ ناشڵەژێ و تێک ناچێو، بە شێوازێکی نەرم و نیان پێی دەڵێ: ئەدی ئەگەر موعجیزەیەکی ئاشکرات پێشان بدەم، چ دەڵێیی؟!

فیرعەونیش دەڵێ: کوا، با بزانم ئەگەر ڕاست دەکەی!

ئنجا کاتێک مووسا دوو موعجیزە سەرسام کەرو دەستەوستانکەرەکانی خۆی پیشان دەدات، فیرعەون دوایین فیشەکی نێو فیشەکدانی تەڵەکەبازیی و پیلانگێڕیی خۆی بە مووساوە دەنێت و، تۆمەتی جادووگەرایەتیی دەداتە پاڵ!

ئنجا دوای ئەوەی داروودەستەکەی فریو دەدات و، بەهەڵە وایان حاڵی دەکات، کە مووسا بابایەکی جادووگەرو کورسییخوازو فێڵبازەو، دەیەوێ ماڵ و حاڵ و نیشتمانیان پێ بەجێ بهێڵێ! داروودەستەکەی پاش پرس و ڕاو تەگبیر، بڕیار دەدەن، کۆمەڵە جادووگەرێکی کارامەو شارەزا، خڕ بکەنەوەو بەگژ[1] مووسایان وەنێن!!

جا ئێستا با سەرنج دەین!!

دیتتان! چۆن فیرعەونی زۆردارو خۆ بە پەرستراوزان، لە ئاقار تیشکی ڕۆژی بانگەوازی بڕوادارانەی مووسادا، لەخۆگێل کردنەوە، گواستیەوە بۆ گاڵتەپێکردن و، لە گاڵتە پێکردنەوە بۆ بوختان هەڵبەستن و، ئنجا بۆ هەڕەشەو خۆسوور کردنەوەو سەرەنجام.. بەڵێ سەرەنجامی هەموو هەوڵ و کۆششی فیرعەون بۆ بەرهەڵستیی پەیداکردن لە ڕووی بانگەوازی خواناسانەی مووسادا، بریتی بوو لە پەنابردنە بەر کۆمەڵێک جادووگەری چاوبەست و فریودەر!!

بەڵێ ئەمە (پەنا بردنە بەر چەواشەکاریی و چاوبەستن و بەسەهوو بردن) تاکە پشتیوانی بیری بێبڕوایی و خوانەناسییە، لەکاتێکدا لەگەڵ عەقیدەی خواناسیی و خوا بەیەکگرتندا دەبەرێک ڕادەچێو، زۆرانی لەگەڵ دەگرێ.

---

(١) بەگژ مووسایان وەنێن: بەگژ مووسایان دابکەن، لەمووسایان بەردەن.

**وێنەی سێیەم: زلەزلانی قورەیش و موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)**

بەو پێودانەی کە گوتمان: کاروانی هەڵگرانی مەشخەڵی بیروبڕوای خوایی و ڕابەرو پێشڕەوانی مرۆڤایەتیی، بەرەو هەواری رزگاریی و سەرفرازیی ڕاستەقینە، درێژەی بە ڕۆیشتنی خۆیدا، هەتا نۆرە گەیشتە سەر دوایین هەڵگری مەشخەڵی بڕواو، پێشەوای ڕاستەقینەو سەر بەخێری مرۆڤایەتی (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵێ) پێغەمبەری نەخوێندەوار (صلی الله علیه وسلم).

ئەمیش وەک برایانی پێشووی، لەگەڵ ئاشکراکردنی بانگەوازەکەیدا، بەرەی کوفری چەوسێنەرو خۆسەپێنەر، هەر هێندەیان خۆش بوو تا حاڵیی بوون دەڵێ: چی! ئیدی کێچیان کەوتە کەوڵی و، وەک پیرەژنەی تاقانە مردوو و ڕێوی ژانگرتوو، بە هەرچی هێزی هەیانبوو، خۆیان دەبەر ڕاکردو، تا شەش حەوت ساڵ ڕابردن، جەنگی نێوان بڕواو کوفر وا گەرم بوو، سەرانی قوڕەیشی زۆردار، ددان و چەقوویان دەسوو، لەهەرکەسێک تێ دەگەیی و بەرەو بەرەی بڕوا دەچوو!!

هەڵبەتە زلەزلانی زۆردارو خوانەناسی قوڕەیش، وەک برادەرانی پێشوویان، تاقە چەکێک کە وەبەر پەلیان کەوت، بۆ بەرهەڵستیی پێکردن و پێ بەرەنگاربوونی بانگەوازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ، بریتی بوو لە پەنا بردنە بەر خافڵێندن و بێئاگاکردنی خەڵکی و، مێشک تەزاندنیان لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە کپکردن و داپۆشین و خەفەکردنی، دەنگی زوڵێڵی ئەو بانگەوازە لە ڕێی غەڵبەغەڵب و فیتەفیت و چەپڵە لێدان و، گێڕانەوەی چیرۆک و بەسەرهاتە ئەفسانەییەکانی پادشاکانی فارس، خوا لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَغۡلِبُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ (فصلت- ٢٦).

واتە: ئەوانەی کافرن گوتیان؛ گوێ بۆ ئەم قوڕئانە مەگرن - لە دەمی خوێندنەوەیدا- و غەڵبەغەڵبی تێدا بکەن بەشکم -بەسەریدا- زاڵبن.

بەڵێ تاقە دەستەگیرەیەک[1] کە لەبەر دەم تین و تاوو تەوژمی ئایەتە بەهێزەکانی قورئانی بەپێزدا، بگونجێ دەستی تێبگیرێ، بریتیە لە ونکردن و خەفەکردنی ئەو دەنگە کاریگەرەی کە بچێتە گوێی هەر کەسێکەوە، ئەگەر زۆریش کەللەڕەق و بەدفەڕ بێ، کاری تێ دەکاو دەیگۆڕێ!!

دیسان خوای بێوێنە، دەربارەی هەوڵ و کۆششی کافرە زلەزلەکانی قورەیش بۆ بەرهەڵستییکردنی قورئان، فەرموویەتی:

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْـَٔوْنَ عَنْهُ ۖ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾﴾ (الأنعام: ٢٥-٢٦).

واتە: هەتا کاتێک کە (کافرەکان) هاتنە لات، شەڕەقسەت لەگەڵ دەکەن، ئەوانەی کە بێبڕوان دەڵێن: ئەم-قورئان-ە بێجگە لە ئەفسانەی پێشینان چیدی نیەو، ئەوان خەڵکی لێدەپرینگێننەوەو لێی وەدوور دەکەون، -بەم ڕەفتارەیان- بەس خۆیان دەفەوتێنن، بەڵام هەست ناکەن.

توێژەرەوانی قورئان دەربارەی هۆی هاتنەخوار(سبب النزول)ی ئەم ئایەتانە دەڵێن: هەرجارێک کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە کۆڕێک یان لە شوێنێک دادەنیشت بۆ قورئان خوێندن بەسەر خەڵکیدا (نضر بن الحارث) کە یەکێک بوو لە زلەزلانی قورەیش، لە نیزیک وییەوە، کۆڕێکی دیکەی ساز دەکردو بانگی خەڵکی دەکرد و دەیگوت: ئەگەر موحەممەد بەسەرهات و ئەفسانەکانی پێشووانتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، من سەرگوزشتەو حیکایەتی چاکترم لەلان، ئنجا بەسەرهاتی (ڕۆستەم و ئەسفەندیار)ی فارسیی بەسەردا دەخوێندنەوە، تاکو لە گوێگرتن بۆ قورئان دووریان بخاتەوە!![2]

---

(١) دەستەگیرە: هەرشتێک دەستی پێ بگیرێ و خۆی پێ بگیرێ

(٢) بڕوانە: تەفسیری (غرائب القرآن و رغائب الفرقان)، ب٥، ل١٢٨، لەسەر پەراوێزی تەفسیری (طبري). و بڕوانە: تەفسیری (الكشاف عن حقائق غوامض التنزيل)، ب٢، ل١٣، و بڕوانە: تەفسیری (في ظلال القرآن) ب٢، ل١٠٦٦، چاپی ١٠، ساڵی ١٩٨٢.

بەڵێ خوێنەری سەنگین!

تاقە ڕێی چارەسەر لەدەست طاغووت و زۆردارانی خوانەناس و ملهوڕی قوڕەیشدا، بۆ بەرپەرچ دانەوەی بانگەوازی قورئان و نەهێشتنی تاووتینی لە دڵی خەڵکیدا، بریتی بوو لە غەڵبەغەڵب و ئەفسانە خوێندەوە! هەڵبەتە پیلانی: خەڵک سەرگەرم کردن بە دەنگەدەنگ و ژاوەژاوی بێکاکڵ و مەبەست و، خافڵێندنیان بە گوێگرتن بۆ شتی ئەفسانەیی و خەیاڵی و بێسوود، شتێک نەبووە تایبەت بووبێ بە کافرە فێڵبازەکانی قوڕەیشەوە، بەڵکو کوفری کۆن و نوێ ڕەچاوی کردووەو پەنای بۆ بردووە!

ئنجا لە هەمووی سەرنج ڕاکێشتر ئەوەیە، کە لە کاتێکدا کافرە خۆ بە زلگرەکان داواکاریی بێجێو سەیر سەیریان لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکرد، وەک:

﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ ﴾ (الأسراء: ٩٠-٩٢).

واتە: -کافرەکان- گوتیان: بڕوات پێ ناهێنین، هەتا سەرچاوەیەکمان لە زەوی بۆ هەڵدەقوڵێنی، یاخود باغێکی لە دارخورماو ترێت هەبێ، ئنجا ڕووبارانی بەونێودا بەردەیەوە، یاخود ئاسمانمان پارەپارە بەسەردا بەردەیەوە، وەک گومان دەبەی، یان خواو فریشتەکان ڕوو بەڕوومان بهێنی.

بەڵێ لە کاتی ئەم داواکارییە بێ جێیانەدا، خوای بێهاوتا سەرنجی ئەو کافرە نەفام و بەهانەگرانە، ڕادەکێشێ بۆ وردبوونەوەو تێوەڕامانی دیاردە ڕێک وپێک و سەرسامکەرەکانی بوونەوەر، وەک پێیان بڵێ: مرۆڤایەتیی

تـازە لـە تافـی[١] منداڵیـی و سـادەیی هەڵبـردووە[٢]، کاتـی ئـەوە نەمـاوە کـە ئینسـان بـەس لەڕێـی موعجیـزەو شتی یاسـادڕ (خـارق العـادة)ەوە خـوا بناسێو پەی بـە سیفەتە بـەرزو بێسنوورەکانی بەرێ، بەڵکو لەمەودوا —چونکـە مرۆڤ بـە تێکڕایـی ئاسـتی ژیریـی و بیـرو هۆشـی بـەرز بۆتـەوەو- دەتوانـێ لەڕێـی یاسـاو وردەکارییەکانـی بوونـەوەرەوە، پـەی بـە بوونـی خـوای پـەروەردگار بەرێو، بـە سیفەتەکانی ئاشـنا بـێ، خـوای کارزان فەرمووویەتـی:

﴿وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةٗ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا صُمّٞ وَبُكۡمٞ فِي ٱلظُّلُمَٰتِۗ ﴿٣٩﴾﴾ (الأنعام: ٣٧-٣٩)

واتـە: - کافرەکان - گوتیـان: ئـەوە بۆچـی - پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) - لـە پەروەردگارییـەوە نیشـانە (موعجیزە)یەکـی بـۆ نانێردرێ! بڵـێ: بێگومـان خـوا توانایـە کـە نیشـانەیەک بنێرێتـە خـوار، بـەڵام زۆربەیـان نازانـن —کـە قۆناغـی ئـەو جـۆرە موعجیزانـە بەسـەر چـووە[٣]- و هیـچ ژیانداریێـک لـە زەویـدا نیـەو، هیـچ باڵندەیـەک نیـە کـە بـە دوو باڵەکانـی بفـڕێ، مەگـەر کۆمەڵێنـی وەک ئێـوەن، هیـچ شـتێکمان لـە کتێب[٤]-قورئـان-دا فەرامـۆش

---

(١) تافی: گەرمەی نێوەڕاستیی.

(٢) هەڵبردوە: تێپەڕیوە، ڕەت بوە.

(٣) یـان مەبەسـت ئەوەیە: زۆربەیـان زانیارییـان نیـە بـە یاسـاداریی و ڕێـک وپێکیـی بوونـەوەر، ئەگـەر نـا هەمـوو شـتێکی ئـەم بوونـەوەرە، لـە گەردیلەیەکـەوە بگـرە هەتـا کەهکەشانێـک و، لـە خانەیەکـەوە بگـرە هەتـا ئینسـانێک، بەڵگـەو نیشانەو موعجیـزەی پەروەردگارێتیـی خـوای بێوێنـەو هاوەڵـن.. واش پێدەچـێ ئـەم تەفسـیرو لێکدانەوەیـە ڕاسـتتر بێـت، چونکـە ئایەتەکـەی دوای ئـەم بەڵگەیـە لەسـەری.

(٤) وا پـێ دەچێو گونجاوتـرە کـە مەبەسـت لـە (کتـاب) لێرەدا زانیاریـی ئەزەلیـی خـوا، یـان (لوح المحفوظ) بێـت کـە هیـچ شـتێکی نەبـواردوە تێیـدا تۆمارنەکرابـێ و، ئەگـەر بشـڵێین مەبەسـت

نەکردوە، ئنجا -ئەو ژیاندارانە- بۆ لای پەروەردگاریان خڕ دەکرێنەوەو، ئەوانەی کە نیشانەکانمان بەدرۆ دادەنێن، کەڕو لاڵن لە تاریکاییەکان دان.

وەک دەبینین خوای پەروەردگار ئەو کافرانەی کە داوایان لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکرد: نیشانەو موعجیزەیەکیان پێشان بدات، وەک هی پێغەمبەرانی پێشوو (عليهم الصلاة والسلام)، مۆری (نەزانیی)یان پێوە دەنێ! هەڵبەتە نەزانن، چونکە پێویستە مرۆڤی ژیر لە وردەکاریی و یاساداریی بوونەوەردا، هەوڵی ناسینی خواو پەی بردن بە سیفەتەکانی بدات، نەک لەو موعجیزانەدا، کە یاساکانی بوونەوەر هەڵدەوەشێننەوە!!

بۆیەش دوای ئەوەی مۆری (نەزانیی) بەنێو چاوانی ئەو جۆرە کەسانەوە نا، یەکسەر سەرنجیان بۆ دیاردەی ژیانی ئەو ژیاندارە پێدارو باڵدارانەی کە وەک مرۆڤان، لە شێوەی چەند گەل و کۆمەڵێکی ڕێکوپێکدا دەژین، ڕادەکێشێ، وەک پێیان بڵێ: ئەگەر بەدوای بەڵگەو نیشانەو موعجیزەدا دەگەڕێن، بۆ سەلماندنی بوونی خوای پەروەردگار! هیچ پێویست ناکات دوور بڕۆن، هەر سەرنجی ژیانی کۆمەڵێیەتیی ژیانداران بدەن، نەک یەک و دوو، بەڵکو سەدان و هەزاران، بەڵگەو نیشانەی لە موعجیزەی یاسادڕ[1] (خارق العادة) چاکترو سەرسوڕهێنەرتر دەبینن.

---

قورئانە، دەبێ بڵێین: هەر حوکم و یاسایەک ژیان و گوزەرانیان پێی ئاتاج بێت، کتێبی خوا فەرامۆشی نەکردوە.. ئنجا چ ڕاستەوخۆ وەک: [وأحل الله البيع وحرم الربا](البقرة).. چ بە ئاماژە، وەک: [يحل لهم الطيبات ويحرم عليهم الخبائث](الأعراف).

(١) وشەی (یاسادڕ) بە کۆششی خۆم بۆ (خارق العادة) دانا، چونکە (عادة) هەرچەندە بە مانای (نەریت و خوو) دێ، بەڵام عارەبی زمانان کە لەگەڵ وشەی (خارق)دا لێکیان داوە، ماناکەی لە (نەریت و خوو)ی مرۆڤانەوە فراوانتر کردوە، بۆ نەرێت و خووی بوونەوەر، واتە: ئەو یاساو دەستوورانەی کە تێیدان، جا نازانم زمانزانان ڕایان چۆنەو، چ وشەیەکیان بۆ (خارق العادة) هەڵبژاردوە، کە من چاوم تێ هەڵنەکوتبێ!

ئنجا ڕوودەکاتە ئەو کەسانەی گومانیان وایە ڕێک وپێکیی و وردەکاریی بوونەوەر، بەڵگەو نیشانەی بوونی خواو بەرزی سیفەتەکانی نین و، دەفەرموێ: ئەوانەی کە نیشانەکانمان بەدرۆ دادەنێن - واتە دەڵێن: دیاردە ڕێک وپێکەکانی بوونەوەر بەڵگەو نیشانە نین بۆ بوونی خوا-، ئەوانە کەڕو لاڵن و لە تاریکاییەکان دان.

بەڵێ ئەوانەی نکووڵیی لە دەلالەت کردنی بوونەوەر دەکەن لەسەر بوونی خوا (جل جلالە)، دیارە لە ڕیزی کەڕو لالێنن، چونکە ئەو ئەندامانەیان کە دەگونجا بەکاریان بێنن بۆ دۆزینەوەی هەق و ڕاگەیاندنی، لە ڕێیەکی ڕاست و دروستەوە بەکاریان نەهێناون، هەروەها لە تاریکاییان دان، تاریکایی نەزانیی جۆراوجۆر؛ نەزانیی خوانەناسین و، خۆنەناسین و، بوونەوەر نەناسین، نەزانیی سەبارەت بە ڕابردوو و، ئێستاو، داهاتوو...هتد.

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست!

لەم وێنەیەشدا وەک وێنەکانی پێشوو، دەرکەوت: کە هەموو دەمێ بیری خواناسیی و بڕواداریی، پشتی بە بیرکردنەوەو تێوەڕامان و زانیاریی بەستووە، بەپێچەوانەوە: بیری کوفر و بێبڕوایی، هەموو دەمێ لە ئاقار عەقیدەی بڕواداریدا، پشتی بە خۆگێل کردن و چاوبەستەکێو خەڵک بەسەهوو بردن بەستووە، لە بواری دەستکردنەوەدا لەڕاست بیروباوەڕی خواییدا، لەوە زیاتر چی لەدەست نەهاتووە!!

کەواتە ڕاستە:

هەم بڕواو زانیاریی و، هەم بێبڕوایی و نەزانیی، پێکەوە جۆشدراون.

ئێستاش دەچینە سەر وێنەی چوارەم و کۆتایی:

**وێنەی چوارەم: واقیعی ئێستا**

ئنجا ئێستاش -لەم ڕۆژگارەدا- دەبینین کە ئیمپریالیزمی ڕۆژهەڵێت و ڕۆژئاواو کلک و بەکرێگیراوانی، بەرەنگاری بەرەی بڕوادارو خواناس بوو ون و، دەبەری ڕاچوو ون، لە بەرانبەر ئەو ئایین و بەرنامە تێرو تەواوە خواییەدا، کە شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی لە پێناوی چەسپاندنیدا، سەرو ماڵیان لە گرەو ناوەو، لەڕێی خوادا هەموو شتێکیان وەلا ناوە، تاقە چەکێک کە توانیویانە دەستی بگەیەننێو بەربەرەکانێی پێ بکەن، بریتیە لە:

**یەکەم:** شێواندن و ناشیرین کردنی بەرنامەی خواو ڕابەرو پێشەوا ڕاست و ڕەسەنەکانی، لەڕێی بلێوکردنەوەی پڕوپاگەندەو قسەوقسەڵۆک و بوختان و درۆو دەلەسەوە.

**دووەم:** پەرەپێدان و بلێوکردنەوەی چەند بیرو بیردۆزەیەکی بەناو زانیارییانەی پووچ و بێخێر، کە زۆربەیان لە مێژە لەو جێیەی کە تێیدا لەدایک بوون، وەک قوماشی ناجسن، ئەو ڕەنگە ساختەیەی لێیان درابوو، چۆتەوەو، سپات[1] بوونەوەو بوونە سپیاڵێکی بێکەڵک!![2]

بەڵێ هەر لە یەکەمین ڕۆژی مێژووی کێشەی نێوان بەرەی بڕواو بەرەی کوفرەوە، بەرەی بڕوا پەنای بردۆتە بەر بێدارکردنەوەو وریاکردنەوەو چاوکردنەوەی خەڵکی، لە ڕێی هاندانیانەوە بۆ بیرکردنەوەو تێوەڕامان و سەرنج دان لە سروشت و دەوروبەر، چونکە خوا (سبحانە وتعالی) زاتێکی بێسنوورەو لە هیچ شتێکدا وەک دروستکراوەکانی ناچێو نالوێ لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە پەی پێ ببردرێ، بەڵام زاتی خوا، لە ڕێی سیفەتەکانیەوەو، سیفەتەکانی لە ڕێی کردارەکانیەوەو، کردارەکانیشی لەڕێی دروستکراوەکانیەوە، دەگونجێ پەییان پێ ببردرێ و بناسرێن.

---

(١) سپات بوونەوە: کاڵ بوونەوە، ڕەنگیان چۆتەوە.

(٢) وەک هەرکام لە بیردۆزەکانی: مارکس و فرۆید و داروێن و گەلێکی دیکەش..

كه‌واته‌: بیركردنه‌وه‌و وردبوونه‌وه‌و تێوه‌ڕامان و سه‌رنج دان –كه‌ زانیاریی ئه‌نجامی سروشتییانه‌- بنچینه‌ی بیروبڕوای خواناسیین و، ده‌سته‌گیره‌ی ڕووبه‌ڕوو بوون و به‌ره‌نگار بوونه‌وه‌ینی، له‌گه‌ڵ خه‌ڵكیدا به‌ گشتی و به‌ره‌ی كوفردا به‌ تایبه‌تی.

هه‌روه‌ها خۆ گێل كردن و خه‌ڵك چه‌واشه‌كردن و فێڵبازیی و ئه‌فسانه‌سازیی - كه‌ بێئاگایی و نه‌زانیی، ئه‌نجامی حه‌تمیی و سروشتییانه‌ - بنچینه‌ی بیری بێبڕواییین و، چه‌ك و چاوپێچكێ ده‌ستیشنی، بۆ لێدانی به‌ره‌ی بڕواو، چاوبه‌ستنی خه‌ڵكی بێئاگا، هه‌ر بۆیه‌ش ده‌بینین عه‌لمانییه‌كانی ئه‌م ڕۆژگاره‌ له‌ كوردستان و غه‌یری كوردستانیشدا، یه‌كجار قه‌ڵسن كه‌ ده‌بیستن خه‌ڵكی - به‌تایبه‌ت گه‌نج و تازه‌ پێگه‌یشتووه‌كان - خه‌ریكی قورئان خوێندن و له‌ ئایین تێگه‌یشتن و به‌رچاو ڕوون بوونه‌وه‌ن، یان كه‌ ده‌بینن خه‌ڵك و جه‌ماوه‌ر، ڕوو له‌ مزگه‌وته‌كان و بنكه‌و باره‌گای ئیسلامییه‌كان ده‌كه‌ن، چونكه‌ دڵنیان كه‌ خه‌ڵكی له‌به‌ر بێئاگایی و چه‌واشه‌كراویی، شوێنیان ده‌كه‌ون و بازاڕی ڕه‌شیان قه‌ڵه‌باڵغ ده‌كه‌ن و، هه‌ر كاتێك حاڵیی بوون و هۆشیار بوونه‌وه‌، لێیان دوور ده‌كه‌ونه‌وه‌!!

ئێستاش (٢٠١٩/٩/٢١ز – ٢٠/محرم/١٤٤١ك) ده‌ڵێم: هه‌ربۆیه‌ش حیزبه‌ عه‌لمانییه‌ حوكمڕانه‌كان پاره‌یه‌كی زۆری نه‌وت و گازی دزراو و به‌تالێن فرۆشراویان بۆ چه‌ندان كه‌ناڵی ڕاگه‌یاندنی چه‌واشه‌كاریی ته‌رخانكردووه‌، مه‌سره‌فێكی زۆر له‌خه‌ڵكێكی زوڕنا ژه‌ن و ده‌هۆڵكوتی ئه‌و بواره‌ ده‌كه‌ن، چونكه‌ كه‌سێك هه‌قی پێ نه‌بێ، ناچاره‌ مه‌سره‌فی زۆر له‌ باطیڵ و ناهه‌قه‌كه‌ی بكات!

## چوار: بڕوا بەخوا نەهێنان، لەبەر هەست پێنەکرانی، بەرهەمی زانیاریی نیە:

قسەیەکی دیکەی زۆر نابەجێی کەسانێکی نەزانی خۆ بە زانازان، کە خۆی پێوە با دەدەن و، کەشخەو فیزی پێوە دەکەن، ئەو قسەیە کە دەڵێ: زانیاریی نوێ ئیسپاتی کردوە کە هەرچی هەستی پێنەکرێ بە یەکێک لە پێنج هەستەکان- نیە، خواش بە هیچ کام لە پێنج هەستەکان هەستی پێ ناکرێ، کەواتە؛ نیە!!

بەڵێ بێبڕوایان ئەم قسەیە، بەزادەو بەرهەمی بەرەوپێش چوونی زانیاریی دەزانن، بەڵام لە ڕاستیدا، زۆر خراپ و بەراوەژوو حاڵی بوون.

چونکە ئەوەی ئەو نەزانە بە نەزانیی خۆ نەزانانە، بەبەرهەمی زانیاریی تێگەیشتوون، سیپاڵێکی زۆر کۆن و ڕزیوی سەر سەرانگوێلکی[1] مێژووی فیرعەون و طاغووتانەو، کاتی خۆی فیرعەون و ستەمکارە دنیاخۆرەکان، بەکاریان هێناوە، بۆ دەمامک[2] پێکردنی سەر ڕووی فێڵبازیی و ساختەچییەتییان!

ئەوەتا فیرعەونێکی میسری چوار پێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا، هەمان قسەی ماددە پەرستەکانی ئێستای کردوە، بۆ بەڵگەهێنانەوەی لەسەر نەبوونی خوای پەروەردگارو، چەسپاندنی کوێخایەتیی خۆی بەسەر خەڵکیدا، خوای زاناو توانا لەوبارەوە فەرمووییەتی:

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ (القصص- ٣٨).

---

(١) سەرانگوێلک: زبڵدان، سەرگووفەک.

(٢) دەمامک: هەرشتێک دەم و چاوی پێ دابپۆشرێ، بۆ نەناسرانەوە.

واتە: فیرعەون گوتی: ئەی کۆمەڵ-ی زلەزلان- بێجگە لەمن نەمزانیوە چ پەرستراوتان هەبن، دە جا هامان! ئاگرم بۆ بدە بەر قوڕێ -وخشتی سوورم بۆ دروست بکە- ئنجا کۆشکێکم بۆ دروست بکە، بەشکم -بەهۆی چوونم بۆ سەر ئەو کۆشکە بەرزە- بڕوانمە پەرستراوی مووساو، من گومانم وایە کە ئەو لە درۆزنانە-و ڕاست ناکات-.

ڕاستەوڕاست هەروەک چۆن بابایەکی ماددەپەرستی ئەم سەردەمە پێمان دەڵێ: ئەگەر ڕاستە خوا هەیە، بۆ نایبینم؟! فیرعەونیش (ئەو فیرعەونە ناوی -خۆفۆ- بووە) چەند هەزار ساڵ بەر لە ئێستا، بۆ ئەوەی بانگەوازی خواناسانەی مووسا (علیه السلام) بەدرۆ بخاتە ڕوو، هەمان شێوازی ئەزموونیی و زانیارییانەی ماددەپەرستانی ئەم ڕۆژگارەی بەکارهێناوە، بۆ سەلماندنی نەبوونی خوا، ئەوەتا فەرمانی بە (هامان)ی وەزیری کردوە، کە باڵەخانەیەکی بڵیندی بۆ لە خشتی سوور دروست بکات، تاکو بچێتە سەری و، لەوێوە بڕوانێ: داخۆ پەروەردگاری مووسا دەبینێ یان نا!

کەواتە: با ئەو ماددەپەرست و ڕواڵەت بینە لاف و گەزاف لێدەرانەی، شانازیی بە بیری ماددیی (الفكر المادي-ماتریالیزم) و بیروباوەڕییەوە دەکەن و، پێیان وایە مێش (هەنگ)یان لە دارێدا دیوەتەوە، هۆشیان بێننەوە سەر خۆو ڕابمێنن و، بەخۆیان بڵێن:

(دیارە ئەو بیروڕایەی ئێمە بە زادەو بەرهەمی بەرەوپێش چوونی زانیاریی سەدەی بیستەمی دەزانین و، پێمان وایە قوماشێکی تازە بابەت و مۆدێلێکی نوێیە[1]، سیپاڵێکی ڕزیوو کۆنی سەر زبڵدانی مێژووییە!!

---

(١) چونکە ئەو جۆرە کەسانە، هەروەک چۆن لەبواری بەرگ و پۆشاک و کەلوپەلی نێومالّدا، بەپێی (مۆدێل)ەکانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵێت دەجووڵێنەوە، لەبواری بیروباوەڕیشدا بەهەمان شێوە، ئنجا هەر لەسەر ئەم بنچینەیەش، ئیسلام ڕەفز دەکەن، چونکە ئیسلام بیروبڕوایەکی کۆنەو هیچ شتێکی کۆنیش -بەبڕوای وان- بە کەڵک نایەت، نازانن کە ڕاستی و هەڵەیی بیروبڕوا لە کۆنیی و نوێییانی وەرناگیرێ، بەڵکو لە خودی خۆی!!

په‌ڕۆیه‌كیش بووه بابایه‌كی خۆ به‌ په‌رستراو دانه‌رو چه‌وسێنه‌رو خۆ سه‌پێنه‌ری وه‌ك فیرعه‌ون، كه‌ گه‌لێكی بێچاره‌و بێ ده‌ره‌تانی، وه‌ك (بني إسرائيل)[1]ی ژێرده‌سته‌و زه‌بوون كردبوو و، پیاوه‌كانی خستبۆ ژێر نیری سۆغره‌و بێگاره‌وه‌و كوڕه‌كانی سه‌ر ده‌بڕین و، ئافره‌ته‌كانیشی ده‌هێشتنه‌وه‌، به‌ڵێ قسه‌ی گۆڕین په‌ڕۆیه‌ك بووه‌ كه‌ فیرعه‌ونێكی ئاوا، كردوویه‌ته‌ ده‌مامكی سه‌ر ڕووی فیرعه‌ونایه‌تیی و ساخته‌چییایه‌تی خۆی و به‌هانه‌یه‌ك بووه‌، فیرعه‌ونێكی ئاوا له‌ په‌نایدا داوای په‌روه‌ردگاریتیی كردوه‌!!

كه‌واته‌ بیری بێبڕوایی و ڕواڵه‌ت په‌رستیی، میراتی كۆن و به‌جێماوو نا له‌ پێش چاوی، كه‌سانێكی وه‌ك نه‌مروود و فیرعه‌ون بووه‌، ئه‌دی ئێمه‌ «وه‌ك بێبڕوایان» ئه‌م خۆڕاوه‌شاندن[2] و شانازیی كردنه‌مان له‌چی، به‌ بیروباوه‌ڕێكه‌و، كه‌ ئێمه‌ به‌ خه‌یاڵی خاوی خۆمان به‌ به‌رهه‌مـی زانست و به‌ بنچینه‌ی جوولێن و شۆڕش و ڕزگاربوونی ده‌زانین، به‌ڵام له‌ ڕاستییدا، زاده‌و به‌رهه‌می بیركورتیی و نه‌زانییه‌و، بناغه‌و بنه‌ڕه‌تی فیرعه‌ونایه‌تیی و سته‌مكاریی و بێدادیی و خه‌ڵك فریودان و چه‌وساندنه‌وه‌یه‌!!

خوێنه‌ری خۆشه‌ویستم!

له‌سۆنگه‌ی ئه‌وه‌وه‌ كه‌ ئێمه‌ لێره‌دا به‌س مه‌به‌ستمان ئه‌وه‌ بوو: بیسه‌لمێنین ئه‌و قسه‌ نابه‌جێو بێسه‌روپێیه‌ی ده‌ڵێ: بڕوا به‌خوا نه‌هێنان له‌به‌ر هه‌ست پێنه‌كرانی، به‌رهه‌می زانیارییه‌و، پاش ئه‌وه‌ی زانیاریی شه‌قڵێكی نوێی به‌خۆوه‌ گرت، سه‌ری هه‌ڵداوه‌، قسه‌یه‌كی هه‌ڵه‌و بێ پشتیوانه‌و، بڕوا به‌خوا نه‌هێنان، به‌به‌هانه‌ی نه‌دیتران و به‌رهه‌ست نه‌بوونی، بیرێكی كۆنی چه‌ند هه‌زار ساڵه‌یه‌و، فڕی به‌سه‌ر زانیارییه‌وه‌ نیه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ به‌م بڕه‌ توێژینه‌وه‌یه‌ وازی لێ دێنین.

---

(١) (بني إسرائيل) یانی كوڕانی ئیسرائیل، ئیسڕائیلیش به‌ (یعقوب) (علیه السلام) گوتراوه‌، كه‌ به‌ یوسفه‌وه‌ دوازده‌ كوڕی هه‌بوون، له‌و دوازده‌ كوڕه‌ش، ئه‌و دوازده‌ تیره‌ (سبط) یه‌ وه‌پاشكه‌وتن كه‌ گه‌لی (بني إسرائيل) پێكدێنن.

(٢) خۆڕاوه‌شاندن: فیزوكه‌شخه‌كردن، خۆنواندن.

## پێنج: بەرهەست نەبوونی خوا لە دنیادا، گەورەترین حیکمەتی تێدایە:

یەکێک لەو مەسەلانەی ماوەیەک لە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون و، زەین و هۆشم پێیانەوە خەریک بوو، ئەمە بوو: بۆچی خوای پەروەردگار لەم ژیانە دنیاییەدا خۆی لە مرۆڤ پەنهان کردووە، کارێکی وای نەکردوە: کە هەروەک چۆن ڕۆژی ڕوون، هەموو کەس هەستیٚ پیٚ دەکات و، کەس لە بوونیدا مەودای کێشەو مشتومڕی نیە، ئەویش ئاوا خۆی ئاشکرا کردبایەو بەشێوەیەک درەوشابایەوە (بەجۆرێک کە لە زاتی بێوێنەی خوا دەوەشێتەوە) کە هیچ کەس ڕێی زمان درێژیی نەبیٚ؟!

بەڵام پاشان بۆم دەرکەوت، کە ئەم کارەی خوای زاناو توانا، وەک هەر کارێکی دیکەی، ئەوپەڕی حیکمەت و لێزانیی تێدایەو دەبوو هەروابیٚ.

چونکە ئەم ژیانە، مەیدانی تێدا تاقیکرانەوەو هەڵسەنگێنرانی چاک و خراپانە، ئنجا سروشت و جۆری هەڵکەوتنی ئەم ژیانە، وا داخوازیی دەکات کە خوا (جل جلالە) وەک مانگی چواردە لە هەموو کەس دیار نەبیٚ، بەڵیٚ مادام ژیانی دنیا، بە مەبەستی تاقیکرانەوەو لێک هەڵێوێردرانی ئینسانە چاک و خراپەکان هەڵخراوە، ئەگەر هاتباو خوا بە پێنج هەستەکان هەستی پێکرابایە، ژیانی دنیا ئەم چۆنیەتیی و شێوەیەی ئێستای لەدەست دەداو، وەک خۆی نەدەماو، لەوە دەشۆرا، کە بگونجیٚ ئینسانی تێدا تاقی بکرێتەوە، چونکە ئەودەمە، پێلێنان و دانهێنان بە بوونی خوادا، دەبوو بە شتێکی ناچاریی و، کەس نەدەما ئازاد بیٚ لە هەڵبژاردنی بڕوا یان بێبڕواییدا.

بەڵیٚ خوای کاربەجێو میهرەبان، ئینسانی وا ڕێکخستوە، کە وەک بابایەکی تینووی بەدوای ئاودا گەڕاو، تینوو و عەودالی خوا بێو، دەروونی

داخوازیی خوا بکات، ئنجا خۆیشی لێ پەنهان کردوە، تاکو بە کردەوە دەربکەوێ، کێ بەدەم بانگەوازی دەروونییەوە دەچێو، داخوازیی سروشتیی گیانی جێبەجێ دەکات و، لە پێناوی وەنیزیک کەوتن و بەخوا گەیشتندا، خۆی ماندوو دەکات و، بە تیشکی عەقڵ ئەو پەردەیە دەدڕێ و، ئەو دیوارە دەبڕێ و، دەگاتە ناسینی خوای بەرزو مەزن، بۆ ئەوەی ئەوانەی خوایان لە هەموو شتێک خۆشتر دەوێو، بەڕاستیی بەدوایدا وێڵن، دەربکەون و جوێ وەبن، لە کەسانێک کە لەبەر خۆپەرستیی، خوا پەرستییان لە یاد نیەو، لەبەر تێرکردنی ئارەزووە نزم و ئاژەڵییەکانیان، ئاگایان لە داخوازییەکانی گیانیان نەماوەو، وا لە گۆمی دنیادا نقووم بوو ون، نایان پەرژێتە سەر ناسین و بەدواداگەڕانی خواو پەرستن و بەندایەتیی بۆکردنی.

خوێنەری بەڕێز!

ئێستاش دوای ئەوەی لە کردنەوەی پێنج گرێکوێرەی سەرەکیی بووینەوە، دەچینە سەر ڕوونکردنەوەی ڕێگەو چۆنیەتی پاک ڕاگرتنی دڵ و دەروون و، پاراستنی بڕوا (ایمان)، کە بەندی شەشەمی بۆ تەرخان کراوە:




# ڕێگـەی پاک ڕاگرتنی دڵ و پاراسـتنی بـڕوا

## دەسـتپێك

خوێنەری بەڕێـز!

وەک گوتمان: سروشتی ئینسان وێڵ و عەوداڵ و تینووی ناسینی خوای پەروەردگارە، بەڵام خوای کاربەجێو زانا بە مەبەستی تاقیکرانەوەی بەندەکان و، لێک هەڵێوێردرانی پاک و پیسان، ژیانی دنیای وا هەڵخستوە کە پڕپڕ بێ لەو هۆیانەی دڵ و دەروونی ئینسان ژەنگاویی دەکەن و، بەرچاوی تەماویی دەکەن، ئەمە لە لایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە: خوای کاربەجێو لێزان، سروشتی ئینسانی وا ڕێکخستوە، کە وێڕای لایەنی خوادۆستیی و خێرخوازیی، لایەنی دنیادۆستیی و شەڕخوازییشی تێدا بێ، ئنجا کەسێک کە بیەوێ ئاوێنەی دڵی، هەردەم سپی و سۆڵ و ڕوون و بێغەور بێ و، بەرچاوی بێتەم و هەور بێ، تاکو هەرچی زیاتر تیشکی خواناسیی لەڕێی چاوی دڵییەوە، بێتە نێو ئاوێنەی گیانی و، سەرو سینەی بەناسینی خوا درەوشاوە بن، دەبێ هەمیشە لە سەنگەردا بێ و لە خۆی وریابێ کە تیرە ژەهراوییەکانی دنیاو ئارەزووەکانی، پەنجەرەی دڵی نەشکێنن و، پێویستە هەردەم چاودێرو ئاگاداری دڵ و سینەی بێو، نەهێڵێ شەیتانی بەد پێی فێر

بێو، وەک گورگی برسی تێی بەربێ، ئنجا ئینسان هەتا لە بواری خۆ لە خۆشەویستیی دنیا پاراستن و، دڵ بەستن بە ئارەزووەکانی و، چاودێریی و ئاگالێبوونی پاک ڕاگرتنی سینەو دڵیدا، بەکارترو ئازاترو لە بڕشتتر بێ، ڕۆژی بڕواداریی و خواناسیی، لە ئاسمانی دەروونیدا پرشنگدارتر دەبێ، هەڵبەتە گەورەترین سوود و حیکمەتی ئەو یادی خواو بیرکردنەوەو نوێژو ڕۆژوو و قورئان خوێندن و یادی مردن و جلەوگیریی نەفس و..هتدەی کە لەسەر مرۆڤی مسوڵمان دیاریی کراوە، هێنانەدی ئەم ئامانجەیە، وەک پێغەمبەری سەروەرمان (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ هَـذِهِ القُلُوبَ تَصْدَأ كَمَا يَصْدأُ الحَدِيدُ إِذَا أَصَابَهُ المَاءُ، قِيلَ: وَمَا جِلاَؤُهَا؟ قَالَ: كَثْرَةَ ذِكرِ المَوْتِ، وَتِلاَوَةَ القُرآنِ}[1] واتە: بێگومان ئەم دڵێنە ژەنگ دەگرن، وەک چۆن ئاسن کە ئاوی وآکەوت ژەنگآ دەگرێ، گوترا: ئنجا بەچی سپی دەبنەوە - وژەنگەکان بەردەدەن - ؟!

فەرمووی: بەزۆر یادکردنی مردن و قورئان خوێندن.

لەم فەرموودەیەدا ئیشارە کراوە بۆ دوو شتان، کە یەکیان چاکترین و سەرەکییترین هۆی پاراستن و پتەوترین قەڵغانی، دڵ و دەروونی ئینسانی بڕوادارە، لە ئاقار تیرە ژەهراوییەکانی دنیاو ئارەزووەکانیداو، باشترین هۆی پاکڕاگرتن و ژەنگ وەراندنیەتی، ئەویش بریتیە لە زۆر بیرکردنەوە لە مردن و زۆر یادکردنی.

هەروەها دووەم لەو دوو شتانە چاکترین و بنەڕەتییترین، پاڵپشتی عەقڵ و گیانی ئینسانی خواناسە، بۆ زاڵکردنی لایەنی چاکەو خێرخوازیی بەسەر لایەنی شەیتانیی و شەڕخوازییداو، باشترین سوپەری تیر گێڕەوەی ئەو تیرانەیە، کە شەیتان لەڕێی لایەنی شەڕخوازیی دەروونەوە، وەک ئامانج (نیشانە)ێک لە بڕوا (إیمان)یان دەگرێ، ئەویش بریتیە لە قورئان خوێندن - بێگومان بە حاڵی بوونەوە-.

---

(١) أخرجه البيهقي في شعب الإيمان برقم: ٢٠١٤، والطبراني في «مسند الشهاب» برقم: ١١٧٨، وَضَعَّفَهُ الألباني في «الضعيفة» برقم: ٦٠٩٦.

خوێنەری بەڕێز!

شـەیتان لـەو جەنگەیـدا کـە لەگـەڵ ئینسـاندا دەیـکات، دوو سـەنگەری سـەرەکیی بەدەسـتەوەن، کـە خۆیـان تێـدا مەڵێـس دەدات و، دڵ و دەروونـی ئینسـانیان لێـڕا تیـرباران دەکات؛ یەکـەم: دنیـا، دووەم: نەفـس.

بەڵـێ بێگومـان شـەیتانی بـەدی لەعنەتیـی، لەڕێـی خۆشەویسـتیی دنیـاو، لەڕێـی لایەنـی بـەدو شـەڕخوازیی نەفسـەوە، بەسـەر مرۆڤـدا زاڵ دەبـێ، هەربۆیـەش دەبینیـن خـوای پـەروەردگار، چوونـە دۆزەخـی بـە سەرکێشـیی و لەسـنوور دەرچوونـی نەفـس و هەڵبژاردنـی ژیانـی دنیـاوە، بەسـتۆتەوە، وەک دەفەرمـوێ:

﴿ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾ (النازعات: ٣٧-٤١).

واتـە: ئنجا کەسێـک لـە سنوور دەرچێ و، ژیانـی دنیـا هەڵبژێرێ -بەسـەر دواڕۆژدا-، ئەوە بێگومان دۆزەخ جێیەتی، بەڵام کەسێـک لە ڕاوەستانی[1] بەر دادگای پـەروەردگاری بترسێ و، جڵەوگیریـی نەفسـی بـکات لـە ئارەزووەکانـی، ئـەوە بێگومان بەهەشـــت جێیەتی.

وەک دەبینیـن: یاخیبـوون و سنوورشـکاندنی نەفـس و خۆشەویسـتیی و هەڵبژاردنـی ژیانـی دنیـا، مرۆڤ بـەرەو دۆزەخ دەبـەن و، ترسـان لـە لێپرسینەوەی دواڕۆژو پێشگیریی (منع)کردنی نەفس، لە ئارەزوو و داخوازییە ناڕەوایەکانی، دەبنـە هـۆی چوونـە بەهەشـتی ئینسـان، بـە تەعبیرێکـی دیکـە:

سنوورشکاندنی نەفس + هەڵبژاردنی دنیا = چوونە دۆزەخ.

ترسان لە لێپرسینەوە + سەرشکاندنەوەی نەفس = چوونە بەهەشت.

---

(١) یان مەبەست لە (مقام ربه) پلەوپایەی هەرەبەرزی پەروەردگارێتییە.

ئنجا بێگومان لە نێوان سەرکێشیی و یاخیبوونی نەفس و، هەڵبژاردنی دنیاداو، لە نێوان لەخواترسان و سەرشکاندنەوەی نەفسیشدا، پەیوەندییەکی پتەوو ڕاستەوخۆو ڕاستەوانە (طردي) هەیە.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

ئەو دوو سپێرەی[1] کە شەیتان لە جەنگی نێوان خۆی و مرۆڤدا، بەکاریان دێنێ ژیانی دنیاو نەفسی خراپەکارن، هەر بۆیەش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی ژیانی دنیاوە فەرموویەتی:

١- {مَنْ أَحَبَّ دُنْيَاهُ أَضَرَّ بِآخِرَتِهِ، وَمَنْ أَحَبَّ آخِرَتَهُ أَضَرَّ بِدُنْيَاهُ، فَآثِرُوا مَا يَبْقَى عَلَى مَايَفْنَى}[2] (أخرجه أحمد برقم: ١٩٧١٣، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب برقم: ٣٢٤٧)، واتە: هەرکەسێک ژیانی دنیای خۆش بوێ، زیان بە دوارۆژی دەگەیەنێ و، هەرکەسێک ژیانی دوارۆژی خۆش بوێ، زیان لە ژیانی دنیای دەدات، کەواتە ئەو - ژیان-ەی کە دەمێنێ، هەڵیبژێرن بەسەر ئەو - ژیان-ەدا کە لەنێو دەچێ.

٢- دیسان فەرموویەتی: {ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللهُ} (أخرجه إبن ماجه برقم: ٤١٠٢، وصححه الألباني)، واتە: دنیا بەکەم بگرە خوا خۆشی دەوێی.

شایانی باسیشە:

زۆر کەس وشەی (زهد) بە (دنیانەویستیی) لێک دەدەنەوە، بەڵام من وشەی (دنیا بەکەمگرتن)م لەلا پەسندترە، چونکە لە واقیعدا هەروایە، نە مرۆڤ دەتوانێ ژیانی دنیای هەر نەوێ و، نە ئیسلامیش ڕازی دەبێ مرۆڤی مسوڵمان دنیا بە یەکجاریی واز لێبێنێ و گرنگیی پێنەدات، چونکە ئیسلام دەڵێ: دنیا مەکە ئامانج و بەسەر دوارۆژدا هەڵی مەبژێرە، نەک دەست لە

---

(١) سپێر: سەنگەر، بۆسە.

(٢) تعليق شعيب الأرنؤوط : حسن لغيره وهذا إسناد ضعيف لانقطاعه.

دنیا هەڵگرەو فەرامۆشی بکە! دیسان ئەو وشەیەی پەسندمان کرد، پڕ بە پێستی وشە عارەبییەکەشە، ئەوەتا بڕواپێکراوترین و گەورەترین فەرهەنگی زمانی عارەبی گوتوویەتی: [زوهد (زهد) دژی خۆشویستن و سووربوونە لەسەر دنیاو، (زهد) لەهەر شتێکدا، دژی مەیل و دڵ لێبوونە، .... (عطاء زهيد: قليل)، واتە بەخششێکی (زهید) یانی کەم، (وأَزْهَدَ العطاءَ) یانی بەخششەکەی بەکەم گرت] [1].

هەروەها فەرموویەتی: {أَعْظَمُ آفَةٍ تُصِيبُ أُمَّتِي حبُّهُم الدُّنيَا} (أخرجه الديلمي برقم: ٦٤١)، واتە: گەورەترین دەرد کە تووشی ئۆممەتم دەبێ، دنیا خۆشویستنیانە.

بەڵێ بەڕاستی ئەو کەسەی فەرموویەتی: {حُبُّ الدُّنيَا رَأْسُ كُلِّ خَطِيئَةٍ}[2] خۆشەویستیی دنیا سەری هەموو تاوانێکە، زۆر ڕاستی فەرمووە.

هەروەها فەرموویەتی: {الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ للَّهِ} (أخرجه الترمذي برقم: ١٦٢١، وقال: حسن صحيح، وابن حبان برقم: ٤٦٢٤، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح)، واتە: تێکۆشەری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە، کە دژ بە نەفسی خۆی تێدەکۆشێ-و بەپێی شەرع ڕامی دەکات- لە پێناوی ڕازیکردنی خوادا.

٤- دیسان فەرموویەتی: {الْكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ وَالْعَاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا وَتَمَنَّى عَلَى اللَّهِ} (أخرجه أحمد برقم: ١٧١٦٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف، لضعف أبي بكر بن أبي مريم، وباقي رجال الإسناد ثقات).

واتە: ئینسانی ژیر ئەوکەسەیە کە سەرکۆنەی نەفسی خۆی دەکات - و لێی دەپرسێتەوە - و بۆ پاش مردنێ هەوڵ دەدات و، ئینسانی تەنبەڵ و

---

(١) بڕوانە: لسان العرب، ب٣، ل١٩٦-١٩٧، وشەی (زَهَدَ).

(٢) عن الحسن مرسلا (قال العجلوني في كشف الخفاء حول هذا الحديث برقم (١ ٩٩) ما يلي رواه البيهقي في الشعب بإسناد حسن إلى الحسن البصري رفعه مرسلا.

گێژیش[1] ئەو کەسەیە، کە نەفسی خۆی وەدوا ئارەزووەکانی دەخات و، خۆزگەو ئاواتان لەخوا دەخوازێ.

ئێستا کە لەبەر تیشکی ئەم دەقانەدا بۆمان ڕوون بۆوە، خۆشەویستیی ژیانی دنیاو دڵ پێبەستنی و، نەفسی خراپەخوازی ئینسان، تا چ ڕاددەیەک کاریگەرن لە پیسکردن و ژەنگاویی کردنی دڵ و گیاندا، با بگەڕێینەوە سەر ئەو فەرموودەیەی کە باسی ژەنگ گرتنی دڵێن و، چۆنیەتی لابردنی ئەو ژەنگەی کرد:

وەک گوتمان و ڕوونمان کردەوە: کە خۆشەویستیی دنیاو نەفسی شەڕخواز، دوو سەنگەری بێڕەزاو، دوو دەستەگیرەی پتەون، بەدەست شەیتانی بەدەوە، لەو جەنگەیدا کە لە دژی مرۆڤی بەرپاکردوە، ئنجا لە فەرموودەی ناوبراویشدا —ئەو فەرموودەیەی کردمانە بنچینەی ئەم باسە- چارەسەری هەرکام لە خۆشەویستیی دنیاو، نەفسی شەڕخوازی تێدایە، بە واتایەکی دیکە: لەو فەرموودەی گۆریندا: هەم دەرمانی دەردی (دنیاپەرستیی)و، هەم دەرمانی دەردی (خۆپەرستیی) هەیە.

بەڵێ لەو فەرموودە بەرزو بەپێزەدا، دوو قەڵغانی تیرگێڕەرەوە، خراونە ڕوو کە مرۆڤی خواناس، بتوانێ هەموو ئەو تیرە ژەهراوییانەیان پێ لەخۆی بگێڕێتەوەو بەرپەرچیان بداتەوە، کە شەیتانی لەعنەتی و نەگبەت لە دوو سەنگەری دنیاویستیی و، خۆپەرستییەوە، لە دڵ و دەروونی ئینسانی خواناسیان دەگرێ و، گیانی ئینسانیان پێ بریندار و ژەنگاویی دەکات، چونکە کاریگەرترین دەرمان بۆ دەردی دنیاویستیی، بریتیە لە یادی مردن (ذکر الموت)، چونکە سەرگەرم بوون و زیاد لەپێویست خەریک بوون بە ژیانی دنیاوە، ئەنجامی حەتمیی و سروشتیی مردن و دوارۆژ لەبیرچوونەوەیە.

---

(١) وشەی (عاجز) کە لە بەرانبەری (کێس)دا بەکارهێنراوە، مانای سستیی و بێهێزیی جەستەیی و بیریی دەگەیەنێ، کەواتە: عاجز= تەنبەڵ و گێژ. بڕوانە فەرهەنگی (لسان العرب)، ب٥، ل٣٦٩.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی یاد کردنی مردنی فەرموویەتی: {أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اَللَّذَّاتِ} (أخرجه أحمد برقم: ٧٩١٢، والترمذي برقم: ٢٣٠٧، وقال : حسن غريب، والنسائي برقم: ١٨٢٤، وابن ماجه برقم: ٤٢٥٨، وابن حبان برقم: ٢٩٩٢).

واته زۆر یادی لەنێوبەر[١] و لابەری خۆشییان بکەن.

واتە: زۆر یادی مردنی بکەن، چونکە مردن ئینسان، لەخۆشیی و ئارەزووەکانی دنیا دەپچڕێنێو، ئەو شتانەی کە خۆشی دەوێن و حەزیان لێ دەکات، لە دەستی دەردێنی.

کەواتە: بە پێچەوانەوە: مردن لە بیرچوونەوە، دەبێتە هۆی مردنی دڵ و بەسام بوونی مردن، دڵ دەمری، چونکە وەک گوتمان: مردن لە بیرچوونەوە، نیشانەی زۆر بەدنیادا ڕۆچوونەو، هەر دڵێکیش زۆر بەدنیادا چۆخواری و خۆشیویست، وەک درەختێکی ئاو لێبڕاو، ئیشک دەبێو دەمری، چونکە دڵێک بەخواوە پەیوەست بێ مەحاڵە، ڕێ بە خاوەنی بدات هێندە بە گۆمی دنیاو ئارەزووەکانیدا ڕۆ بچێ، کە مردنی لەبیر بچێتەوە، کەواتە: هەر دڵێک مردنی لەبیر بچێتەوە، وا دیارە پەیوەندیی لەگەڵ خوادا پچڕاوە، ئاخر مردن یانی گەڕانەوە بۆ لای خوا، بێگومان کەسێکیش خوا بناسێ و پەیوەندیی لەگەڵ هەبێ، بڕوای بەگەڕانەوە لایشی دەبێ، ئنجا خوای بەرزو مەزن، سروشتی ئینسانی وا ڕێک خستوە، کە دڵ و گیانی (لایەنی فریشتەیی و مەعنەویی) پەیوەندیی لەگەڵ خوادا، وەک پەیوەندیی ماسی وابێ لەگەڵ ئاودا، کەواتە: مردن لەبیرچوونەوە، نیشانەی پەیوەندیی پچڕانە لەگەڵ خواداو، پەیوەندیی پچڕانیش لەگەڵ خوا، هۆی ئیشک بوون و مردنی دڵە، هەروەک چۆن پەیوەندیی پچڕانی نێوان ئاوو ماسی، هۆی مردن و ڕەق هەڵێتنی ماسییە.

---

(١) بڕوانە: (لسان العرب)، ب١٢، ل٦٠٦، وشەی (هَدَمَ).

ئنجا بە لەبیرچوونەوەی مردن، دیاردەی مردن دەبێتە شتێکی مەترسییدارو بەسام، چونکە:

١- هەر کەسێک شتێکی لەیاد نەبێو، بیری لێ نەکاتەوەو لەبەر چاوی خۆی نەگرێ، لەدەمی تێهەڵەنگووتن و بەرەنگار بوونیدا، دەحەپەسێو دەتۆقآ، لەبەر ئەوەی شتێکی چاوەڕوان نەکراوی تووش بووە.

٢- کەسێک مردنی لەیاد نەبێو لەبیری چووبێتەوە، دیارە خۆی بۆ ئامادە نەکردوە، مادام وابێ لە کاتێکدا لەگەڵی دەستەویەخە دەبێ، وەک ئەو کەسەی لێدێ کە لەگەڵ دوژمنێکدا ڕووبەڕوو دەبێ بە دەستی بەتاڵ و حەتاڵ، یان وەک ئەو قوتابییەی لێدێ کە لەگەڵ تاقیکردنەوە (إمتحان) دا ڕووبەڕوو دەبێ، بێئەوەی کۆششێکی کردبێو خۆی بۆ ئامادە کردبێ.

هەروەها بێجگە لە دەرمانی دەردی (دنیاپەرستیی) کە بریتی بوو لە یادی مردن، فەرموودەی ناوبراو، دەرمانی دەردی (خۆپەرستیی)شی تێدایە، کە بریتیە لە قورئان خوێندن (تلاوة القرآن).

بەڵێ چاکترین دەرمانی دەردی یاخیبوون و لەسنوور دەرچوونی نەفس و، باشترین هۆی وەراندنی ئەو ژەنگ و ژارەی بەهۆی سنوور شکاندن و ڕیشەپچڕاندنی نەفسەوە لەسەر دڵ و گیان کۆ دەبێتەوەو، پتەوترین قەڵغانی سەرسەری دڵ و گیان، بۆ بەرپەرچدانەوەو گێڕانەوەی ئەو تیرانەی کە ئیبلیسی پیسی بێخێرو نەگریس، لە سەنگەری نەفسەوە دەیان هاوآ، بریتیە لە (قورئان خوێندن)، چونکە شەیتانی بەدو بێخێر، تەنیا لەکاتێکدا دەتوانێ زەفەر بە قەلێی نەفسی مرۆڤ بەرێ و سەنگەری تێدا دروست بکات، کە بەهۆی لەخوا بێئاگابوونی ئینسانەوە، دڵی بووبێتە شاری بێساحێب.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {الشَّيْطَانُ جَاثِمٌ عَلَى قَلْبِ ابنِ آدَمَ، فإِذَا ذكَرَ اللّه خَنَسَ وإذا غَفَلَ وَسْوَسَ} (أخرجه أبي يعلى في

مسنده ج ٧/ ص ٢٧٩ حديث رقم: ٤٣٠١)، واتە شەیتان لەسەر دڵی ئادەمیزاد چۆکی داکوتاون، ئنجا ئەگەر - ئینسان - یادی خوای بەرزی کرد، پاشەکشە دەکات و، ئەگەر بێئاگاش بوو، خوتخوتە دەخاتە - دڵییەوە -.

بەڵێ ئیبلیسی بەدو نەگریس، بەس لەکاتی بێئاگایی و دوور لە خواییدا، دەتوانێ پێ بنێتە نێو قەڵێی دەروونی مرۆڤەوە، هەروەک چۆن بابایەکی دزو جەردە، لەکاتی نووستن و چرا کوژانەوەی ماڵێندا، دەرفەتی چەنگ دەکەوێ، واتە هەتا ڕۆژی یادی خواو لەگەڵ خوابوون، لە ئاسمانی شاری دڵدا هەڵێتوو و شوعلەوەر بێ، دەبێ شەیتانی جەردەو دز، هەر دەرکراوو شاربەدەر بێ.

تەنانەت شەیتان بۆ خۆشی پێی لێناوە، کە توانای بەسەر هەموو کەسدا دەشکێ بۆ خوتخوتە هاویشتنە دڵ و لەڕێ لادانی، بێجگە لە بەندە ڕاستەقینەو بێ خڵتە و یەکلابووە وەکانی خوا، وەک خوای بەبەزەیی و بەخشندە فەرموویەتی:

﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾ (الحجر ٣٩-٤٢).

واتە: -شەیتان- گوتی: پەروەردگارم! چونکە گومڕات کرد -تاوان و خراپەیان- بۆ دەڕازێنمەوە لە زەویداو، وە تێکڕا سەریان لێ دەشێوێنم. جگە لەو بەندانەت کە لێت هەڵبژاردوون. -خوا- فەرمووی: ئەم -دەسەڵات نەبوونەی تۆ بەسەر بەندە هەڵبژاردەکانمدا-ە، لەسەر من ڕێیەکی ڕاستە، بێگومان بەندەکانم تۆ دەستەڵاتت بەسەردا نین، ئەوانە نەبێ کە دوات دەکەون لە سەرگەردانان.

بەڵێ شەیتانی زەبوون و دەرکراو، چ ڕێی[1] دەکەوێ، بتوانێ کەسانێک بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، کە لە جوغزی بەرنامەی خوادا دێن و دەچن و، بەگوێرەی ڕەزامەندیی خوا بەڕێوە دەچن! کەسێک بەڕاستی بەندەی خوا بێ، شەیتان ناتوانێ بەدیلی بگرێ و ئەوساری ئارەزووپەرستیی و دنیاویستیی لەملی بکات و، بیکاتە کۆیلەی خۆی!!

ئنجا ئێمەش کە گوتمان: (قورئان خوێندن) - بەڵام نەک هەموو قورئان خوێندنێک- چاکترین دەرمانی خۆپەرستیی و، باشترین ژەنگ وەرێنی دڵ و، پتەوترین سوپەری دەروونە، بۆیە وامان گوت، چونکە وەک ڕوونمان کردەوە: یادی خواو لەگەڵ خوا بوون، ئینسان لە تۆڕو شەداوو قولاپ و داوی شەیتان، قوتار دەکات و، لەمەودای هێزی کێشکردن (مجال قوة الجاذبیة)ی وی ڕزگاری دەکات و، لە ڕست و بەندی کۆیلایەتیی ئازادی دەکات، ئنجا قورئان خوێندنیش -بەڵام وەک پێویست- چاکترین و کاریگەرترین جۆری یادی خواو، لەگەڵ خوا (مع الله) بوونە، مادام وابێ، چاکترین و بەکارترین قەمچیی و شووترکی[2] لووتی شەیتانی بەدو بێفەڕو چەتوونە.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەوە فەرموویەتی: {خَيْرُ الدَّوَاءِ الْقُرْآنُ} (أخرجه ابن ماجه برقم: ٣٥٠١ و٣٥٣٣)، وَضَعَّفَهُ الألباني)، واتە: باشترین دەرمان قورئانە.

بێگومان ئەگەر لێرەدا مەبەست لە دەرمان، دەرمانی نەخۆشییە جەستەییەکانیش بێ، هیچ لە مەبەست ناگۆڕێ، چونکە ئێستا زانایان بۆیان ساغ بۆتەوە: کە زۆربەی نەخۆشییە جەستەییەکان، بەرهەمی چەند هۆیەکی دەروونین، وەک: هەست بە تەنیایی کردن و، ترسان لە مردن و،

---

(١) چ ڕێی دەکەوێ: چ حەددی هەیە، چۆن دەتوانێ!

(٢) شووترک: شولک، شوو (چڵەداری سەوزی باریک).

دڵەڕاوکەو، هەست کردن بە تاوان و، دڵتەنگیی و، ڕاڕایی و، دڵپیسیی و،... هتد. ئنجا گومانیشی تێدا نیە کە ئەم جۆرە تێڕوانین و هەست و نەستە بەدو بێخێرانەش، قەلەفسەی بڕکە گوژاڵکی بێبڕوایی و خوانەناسیین و، هەموویان گەرای وەسوەسەی شەیتانن لە دڵ و دەروونێکی بێبڕوادا[1].

هەروەها فەرموویەتی: {الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ} (أخرجه البخاري برقم: ٤٦٥٣، ومسلم برقم: ٧٩٨)، واتە: بابای لە قورئاندا کارامەو شارەزا، لە ڕیزی —فریشتە- نوێنەرە بەڕێزو چاکەکان دایە.

واتە: ئینسان بەهۆی قورئان خوێندن و لە قورئان شارەزابوونەوە، دەتوانێ هێندە چاک و بەڕێزو پاک بێ، وەک فریشتانی لێبێ، لە پاکیی و چاکییدا.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە کە بزانین؛ لە سۆنگەی چییەوە، قورئان خوێندن و لەگەڵ قورئان ژیان و تێکەڵ بوون، هێندە بە تاوو تین و کاریگەرە، لە پاراستن و بەهێزکردنی قەڵیی شاری دڵ و دەروونندا، لە ئاقار هێرشی شەیتان و سەربازەکانیدا؟!

لە وەڵامدا دەڵێین:

وەک پێشتر گوتمان؛ شەیتانی لەعنەتیی و نەگبەت، بەس بە کەسێک دەوێرێ و تەنیا زەفەر بە دڵ و دەروونێک دەبا، کە لەخوا تۆرابێو پەیوەندیی لەگەڵی پچڕابێ، هەروەک چۆن گورگی برسی، بەس زەفەر بە مەڕێک دەبات کە لە مێگەل دابڕابێو، لەبەر ڕکێفی ئاگاداریی و چاودێریی شواندا نەمابێ، ئنجا ئەندازەی پێوێرانی شەیتانیش، سەبارەت بە دەروونی ئینسان، پەیوەندییەکی ڕاستەوانەو پێچەوانە (طردي وعكسي)ی هەیە لەگەڵ کزیی

---

(١) لە کتێبی (یادی خودا)دا باسێکی بەپێزمان لەوبارەوە نووسیوە، بڕوانە ب١، بەشی شەشەم (پەیوەندیی نێوان یادی خواو پارێزران لە نەخۆشییە دەرو دەروونییەکان).

و بەهێزیی بڕوا (إیمان)ی نێو دڵ و دەروونندا، واتە: تاکو بڕوای مرۆڤ کز بێ، توانای زاڵبوونی شەیتان زۆر دەبێو، هەتا بڕوا بەهێز بێ، توانای شەیتان کەم دەبێ.

ئنجا قورئان سەرەڕای ئەوەی کە بەرزترین شێوەی یادی خوا (ذکر الله) یە، چاکترین و کاریگەرترین هۆی پەیدابوون و فراژوو بوون و گەشەکردنی بڕواشە، چونکە -وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە- تاقە ڕێگەی پەیدابوون و فراژوو بوونی بڕوابەخوا بوون، بریتیە لە (بیرکردنەوەو یادکردن= الفکر والذکر) واتە: بیرکردنەوەو تێوەڕامان، لەو پەرێزو شوێنەوارەی کە ئاوێنەی تێدا دەرکەوتنی سیفەتە بەرزەکانی خوایەو، یادکردنی خوا، بەهۆی باسکردن و بەسەر دڵدا هێنانی، ناوو سیفەتە بەرزو پیرۆزو پاک و چاکەکانییەوە، بۆیەش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {إِذَا أَحَبَّ أَحَدُكُمْ أَنْ يُحَدِّثَ رَبَّهُ فَلْيَقْرأِ القُرآنَ} (أخرجه الخطیب (٢٣٩/٧)، والدیلمی (٣٠٢/١، رقم ١١٩٥)، قال المناوی (٢٤٨/١): فیه الحسین بن زید قال الذهبی ضعیف، وقال الألباني: ضعیف جدا)، واتە: ئەگەر یەکێکتان ویستی لەگەڵ پەروەردگاریدا بدوێ، با قورئان بخوێنێ.

بێگومان قورئانی بەپێزو خاوەن ڕێزیش، ئەگەر وەک خوا (جل جلاله) داوای کردوەو پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەکردار ڕای نواندوە، بخوێنرێ: هەم بیرکردنەوە لە شوێنەواری خوا، هەم بەسەر دڵ و زماندا هێنانی ناوو سیفەتەکانی خوا، واتە (فکر و ذکر) ئەنجام دەدرێن، هەر دڵ و دەروونێکیش ئەم دووانەی تێدا بن، ئەوە بێگومان نەمامی بڕوا بەخوا بوون لە زەوی ئەو دڵ و دەروونەدا، بەزوویی دەڕوێ و گەشەدەکاو، وەک کۆرپەی بەر دوو دایکان، هەر یەک ڕۆژەی دوو ڕۆژە دەبێ و، هێندە نابات، دەبێتە درەخت و، لق و پۆپی ڕەوشت و خووەجوانەکان دەردەکاو، بەرو میوەی خەسڵەتە بەرزو فریشتەییەکان بەرهەم دێنێ و، شەیتانی بەد دەرەتێنێ و، خاوەنی خەنی دەکات.

بۆیە خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا ﴾ (الأنفال-٢).

واتە: بڕواداران بەس ئەوانەن کە ئەگەر باسی خوا کرا، دڵیان ڕادەچڵەکێ و، ئەگەر ئایەتەکانییان بەسەردا خوێندران، بڕوایان زیاد دەکات.

ئێستاش دوو قسە، کە لەبەر پەنجەرەی زەینم سەرەتاتکە دەکەن و، بەهیوای خرانەڕوو، جار لەدوای جار خۆ ڕەپێش دەکەن و، ئەستۆ درێژ دەکەن، پێم خۆشە بێدڵییان نەکەم و تۆماریان بکەم:

**یەکەم:** ئێمە کە لەبەر تیشکی چەند فەرموودەیەکدا، باسی گرنگیی و کاریگەریی، یادی مردن و بیرکردنەوە لە لێپرسینەوەی دوارۆژمان کرد، مەبەستمان پێ ئەو جۆرە بیرکردنەوەو یادکردنە ماقووڵ و بەرێوجێیە بوو، کە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) و هاوەڵێنی و باقی مسوڵمانە کامڵ و تەواوەکان ڕەچاویان کردوە، کەواتە: با هیچ کەس بەهۆی دیتنی ڕەفتاری هەڵەو ناتەواوو لەگەڵ ئیسلامدا نەگونجاوی، بڕێک سۆفیی و دەروێشی نەشارەزاو، لە ئیسلام بێهەواڵ و فەقیرحاڵ، زەینی بە سەهووی نەبات و، بیر لە مردن کردنەوەی مسوڵمانانەو ڕاست، لەگەڵ هی بەناو سۆفییانەی[1] ناڕاست تێکەڵ نەکات.

---

(١) بەڵێ سۆفی هەیەو، خۆ بەسۆفی زان (متصوف)یش هەیە، ئنجا ئێمە خۆ تەزکیە کردنمان لە بنچینەدا پێ دیاردەیەکی ڕەسەن و ئیسلامییەو، دەزانین کە لە قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەی گرتوە، بەڵام بەمەرجێک وەک لایەنێک لە ئیسلام (لایەنی گیانیی و پەروەردەیی) دابنرێ، نەک وەک جۆرە ئیسلامێکی تایبەتیی و داهێنراو، ئنجا بێگومان (تصوف) بە درێژایی مێژوو لیتەولاڵی نائیسلامیی تێکەڵ بووەو، گەلێک لایەنی وای تێدان کە گۆڕاون و لە گرێژنە چوون و، جا کورتەی قسان ئەوەیە؛ کە (تصوف) وەک کتێب و سەرچاوەکانی (فقە)، وەک لایەنێکی شەرح کراو لە قورئان و سوننەت، جێی سوود لێوەرگرتن و پشت پێ بەستنە، بەڵام بەتەنێ بەس نیەو، بەس بە سۆفیی بوون مسوڵمانەتیی نایەتە دی، بەڵکو مسوڵمانی ڕاستەقینە، دەبێ بڕوای بە هەموو لایەنەکانی ئیسلام بێو بۆیان تێبکۆشێ، واتە مسوڵمان دەبێ هەم سۆفیی بێ، هەم زانا، هەم تێکۆشەر هەم سیاسی... هتد، ئنجا مەسەلەی تەزکیەی نەفس لە ئیسلام دا، خاڵی هاوبەشی تێکڕای مسوڵمانانە و،

بەڵێ ئەو شێوە بیر لە مردن کردنەوەیەی ئیسلام فەرمانی پێکردوە، جوێیە لەوەی خۆ بەسۆفی زانە نەزانەکان دەیکەن، ئیسلام دەڵێ بیر لە مردنێ بکەوەو یادی گۆڕو گۆڕەپان (میدان)ی حەشر بکە، تاکو دنیا نەتوانێ بتکاتە کۆیلەو دیلی خۆی و، بەس بۆ دنیات هەوڵ نەدەی و پیاوی دنیاو دوارۆژان بی.

بەڵام بابای خۆ بەسۆفی زان، شێخە نەزانەکەی وای حاڵی کردوە[1]، کە بیرکردنەوە لە دنیا تاوانەو، مایەی چڵکن بوونی گیانەو، مرۆڤ هەتا لە کاروباری ژیانی دنیا بێئاگاو بێهەواڵتر بێ، لە هەڵسووڕاندنی ژیاندا کەم دەست و کۆڵەوارتر بێ، لەلای خوای پەروەردگار بەڕێزترو خۆشەویستترە!!

ئنجا بەڕاستیی من پێم وایە: بابایەکی هەتا بناگوێیان لە دنیادا ڕۆچوو، چەندە حەوجێی یادی مردن و قەبرو قیامەتە، بۆ ئەوەی شەیتان لە ڕێی دنیاپەرستییەوە، زەفەری پێ نەبات و، لە خۆڵێی وەرنەدات، ئەو جۆرە خۆ بەسۆفی زانەش، کە گوتم: بارتەقای وی، حەوجێی بیر لە دنیا کردنەوەو لەژیان حاڵی بوونە، بۆ ئەوەی طاغووتی بەرازو جامباز، لەڕێی واز لە دنیا هێنان و چاوهەڵنەهێنان و، لەژیان بەجێمان و، نەبوونی ڕۆزیی و

---

هەریەک لە (عابد و زاهِد) بوون وەک (فقیە و مجاهدو مقاتل و سیاسي) بوون وان و، هیچیان تایبەت نین بە هێندێک کەسەوەو، مسوڵمانی کامڵ و هاوسەنگ ئەوەیە کە هەموو لایەنەکانی شەریعەت بە پێی بۆ لوان بەڕێوە بەرێت.

قسەی کۆتایی خۆشم لەبارەی تەزکیەی نەفسەوە لە کتێبی: (ڕێگای صالح بوون و بەرەوخواچوون)دا کردوە، بڕوانە چاپی پێنجەم: ٢٠١٢ز، نووسینگەی تەفسیر.
هەروەها لەکتێبی پێنجەمی مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا) شدا قسەی باشمان لەوبارەوە کردوە.

(١) شێخی نەزان و بێهۆشیش وەک کۆڵکە مەلای دینفرۆش، لەبەرانبەریاندا شێخی زاناو داناو، مەلاو پێشەوای ڕەسەن و توانا هەن و، پێویستە هەمیشە پاک و پیس و چاک و خراپی هەر کۆمەڵێک لەیەک جیا بکەنەوە.

نـان و، تێکچوونـی گوزەرانـەوە، بەسـەریدا زاڵ نەبێ و، زەبوون و بێحاڵ نەبێو، کەنەفت و بێمـاڵ نەبێ!!

ئنجا ئـەم قسـەیەشم کـە کـرد لـە گیرفانـی خۆم دەرم نەهێناوەو، لـەم ڕسـتە بەپێزە فامراوەتـەوەو وەرگیـراوە:

﴿.... كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ....﴿٢٢٠﴾﴾ (البقرة ٢١٩-٢٢٠).

واتـە: ئـاوا خـوا ئایەتەکانـی بۆتـان ڕوون دەکاتـەوە، بەشـکم بیـر بکەنـەوە لـە —بەرژەوەندیـی- دنیـاو دوارۆژدا.

بەڵـێ مسـوڵمانی کامـڵ و تـەواوو چـاک لـە ئیسـلام حاڵـی بـوو، دنیـاو دوارۆژان وەک دوو تـای تـەرازوو هاوسـەنگ ڕادەگرێو، هەرکامێکیـان مافـی خۆی دەداتێو، شـتاقیان بۆ شـتاقیان فڕێ ناداو، بەنـاوی سـۆفییایەتی و دنیـا بەکەمگرتـن (زهـد)ەوە، کارێکـی وا ناکات، بـەس مـەردی قیامـەتێ بێو، لـە ژیانـی دنیـادا هیـچ نەبێو، طاغووتێـک خۆی لەسـەر بکاتـە نۆو نیو، ئەویش بەکزیـی و داماویـی لـە دەسـتییەوە ڕابمێنێو، جارجـارەش کـە زۆر برسـیی بـوو وەک پشـیلەی برسـیی بێـت و بچێو بەزەبوونیـی بمیاوێنـێ!

**دووەم:** وەک لەمەوبەریـش چەنـد جارێـک ئیشـارەمان کـرد: مەبەسـتمان لـەو قورئـان خوێندنـەی کـە هێنـدە بەتـاوو تینـە، بتوانـێ شـەیتانی بەدفـەڕ بڕەتێنێو، ژەنگـی سـەر دڵ بوەرێنێو، بڕوابەخـوا بـوون بخەملێنـێ، ئـەو قورئـان خوێندنەیـە کـە خـوا داوای کـردوەو، فەرمانـی پێکـردوەو، پێغەمبـەر (صلـی اللـە علیـە وسـلم) بەکـردار بەڕێوەی بـردوە.

جـا بابزانیـن داخـۆ خـوای زانـاو توانـا، لەبـارەی چۆنیەتـی خوێندنـی قورئانەوە، چـی فەرمووە!

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٩ ﴾ (ص- ٢٩)

واتە: ئەم قورئانە کتێبێکە بەپیت و پیز، بۆ لای تۆمان ناردۆتە خوار، تاکو لە ئایەتەکانییەوە ڕابمێنن و، بۆ ئەوەی خاوەن هۆشەکان پەند وەربگرن.

دیسان فەرموویەتی: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ٢٤ ﴾ (محمد- ٢٤).

واتە: ئایا لە قورئانێ ورد نابنەوە، یان دڵەکان قفڵی خۆیانیان لەسەرە!

ئەمە سەبارەت بەوە کە قورئان خوێندن، پێویستە بە تێوەڕامان و وردبوونەوەوەبێ، سەبارەت بەوەش کە پێویستە بابای قورئان خوێن، وێڕای لێحاڵی بوون و تێگەیشتن، ئیش بەو ئایەتانەش بکات کە وەری گرتوون و لێیان حاڵی بووە، فەرموویەتی:

﴿ ۞ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٤٤ ﴾ (البقرة-٤٤).

واتە: ئایا فەرمان بە خەڵکی دەکەن بە چاکەکاریی و، خۆتان لەبیر دەکەن، لە حاڵێکدا کە ئێوە کتێبی –خوا- دەخوێننەوە، ئەوە بۆچی نافامن!!

ئێستاش بابزانین ئەم فەرمانانەی قورئان چۆن لە لایەن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵە بەڕێزەکانییەوە (رضي الله عنهم) بەڕێوەبراون:

١- {(حذيفة) دەڵێ: شەوێک لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوێژم کرد، سووڕەتی بەقەڕەی خوێند تا تەواوی کرد، ئنجا سووڕەتی نیسائی خوێند، دوایی ئالی عیمرانی خوێند، بە کاوەخۆ دەیخوێند، کە بە لای ئایەتێکدا تێپەڕ دەبوو، پاکیی دەربڕینی تێدابێ، پاکیی دەردەبڕی و، کە بە لای داواو پاڕانەوەیەکدا ڕەت دەبوو، داوای لە خوا دەکردو، کە بەلای پەنا بە خواگرتنێکدا ڕەت دەبوو، پەنای بە خوا دەگرت}[١].

---

(١) رواه مسلم، (الإتقان في علوم القرآن)، ب١، ل١٠٦، جلال الدين السيوطي.

٢- {(عوف بن مالك) دەڵێ: شەوێک لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەستامەوە -بۆ نوێژکردنێ-، ئنجا هەستا -نوێژی دابەست و- سووڕەتی بە قەڕەی خوێند، بەلای هەر ئایەتێکی مـوژدەدەردا ڕەت بووبایە، ڕادەوەستاو داوای لە خوا دەکردو، بەلای هەر ئایەتێکی ترسێنەردا ڕەتبووبایە، ڕادەوەستاو پەنای دەبردەبەر خوا}[1].

٣- {پرسیار لە (عائشة) کرا دەربارەی ئاکاری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: (كَانَ خُلُقُـهُ الْقُـرْآنَ) (أخرجه أحمد برقم: ٢٤٦٤٥، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح) واتە: ڕەوشتی وی بریتی بوو لە قورئان}.

٤- {یەکێک لە هاوەڵێنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خوا لێیان ڕازی بێ، کە (عبدالله بن مسعود)ە، دەربارەی چۆنیەتی خوێندن و وەرگرتنی قورئان گوتوویەتی: هەرکام لە ئێمە کە دە (١٠) ئایەتان فێر دەبوو، لێیان هەڵنەدەبرد، هەتا لە مەبەستەکانیان دەگەیشت و ئیشی پێ دەکردن}[2].

٥- {(أبو عبدالرحمن السلمي) دەڵێ: ئەوانەی کە قورئانیان فێر دەکردین دەیانگوت: داوای قورئان فێرکردنمان لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکرد، ئنجا کە دە (١٠) ئایەتان فێر دەبووین، بەجێمان نەدەهێشت، هەتا ئیشمان بەو کردەوانە دەکرد، کە تێیاندا هەن، بەم جۆرە قورئان و ئیش پێکردنی، وێکڕا فێربووین}[3].

---

(١) رواه أبوداود والنسائي، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) بڕوانە (تفسير القرآن العظيم)، ب١، ل٣، چاپی١٣٨٨ک، إبن كثير.

(٣) سەرچاوەی پێشوو.

بەڵێ خوێنەری سەنگین!

جۆرو چۆنیەتی و قورئان خوێندنی پێغەمبەرو هاوەڵە مسوڵمانە ڕاست و کامڵەکانی، بەو شێوەیە بووە، کە لەم پێنج دەقەدا خرایە ڕوو؛ قورئان خوێندنێکی هێدی و ئارام بە وردبوونەوەو ڕامان و سەرنجەوە، ئنجا دوا بەدوای خوێندن و وەرگرتن و حاڵی بوونی مەبەست و نێوەڕۆکی ئایەتەکان، یەکسەر قۆڵ هەڵکردن و خۆگورج کردن بۆ خستنەکارو جێبەجێکردنیان.

هەڵبەتە کەسێکیش بڕوای وابێ، قورئان پەیامی خوایە بۆ ئینسان و بەرنامەی ژینیەتی، هەڵوێستی لەبارەی قورئانەوە هەر ئاوا دەبێ، بەڵام کەسێک بە هەڵە وا حاڵی بووبێ، کە قورئان بەس شتێکی بەپیت و پێزو پیرۆزەو خوێندرانی (بگرە تەنانەت ئامادەبوونی ڕووتی لە ماڵێدا) بەمەرجێک سێچوار بەرگی نوێی ڕەنگاوڕەنگی تێ وەرپێچرابن و، لەسەر شوێنێکی بەرز دانرابێ! مایەی هەڵڕژان و دابارینی بەزەیی و بەخششی خوایە! بەڵێ بابایەکی ئاوا، دیارە بەو جۆرەی کە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵەکانیمان گێڕایەوە، لەگەڵ کتێبی خوادا ڕەفتار ناکات، چونکە هەموو دەمێ جووڵێن و کارکردنی ئینسان، بەگوێرەو ئەندازەی بیروبۆچوون و تێڕوانینیەتی و، قەت هەڵوێستێکی کرداریی ڕاست، لە بابایەک چاوەڕوان ناکرێ کە خاوەنی بیروباوەڕو تێڕوانینێکی هەڵەیە، ئاخر گۆزە چی تێدا بێ هەر ئەوەی لێدەڕژێ.

دوا تکاشمان لە خوێنەران ئەوەیە کە: مردن یادکردنی هەڵەو، قورئان خوێندنی هەڵە، لەسەر ئیسلام حسێب نەکەن و، لەگەڵ مردن یادکردنی راست و قورئان خوێندنی ڕاستدا تێکەڵیان نەکەن و، یەک حوکم بەسەر دوو شتی هێندەی ڕەش و سپی لێک جوێو، ئاسمان و زەوی لێک دووردا، نەدەن.

ئێستاش کە بەکورتی دەربارەی ڕێگەو چۆنیەتی پاک ڕاگرتنی دڵ و پاراستنی بڕوا دواین، بەپێویستی دەزانم وەڵامی پرسیارێکی گرنگ بدەمەوە:

ئه‌م باسانه‌ که‌ ده‌رباره‌ی (بڕوا به‌خوا بوون) ده‌دوێن، چۆن بوو ئه‌م باسه‌ که‌ ده‌رباره‌ی پاک ڕاگرتنی دڵ و ده‌روونه‌، خۆی ئاخنیه‌ نێویان و لێیان بوو به‌ (نێوئاخنه‌)؟!

له‌ وه‌ڵامدا ده‌ڵێین، هه‌روه‌ک چۆن ڕووه‌کێک - بۆ وێنه‌: بڕکه‌ ته‌ماته‌ - هه‌تا ئه‌و زه‌وییه‌ی تێیدا ده‌چێندرێ، نه‌کێڵدرێ و خۆش نه‌کرێ و هه‌ڵنه‌وێژێردرێ و، خه‌ت و کووز نه‌کرێو، نه‌کرێته‌ دێراوو دێراوه‌کانیش هه‌ڵنه‌درێنه‌وه‌، ئه‌و ڕووه‌که‌ ناگونجێ بچێندرێ و، ئه‌گه‌ر گریمان چێندراش، ته‌مه‌ن درێژ نابێو، زوو زه‌رد هه‌ڵده‌گه‌ڕێ و هێنده‌ نابات ئیشکه‌ڵ ده‌بێو ده‌مرێ، نه‌مامی بڕوا به‌خوا بوونیش به‌هه‌مان پێودان، ناتوانێ له‌ زه‌وی دڵ و ده‌رووندا: ڕه‌گان داکوتێو بڕوا، مادام له‌ به‌ردو دارو زه‌مه‌ند، بژار نه‌کرابێ و، له‌ چه‌قڵیی و چاڵی خوو و خده‌و خه‌سڵه‌ته‌ نزم و په‌سته‌ ئاژه‌ڵییه‌کان و، کرده‌وه‌و ئاکاره‌ ناقۆڵێو دزێوه‌ شه‌یتانییه‌کان، پاک نه‌کرابێته‌وه‌و هه‌ڵنه‌وێژێردرابێ، به‌ڵێ به‌ڕێزان:

١- (بڕوا به‌خوا بوون) بولبولێکی ئازاده‌و، ئاماده‌ نیه‌ له‌ قه‌فه‌زی دیلیی و کۆیله‌ییدا بژی، که‌سێکیش ڕێشمه‌ی نه‌فسی به‌ده‌ست شه‌یتان بێو، گیرۆده‌ی خراپه‌و تاوان بێو، به‌نده‌ی ئاره‌زووه‌کان بێ، قه‌ت ناگونجێو ڕێی تێ ناچێ، بڕواو خواناسیی میوان بێ.

٢- (بڕوا به‌خوا بوون) باڵنده‌یه‌کی ده‌نگ خۆشه‌و، له‌نێو گوڵا و گوڵزاری کرده‌وه‌و ئاکاره‌ جوانه‌کاندا نه‌بێو، له‌سه‌ر دره‌ختی خه‌سڵه‌ته‌ به‌رزه‌کان نه‌بێ، نانیشێ و ناچریکێنێ.

٣- (بڕوا به‌خوا بوون) گوڵێکه‌ له‌ زه‌وییه‌ بڵیند و ڕه‌ق و ئیشکه‌ڕۆیه‌کاندا، سه‌ر هه‌ڵناداو، تایبه‌ته‌ به‌و جۆره‌ زه‌وییانه‌وه‌، که‌ نزم و گه‌ردنکه‌چ و نه‌م و نیان و شێدارن.

٤- (بڕوا بەخوا بوون) ماسییەکی سروشت پاک و چاو ڕووناکەو، قایل نابێ لەئاوی گۆڕاوی زۆنگەکاندا ژیان بەرێتە سەرو، هەموو کات بەدوای ئەو سەرچاوەو ڕووبارە پاکانەدا وێڵە، کە ئاویان شیرین و سازگارەو، ڕوون وەک چاوی قرژاڵە.

٥- (بڕوا بەخوا بوون) میوانێکی خانەدان و شەرم بەخۆو نەفس بەرزەو، بێزی نایەت، میوانی هەموو ماڵێکی ناکەس بەچەو رژدو چرووک و چاو لەنان بێ.

٦- (بڕوا بەخوا بوون) مێشەڕەشەیەکی پیس نیە، بەسەر ئەو دڵ و دەروونانەوە بنیشێ، کە پڕ لە دەیان خوو و خەسڵەتی پیستر لە چڵم و بەڵغەمن، بەڵکو مێشهەنگوینەیەکی بێگەردە، عەوداڵی ئەو دڵ و دەروونە پاکانەیە کە پڕپڕن لە خوو خەسڵەتی پەسندی وەک گوڵ و گیای بۆنخۆش و، درەختی خاوەن میوەی بەتام و خۆش و، شیلەو تام و بۆنیان دەمژێ.

٧-لە کۆتاییدا، هەروەک چۆن فریشتەی بێگەردو پاک، ناچێتە ماڵێکەوە کە بت و سەگی بەد و ناپاکی تێدا بن، چونکە لەگەڵ سروشتی پاک و فریشتەییانەیدا ناگونجێن[1]، (بڕوا بەخوا بوون)یش چاوی بە دڵ و دەروونێکی پیس و بێخێر هەڵنایەت کە پڕ بێ، لەو خەسڵەت و ئاکارە نالەبارانەی کە بنک و ڕیشەی هەموو خراپە و تاوانێکن!

بەڵێ ئێمە بۆیە ئەم باسی (پاک ڕاگرتنی دڵ و دەروون)ەمان، ئاخنیە نێو ئەم باسانەوە، کە سەبارەت بە بڕوا بەخوا بوون، دەدوێن، چونکە وەک گوتمان: هەروەک چۆن کێڵین و خۆشکردن و هەڵوێژارتن و..هتدی زەوی مەرجێکی بنەڕەتیی و پێویستە بۆ ڕووان و پنج داکوتان و فراژوو بوونی ڕووەک، خاوێن کردنەوەو بژارکردن و ڕام کردن و هەموار کردنی دڵ و

---

(١) {لاَ تَدْخلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ صُورَةُ تَمَاثِيلَ} (أخرجه أحمد برقم: ١٦٣٩١، والبخاري برقم: ٣٠٥٣، ومسلم برقم: ٢١٠٦)) ، واتە: فریشتە ناچنە ماڵێکەوە، کە سەگ یان وێنەیێکی تێدا بێت، کە مەبەست پێی بت و صەنەمە.

دەروونی مرۆڤیش، یەکەمین مەرجی بنەڕەتییە، بۆ نیشتەجێبوون و چەسپانی بڕوا بەخوا بوون، ئنجا پاک ڕاگرتنی دڵ و دەروون و پاراستنی لەو تیرە ژەهراوییانەی کە ئیبلسی بەدو نەگریس لە دوو سەنگەری؛ دنیا هەڵبژاردن و سنوور شکاندنی نەفسەوە دەیانهاوێ، بەهۆوی یادی مردن و قورئان خوێندنەوە، یەکەمین و دوایین مەرجی پارێزران و هێشتنەوەی بڕوابەخوا بوونە.

خوای پەروەردگار و بەخشندە، یارمەتی ئەوانە بدات کە هەتا ئێستا زەوی دڵ و دەروونیان بە مەبەستی پەیدابوون و چەسپانی بڕوا بەخوا بوون، پاک نەکردۆتەوەو هەڵنەوێژارتوە ناوی خوای لێ بێنن و لە جۆماڵ و پاککردنەوەی سەرچاوەی کوێربووەوەی دەروونیان وەخۆ بکەون، ئەوانەش کە - سوپاس بۆخوا - قۆناغی جۆماڵ و خاوێن کردنەوەی دڵ و دەروونیانیان بڕیوەو لێی هەڵبردوون، لە خوای پەروەردگارو چاکەکار داواکارین، هێندە لە یادی مردن و گۆڕو گۆڕەپانداو، خوێندن و موتالێی قورئاندا، وریاو بەکار و لە بڕشت بن، کە هەتا ماست ڕەش نەبێو قیر سپی نەبێ و، حوشتر بە کونی دەرزییەوە نەچێ، بەتیری وەسوەسەی شەیتان موو لە بڕوایان نەلەخشێ و، قەڵێی بەرزی خواناسییان، تاقە بەردێکی نەشجوولێ، چ جای بشکێ!

ئامین.




# هەرکەسێک بەڕاستیی بەرەو خوا بڕوات نائومێدی ناکات

## دەستپێك

**خوێنەری سەنگین!**

خوای میهرەبان و کاربەجێ وردو درشتی ئەم بوونەوەرەی بەپێی حیکمەت و لێزانییەکی بێسنوور خوڵقاندوە.

ئنجا یەکێک لە حیکمەتەکانی خوا (جل جلالە) لە خوڵقاندنی ئینساندا، ئەوەیە کە بە بارتەقای هەوڵدان و خۆ ماندووکردنی و بەرەو خوا چوونی، لوتف و بەزەیی لەگەڵ دەنوێنێو، لە خۆی وەنیزیک دەخات و خۆی پێ دەناسێنێ.

خوای بەبەزەیی لەوبارەوە فەرمووویەتی: ﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ (العنكبوت-٦٩).

واتە: بێگومان ئەوانەی لەپێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، ڕێیەکانی بەئێمە گەیشتن-مانیان پیشان دەدەین و بێگومان خوا لەگەڵ چاکەکاران دایە.

خوێنەری بەڕێز!

هەرکەسێک بەرەو خوا بکەوێتە ڕێ و، مەبەستی ناسینی خواو ڕازیکردنی و بەندایەتیی بۆ کردنی بێت، حەتمەن خوای کردگارو چاکەکارو سیفەت بەرزو پەسند ئاکار، دەستی یارمەتی و هاوکاریی بۆ درێژ دەکات و، دەرووی خێری لێ دەکاتەوەو، بەو ڕێیانەی ئاشناو شارەزا دەکات، کە لێیانەوە بە ئامانج دەگات و، مورادی دڵ حاسڵ دەکات.

چونکە پاداشتی چاکە هەر چاکەیە: ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴿٦٠﴾ ﴾ (الرحمن- ٦٠).

خوای میهرەبانیش لە فەرموودەیەکی (قدسي)دا (واتە لە یەکێک لەو فەرموودانەدا کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە خوایان دەگێڕێتەوە) فەرموویەتی: {...وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْرًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ ذِرَاعًا، وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وَمَنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً...} (أخرجه مسلم برقم: ٢٦٨٧)، واتە: هەرکەسێک بستێک لێم وەنیزیک بکەوێ، من باسکێک لێی وەنیزیک دەکەوم و، هەرکەسێک باسکێک لێم وەنیزیک بکەوێ، من باڵێک لێی دەچمە پێش و، هەرکەسێک بەڕۆیشتن بۆ لام بێ، بە نەرمە ڕاکردن بۆ لای دەچم.

بەڵێ کەسێک دەتوانێ گەوهەرو مروارییەکانی دەریای خواناسیی وەدەست بێنێ، کە بەڕاستیی خۆی بۆ خوا یەکلا کردبێتەوەو، بەرگ و پۆشاکی پەیوەندییە دنیاییەکانی لەخۆی داڕنیبێو، مەلەوانییەکی زۆر چاک فێر بووبێ لە دەریای قووڵی خواناسییداو، هەوڵ و کۆششێکی زۆر سەرف بکات، لە قووڵ ڕۆچوونی دەریای بەرەو خواچووندا.

هەر بۆیەش گوتراوە: (بِقَدر الكَدِّ تُكْتَسَبُ المعالي، مَنْ طَلَب العُلى سَهَر اللَّيالي) یانی: بە ئەندازەی ڕەنج کێشان، پلەبەرزەکان وەدەست دێن و، ئەوەی بەدوای بەرزییدا بگەڕێ، دەبێ شەونخوونیی بکێشێ.

کەواتـە: مرۆڤ هەتـا پتـر لەڕێـی خواناسـییدا، هـەوڵ بـدات و خـۆی مانـدوو بـکات و، زیاتـر خـۆی بـۆ خـوا یـەکلا بکاتـەوەو بـەرەو خـوا هەنـگاو بنـێ، خـوای میهرەبـان پتـر پـەردەی سـەر ڕووی جوانیـی و هەیبـەت (جمـال و جـلال)ی خـۆی بـۆ لادەدات و دەسـتی دەگرێـو بـە زات و سـیفەتەکانی و کردەوەکانـی و دروسـتکراوەکانی یاساکان (الأحکام)ی و ناوەکانـی خـۆی، ئاشـنای دەکات و، لـە ئەنجامـی ئەوەشـدا، دەگاتـە یەقیـن و دڵیرامـی و دڵدامـرکان و سـێبووریی هاتـن.

بـەڵام کەسـێک لـە ڕێـی ناوبـراودا، هیـچ هـەوڵ نـەدات و خـۆی مانـدوو نـەکات، کـە نەگەیشـتە پلـەی خواناسـین و بەخـوا گەیشـتن، بێجگـە لەخـۆی، بـۆی نیـە ڕووی ڕەخنـەو گلەیـی و گازانـدە لەکەسـی دیکـە بـکات.

چونکـە وەک عاریـف و خواناسـە ڕەسـەنەکان دەڵێـن: خـوا وەک ئـەو ڕۆژە بەخشـندەو پرشـنگدارە وایـە، کـە دەسـتی بەخشـین و چاکەکاریـی خـۆی، بەیەکسـانیی بەهەمـوو لایەکـی دنیـادا درێـژ کـردوەو، تیشـکی زێڕینـی خـۆی بەسـەر هەمـوو شـتێکدا دابـەش دەکات، بـەڵام ئەنـدازەی بەهرەوەرگرتـن لـە تیشـکی ڕۆژو ئەنـدازەی شـوعلەوەر بـوون و درەوشـانەوەیان، دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەنـدازەی ئامادەیـی، هەرکام لـەو شـتانەی کـە تیشـکەکەیان دەکەوێتـە سـەر.

بۆ وێنە:

ئـەو شـتانەی کـە ژیانیـان تێدایـە، دەتوانـن لـەو تیشـکە خـۆراک و بژێـو دابیـن بکـەن و بیکەنـە مایـەی گەشـەکردن و فراژووبوونیـان، کـە مـرۆڤ و ئـاژەڵ و زینـدەوەرو ڕووەکەکانـن.

ئـەو تەنانـەش کـە سـاف و لـووس و سـپی و بریقـەدارن، دەتوانـن بـەو تیشـکە خۆیـان شـوعلەوەر بکـەن و بدرەوشێنەوە.

بـەڵام ئـەو تەنانـەی کـە نەژیانیـان تێدایـە، نـە ئامادەیـی تیشـکدانەوەیان هەیـە، وەک بـەردو خـۆڵ و کەسـتەک و لەتکـە سـواڵک، نابینیـن هیـچ جـۆرە

بەهرەیەکی بەرهەست لە تیشکی خۆر وەربگرن، هەڵبەتە نەک لەبەرئەوەی خۆر لە تیشکی خۆی بەشی نەداون، بەڵکو لەبەرئەوەی لەبەر نائامادەیی و ناشایستەیی خۆیان، توانای بەهرە وەرگرتنیان نیە.

بەڵێ مرۆڤ بەپێی ڕەنج دان و کۆششی خۆی، لە ناسینی خوا بەهرەمەند دەبێ، کەواتە کەسێک بیرو هۆشی خۆی لە تێوەڕامان و سەرنجدانی دیاردە ڕێک وپێک و پڕ وردەکارییەکانی بوونەوەردا، ماندوو نەکردبێو، لە پاککردنەوەو شۆردن و بژارکردنی دڵ و دەروونیدا، خۆی زەحمەت نەدابێ، مەحاڵە هیچی دەستگیر بێ، چونکە چ بچێنی هەر ئەوەش دەدووریەوە.

ئنجا ئامۆژگارییەکی برایانەم بۆ هەرکەسێک کە دەیەوێ ڕێی بەرەوخوا چوون بگرێتە بەر، ئەوەیە کە تۆبەیەکی ڕاست و پاک (نصوح) بکات و، لە خزمەت خوا بەکزیی و داماویی و هەست کردن بە شەرمەزاریی دابنیشێ و بڵێ:

ئەی پەروەردگارم! بەڵێنت داوەو بەڵێنیش ناشکێنی، کە هەرکەسێک بۆ لات بێو هەوڵی ناسینت بدات، بەدەنگییەوە دێی و دەستی دەگری، ئنجا لەبەرئەوەی من خۆم بە بەندەی تۆ دەزانم و، دەمەوێ ئەرکی بەندایەتیی خۆم سەبارەت بە تۆ ئەنجام بدەم و، تۆ لە خۆم ڕازی بکەم و، لەبەرئەوەش ناتوانم ئەرکی بەندایەتیی جێبەجێ بکەم و تۆ لە خۆم ڕازی بکەم هەتا نەتناسم، داوات لێ دەکەم کە: خۆتم پێ بناسێنی و، دڵم بەیادی خۆت ئاوەدان بکەیەوە.

ئنجا کۆتایی ئەم باسە بە چەند قسەیەکی زۆر بەنرخی زانای خواناس (أحمد عطاء الله الأسكندري) دێنین کە دەڵێ:

(إلهي! كيف يُسْتَدلُّ عليك بما هو في وجوده مفتقر إليك؟! أيكون لغيرك من الظهور ما ليس لك حتى يكون هو الُمظْهِر لك؟! متى غِبْتَ حتى تحتاج إلى دليل يدل عليك؟! ومتى بَعُدْتَ حتى تكون الآثار هي التي توصل إليك؟!

عميت عين لا تراك عليها رقيباً وخسرت صَفقَةُ عبدٍ لم يجعل من حبك نصيباً)[1].

واتە: خوای خۆم! چۆن شتێک بە بەڵگە دەهێنرێتەوە لەسەر بوونی تۆ، کە لە بوونیدا حەوجێی تۆیە؟! ئایا غەیری تۆ لە تۆ ئاشکراترە، تاکو ئەو ببێتە وەدەرخەری تۆ؟! تۆ کەی ون بووی، هەتا حەوجێی بەڵگەیەک بێ کە ئیسپاتی تۆ بکات! کەی دوور بووی هەتا شوێنەوارەکان، ئینسان بگەیەننە تۆ! ئەو چاوە کوێر بێ کە تۆ بەسەر خۆیەوە بە چاودێر نابینێ و، دەسخەڕۆ بێ بەندەیەک کە بەشی لە خۆشەویستیی تۆدا نیە.

لێرەشدا کۆتایی بە بەندی حەوتەم دێنین و، دەچینە سەر بەندی هەشتەم و کۆتایی کە بریتیە لە: (گرنگیی بڕوا بەخـــوا بوون، لە ژیانی تاک و کۆمەڵدا).

خوێنەری بەڕێز!

ئەوەی کە لە کۆتایی ئەم باسانەدا، دەمەوێ پێت ڕابگەیەنم بەر لەوەی بەجێیان بهێڵین و، دەست بە بەندی کۆتایی بکەین، ئەوەیە کە ئەو باسانەی لە حەوت بەندی پێشوودا ڕابردن، هەرچەندە هەندێکیان دووروودرێژن و، بەڕواڵەت زیاتر بە بابەتی تەزکیەوە پەیوەستن، نەک بە بابەتی خواناسین و ئیمانەوە، بەڵام لە ئەنجام و بەرهەمی ئەزموون و تەجرەبەی خۆمەوە - سەرەڕای ڕێڕوونیی دەقەکانی قورئان و سوننەت - بۆم دەرکەوتوە و لێی دڵنیاو مسۆگەر بووم، کە تەزکیەی نەفس و پارێزکاریی (تقوى) کاریگەرییەکی یەکجار گەورەیان لەسەر ئیمان هەیە، بۆیە دەڵێم: گرنگیی و بایەخی پێویست و شایان بەو باسانە بدەو، هەتا پێت دەکرێ لە خوێندنەوەو موتالێیاندا لەسەرەخۆو وردو دڵڕوون و پشوودرێژ بەو، هیچ کام لە باسەکانی بە پەلە ماڵئاوایی لێ مەکەو، چەند جارێک بە گاسنی تیژی زەین و بیرو هۆشت و، دڵی پڕ لە بڕوای بەجۆشت، بیکێڵەو وەردی بدەوە، چونکە دەریا

---

(١) بڕوانە: (إيقاظ الهمم في شرح الحكم)، ل٤٧١، محمد ابن عجيبة.

قووڵەکان، گەوهەرو مرواریی و گەنجینە بەنرخەکانیان، لە تەختی بنەوەیان دان و، بە ڕۆچوونە خوارو پشوو درێژیی نەبێ دەستگیر نابن.

زەین ڕوونیی و دڵسافیی و کردار چاکیی تۆش و خۆشم و، هەر بڕوادارێکی دیکەش لەو خوا پەروەردگارە دەخوازم، کە گیانی هەمووانمانی بەدەستەو، بەس بۆخۆی جێی مەبەستە.




# گرنگیی بڕوا بەخوا بوون لە ژیانی تــاک و کۆمەڵدا

## دەسـتپێك

خوێنەری بەڕێز!

بـڕوا بەخـوا بـوون وێـڕای ئـەوەی کـە گـەورەتریـن ڕاسـتییەو، ڕاسـتییەکە ژیریـی و فەلسـەفەو زانیاریـی و ئەزمـوون و سروشـتی مرۆڤ و واقیعـی ژیـان و مێـژووی مرۆڤایەتـی دەیسـەلمێنن، سـەرباری ئـەوەش شـتێکی یەکجـار گرنـگ و پێویستیشـە لـە ژیانـی ئینسـاندا، بۆ بەڕێوەچوونـی ژیانـی تاکیـی (فردي) و کۆمەڵیـی (الجماعـي) بـە شـێوەیەکی ئینسـانانەی ڕاسـت و دروسـت.

بەڵـێ، تیشـکی ڕۆژو ئـاوو هـەواو دانەوێڵـە، چەنـد گرنـگ و بایەخدارو پێویسـتن بـۆ گـوزەران و بەڕێوەچوونـی ژیانـی ئادەمیـزاد، بـڕوا بەخـوا بـوون و خواپەرسـتییش هێنـدەو بگـرە پتریـش.

چونکـە بـە نەبـوون یـان کـەم بوونـی هـەر کام لەوانـە - تیشـکی ڕۆژو ئـاوو هـەواو دانەوێڵـە - بـەس جەسـتەی ئینسـان دەکەوێتـە مەترسـییەوەو، مرۆڤ لەگـەڵ مردنێکـی ڕواڵەتـی جەسـتەییدا بەرەنـگار دەبـێ.

بەڵام بە نەبوون یان کەمبوونی بڕوا بەخوا بوون و خواپەرستیی، کەسایەتیی مرۆڤ بەتاک و کۆمەڵییەوە دەکەوێتە مەترسییەوەو، مرۆڤایەتی لەگەڵ لەنێوچوونێکی یەکجاریی ماددیی و مەعنەویی و دنیایی و دوارۆژییدا، ڕووبەڕوو دەبێ.

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست!

ئایین و عەقیدەی خواناسیی، ئەوە نیە کە ئاڵقە لەگوێ و کاسەلێسانی ئیمپریالیزمی ڕۆژهەڵێت و ڕۆژئاوا، یان فریوخواردووانی بیردۆزە پووچەکانی وان، بۆ خەڵکی دەخەنە ڕوو؛ گوایە عەقیدەی خواناسیی چەکی دەستی چینی مشەخۆرو ستەمکار و، تلیاکی گەلان و، بەربەست و کۆسپی سەر ڕێی کاروانی بەرەو پێش چوونەو، دوژمنی شارستانەتییەو، میکرۆبێکە دژی زانیاریی و بیری نوێ و گەشەکردن و گۆڕانکاریی ژیانە[1].

بەڵکو ئایین و بەرنامەی خوا بۆ مرۆڤایەتیی، وەک هێڵی ئاسن (سكة الحديد) وایە بۆ شەمەندەفەر (القطار)، وەک چۆن لەکاتی ترازانی شەمەندەفەردا لەسەر هێڵی ئاسن، ژیانی هەموو ئەوانە دەکەوێتە مەترسییەوە کە سواری بوو ون، مرۆڤایەتییش بە لاڕێبوون ولادانی لەسەر ڕێڕەوو بەرنامەی خوا، ژیان و گوزەرانی دنیای دەکەوێتە مەترسییەکی هەرەگەورەی هەمەلایەنەوە، سەرەڕای خەشم و تووڕەیی و سزاو تۆڵەی خوای دادگەر لە دوارۆژدا.

بەڵێ بڕوا بەخوا بوون، کە بنچینەی ئایین و خواپەرستییە، شتێکی یەکجار گرنگ و کاریگەرو پێویستە بۆ ژیانی ئینسان، سەرەڕای ئەوەی کە گەورەترین و درەوشاوەترین ڕاستییە لە بوون (وجود)دا.

ئێستاش خوا یاربێ لە چەند ڕوویەکەوە، ڕاستیی ئەو قسەیەمان دەسەلمێنین و گرنگیی و بایەخ و پێویستیی بڕواداریی ڕادەنوێنین.

---

(١) سوپاس بۆ خوا لە ئاڵقەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمی زنجیرەی: (ئیسلام و ڕێچکان) و، لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا، هەموو ئەو گومانانە پووچێنرانەوەو ڕەوێنران.

## یەکەم: گرنگیی بڕوا بەخوا بوون، لە ڕووی دەروونییەوە

١) لە سۆنگەی ئەوەوە کە عەقیدەی بڕواداریی و خواناسیی، چارەنووسی ڕابردوو و داهاتووی ئینسان دیاری دەکات و، تێی دەگەیەنێ؛ لەکوێوە هاتووە، بۆچی هاتووە، کێ هێناویەتی و، بەرەو کوآ دەچێو، چی لێدێ؟!! مرۆڤی خواناس و بڕوادار بە پێچەوانەی بابای بێبڕواو دوور لە خواوە، ئارامیی و دڵنیاییەکی بێسنووری دێتە نێو دڵی و، بە خەم و پەژارەو مەراق و دڵتەنگیی و ترس دەڵێ: مەودای نیشتەجێ بوونتان نیە!! ئەوانیش بەناچاریی تاوڵی ڕەوشی خۆیان دەپێچنەوەو بار دەکەن.

٢) دیسان بڕوا بەخوا بوون، مردن لەلای مرۆڤ، دەکاتە شتێکی ئاسایی و مەترسیی لێنەکراو؛ چونکە پێی دەڵێ: مردن بریتی نیە لە لەنێوچوونی یەکجاریی، بەڵکو مردن پردێکە -بۆ ئینسانی مسوڵمان- کە لێیەوە دەپەڕێتەوە بۆ ژیانێکی فراوانتر و تەواوترو چاکتر، کە قۆناغی بەرزەخ و پاشان قیامەتە.

٣) دیسان بڕوا بەخوا بوون، بەهۆی هەڵەنگاوتنی چاوی ئینسان، لە تێوەڕامانی ژیانێکی ماددیی دنیایی بەرتەسکەوە، بۆ ژیانێکی دنیایی و دواڕۆژیی ماددیی و مەعنەویی پان و بەربڵێو، مرۆڤ وا لێدەکات، کە بەخۆی ڕەوا نەبینێ، وەک کرمێکی گڵ خۆرکە بەزەوییەوە بچەسپێو، ئاگای لەخۆی و خواو خەڵکی ببڕێ!

٤) دیسان بڕوا بەخوا بوون، چاکترین پشتیوان و پاڵپشتی دڵ و دەروونی ئینسانە، بۆ زاڵ بوونی بەسەر ئارەزووەکانیداو، بۆ هاوسەنگ ڕاگرتن و ڕێکوپێک کردنی غەریزەو داخوازییە سروشتییەکان، ئەو غەریزەو داخوازییانەی کە نەمانی هاوسەنگیی (تعادل)ی نێوانیان و لەغاو نەکردنیان، سەرچاوەی هەموو ئێش و ژان و دەردەسەریی و خاکەساریی و گیروگرفت و ژینتاڵییەکە.

بۆ وێنه؛ غه‌ریزه‌ی جینسیی له‌ مرۆڤدا هه‌یه‌و، پاڵنه‌رێکی سروشتیی و پێویستیشه‌ بۆ به‌رده‌وام بوونی ژیان، به‌ڵام ئه‌و غه‌ریزه‌یه‌ ئه‌گه‌ر بێت و لغاو نه‌کرێت و ڕێڕوونیی نه‌کرێ، ده‌بێته‌ مه‌یدانی ڕمبازێنی ئه‌سپی نه‌فس و شه‌یتان و، ژیانی مرۆڤ به‌جارێک ده‌بێته‌ زه‌لکاوێکی پڕ له‌ تاوان و سه‌رپێچیی، ئنجا بڕوا به‌خوا بوون، له‌ ئه‌نجامی ئه‌وه‌وه‌ که‌ هه‌ست کردن به‌چاودێریی خواو، جوێکردنه‌وه‌ی چاکه‌و خراپه‌و، حه‌ڵێڵ و حه‌ڕام، له‌ ئینساندا دێنێته‌ دی، ڕێشمه‌یه‌کی توند ده‌خاته‌ ئه‌ستۆی غه‌ریزه‌ی گۆرین و، هه‌ر غه‌ریزه‌یه‌کی دیکه‌ش.

هه‌روه‌ها غه‌ریزه‌ی (ملکایه‌تیی و شت هه‌بوون)یش، دیسان یه‌کێکه‌ له‌ داخوازییه‌ سروشتییه‌کانی ئینسان و، پاڵنه‌رێکی گه‌لێک پێویستیشه‌ بۆ به‌ڕێوه‌چوونی ژیان و به‌رقه‌رار بونی ژیارو ئاوه‌دانیی، به‌ڵام له‌کاتێکدا به‌هۆی سه‌رکێشیی نه‌فس و له‌ سنوور ده‌رچوونی، لاقان له‌ به‌رێ تێده‌په‌ڕێنێ و، ده‌بێته‌ نه‌خۆشییه‌کی ده‌روونیی و کۆمه‌ڵێیه‌تیی و، پاره‌و دارایی له‌جیاتی وه‌سیله‌ی ژیان و گوزه‌ران بێ، ده‌بێته‌ بت و سه‌نه‌مێکی په‌رستراو، له‌ حاڵه‌تێکی وادا، غه‌ریزه‌ی ناوبراو ده‌بێته‌ ده‌سته‌واژه‌یه‌کی چاک، که‌ مرۆڤی پێ له‌خوا بتۆرێنرێ و، له‌نێو خۆڵه‌مێشی دنیاپه‌رستیی بگه‌وزێنرێ، به‌ڵام بڕوا به‌خوا بوون، چونکه‌ ئینسان تێده‌گه‌یه‌نێ که‌ جێنشینی خوایه‌و، هه‌رچی له‌ده‌ستی دایه‌، سپارده‌ی خوای خاوه‌ن موڵک و توانایه‌و، ده‌یه‌وێ پێی تاقی بکاته‌وه‌، وا له‌ مرۆڤ ده‌کات -به‌ مه‌رجێک وه‌ک پێویست له‌ ده‌روونیدا جێگیر بووبێ- ڕێ به‌ پاره‌و سامانێک نه‌دات، که‌ جێی شیاوی گیرفانیه‌تی، بچێته‌ نێو دڵییه‌وه‌، خۆی لێ بکاته‌ بت و سه‌نه‌م و کڕنووشی کۆیلایه‌تیی پێ به‌رێ.

٥) دیسان بڕوا به‌خوا بوون، له‌به‌رئه‌وه‌ی که‌ ڕوو به‌ مرۆڤ ده‌کاته‌ یه‌ک ئامانج و مه‌به‌ست، هاوسه‌نگیی و ڕیک وپێکیی و سه‌رده‌وبه‌رده‌یه‌کی بێوێنه‌ له‌ژیانیدا په‌یدا ده‌کات و، نایه‌ڵێ ده‌روونی ببێته‌ بتخانه‌و، دووچاری ڕاڕایی و سه‌رگه‌ردانیی و هه‌ڵوه‌دایی و به‌رهه‌ڵدایی ببێو، ببێته‌ داشی دامه‌ به‌ده‌ست هێچ قومارچییه‌که‌وه‌[1].

---

(١) بۆ پتر حاڵی بوون له‌وباره‌وه‌، سه‌رنجی خوێنه‌ر ڕاده‌کێشن بۆ به‌شی ده‌یه‌می کتێبی:

**٦)** دیسان بڕوا بەخوا بوون و خواناسیی، دەبێتە هۆی شیرین کردن و خۆشەویست کردنی ئینسان لەلای خەڵکی، وەک خوای زانا فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا﴾ (مریم- ٩٦).

واتە: بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کرداری چاک دەکەن، خوای میهرەبان خۆشەویستییان دەخاتە دڵی خەڵکیەوە.

بەڵێ، لەبەرئەوەی خوای میهرەبان سەرچاوەی هەموو نازونیعمەتێکەو، هەموو چاکیی و جوانیی و پەسندییەک لەویەوە سەرچاوە دەگرێ، مرۆڤەکان خۆشیان دەوێ و ڕێزی لێدەگرن، جا هەر کەسێکیش پەیوەندیی بەویەوە هەبێت، بەگوێرەی پتەویی و ڕاستیی ئەو پەیوەندییە، هەمان جۆرە ڕێزو خۆشەویستیی -بە شێوەیەک کە لە ئینسان بوەشێتەوە- لە دڵی بەندەکاندا سەبارەت بەویش پەیدا دەبێ.

**٧)** لە هەمووی گرنگتر: مرۆڤی بڕوادار لە هەموو کەس زیاتر توانای هەیەو، پشوو درێژترە لە ئاقار گیروگرفت و کۆسپ و تەگەرەو کوێرەوەرییەکانی ژیاندا، چونکە:

**أ/** لە ڕوانگەی بڕواوە سەیری ژیان دەکاو، دەزانێ کە ژیانی دنیا گۆڕەپانی تێدا تاقیکرانەوەیەو، لەدەمی تاقیکرانەوەشدا چاوەڕێکردنی خۆشیی و ناخۆشیی و تاڵیی و شیرینیی و هەورازو نشێوان، شتێکی سروشتیی و ئاساییە.

**ب/** دەزانێ کە هەرچی لەم ژیانەیدا بەسەری بێت، یەکێکە لە پرسیارەکانی پێتاقیکرانەوەی و، وەڵامی ئەو پرسیارەش پەیوەستە بە نواندنی هەڵوێستێکی ڕاست و گونجاوەوە، لەبەردەم هەرکام لەو خۆشیی و ناخۆشییانەدا.

---

(یادی خوا) بەناوی (پەیوەندیی نێوان یادی خواو دروست بوونی کەسایەتیی)یەوە، بڕوانە: چاپی یەکەم، ١٩٨٧ز.

ج/ دەزانێ کە هەرچی بەسەری دێ، ویستی خوای لەسەرەو، خواش تاقە خۆشەویستی ویەو، هەرچی لەلایەن خۆشەویستیشەوە بڕیاری لەسەر درابێ، ئەگەر تاڵیش بێ، دڵ هەر بە شیرینی دەزانێ.

هەڵبەتە کاریگەریی عەقیدەی بڕواداریی و خواناسیی، لە دەروونی ئینسانی بڕواداردا، باسێکی زۆر بەپێزو خەست و خۆڵی دەوێو، دەتوانین بڵێین: ئەوەی لێرەدا نووسیمان، بەس بەهێڵە سەرەکییەکانی ئەو باسە دادەنرێن، بەڵام لەبەرئەوەی نووسراوێکی سەربەخۆمان بۆو جۆرە باسانە تەرخانەکردوە، لێرەدا بەوەندە واز دێنین و خوێنەرانی بەڕێز حەواڵەی ئەوێ دەکەین.[1]



---

(١) ئەو شوێنە تەرخان کراوە، بەرگی یەکەمی (یادی خوا)یە بە ناوی (گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا) بەتایبەتی بەشەکانی: چوارەم و پێنجەم و شەشەم و دەیەم، ئنجا بێگومان باسی: (یەکەمین پاڵنەری مرۆڤ بەرەو خواناسیی) دیسان پەیوەندیی بەم باسەوە هەیە، کە لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا هاتوە.

## دووەم: گرنگیی بڕوا بەخوا بوون لە ڕووی خووڕەوشتەوە

بڕوا بەخوا بوون، سەرچاوەی هەموو هەست و نەست و ڕەوشت و ئاکارێکی پەسندو دڵگیرە؛ چونکە مرۆڤ چ شتێکی زۆر خۆش بوێو پێیەوە خەریک بێو جێی سەرنج و بیکردنەوەو تیۆەڕامانی بێ، جۆرو چۆنیەتی ئەو شتە کار دەکاتە سەر ڕەفتارو خوو و خدەو ڕەوشتی، بەڵێ ئینسان چ شتێکی زۆر لە دڵ و مێشکدا بێو لە دەروونیدا چەسپی بێ، ژیان و گوزەرانی ڕەنگی ئەو شتە بەخۆیەوە دەگرێ، چ چاک بێ چ خراپ[1].

جا بێگومان خوای بەرزو بێهاوتاش، سەرچاوەو خاوەنی هەموو چاکیی و جوانیی و تەواوییەکە، کەواتە: مرۆڤ هەتا لەو سەرچاوەیەوە نیزیکتر بێت، لە چاکیی و جوانیی و تەواویی نیزیکتر دەبێت.

هەر بۆیەش ڕەفتارو رەوشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە چاکترین و بەرزترین ڕەوشت و ئاکار بووە، وەک خوای پەروەردگاری لە وەسفیدا فەرموویەتی:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ (القلم- ٤).

بەڕاستیی تۆ لەسەر ئاکارێکی زۆر مەزنی، لەبەر ئەوە بووە کە ئەو زاتە (ڕووحم فیدای ڕێبازی بێ) زۆر لەخوا نیزیک بووە، واتە: لەهەموو کەس پتر ئەو سیفەتە بەرزو پەسندانەی کە خوا خۆشی دەوێن، لەخۆیدا هێناونە دی، ئەوەتا کاتێک لە عائیشەی خێزانییان پرسی خوا لێی ڕازی بێ، ئەخلاق و ڕەوشتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چۆن بوو؟! گوتی: {كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ} (أخرجه أحمد برقم: ٢٤٦٤٥، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح)، واتە: ئاکاری وی قورئان بوو.

---

(١) لە بەشی دەیەمی بەرگی یەکەمی (یادی خوا)دا، ئەم باسە بە فراوانیی توێژراوەتەوە.

ئێستاش ژماره‌یه‌ک له‌و ڕه‌وشته‌ به‌رزانه‌ی که‌ ڕاسته‌وخۆ په‌یوه‌ندییان به‌بڕواوه‌ هه‌یه‌، ده‌خه‌ینه‌ ڕوو:

١- (ئیخلاص) مرۆڤی بڕوادار تاقه‌ که‌سێکه‌ که‌ سیفه‌تی ئیخلێصی تێدا بێته‌ دی؛ چونکه‌ به‌س بابای بڕواداره‌، که‌ یه‌ک تاقه‌ پاڵنه‌رو هانده‌ری هه‌بێ له‌ ژیاندا؛ به‌س مرۆڤی مسوڵمان و خواناسه‌، که‌ هه‌موو جموجۆڵ و چالاکییه‌کانی هه‌ڵقولێوی یه‌ک تاقه‌ سه‌رچاوه‌ بن، سه‌رچاوه‌ی (وه‌ده‌ستهێنانی ڕه‌زامه‌ندیی خوا).

هه‌ڵبه‌ته‌ هه‌رکاتێکیش ئینسان به‌س ڕه‌زامه‌ندیی خوای مه‌به‌ست بوو، له‌ ڕیابازیی و خۆده‌رخستن و کورسیخوازیی به‌دوور ده‌بێ.

به‌ڵێ مرۆڤی خواناس، خۆی بۆ خوا یه‌کلا ده‌کاته‌وه‌، یه‌ک په‌رستراوو یه‌ک تاقه‌ ئامانجی ده‌بێو، نابێته‌ بت په‌رستێک که‌ ده‌روون و که‌سایه‌تیی، ببێته‌ سه‌د پارچه‌و هه‌ر پچکه‌ی به‌ده‌ست بتێکه‌وه‌ بچێ.

٢- (فیداکاریی) هه‌روه‌ها مرۆڤی بڕوادار فیداکارو له‌خۆبوردوویه‌؛ چونکه‌ ئه‌و بڕوای به‌خوایه‌ک هه‌یه‌، که‌ گیان و سامانی خۆی له‌ گره‌وی وی ناوه‌و پێی فرۆشتوه‌، ئنجا گومانی تێدا نیه‌ که‌ بابایه‌کی وا، هیچ کاتێک له‌پێناوی خوایه‌کی وادا ماڵ و گیانی خۆی لێ وه‌چاو نیه‌و، ڕژدیی و چرووکیی له‌ به‌خشینیدا ناکات.

٣- (ئاوات به‌رزیی) دیسان ئینسانی بڕوادار، هه‌میشه‌ بیرو خولیاو ئاوات و هیوای به‌رز به‌رزی به‌دڵ و مێشکاندا دێن؛ چونکه‌ ئه‌و خۆی به‌ به‌نده‌ی خوایه‌کی هه‌ره‌به‌رزو په‌سند و جوان و ته‌واو ده‌زانێ، ئنجا بێگومان هه‌موو ده‌مێ بیرو خولیاو ئاوات و هیوای که‌سێک، که‌ هه‌میشه‌ به‌یادی خوایه‌کی هێنده‌ به‌رزو پیرۆزو په‌سندو چاکه‌وه‌ ده‌ژی و، هه‌رده‌م سه‌رگه‌رمی موتالێکردنی ناوو سیفه‌ته‌ به‌رزو په‌سنده‌کانییه‌تی، له‌سه‌ر لاپه‌ڕه‌کانی کتێبی گۆیای

قورئـان و کتێبـی بینـراوی بوونـەوەر، زۆر جیـاوازە لـە بیـرو ئـاوات و هیـوای مێشکی بابایەک کە (پارە) یان (ئافرەت) یان (کورسیی) یان (خواردن و خواردنـەوە) یان هـەر شتێکی دیکـەی، لـەم بابەتانـەی لـە مێشکدا دێت و دەچێ، هـەروەک چۆن زەوییەکی بەپیت و پێزو بەراو و، بیابانێکی وشک و گـەرم و بێئـاو، لێک جودان و، ئەوەی یەکەمیـان دەگونجێ هەمـوو درەختێکـی بـەردارو سـەربەخێری تێدا بڕوآ، بـەڵام دووەمیـان ئامادەیی شینکردنی هیـچ شتێکی نیـە، بێجگـە لـە چەند ڕووەکێکی چارەگرانی کـەم بایەخی دڕکاویی.

٤- (هەسـت کـردن بـە بەرپرسیاریی) هەروەهـا مرۆڤـی خوانـاس لـە سۆنگەی ئـەوەوە کـە دەزانـێ دروسـتکراوێکی ڕێزلێگیـراوو هەڵبژێـرراوەو، جێنشـینی خوایـەو، بۆ تاقیکرانـەوە وەدی هێنـراوە، هەست بە باری بەرپرسیاریی دەکات و، خۆی وەک شتێکی بێخاوەن و بەرهەڵدا نایەتـە بەرچاوو، هەمیشـە هەسـت بـە چاودێریی و بەسەرڕاگەیشتنی خوا دەکات و، تەقـواو پارێز لـە هـەر کـردەوەو ڕەفتارێـک دەکات، کـە لەگـەڵ پلـەو پایـەوی بـەرزو پەسـندی جێنشـینایەتیی و بەندایەتییـدا نەگونجێ.

٥- (ڕاستیی) دیسان ئینسانی بڕوادار دڵڕاست و زمان ڕاست و ئاکار ڕاستـە لەگـەڵ خـۆی و خـواو خەڵکـدا، دڵڕاسـتیی و زمانڕاسـتیی و ئاکارڕاسـتیی لەگـەڵ خۆیدا ئەوەیە، کە بەردەوام دڵی و زمانـی و ئەندامەکانی، بەو جۆرە بیـرو قسـەو کردەوانـەوە سـەرگەرم دەکات، کـە لـە دنیـاو دوارۆژدا، لێیـان بەهرەمەنـد دەبێ و، هـەوڵ دەدات بە هیـچ ڕەنگێـک خەیاڵێکی وای بەدڵـدا ڕەت نەبێ و، وشـەیەکی وای بەسـەر زمانـدا نەیـەت و، ڕەفتارێکـی وای لـێ وەدی نەیـەت، کـە بـەدو زیانبەخش بێ و سـوودی لێوەرنەگرێ.

دڵڕاستیی و زمانڕاستیی و ئاکارڕاستیی، لەگـەڵ خەڵکدا، ئەوەیە، کـە هـەوڵ دەدات بـە دڵ و زمـان و ئەندامەکانـی، سـوود بـە بڕواداران بگەیەنێـو سـەرگەرمی زیـان گەیانـدن بێ بـە ناحـەزان و دوژمنانـی ڕێـی خـوا.

دڵڕاستیی و زمانڕاستیی و ئاکارڕاستیی، لەگەڵ خوادا، ئەوەیە، کە بە دڵ و زمان و ئەندامەکانی خوای خۆی دەپەرستێ و، مەبەستی ڕەزامەندیی ئەوە و لە هەوڵ و تێکۆشانی نەپساوە دایە، لەپێناوی بەرزکردنەوەی ئالێی ئیسلام و چەسپاندنی حوکمی خوادا.

ئنجا ئەو ڕاستییە هەمەلایەنەی گوتیشمان، بەرهەمی سروشتیی و حەتمیی خواناسیی و بڕوادارییەو، کەسێک بەڕاستیی خوا بناسێ، خۆشەویستیی و ڕێزی سەبارەت بەخوا لەلایەکەوەو، ترس و سام و شەرمی لەلایەکی دیکەوە، وای لێ دەکەن، هەوڵ بدات بە موو نیازی نێو دڵ و قسەی سەرزارو کردەوەی ئەندامەکانی، لارییان تێدا نەبێ، نەوەک خوا لێی بڕەنجێ یان تووڕە بێ.

(ئازایەتیی و بەجەرگیی) یەکی دیکە لەو سیفەتانەی کە لە کانیاوی ڕوونی بڕواداریی‌یەوە، سەرچاوە دەگرن، بریتیە لە دلێریی و ئازایەتیی و چاونەترسیی، چونکە بابای مسوڵمان و بڕوادار، دەزانێ کە ئەو گیانەی خوا بە بەرجەستەی کردوە، بێجگە لەخۆی، کەسی دیکە توانای وەرگرتنەوەی نیە، دیسان دەزانێ کە مردن تاقە هۆی گەیاندنیەتی بەخزمەت ئەو پەروەردگارە میهرەبان و بەخشندەیە کە لەوەتی ناسیویەتی، بە دڵ شەیدای بەدیدار شادبوونیەتی، هەر بۆیەش هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (خوا لێیان ڕازی بێ) کە نموونەی هەرەڕاست و کامڵی بڕواداریی و خواناسیی بوون، مردنیان لەپێناوی خوادا، لەلا شیرینترو بەلەززەتتر بوو، لە ڕابواردن و مانەوەیان لە دنیاداو، هەر لەبەر ئەم سیفەتە بەرزەشیان بوو، کە توانیان سەر بە کوفری جیهان شۆڕ بکەن و، کیسراو هیرەقلێن بڕەتێنن و، چەوساوانیان لەچەنگ دەرێنن.

هەرکاتێکیش ئۆممەتی مسوڵمان ئەو جۆرە بڕوادارانەی تێدا هەڵکەونەوە، دەتوانن ڕێشمەی مێژوو توند بکەن و، بەرەو دووبارەکردنەوەی ئەزموونی هاوەڵە بەڕێزەکان (خوا لێیان ڕازی بێ) بیگێڕنەوە.

## سێیەم: گرنگیی بڕوا بەخوا بوون، لە ڕووی کۆمەڵێیەتییەوە[1]

شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە ئینسان مەخلووقێکی کۆمەڵێیەتییەو، ناتوانێ بەتەنێ بژی، ئنجا هەر مرۆڤێکیش بیگری، وێڕای پاڵنەرو هاندەری چاکەو خێرخوازیی، پاڵنەرو هاندەری خراپەو شەڕخوازییشی تێدایەو، هەموو ئینسانێک هەروەک چۆن توانای ئەوەی هەیە، بەهۆی ڕامکردنی نەفسی و جوانکردنی ڕەوشتی و سوود بەخەڵک گەیاندنییەوە، ببێتە مرۆڤێکی پاک و چاک و لە فریشتەش پێهەلێتر بچێ، دەشتوانێ بەهۆی جڵەو بەردانی نەفسی و دزێوکردنی ڕەوشتی و زیان بەخەڵک گەیاندنیەوە، خۆی بکاتە ژیاندارێکی شەیتانیی و لە ئاژەڵیش بەدتر بێ.

کەوابێ: ئەگەر بویسترێ کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلیم و تەواوو ئینسانانە پێک بێ و بەڕێوە بچێ، پێویستە هەرکام لە دانیشتوانی ئەو کۆمەڵگایە، هەست بە چاودێریی هێزو دەسەلێتێکی وا بکەن، کە توانای پاداشتدانەوەی ئەوانەی هەبێ کە نەفس پاک و ڕەفتار چاک و سوودبەخشن و، توانای سزادانی ئەوانەی هەبێ، کە نەفس پیس وکردار نەگریس و زیانبەخشن، بۆئەوەی هەرکام لە تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە، ئومێدی پاداشت، بەرەو چاکیی و پاکیی کەمەندکێشی بکات و، ترسی سزا، لە بەدیی و خراپە قوتاری بکات.

ئنجا ئەو هێز و دەستەڵاتەش، کە ئەوەی دەباران دا هەبێ کە گوترا، بەس ئەو هێزو دەستەڵاتە خواییەیە، کە لەڕێی بڕوا بەخوا بوونەوە، دەچێتە دڵی ئینسانەوەو تێیدا دەچەسپێ، بەڵێ، بەس بڕوا بەخوابوون[2] ئەوەی لە

---

(١) بۆ زێدە شارەزایی لەوبارەوە، بڕوانە بەرگی یەکەمی: (یادی خوا) بەشی حەوتەم: (پەیوەندیی نێوان یادی خواو پێکەوە جۆشدانی مسوڵمانان).

(٢) دووبارەی دەکەینەوە کە مەبەستمان لە (بڕوا بەخوا بوون) ئەو شێوەیە بڕوایەیە، کە تاکە بەرنامەی ڕاستی دەستکاریی نەکراوی خوا خستوویەتە ڕوو.

وزه‌دایه، که دوو باڵی ترس و ته‌ما (الخوف والرجاء) بۆ ئینسان بڕه‌خسێنێو، وای لێبکات که به یارمه‌تی ئه‌و دوو باڵه پیرۆزه، له ئاسمانی به‌رزی ده‌روون پاکیی و ڕه‌وشت چاکییدا، بکه‌وێته په‌روازو فڕین و، به‌پێچه‌وانه‌ی داخوازی هێزی کێشنده‌ی به‌رژه‌وندییه تاکیی و تایبه‌تییه‌کان و، خه‌سڵه‌ته به‌ده ئاژه‌ڵیی و شه‌یتانییه‌کان، به‌ره‌و ئاسۆی فراوان و ڕوونی سوود به‌خه‌ڵک گه‌یاندن و، خه‌سڵه‌ته په‌سنده ئینسانی فریشته‌ییه‌کان، به‌رز بێته‌وه.

هه‌ڵبه‌ته که‌س نکووڵیی له‌وه نیه که ده‌سته‌ڵاتی ده‌وڵه‌تیش، هه‌تا ڕاده‌یه‌ک ڕۆڵێکی گرنگ ده‌گێڕێ له پاراستنی شیرازه‌ی کۆمه‌ڵ و ڕێگرتن له خراپه‌و ئاشووب و په‌شێوی، هه‌ر بۆیه‌ش یه‌کێک له ئامانجه‌کانی ئایینی خوا پاش خوا به‌خه‌ڵک ناساندن و خوا په‌رست کردنی خه‌ڵکی، بریتیه له وه‌ده‌ست گرتنی جڵه‌وی حوکم و ده‌وڵه‌ت دامه‌زراندن، به‌ڵام گومانیش له‌وه‌دا نیه -بۆ که‌سێک به وردیی تێفکرێ- که ده‌ستی ده‌سته‌ڵاتی قانوون و ده‌وڵه‌ت -که له‌سه‌ر بنچینه‌ی بڕوا دانه‌مه‌زرابێ- نه به هه‌موو کات و شوێنان و، نه به هه‌موو که‌س ڕاده‌گا، ئه‌مه له‌لایه‌که‌وه، له‌لایه‌کی دیکه‌شه‌وه: چاوی قانوون و ده‌وڵه‌ت ڕواڵه‌ت بینه‌و، توانای چاودێرییکردنی ڕازو نهێنییه شێرراوه‌کانی نێو دڵ و ده‌روونانی نیه، ئه‌و ڕازو نهێنییانه‌ی که گه‌راو تۆوی کردارو ڕه‌فتاره‌کانن، دیسان ده‌ستی ده‌سته‌ڵاتی ده‌وڵه‌ت ته‌نیا کوته‌ک و قه‌مچی پێیه‌و، به‌س توانی سزادانی هه‌یه‌و، مه‌گه‌ر چۆنه‌کایی، ده‌نا بیر له پاداشت دانه‌وه‌و چاکه ژماردنی چاکان ناکاته‌وه‌و، ته‌نیا سه‌رگه‌رمی تۆمارکردنی تاوان و سه‌رپێچییانه، که‌واته: ئه‌وپه‌ڕی توانای ده‌سته‌ڵاتی ده‌وڵه‌ت پرینگاندنه‌وه‌ی خه‌ڵکییه له لادان و تاوان، به‌ڵام هاندانیان بۆ چاکه‌و خێرخوایی شتێک نیه توانای به‌سه‌ردا بشکێ، ئنجا ئه‌وپه‌ڕی سزایه‌ک که ده‌وڵه‌ت هه‌ڕه‌شه‌ی پێ له تاوانبارو به‌دکاران بکات، سزاو ئه‌شکه‌نجه‌یه‌کی مرۆڤکردی کاتییه، که به‌هه‌ر حاڵ له چوارچێوه‌ی ئه‌م ژیانه دنیاییه ده‌رناچێ.

بەڵام هێزو دەستەڵاتی بڕوا بەخوا بوون، هیچ کام لەو کەموکوڕیی و کەلێن و کونانەی نین، کە دەستەڵاتی دەوڵەت هەینی؛ چونکە:

**١)** دەستی دەستەڵاتی خوا، هیچ کات و جێیەکی لەبەر عاسێ نابێ، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا ﴾ (غافر-٧).

واتە: ئەی پەروەردگارمان، بەزەیی و زانیارییت هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

دیسان فەرموویەتی: ﴿ وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَٰهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَٰهٌ ﴾ (الزخرف-٨٤).

ئەو (خوا) ئەو زاتەیە کە لە ئاسمانێ پەرستراوەو لە زەویدا پەرستراوە. (واتە مرۆڤ لە هەر جێیەک سەرپێچیی بکات، دەستی تۆڵەی خوا دەیگاتێو پێویستە ئینسان لە هەرجێیەک بێ، بیپەرستێ و بەندایەتیی بۆ بکات).

**٢)** لە ئاقار دەستەڵاتی خوادا پادشاو گەدای نیەو، هەموو کەس لە بەندایەتییدا یەکسانەو، کەس لەکەس بەرزتر نیەو، دەستەڵاتدارترین کەس و بێدەستەڵاتترین کەس، لەبەردەم حوکمی بەرنامەی خوادا، وەک یەکن، نەک وەک بەرنامە مرۆڤکردەکان، کە وەک تەونی جاڵجاڵۆکە وان و، ئەوانەی وەک مێش و مەگەزی کەمدەست و فەقیرحاڵ وابن، دەیانگرن، بەڵام ئەوانەی وەک ژەنگەسوورەو زەردەواڵە هار و دڕبن، تێیان ڕا دەڕۆنە دەرو قوتار دەبن، بەڵێ بڕوا بەخوا بوون وا لە کۆمەڵگا دەکات، کە بە کاربەدەست و ڕەعیەتەوە، لە سزای دنیایی و دوارۆژیی خوا بترسێن و نەوێرن خەتێ خوار بکەن، خوای کاربەجێ لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ ﴾ (مريم-٩٣).

هیچ کەس نیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، کە بە بەندیی نەیەتە لای خوای میهرەبان.

**٣)** بڕوا بەخوا بوون وا لە ئینسان دەكات، كە بە دڵ و دەروونیش، نەتوانێ بیر لە شەڕو خراپە بكاتەوەو، هیچ ڕازو نهێنییەكی پیس و بەد لە سەرو سینەیدا حەشار بدات، چونكە ئەو دەزانێ كە خوای وردبین، نێو دڵی دەبینێو، هەموو سركەو چپەیەك دەبیستێ، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ ﴾ (غافر-١٩).

خوا لە خیانەتی چاوو لەوەی كە سینەكان دەیشارنەوە، ئاگادارە.

ئنجا بێگومان بڕوا هەبوونی مرۆڤ بەوە، كە خوای دادگەر لە خوتخوتەی نەفس و خولیای مێشك و، هەست و نەستی دەروونی ئاگادارە، كارێكی یەكجار گەورە دەكاتە سەر ژیانی، چونكە كەسێك بەڕاستیی بڕوای بەوەبێ، كە خوا وەك دەر (ظاهر)ی لە دەروون (باطن)یشی، شارەزاو زانایە، هەروەك چۆن چاودێریی و ئاگاداربوونی خەڵكی، پێشگیریی هەموو كردەوەو ڕەفتارێكی دزێوی بەرچاوی لێدەكات، چاودێریی و پێزانینی خواش، ڕێی هەر جۆرە بیرو خەیاڵ و هەست و نەستێكی ناقۆڵێو خراپی لێ دەگرێ، ئنجا گومانیشی تێدا نیە كە بیرو خولیاو خەسڵەتە پەستە دەروونیی و پەنهانەكان، چی وایان كەمتر نیە لەو تاوان و خراپانەی، كە بە ئەندامە ڕواڵەتییەكان دەكرێن، بەڵكو ئەگەر بەوردیی سەرنج بدەین، دەزانین كە تاوان و ڕەفتارە نزمە ڕواڵەتییەكانیش، هەر زادەو بەرهەمی ئەو بیرو خەیاڵ و سیفەتە دەروونییانەن، چونكە هەر مرۆڤێك مەحاڵە هیچ هەنگاوێكی كرداری بنێ —بەرەو چاكە یان خراپە- پێش ئەوەی وەك بیروبڕواو نیازو مەبەستێك بەدڵی خۆیدا بهێنێ و، عەزمی لەسەر جەزم بكات، كەوابێ: بابای خواناس و بڕوادار لە سۆنگەی هەست كردنییەوە، بە ئاگاداریی و چاودێریی خوا، هەمیشە دڵ و دەروونی خۆی پاك ڕادەگرێ و، ناهێڵێ تۆوی وەسوەسەی شەیتانیی و، خەیاڵ و هەست و نەستی بەد، لە زەوی دڵیدا جێگیر بن و، لە ئەنجامی ئەمەشدا، بەسەر هەموو تاوانە دەریی و دەروونییەكاندا، زاڵ دەبێ و بنەبڕیان دەكات، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿وَذَرُواْ ظَـٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ...﴾ (الأنعام-١٢٠).

هه‌روه‌ها وازبێنن له‌ تاوانه‌ ئاشكراو په‌نهانه‌كان.

بڕوا به‌خوا بوون، وێڕای ئه‌وه‌ی كه‌ به‌ زه‌بری قه‌مچی سزاو تۆڵه‌ی خوا، خه‌ڵكی له‌ تاوان و خراپه‌ ده‌پرینگێنێته‌وه‌، به‌هۆی ته‌ماع وه‌به‌رنانی گه‌یشتن به‌ خێرو پاداشتی بێسنووریش، به‌ره‌و چاكیی و پاكیی و سوود به‌خش بوون، هانیان ده‌داو هه‌ڵیان ده‌نێ، ئنجا ئه‌مه‌ ته‌نیا سه‌باره‌ت به‌ خه‌ڵكی ئاسایی و عه‌وام، ئه‌گه‌رنا له‌ڕاستیدا به‌نده‌ خواناسه‌ ڕاسته‌قینه‌كان، بۆ پرینگانه‌وه‌ له‌ خراپه‌و به‌دڕه‌فتاریی و، لێبڕان بۆ چاكه‌و جوان ئاكاریی، حه‌وجێی گوێبیست بوونی هه‌ڕه‌شه‌و گه‌فی سزاو، مزگێنی پێدانی پاداشت نین؛ چونكه‌ ئه‌وان گه‌یشتوونه‌ قۆناغی هه‌ره‌به‌رزی خواناسیی و بڕواو، هه‌موو كات به‌چاوی دڵ خوا ده‌بینن و، هه‌ست به‌ چاودێریی و به‌سه‌رڕاگه‌یشتنی ده‌كه‌ن و، ڕێزو خۆشه‌ویستیی و شه‌وق و شه‌رمێك كه‌ ئه‌و جۆره‌ بڕوایه‌ له‌ دڵیاندا وه‌دی دێنێ، وایان لێ ده‌كات، كه‌ هه‌ر پێیان شه‌رم بێ، بیر له‌ تاوان و خراپه‌ بكه‌نه‌وه‌، چ جای ئه‌وه‌ی هه‌نگاوی بۆ بنێن، پێغه‌مبه‌ری به‌ڕێزمان (صلى الله عليه وسلم) له‌وباره‌وه‌ فه‌رموویه‌تی: {اتَّقِ الله حَيْثُمَا كُنْتَ وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ} (أخرجه أحمد برقم: ٢١٣٩٢، والترمذي برقم: ١٩٨٧، وقال : حسن صحيح، والدارمي برقم: ٢٧٩١، والحاكم برقم: ١٧٨، وقال : صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبی)، له‌ هه‌رجێیه‌ك بووی پارێز له‌خوا بكه‌و شه‌رمی لێ بكه‌و، به‌دوای خراپه‌دا چاكه‌ بكه‌ ده‌یسڕێته‌وه‌، له‌گه‌ڵ خه‌ڵكیدا به‌ ڕه‌وشتێكی جوان ڕه‌فتار بكه‌.

پێغه‌مبه‌ری پێشه‌واش (صلى الله عليه وسلم) ناوی له‌م قۆناغه‌ هه‌ره‌به‌رزه‌ ناوه‌ (الإحسان) وه‌ك له‌ فه‌رمووده‌یه‌كیدا فه‌رموویه‌تی: {الإِحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ آرَاكَ} (أخرجه أحمد برقم: ٩٤٩٧، والبخاري برقم: ٥٠، ومسلم برقم: ٩، وابن ماجه برقم: ٦٤)، واته‌: ئیحسان ئه‌وه‌یه‌ كه‌

لەکاتی خواپەرستییدا، پێت وابێ لە خواوە ڕاماوی، ئەگەر واش نەبی کە پێت وابێ دەیبینی، پێت وابێ کە ئەو تۆ دەبینێ.

بێگومان وەک دەردەکەوێ مەبەست لە (السیئة) بەدڵدا هاتنی ئەو خوتخوتەو خەیاڵێنەیە کە ئینسان بەرەو تاوان دەبەن، نەک تاوانی ڕاستەقینەو واقیعیی، بەڵام بۆیە ناونراوە: (سیئة) چونکە وەک گوتراوە: ((حسنات الأبرار سیئات المقربین)) مەبەست لە (حسنة) داوای لێبوردن (إستغفار) و چاوپۆشیی کردنە، بەڵگەشمان لەسەر ڕاستیی ئەم بۆچوونە، ئەوەیە کە هەر کەسێک هێندە لەخوا نیزیک بێ و، هێندەی ناسیبێ، کە لە هەر جێیەک بوو، شەرم و پارێزی لێ بکات، ئەگەر مەحاڵیش نەبێ، زۆر دەگمەنە تووشی تاوان و خراپە بێ، بەڵام خولیاو بیرو خەیاڵی بەد شتێکە قەت ئینسان لێی ڕزگار نابێ.

٥) ئەو سزاو پاداشتانەی کە بەهۆی خواپەرستییەوە، دوو باڵی ترس و تەما (الخوف والرجاء) بۆ مرۆڤ دەڕەخسێنن، خواکردو هەمیشەیین، نەک مرۆڤکردو کاتیی، ئنجا هەڵبەتە جیاوازیی نێوان سزاو پاداشتی خواو بەندە، هێندەی جیاوازیی نێوان خواو ئینسان وایەو، جیاوازیی نێوان سزاو پاداشتی کاتیی و سنووردار و هی نەبڕاوەو بێسنوور، وەک جیاوازیی نێوان بوون (وجود) و نەبوون (عدم) وایە!!

دەجا هەر لێرەشدا جیاوازیی نێوان: کاریگەریی سزاو پاداشتی خواو، کاریگەریی سزاو پاداشتی[1] ئینسان، لە ژیانی کۆمەڵگادا، وەک مانگ لە شەوی چواردەیدا دەدرەوشێتەوە.

٦) ئنجا لە کۆتاییداو لە هەمووشی گرنگتر، ئەوەیە کە بڕوا بەخوا بوون، وا لەکۆمەڵ دەکات، کە یەک پارچەو یەکڕیز و تەباو برا بێ؛ چونکە

---

(١) وەک پێشتر گوتمان: مەگەر چۆنەکایی، دەنا بەرنامەی مرۆڤکرد، پاداشت دانەوەی چاکەکارانی تێدا نیە، بەڵام لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە ئەگەر گریمان هەشبێ...

تێـی دەگەیەنـێ کـە هەمـوو مرۆڤـەکان: یـەک خـوا، لـە یـەک ڕەگـەز و سروشـت و، لـە یـەک بـاوک و دایـک، بـۆ یـەک ئامانـج، بەبـێ فـەرق و جودایی، دروستی کـردوون، یانـی: بـڕوا بەخـوا بـوون –ئەگـەر بەڕاستیی لـە دڵ و مێشکی گەلدا هەبێ، نـەک هـەر بـە حوکمـی لاسایی کردنـەوەو نەرێت- وا لـە کۆمـەڵ دەکات کـە هەرگیـز چیـن و توێـژی لێـک جـودای نەبـن و، ڕژێمی بەدی ئاغاو مسکێنیی و سەیید و کۆیلەیی و ئەشراف و ڕەشۆکیی، نەتوانـێ تێیدا سـەر هـەڵ بدات، بەڵـێ بـڕوا بەخـوا بـوون، وا لـە خەڵکـی دەکات کـە هیـچ کـەس ئیمتیـازو پلـەی بەسـەر کەسـدا نیـەو، مرۆڤـەکان تێکـڕا وەچـەی ئادەمـن و، ئادەمیش لـە گڵ دروسـت بـووە: {النَّـاسُ بَنُـو آدَمَ وَآدَمُ مِـنْ تُـرَابٍ} (أخرجه أحمد برقم: ١٠٧٩١، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن).

کەواتـە: هیـچ کـەس بـۆی نیـە بـە هیـچ نـاوو عینوانێکـەوە، خـۆی بەسـەر کەسـدا هەڵکێشـێ و، کەسـیش لـە کـەس زیاتـر بەشـی بـەو نـاز و نیعمەتانـەوە نیـە، کـە خـوا بـۆ هەمـوو مرۆڤەکانـی ڕەخسـاندوون بێجیاوازیـی[1].

ئنجا گومانیشی تێدا نیە کە لـە ئەنجامی ئـەوەدا کـە گوتمـان، کۆمـەڵ یەکڕیـزو یەکسـان و بـراو تەبـا دەبـێ، چونکـە ئـەوەی دەبێتـە هـۆی تێکدانـی برایەتیی و یەکڕیزیی و تەبایی کۆمـەڵ، ئـەو نەخۆشییە کوشندەو پیسانەن، کـە خواناسیی و ئایینـی ڕاست ڕەگ و ڕیشـەیان لـە بـن دێنـێ، وەک:

أ- توێژ توێژ بوونی خەڵک، لەسەر بنچینـەی ڕەنـگ و زمـان و پـارەو سـامان و وەجاخ و ڕەچەڵـەک و ڕەگـەزو نیشتمان.

ب- چینایەتیی و قڕیی و پڕیی.

---

(١) سـوپاس بـۆ خـوا ئـەو باسـانەمان بـە تێروتەسـەلیی لـە کتێبـی: (سـۆزی نەتەوایەتیـی)دا توێژیونـەوە، بڕوانـە چاپـی دووەمـی سـاڵی ١٩٩٨، و چاپـی سێیەمی نووسینگەی تەفسیر سـاڵی (٢٠٠٥)و چاپـی دووەم: ٢٠١٩ز.

ج- حوکم و دەسەڵات تایبەت کردن بە کەسێک، یان بنەماڵەیەکی تایبەتییەوە.

کەواتە: وەک لە سەرەتاشەوە گوتمان، هەر کاتێک بویستریَ کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلیم و تەواوو ئینسانانە، پێک بێ، پێویستە هەرکام لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵە، هەست بە چاودێریی هێزو دەستەڵاتێکی وا بکەن، کە لە دنیاو دوارِۆژدا، توانای سزادان و پاداشت دانەوەی هەبێ، ئەو هێز و دەستەڵاتەش بەس هێزی دەستەڵاتی خوایەو، ئەمیش لە ڕێی برِوا بەخوا بوون و ئیمانێکی ڕاستەوەن لەدڵ و مێشکی مرۆڤەکاندا جێگیر دەبێ.

## چوارەم: گرنگیی بڕوا بەخوا بوون، لە ڕووی ڕامیارییەوە:

بڕوا بەخوا بوون و خوا بەیەکناسین، بەمەرجێک لە ئایینی ڕاست و نەشێوێنراوی خوا وەربگیرێ، گەورەترین و چاکترین پاڵپشتی چەسپان و بەڕێوەبرانی سیاسەتێکی ڕاست و دادگەرانەیە، چونکە بڕوا بەخوا بوون، سەرچاوەیەکی سازگارو ڕوونە، هەموو ئەو یاساو بنچینە سەرەکییانەی لێ پەیدا دەبن، کە ئەو جۆرە سیاسەتەیان لێ پێکدێ.

ئێستاش بەر لە هەموو شتێک، با نەختێک چەمک و مەبەستی بەرفراوانی بڕوا بە خوا بوون ئاوەلێ بکەینەوە، تاکو دواتر هەڵهێنجانی ئەو یاساو دەستووره بنچینەیی و سەرەکییانەمان بۆ ئاسان بێ، کە گوتمان پێکهێنەری سیاسەتێکی ڕاست و دادگەرانەن.

أ- بڕوا بە خوا بوون و خوا بەیەکناسین، یانی: بڕوا بوون بەوەی کە بەس خوا وەدیهێنەرو بنیاتنەری بوونەوەرو هەر شتێکە کە تێیدایەو، بێجگە لە خوا هیچ شتێک خاوەنی بوونێکی زاتیی و سەربەخۆ نیەو، هەموو شتێک بوونی بەخواوە بەستراوەو لەوی خوازراوە، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ ﴾ (الزمر-٦٢)، خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە.

ب- هەروەها یانی: تەنیا: خوا پەروەردگارو چاودێرو مشورخۆری بوونەوەرەو، ژیان و مردن و ڕۆزییدان و بەخێوکردنی هەرچی لە بوونەوەردایەو، هەموو شتێک بەس بەدەست وییە، وەک خوا (عزّ وجلّ) فەرموویەتی:

﴿ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِي رَبّٗا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖۚ ... ﴾ (الأنعام- ١٦٤).

بڵێ: ئایا جگە لە خوا پەروەردگارێکی دیکە بخوازم، لە حاڵێکدا کە ئەو پەروەردگاری من و پەروەردگاری هەموو شتێکە؟!.

ج- هەروەها بڕوا بە خوا بوون و خوا بەیەکزانین، واتە: بڕوا بوون بەوەی کە بەس خوا ماف و توانای کامڵ و تەواوی سزادان و پاداشت دانەوەی خەڵکی هەیەو، تەنیا ئەویش شیاوی ئەوەیە کە ئەوپەڕی شەرم و سامی لێبکرێ و، ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیی بۆ لە دڵ بگیری، وەک فەرموویەتی:

﴿ ...فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ ... ﴾ (المائدة-٤٤).

واتە: جا لە خەڵک مەترسن و لەمن بترسن....

﴿ ... وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ... ﴾ (البقرة -١٦٥)، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە خۆشەویستی یان بۆ خوا زیاترە.

د- هەروەها یانی: تەنیا خوا لەوە دەوەشێتەوە کە مرۆڤ بیپەرستێو، لێی وەپاڕێ و، داوای لێبکاو، پەنای بەرێتە بەرو، پشتی پێ ببەستێ و، خۆی پێ بسپێرێ و، هیچ کەسی دیکە شیاوی ئەوە نیە، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ ... فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ ﴾ (الزمر-٢)، واتە: بەساغیی خوا بپەرستەو ملکەچیی بۆ یەکلایی بکەوە.

﴿ هُوَ ٱلْحَىُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴿٦٥﴾ ﴾ (غافر-٦٥).

واتە: ئەو زیندوویە جگە لەو پەرستراو نیە، دەجا تەنیا لەوی بپاڕێنەوەو ملکەچییتانی بۆ ساغ بکەنەوە..

ئێستا دوای ئەوەی چەمک و واتای بڕوا بەخوا بوونمان، تاڕادەیەک ڕوونکردەوە، با بزانین چۆن بڕوا بەخوا بوون، کار دەکاتە سەر پێکهێنان و چەسپاندنی سیاسەتێکی ڕاست و دادگەرانە؟ دەتوانین لە چەند خاڵێکدا ئەو یاساو بنچینە سەرەکییانە بخەینە ڕوو، کە لە سەرچاوەی ڕوونی بڕوا بەخوا بوون و خوا بەیەکگرتن هەڵدەقوڵن و، دەبنە هۆی پێکهێنان و بەڕێوەبردنی سیاسەتێکی دادگەرانەو ڕاست:

١- مادام بەس خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو ڕۆزیدەرو ژیێنەرو مرێنەرەو، بەس ئەو مافی سزادان و پاداشت وێدانەوەی هەیەو، هەر ئەو شایستەی پەرستران و پەناهێنرانە بەرو، پشت پێبەستران و، خۆ پێ سپاردنە، هەر ئەویش مافی حوکمڕانیی موتلەق و بەرنامەدانانی هەیەو، هەرکەسێکیش لافی حوکمڕانیی و یاسادانان لێبدات، مانای وایە داوای پەروەردگاریّتیی کردوە، چونکە بەرنامەدانان، تایبەتییترین و سەرەکییترین سیفەتی خوایە.

٢- مرۆڤەکان لە ئاقار حوکمی خوادا، یەکسانن و هیچ کەس هیچ جۆرە ئیمتیازو زیادییەکی بەسەر باقی مرۆڤەکاندا نیە؛ چونکە هەموویان وەدیهێنراوی یەک خوان و، ئەو خوایە هەموویانی لە یەک ئەسڵ و سروشت دروست کردوە بێ جیاوازیی، کەواتە: عەقیدەی خوا بەیەکگرتن لە خەڵکی دەگەیەنێ، کە هیچ ڕەگەزو نەتەوەو تیرەو بنەماڵەیەک، لە باقی ڕەگەزو نەتەوەو تیرەو بنەماڵەکان زیاتر بەشی بە سەرۆکایەتیی و حوکمڕانییەوە نیە، بەکورتیی: ئۆرستۆکراسی (الأرستقراطية) لە کۆمەڵگایەکدا جێی نابێتەوە، کە لەسەر بنچینەی بڕوا بەخوا بوون و خوا بەیەکناسین، پەروەردە کرابێ و دامەزرابێ.

٣- بەپێی حوکمی (لا إله إلا الله) کە بنچینەی یەکتاپەرستییە، سەرۆک و حوکمڕانی دەوڵەت، دەبێ گەل لەسەر بنچینەی ڕاوێژ (الشورى) هەڵیبژێرێ، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ ... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ... ﴿٣٨﴾ ﴾ (الشورى-٣٨).

واتە: با کاروبار بەڕێوەبردنی بڕواداران، بەپێی ڕاوێژ بێ، واتە گەل تێ دەفکرێ کێی بە لێوەشاوەترو لێهاتووتر زانی، بۆ بەڕێوەبردنی حوکمی خواو سەرپەرشتیکردنی کاروباری گەل، هەڵیدەبژێرێ، بەبێ لەپێش چاوگرتنی ڕەنگ و زمان و دارایی و وەجاغ و بنەماڵە[1].

---

(١) هەندێک لە زانایان (قورەیشیی بوون)یان بەمەرج گرتوە بۆ هەڵبژاردنی جێنشین، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو، ئەو فەرمایشتەش کە لەوبارەوە هاتوە، مەبەستێکی دیکەی هەیە، وەک (ابن خلدون) لە (مقدّمة)کەیدا ڕوونی کردۆتەوە.

٤- سەرۆکی دەوڵەت لە کۆمەڵگەیەکی خوا بەیەکگر (مُوَحِّد)دا، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هیچ دەستەڵاتێکی نیە لە دانان و گۆڕین و دەستکاریکردنی بەرنامەو پەیڕەوی دەوڵەتدا، لە ئاقار حوکمی بەرنامەی دەوڵەتدا، لەگەڵ سادەترین و کەمدەستترین ئەندامی کۆمەڵگادا یەکسانەو، لە کاتی لادان و سەرپێچییدا، وەک هەرکام لە ئەندامانی کۆمەڵ، سزای دیارییکراوی بەسەردا دەچەسپێنرێ، بێ کەم و زیاد.

٥- لەبەرئەوەی هەریەک لە ئینسانەکان بە جێنشینی خوا دادەنرێ و، هەرکامێکیان لە ئاقار کاروباری دەوڵەت و گەلدا بەرپرسیارن، پێویستە گەل چاودێر بێ بەسەر هەڵسوکەوتی سەرۆک و کاربەدەستانی دەوڵەتداو، هەر لاریی و کەموکوڕییەکی لێ دیتن، دەستیان بگرێ و ئاگاداریان بکاتەوە.

٦- چونکە ڕۆزییدان یەکێکە لە سیفەتە تایبەتییەکانی خواو، بۆ ئەوەی گەل دەستی نەکەوێتە بن باری کاربەدەست و حوکمڕانان و، توانای هەڵەڕاست کردنەوەو ڕەخنەگرتنی تێدا نەمرێ، پێویستە خەڵکی لەبواری ڕزق و بژێو پەیداکردندا ئازاد بن و، دەوڵەت ناچاریان نەکات، کە چاویان لەدەستی وی بێ و، خۆیان وەک سواڵکەرێک بێتە بەرچاو، هەڵبەتە لەو ولێتانەشدا کە بەحوکمی ڕژێمە دەستکردە نەفامییەکان، دەوڵەت بۆتە بەخێوکەرو بژێودەری گەل، کۆیلەیی و بێئیرادەیی و چارەڕەشیی ئەو گەلانە، وەک ڕۆژی ڕوون دەدرەوشێتەوە.

٧- لە سۆنگەی ئەوەوە کە سەرۆکی دەوڵەت خۆی بە جێگری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و بەڕێوەبەری شەریعەتی خواو، مشورخۆری گەل دەزانێ، خۆی بە لێپرسراو دەزانێ، کە مافە سەرەکییەکانی هەر ئینسانێک دابین بکات و بپارێزێ، کە بەپێی یەکدەنگیی زانایانی ئیسلام پێنج[1] مافن:

---

ئێستاش: {(٢٠١٩/٩/٢١ز) دەڵێم: لەمەوسووعەی چوار بەرگی (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا بەدرێژیی لەوبابەتە دواوین.

(١) لەکتێبی: (چەند مەسەلەیکی باوی سەردەم) چاپی شەشەم ٢٠١٨و، مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا حەوت مافمان دیارییکردوون.

أ- مافی پارێزرانی گیان، بۆ پارێزرانیشی سزای تۆڵە (عقوبة القصاص) دانراوە.

ب- مافی پارێزرانی ئاسایش و هێمنیی، بۆ پارێزرانیشی، سزای ڕێگریی و ئاشووبنانەوە (حدُّ الحرابة) دانراوە.

ج- مافی پارێزرانی ئابڕوو، بۆ پارێزرانیشی، سزای زینا (حدّ الزنا) کە (١٠٠) قەمچیەو، سزای بوختان کردن (حد القذف) کە (٨٠) قەمچییە، دانراون.

د- مافی پارێزرانی ژیریی، بۆ پارێزرانیشی، سزای مەیخۆریی (حد شرب الخمر) دانراوە کە (٤٠) یان (٨٠) قەمچییە.

هـ- مافی پارێزرانی ماڵ، بۆ پارێزرانیشی، سزای دزیی و (حد السرقة) دانراوە.

ئێستاش پاش ئەوەی کاریگەریی بڕوا بەخوا بوونمان، کەم تا کورتێک لە دروستکردنی سیاسەتێکی ڕاست و دادگەرانەدا خستە ڕوو، بابزانین ئایا سیاسەتێکی ئاوا ڕاست و بەجێ، کە عەقیدەی بڕواداریی و خوا بەیەکگرتن پێی دەرەخسێ، دەگونجێ بەبێ بڕوا بەخوا بوون و خوا بەیەکگرتن بێتە دی؟!

جارێ، خاڵی یەکەمیان، کە تایبەتکردنی مافی یاسادانانە، بەخواوە، ئەوە شتێکی ڕوون و بەڵگەنەویستە، کە بەبێ بڕوا بەخوا بوون، هاتنەدی مەحاڵە.

خاڵی دووەمیش کە وەک یەک بوون و یەکسانیی مرۆڤەکانەو، نەبوونی جیاوازیی و ئیمتیازە لە نێوانیانداو، بەشداربوونیانە لە پلەو پایەی سەرۆکایەتیدا، دیسان زادەی سروشتی عەقیدەی خوا بەیەکگرتنە؛ چونکە لە ڕێچکەو بیرە دەستکردەکاندا تەرازووگەلێکی زۆر هەن، بۆ هەڵسەنگاندنی ئینسانەکان

وەک (ڕەنگ)؛ کە لە دیموکراتییترین دەوڵەتانی ئەم سەردەمەدا —کە ولێتە ڕۆژئاواییەکانن- بەگرنگترین پێوەری هەڵبژاردنی سەرۆک دادەنرێ و سپی پێستیی، مەرجی سەرەکییە[1]!!

(بنەماڵەو ڕەچەڵەک)؛ کە ئێستا هەندێک لە دەوڵەتانی دنیا مافی سەرۆکایەتی بە میرات و مافێکی بنەماڵەیی دەزانن و، لە بابەوە بۆ کوڕو لەوەوە بۆ خوارتر دەگوازرێتەوەو، کەسیش بۆی نیە بڵێ لەل.

هەروەها زۆر تەرازووی لاتەڵی دیکە، بۆو مەبەستە ڕۆنراون وەک: زمان، پارەو دارایی، حیزب، ڕەگەز، نەتەوە...هتد.

**٣-خاڵی** سێیەمیش کە هەڵبژاردنی سەرۆکە لەسەر بنچینەی ڕاوێژو پرس و ڕای گەل، دوای تێچوونی خاڵی یەکەم و دووەم، تێچوونی ویش شتێکی ئاساییەو ئەنجامێکی سروشتییە.

٤- خاڵی چوارەمیش کە یەکسان بوونی سەرۆکە لەگەڵ نزمترین ئەندامی کۆمەڵدا، لە بەردەم بەرنامەو پەیڕەوی دەوڵەتدا، تەنیا بەرهەم و دیاری سیاسەتی ئیماندارانەو خواناسانەیە، چونکە بەس لە ڕوانگەی بڕواداربیەوەیە، کە سەرۆک بێجگە لە جێبەجێکردنی یاساکانی بەرنامەی دەوڵەت، هیچ ئیمتیازێکی بەسەر گەلدا نیە، باشترین بەڵگەشمان بۆ ڕاستیی ئەم قسەیە ئەوەیە، کە لە ڕوانگەی ئایینەوە هۆی هەڵبژێررانی سەرۆک شتێکی زاتیی نیە، بەڵکو تاقە هۆی هەڵبژێررانی، پەسند کرانیەتی لەلایەن گەلەوە، لەبەر هەبوونی ئەو سیفەتە چاکانەی کە لە سەرۆکدا بە مەرج گیراون، بەڵام لە ڕوانگەی ڕێچکە دەستکردەکانەوە، هۆی هەڵبژاردنی سەرۆک یان وەک میرات و مافێکی زاتیی بۆ بابای سەرۆک دێتە دی، یان ئەگەر لە هەندێک حاڵێندا هەڵبژاردنەکە ڕاوێژیشی تێدا بەکاربهێنرێ، ئەوە ڕاوێژێکی ناتەواوو کەچ و کرووچ دەبێ؛ چونکە بەس لە جوغزی

---

(١) ئەوکاتە (١٩٨٥ز) وابوو و، ئێستاش ئەو گرفتە هەر بەردەوامە بەڵام بەپلەیەکی کەمتر.

کۆمەڵێکی تایبەتیدا بەڕێوەدەبرێ، وەک: سپی پێستەکان، یان حیزبییەکان، یان پارەدارەکان... یان... یان...هتد، وەک لە سیستمە دیموکراسییەکان دا بەزەقیی دەبینرێ.

٥- خاڵی پێنجەمیش کە بریتیە لە چاودێریی گەل بەسەر سەرۆک و کاربەدەستانی دەوڵەتەوە، دیسان لە سێبەری دینداریی و خواناسییدا نەبێ، مەحاڵە بێتە دی، وەک مێژووی کۆن و نوێ و واقیعی ژیان شایەدە؛ چونکە گەلێک دەتوانێ ڕەخنە لە سەرۆکەکەی بگرێ و چاودێریی بکات و هەڵەکانی ڕاست بکاتەوە، کە هەر بۆخۆیشی ئەو سەرۆکەی پەسند کردبێ و، بەهێزی گەل گەیشتبێتە کورسیی حوکمڕانی و، سەرۆکێکیش دەتوانێ هێندە بارقووڵ و سینگ فراوان بێ، کە چاودێریی و ڕەخنەو ڕاستکردنەوەی گەلی پێ قبووڵ بکرێ، کە کورسی حوکم بە سپاردەی خواو مافی گەل بزانێ، نەک بە مافێکی زاتیی و شەخصی و بە میراتێکی باب و باپیرانی، هەروەها سەرۆکێک مافی ڕەخنەگرتن و هەڵە ڕاستکردنەوە بەگەل ڕەوا دەبینێ، کە خۆی وەک باقی خەڵکی بە بەندەیەکی بەرپرسیار بزانێ و، هەست بە هیچ جۆرە پلەوپایەو ئیمتیازێک نەکات و، خۆی وەک خەڵکی حسێب بکات، بەڵام طاغووتێک کە خۆی بە پەروەردگارو ڕۆزیدەرو پەرستراوو یاسادانەری خەڵکی بزانێ، هەیهوو هەیهوو هەتا بابایەکی وا ڕەخنەی خەڵکی قبووڵ، دەکات قیر سپی دەبێ و، زیخ گوڵێ دەدات!!

خاڵی شەشەمیش کە بریتیە لە ئازادکردنی خەڵکی لە بژێو پەیداکردندا وەک خاڵەکانی پێشووی، مەحاڵە لەنێوچاوانی بێفەڕی حوکمی نەفامیی هەڵوەرێ، ئاخر گوژاڵک هەر هێندەی دەبارانداا هەیە قەلەفسان بگرێ! ئنجا بابای طاغووت کە خۆی لە خەڵک کردۆتە پەرستراو و بەرزترین پەروەردگار! وەک فیرعەونی مووسا دەیگوت: [أنا ربكم الأعلى] (النازعات-٢٤)، من پەروەردگاری هەرەبەرزتانم - ئەی گەلی میسر-، بۆ ئەوەی پەروەردگارێتییەکەی بەجۆرێک بەسەر گەلدا بکات، کە مەودای هاوبەشان

(شرکاء) نه‌هێڵێ به‌شداریی بکه‌ن، بێگومان چاکترین هۆی کاریگه‌ر بریتیه له‌وه‌ی که ڕۆزیی و بژێویان بخاته ژێر ڕکێفی خۆیه‌وه[1].

٧-خاڵی حه‌وته‌میش که بریتیه له پاراستنی مافه ئینسانیی و سروشتییه‌کانی هه‌ر کام له ئه‌ندامانی کۆمه‌ڵ، به‌هه‌مان پێودان، مه‌حاڵه له کۆمه‌ڵگایه‌کدا بێته‌دی، که ملکه‌چی سیاسه‌ت و حوکمێکی بێبڕوایانه‌ی نه‌فامییه، چونکه:

**یه‌کـه‌م:** سه‌رۆکێک خۆی به به‌رپرسیار ده‌زانێ به‌رانبه‌ر به گه‌ل و، دابینکردنی مافه سروشتییه‌کانی گه‌ل به فه‌رز ده‌زانێ، که هه‌ست به هه‌بوونی هێزو ده‌سته‌ڵاتێکی له‌خۆی به‌پشته‌وه‌تر بکات —واته بڕوای به‌خوا بێ- و بڕوای وابێ که ژیانی دنیا گۆڕه‌پانی تاقیکردنه‌وه‌یه‌و، ئه‌مڕۆ دنیایه، سبه‌ینێ قیامه‌ته‌و سزاو پاداشت چاوه‌ڕێی ده‌که‌ن.

**دووه‌م:** ئه‌و تاوانانه‌ی که ده‌بنه هۆی فه‌وتاندنی پێنج مافه سروشتییه سه‌ره‌کییه‌کان، به‌س ئایین و به‌رنامه‌ی خوا، وه‌ک پێویست ناسیونی و هه‌وڵی بنه‌بڕکردنیانی داوه، به‌ڵام له ڕێچکه مرۆڤکردو حوکمه نه‌فامیی و طاغووتییه‌کاندا، یان هه‌ر دان به‌وه‌دا نه‌هێنراوه، که ئه‌وانه تاوانن و حه‌وجێی سزاو تۆڵه‌ن[2]، یان سزایه‌کی وایان بۆ دانراوه، که که‌متر وایه تاوانبار له‌و جۆره سزایانه بره‌وێته‌وه، بگره ڕه‌نگه به‌عه‌زه جارێک هانیشی بده‌ن به‌ره‌و تاوان!!

ئێستاش بۆ که‌سێک تێگه‌یشتن و ویژدانی هه‌بێ، ساغ بۆوه که بڕوا به‌خوا بوون، چ کاریگه‌ریی و گرنگییه‌کی مه‌زنی هه‌یه، له ڕووی حوکم و سیاسه‌ته‌وه.

---

(١) پێویسته بگوترێ: که مه‌به‌ستی سه‌ره‌کیی له‌و ڕژێم و سیستمی حوکمڕانییه‌ی که له‌گه‌ڵ سیستمی حوکمڕانیی ئیسلام دا به‌راوه‌ی پێکراوه، سیستمه دیکتاتۆرییه‌کانن، وه‌ک ڕژێمی به‌عسی فه‌وتاو که بێگومان له‌کاتی نووسینی ئه‌م کتێبه‌دا له ساڵێنی (١٩٨٤-١٩٨٥) ئه‌وه‌ی له ئاوێنه‌ی زه‌ینم دا ئاماده‌بوو وه‌ک ڕژێم سیستمێکی دژو پێچه‌وانه‌ی ئیسلام، ئه‌و ڕژێمه عه‌لمانییه دیکتاتۆرییه نه‌گریسه بووه!

(٢) بۆ وێنه: هیچ یه‌ک له ڕێچکه ده‌ستکرده‌کان، چ ڕۆژهه‌ڵێتی بن چ ڕۆژئاوایی، هیچ کام له {زینا، مادام به تۆبزیی نه‌بێ، مه‌یخۆریی، قومار، له‌دین وه‌رگه‌ڕان} پێتاوان نیه!!

## پێنجەم: گرنگیی بڕوا بەخوا بوون لەڕووی ژیرییەوە

بڕوا بەخوا بوون، پێویستییەکی ژیریی و فەلسەفییە؛ چونکە بڕوا بەخوا بوون گەورەترین ڕاستییەو، بەبێ دان هێنان بەو ڕاستییە مەزنەدا، لەبەردەم تەفسیرکردنی دیاردەی پەیدابوونی بوونەوەردا، بەو ڕێکپێکیی و وردەکارییەی، مەحتەل و دەستەوستانین.

بەڵێ هەرکەسێک بیەوێ، وەڵامێکی ڕاست و ماقووڵ و بەڵگەدار لە ئاقاری پرسیاری: (بوونەوەر چۆن هاتۆتە دی)؟! دا دابنێ، ناچارە دەبێ دان بێنێ بەو ڕاستییەدا کە گەورەترین ڕاستیی بوون (عظمى حقائق الوجود) ە، واتە: بوونی خوای پەروەردگار، هەروەک چۆن بۆ کەسێک بیەوێ لەبەردەم پرسیاری: (٢ + ٢ دەکاتە چەند؟!)دا سەرگێژەکەی نەگاتێ و، لەنێو وەڵامە هەڵەکاندا سەرگەردان نەبێ، پێویستە بێسێ و دوو پەنا بەرێتە بەر ژمارەی (٤)و بیکاتە وەڵامی پرسیاری گۆرین، ئنجا هەروەک چۆن بابایەک کە پرسیاری پرسیاری (٢ + ٢ دەکاتە چەند؟!) بەرۆکی دەگرێ، ئەگەر بێت و هەرچی ژمارە هەیە، بێجگە لە ژمارەی (٤) پەنایان بەرێتە بەرێ؛ وەک (٣) یان (٥) یان (١٠) یان (١٠٠)...هتد. ناتوانن دەفریای بێن و، شتێکی وای لەمست بنێن، کە بشێ ببێتە وەڵامێکی ڕاست بۆ پرسیاری ناوبراو، کەسێکیش کە پرسیاری (گەردوون چۆن پەیدا بووە؟!) بەربینگی[1] پێ دەگرێ، ئەگەر بیەوێ مات و حەیران و دەستەوستان نەبێ و، لەنێو جەنگەڵ و بێشەی وەڵامە هەڵەو خوارو خێچەکاندا ون نەبێ و، هەتا مەلان بە لیتەولاڵی دوودڵیی و گومانانەوە نەبێ، پێویستە زوو پەنا بەرێتە بەر بارەگای بەرزی خوای ئاسمان و عەرزو، سەری بەندایەتیی بۆ دابنەوێنێ و، دان بە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریەتیی دابێنێ و بڵێ:

---

(١) بەربینگ: یەخە، بەرۆک.

﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ ﴾ (الزمر-٦٢).

واتە: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکەو هەر ئەویش مشوورخۆرو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە، دەنا ئەگەر بێت و وانەکات، ئەوە هەرچی وشەی ئەفسانەیی و بێکاکڵی هەیە وەک: ڕێکەوت، سروشت، هەوبوویی ماددە، خەیاڵیی بوونەوەر، دیالیکتیک، فەلسەفەی عیلمیی...هتد ناتوانن بەدەنگییەوە بێن و، شتێکی وای لە چەنگ بنێن، کە بلوا بکرێتە وەڵامێکی ژیرانە بۆ پرسیاری گۆرین.

ئێستاش بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست، وێنەیەک دێنینەوە:

زاناو شارەزایان لە ئەنجامی تێوەڕامان و بیرکردنەوەیاندا دەربارەی دیاردەو ڕواڵەتە بەرهەستەکانی بوونەوەر، گەیشتنە ئەو ئەنجامە کە یاسایەکی گشتی و هەمەلایەنە لە سەرلەبەری بوونەوەردا لەکاردایەو ڕێک وپێکیی و سەرەوبەرەی بە تێکڕای بوونەوەر بەخشیوە، ئەو یاسایەش بریتیە لە یاسای ڕاکێشان (قانون الجاذبیة)، ئنجا ئەگەر یەکێک لەو زاناو شارەزایانە بپرسێ: بەڵگەتان چییە لەسەر هەبوونی یاسای ڕاکێشان لە بوونەوەردا؟! لە وەڵامدا دەڵێن:

بەڵگەمان ئەوەیە کە ئێمە بەخۆشیی خۆمان و لەگۆترە، دانمان بە هەبوونی یاسای ناوبراودا نەهێناوە؛ بەڵکو لەژێر پاڵەپەستۆو تینی واقیعدا، ناچار بووین دان بە هەبوونی یاسای ڕاکێشاندا بنێین، چونکە ئێمە گەلێک دیاردەو ڕووداومان دێنە بەرچاو، کە بەبێ دانهێنان بەهەبوونی یاسای کێشکردندا، ناتوانین چۆنیەتی و هۆی پەیدابوون و ڕوودانیان بەشێوەیەکی ژیرانەو زانیارییانە تەفسیر بکەین، بۆ نموونە:

بۆچی دەبێ سێوێک کە لە درەختەکەی بەر دەبێتەوە، تەقڵەکوت بەرەو زەوی بێ، ئایا چ شتێک پێشگیریی لێ دەکات کە بەرەو سەروو، یان ئەملاولا بچێ! چ شتێک ناچاری دەکات، کە ڕمب بکەوێتە خواری؟![1]

---

(١) یەکەمین کەس کە بە دیتنی دیمەنی بەربوونەوەی سێوێک، هەبوونی هێزی کێشکردنی بە زەیندا هات (ئیسحاق نیوتن) بوو.

بێگومان (سەرێ) و (خوارێ) شتێکی گوێڕەیی (نسبي)ین پێوەڕاهاتن و بار پێوەگرتنی ئێمە کردوونی بە شتێکی موتڵەق و بێسنوور، ئەگەرنا ئینسان ئەگەر بە وردیی بیر بکاتەوە، هیچ شوێنێک لە بوونەوەردا نیە کە لای (سەرێ) بێو سیفەتی (سەرێ)یایەتیی لە خودی خۆی وەرگرتبێ!!

کەواتە: ناچارین کە بەدوای ئەو هۆیەدا بگەڕێین کە سیفەتی (سەرێ) و (خوارێ)ی بە ڕواڵەتەکانی بوونەوەر بەخشیوە، ئەو هۆیەش هێزێکە کە زانایان ناویان لێناوە: یاسای کێشکردنی تەنەکان (قانون جاذبية الأجسام)، چەمکی سادەی ئەم یاسایەش ئەوەیە کە هەر تەنێک هێزێکی تێدایە کە ئەو تەنانەی لێی نیزیکن و بارستاییان لەوی کەمترە، بەلای خۆیدا کێشیان دەکات.

بۆ وێنە: ڕۆژ کە بارستاییەکەی (٣٣٢,٠٠٠) جار هێندەی زەوییە[١]، زەوی بۆ لای خۆی کێش دەکات و، زەوی کە بارستاییەکەی شەش هێندەی هی مانگە، مانگ و هەروەها..هەر بەو پێیەش زەوی ئەو شتانە بەلای خۆیدا کێش دەکات کە لەسەرنی.

کەواتە: کەوتنەخوارەوەی سێوەکە، بەهۆی هێزی ڕاکێشانی زەوییەوە ڕوو دەدات، مادام وابێ، ئەو شتەش کە سیفەتی (سەرێ) و خوارێ)ی لە بوونەوەردا دروستکردوە بە شێوەیەکی ڕێژەیی (نسبي) بریتیە لە هێزی کێشکردن، بۆ نموونە: ئێمە ئێستا لە کیشوەری ئاسیادا دەژین، لە سۆنگەی ئەوەوە کە زەوی بەلای خۆیدا کێشمان دەکات، ئاسمانی کیشوەری ئاسیا بۆتە سەرروومان، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەو ئەمریکاییانەی لە کیشوەری ئەمریکادا دەژین، ئاسمانی سەر ئەمریکا دەبێتە سەرروویان؛ یانی ئاسمانی ئێمە جوێیە لەهی ئەمریکاییەکان، بەشێوەیەک کە سەرووی وان، خوارەوەی ئێمەیەو، خوارەوەی ئێمەش، سەرووی وانە.

---

(١) بارستایی زەوی ( $\frac{1}{332.000}$ )ی بارستایی ڕۆژە. بڕوانە کتێبی: (قصة الإيمان) ل٣٢٠ چ٣، و قەبارە (حجم)ی ڕۆژ (١,٣٠٠,٠٠٠) جار هێندەی قەبارەی زەوییە. بڕوانە کتێبی: (محاضرات في العقيدة الإسلامية) ل٢٣٩، احمد البهادلي، و (قصة الإيمان) ل٣٠٩، الشيخ نديم الجسر.

خوێنەری خۆشەویستم!

وەک دیتمان، بۆ ئەوەی بتوانین تەفسیرێکی ڕاستەقینەی جوولێنەوەی تەنەکان بکەین (کە نموونەمان بە بەربوونەوەی سێوێک هێنایەوە) ناچارین بڕوا بهێنین بە هەبوونی هێزی کێشندە لە بوونەوەردا.

هەڵبەتە ئەگەر بابایەکی ڕواڵەت بین و ماددەپەرست و زەین تەسکیش، سواری کەرێ شەیتانی بێ و، وەک عادەتی هەمیشەییان، بە فیزو کەشخەوە ڕووی ڕەخنە لەو زاناو شارەزایانە بکات و بڵێ: ئاخر کوا ئەگەر ڕاستە هێزی کێشندە لە بونەوەردا هەیە، بۆچی دەنگ و ڕەنگ و تام و بۆن و قەبارەی نین؟!! نەخێر درۆیە هێزی کێشندە لە بوونەوەردا نیەو، هەر شتێکیش بە پێنج هەستەکانم هەستی پێ نەکەم، بڕوام پێی نیە؟!

بەڵێ لە ئاقار ڕەخنەو پرسیاری نالەبارو خواری بابایەکی ئاوا ڕواڵەت پەرست و فامکاڵدا، زاناو شارەزایان هەر هێندەیان لەدەست دێ، کە ئەو شوێنەوارو پەرێزە بخەنە بەرچاوی، بەتەمی نەفامیی داپۆشراوی ئەو ڕەخنەگرەو، پێی بڵێن: هێزی کیشندە لە بوونەوەردا، شتێکی سەلمێنراوو لەبەرچاوە؛ چونکە پەرێزو شوێنەوارێک لە بوونەوەردا دەبینرێ، کە بەبێ دانهێنان بە هەبوونی ئەو هێزە نەدیتراوەدا، ناگونجێ چۆنیەتی پەیدابوونی ئەو پەرێزو شوێنەوارە تەفسیر بکرێ، کەواتە ئێمە بەناچاریی بڕوامان بە هەبوونی ئەو هێزە هێناوە، هەروەک چۆن ئاوی جۆگەیەک ناچارت دەکات، بڕوا بە هەبوونی سەرچاوەکەی بهێنی، ئنجا مەسەلەی هەست پێ نەکرانی هێزی کێشندەش، بە هیچ ڕەنگێک نابێتە بەڵگەی نەبوونی ئەو هێزە؛ چونکە ئەو قسەیەی کە بۆتە بنێشتەخۆشکەی سەرزاری گەلێک نیمچەخوێندەواری تاریک بیری ئەم سەردەمە، کە گوایە: بەرهەستبوونی شت مەرجە بۆ هەبوونی، قوماشێکی یەکجار کۆن و لە ڕەواج کەوتووی فابریقەخانەی بیری ماددەپەرستییەو، زۆر لەمێژە لەژێرباری تاووتینی واقیعی بەرەو پێشچوونی زانستدا، ئەو مۆرە ساختەیەی لێ کراوەتەوە، کە خەڵکی

سادەی پێ چاوبەست دەکراو، ئەو دەمامکی ساختەچییەتییەی لەسەر ڕوو لابراوە، کە خۆی پێ لە خەڵکی فەقیرحاڵ کرد بۆ شارەزایەکی تەواوو لەخشتەی دەبردن.[1]

دە جا مەسەلەی بڕوا بەخوا بوونیش بەهەمان پێودان؛ چونکە ناتوانین تەفسیرێکی ژیرانەو ماقووڵ بۆ چۆنیەتی پەیدابوون و بەڕێوەچوونی ئەم بوونەوەرە گەورەو بێڕەزاو ڕێک و ڕەنگینە بکەین، بەبێ دانهێنانی بە (گەورەترین ڕاستیی)دا کە بوونی خوای پەروەردگارە (جل جلالە).

بەڵێ، هەروەک چۆن دیاردەی سووڕانەوەی ئەستێرەو خڕۆکەکان و، دیاردەی بەربوونەوەی تەنەکان و...هتد، هەموو مرۆڤێکی ژیر ناچار دەکات کە دان بێنێ بە هەبوونی هێزی ڕاکێشان لە بوونەوەردا، ئەم بوونەوەرە مەزنەش کە پڕپڕە لە دیاردەی ڕێکوپێک و پڕ وردەکاریی و سەرسوڕهێنەر، نەک هەر جارێک، بەڵکو ڕۆژێ سەدان جار، ئینسان ناچار دەکات کە دان بێنێ بە هەبوونی خوای پەروەردگاری زاناو تواناداد، تاکو بتوانێ وەڵامێکی ماقووڵ و گونجاو بۆ پرسیاری (بوونەوەر چۆن دروست بووە؟!) دابنێ[2].

ئێستاش بۆ ڕوون بوونەوەی مەبەست -ئەو مەبەستەی کە دەڵێ: بوونەوەر عەقڵی مرۆڤ ناچار دەکات بڕوا بەخوا بهێنێ- وێنەیەک دێنینەوە:

ئێمە لە کاتێکدا تابلۆیەکی جوان و ڕازاوەی وێنەکێش (رسّام)ێکمان دەکەوێتە بەرچاو، دەستبەجێ دەکەوینە مەدح و پێهەڵێگوتنی ئەو نیگارکێشە دەست ڕەنگینەی کە دروستی کردوە -بۆ نموونە دیمەنی گوڵێک-.

---

(١) سوپاس بۆ خوا لە ئەڵقەی یەکەمی زنجیرەی: (ئیسلام و ڕێچکان)دا تا ڕاددەیەک ئەم باسە توێژراوەتەوە، بڕوانە لاپەڕە ٢٩-٣٨، چاپی یەکەم و دووەم و، ئێستاش بۆ جاری سێیەم لە لایەن نووسینگەی تەفسیرەوە چاپ کراوەتەوە.

(٢) لە کتێبی (پوختەیەک...)دا، وە لە بەشی یەکەمی ئەم بەرگەدا تا ڕاددەیەک ڕێکوپێکیی و وردەکاریی بوونەوەر خراوەتە ڕوو.

بێگومان لێرەدا عەقڵمان هیچ پێچ و پەناو ئەملاولا ناکاو، یەکسەر دیمەنی تابلۆکە، کە دیمەنی گوڵێکە، بە کارامەیی و دەستڕەنگینی وێنەکێشێکی هونەرمەندەوە دەبەستێتەوە، ئنجا زۆر ڕوونیشە کاتێک یەکێک بیەوێ دان بە بوونی وێنەکێشێکدا نەهێنێ، بۆ دیتنەوەی تەفسیرێکی ماقووڵ سەبارەت بە پەیدابوونی تابلۆی گوڵەکە، سەرگێژەکەی[1] دەگاتێو دەستەوستان دەبێ؛ چونکە ئەو کابرایە بەهۆی چاو لە قووچ[2] نانیەوە لەڕاست دانهێنان بە هەبوونی وێنەکێشێکی کارامەدا، تاقەڕێی لێکدانەوەو تەفسیرکردنی بەجێی لەخۆی گرتوە.

ئنجا بوونەوەریش کە نەک هەر تابلۆیەک، بەڵکوبێ ئەژمار تابلۆی وای تێدان، کە هەر کامێکیان زۆر زۆر ڕازاوەترو دڵگیرترو ڕێکوپێک ترە، لە دیمەنی ئەو گوڵەی کە ناچاری کردین بۆ تەفسیرکردنی چۆنیەتی پەیدابوونی، دان بهێنین بە بوونی نیگارکێشێکی لێهاتوو و زەبر دەستدا، هەر ئینسانێک لە فەرمانی عەقڵ و زانیاریی لانەدا، پێویستە لە ئاقار بوونەوەرێکی ئاوادا، موچڕکێک[3] لەبەری پێیانیرا تا تەپڵی سەری بێو، بەو پەڕی گەردنکەچیی و خۆ بەکەم زانیی و سوپاسگوزارییەوە، سەری بەندایەتیی و بەگەورەدانان و بە پاکگرتن بۆ ئەو خوا بەرزو زاناو میهرەبانە دابنەوێنێ و، لە بارەگای پیرۆزیدا بەچۆک دابێ.

بەڵێ، بەڕاستی ئەگەر دیمەنی گوڵێکی مرۆڤکرد، عەقڵی ئینسان ناچار بکات پاڵی بداتە لای وەستاو کارسازێک، پێویستە بوونەوەری گەورەو ڕێکوپێک و یاسادار، حەوجار حەوجار ناچاری بکات، کە پاڵی بداتە لای تواناو دەستەڵاتی خوای پەروەردگاری بێوێنە؛ چونکە بوونەوەر لانی کەم سێ پلەو ئیمتیازی زۆر گەورەی بەسەر ئەو تابلۆی گوڵەدا هەن، کە ناچاری کردین بیگێڕینەوە بۆ دەستی هونەرمەندو کارسازێک:

---

(١) سەرگێژەکە: سەرسوڕمان، سەرسووڕمان.

(٢) چاو لەقووچ نان: چاونززقاندن .

(٣) موچڕک: تەزوو

**پلـەی یەکـەم:** تابلـۆ مرۆڤکردەکـە -کـە دیمەنـی گوڵێکـە- لـە ئەنجامـی لاساکردنەوەو چاولێکەری بابای وێنەکێش، بۆ دیاردەو دیمەنەکانی سروشتی خواکرد، هاتۆتـە دی، بـەڵام بێگومـان دیمەنـە خواکردەکانی بوونـەوەر ڕەسـەنن و، بەهـۆی لاساکردنەوەوە نەهاتۆتـە دی، ئنجـا ئەگـەر دیمەنێـک کـە بەهـۆی لاساکردنەوەوە دروست بووبێ، حەوجێی کارسازێک بێ، دیمەنێکی ڕەسـەن چاکتر حەوجێیەتی؛ چونکـە شتێک کـە لەنوێ دادەهێنرێ بێ چاولێکەریی، توانـای پتری دەوێ، لـەو شتەی کـە بەهـۆی چاولێکەرییـەوە پەیدا دەبێ.

**پلـەی دووەم:** دیمەنـە مرۆڤکردەکـە، بـەس بریتیـە لـە ڕواڵەتێکـی دەرەکیـی و بەرچـاو و، لەڕاسـتییدا تەنیـا وێنـەو سـێبەرێکی بێنێوەرۆکـەو هیچـی دی، بـەڵام دیمەنـە سروشـتییەکانی خـوا، زینـدوو و واقیعیـی و کاکڵ دارن؛ واتـە دیمەنەکانـی سروشـتی خواکـرد، دیـمەنن نـەک سێبەرو وێنـەی دیمـەن، ئنجـا ئەگـەر وێنەیەکی ڕواڵەتیی و بێگیـان لەخۆوە نەڕەخسێ، مەحاڵـە کـە دیمـەن و دیاردەیەکی ڕاستەقینەو زینـدوو لەخۆوە بڕەخسێ؛ چونکـە وەک گوتمـان: تابلۆیەکی مرۆڤکـرد لەچـاو دیمەنێکی خواکـرد، کتومـت وەک سـێبەرێک وایـە، ئنجـا بێگومـان ئەگـەر سێبەرێک لەخۆوە پەیدا نەبێ، ئـەو شتەی کـە سێبەرەکەی پەیداکـردوە، هـەر پەیـدا نابێ.

**پلـەی سـێیەم:** ئـەو تابلۆیـەی کـە ناچـاری کردیـن بیگێڕینـەوە بـۆ کارامەیـی و لێزانیـی هونەرمەندێـک، بریتـی بـوو لـە یـەک دیمـەن کـە دیمەنـی گوڵێکـە، بـەڵام بوونـەوەری خواکـرد، هـەر لـە ڕەگـەزی گـوڵ هـەزاران جـۆرو، لـە هـەر جۆرەی ملیۆنـان گـوڵ لـە هـەر وەرز (فصل)ێکـی ساڵدا دەڕەخسێنێ، بێجگـە لـە باقـی دیمـەن و دیـاردە دڵبزوێنەکانـی بوونـەوەر، وەک؛ ئینسـان و ئـاژەڵ و باڵنـدەو زینـدەوەرو ڕووەک و دانەوێڵـەو دارودرەخـت و ئـاوو کانیـاوو شـاخ و دەشـت و هـەورو بـاران و بروسـکەو بـاو مانـگ و زەوی و ڕۆژو ئەسـتێرەو کەهکەشـان و...هتـد.

ئنجا سەربارەی هەموو شتێکیش، هەر ئەو وێنەکێشەی کە تابلۆی ئەو گوڵەی سازکردوە، بۆ خۆشی –هەرچەند کارامەو لێهاتووبێ- یەکێکە لە دیمەنە خواکردەکانی بوونەوەر!!

خوێنەری سەنگین!

ئێستا بەم کورتە توێژینەوەیە ساغ بۆوە، کە ڕاستە بڕوا بەخوا بوون پێویستییەکی ژیرییە؛ چونکە وەک ڕوونمان کردەوە: عەقڵی ئینسان – بەمەرجێک لەئاقار هەقیدا خۆی گێل نەکات و، لەبەر تیشکی ڕۆژی ڕاستیی ڕانەکات- بەبێ دانهێنان بەبوونی خوای پەروەردگاردا، ناتوانێ تەفسیرێکی ژیرانەو ماقووڵ بۆ چۆنیەتی دروست بوونی بوونەوەر پەیدا بکات.[1]



(١) باسی (عەقڵ دووەمین پاڵنەری مرۆڤە بەرەو خواناسیی) پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆو پتەوی بەم باسەوە هەیە، کە لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا هات.

## شەشەم: گرنگیی بڕوا بەخوا بوون، لە ڕووی زانیارییەوە

بـڕوا بەخـوا بـوون لـە ژیانـی ئینسـاندا، لـە ڕووی زانیارییشـەوە، یەکجـار گرنـگ و پێویستە، بەڵێ عەقیدەی خوا بەیەکگرتـن و خواناسـیی، چاوپۆشیی لـەوە بکەیـن کـە ڕاستییەکی موتڵەق و سـەلمێنراوو بێپێچ و پەنایـە، شـتێکی یەکجار گرنگ و پێویستیشە، لەو لایەنەوە: کە بنەڕەتییتـرین و کاریگەرترین هاندەری مرۆڤـە بـۆ زانیاربـوون و شارەزایی لـە یاسـاو دەسـتوورەکانی بوونـەوەرو پەیبردنـی بـە ڕازو نهێنییـە شێرراوەکانی!!

ئێسـتا ڕەنگـە کەسـانێک کـە ڕۆژێـک لـە ڕۆژان بـە نیـازی لـە ئیسـلام حاڵـی بـوون و تێگەیشتن لـە بەرنامـەی خوا، کتێبێکیـان لێـک نەکردۆتـەوەو، هەمـوو دەسمایەی وان لـە بـواری شـارەزایی لـە ئیسـلامدا بریتیـە لـە دەرخکردنـی کۆمەڵـە قسـەیەکی بێکاکڵ و قرپۆکـی پاکـەتیـی و حـازر بەدەسـت، کـە بـە زۆری زادەو بەرهەمـی دڵ و مێشـکی بێبـڕواو ژەنگاویـی ڕۆژهەڵێتناسـە داخ لەدڵەکانـن و، تووتییانـە دووبـارەو سێبارەیان دەکەنەوە، بەچاوی ئەبڵـەق و سـەری سوورڕماوەوە بڵێـن:

چـۆن بـڕوا بەخـوا بـوون، هانـدەری مرۆڤـە بـۆ زانیاربـوون و شـارەزابوونی سـەبارەت بەیاسـاو دەسـتوورەکانی سروشـت؟!!

بەڵێ ئەوانە وادەڵێن و ئەگـەر ئاسـتی تێگەیشـتن و شارەزاییشـیان لەبەرچـاو بگریـن، ئـەم جـۆرە پرسـیارانەو زۆری دیکـەی لـەم بابەتەشیان لـێ چـاوەڕوان دەکەیـن و، بـە شـتێکی ئاسـایی دەزانیـن، وەک گـوتراویشـە: (النـاس أعـداء مـا جهلوا) بـە هـەر حـاڵ نەزانیـی و بێئاگایـی لـە ئیسـلام، چاوپێچکێکـە چـاوی گەلێـک کەسـی لاڕێـی پـێ بەسـتراوە، ئنجـا هـەر شـتە بـەدژی خـۆی چـارە دەکـرێ و، چـاری چاوبەسـترانیش، بـەس چاوکردنەوەیـە، کەواتـە بـا ئـەو جـۆرە

کەسانە بە سەرسوڕماویی و چاو ئەبڵەق ماوییەوە بەجێ بهێڵین و، بزانین چۆن بڕوا بەخوا، بوون، بنەڕەتییترین و ڕەسەنترین پاڵنەری مرۆڤە بۆ شارەزا بوون و زانیاربوونی لەبارەی یاساو نهێنییەکانی بوونەوەرەوە.

دەتوانین لە سێ خاڵاندا دەریخەین، کە چۆن بیری خواناسیی و بڕوا بەخوا بوون مرۆڤ هەڵدەنێت و هان دەدات، بۆ زانیاربوون و شارەزابوون لە ڕازو نهێنیی و یاساکانی ئەو سروشت و بوونەوەرەی کە تێیدا دەژی:

**یەکەم:** پتەوترین و بڕندەترین بەڵگەی دەستی بڕواداران لەسەر بوونی خوا، بریتیە لە خستنەڕووی ڕێک وپێکیی و وردەکاریی و یاساداریی بوونەوەر؛ چونکە بوونەوەر پەرێزو شوێنەواری خوایەو، هەتا پتریش ڕێک وپێکیی وردەکاریی بوونەوەر ئاشکرا بێ، پتر دەعوای شوێنەواری خوا بوونی بوونەوەر دەسەلمێنرێ؛ لەبەر چونکە خوا خاوەنی ئەوپەڕی زانیاریی و توانایەو، کاتێکیش دەعوای شوێنەواری خوا بوونی بوونەوەر، هیچ پەرچی لەبەر نامێنن و چاک دەچەسپێ، کە ئەوپەڕی ڕێک وپێکیی و یاساداریی لە بوونەوەردا بخرێتە بەرچاوان.

مادام وابێ، مرۆڤی مسوڵمان و بڕوادار، بەحوکمی بڕوا بەخوا بوونی و، بۆ زیاتر دڵنیابوونی و، بۆ پتر پشت ئەستوور بوونی بە ڕاستیی دەعواکەی، هەمیشە بە چاوی پشکنین و تێفکرین و وردبینییەوە، سەرنجی بوونەوەر دەدات و، لە هەموو کەس زیاتر هەوڵی ناسین و دۆزینەوەی ڕازو نهێنی و یاساکانی گەردوون دەدات.

ئنجا بێگومان لە ئەنجامی ئەوەشدا، ئاستی زانیاریی و شارەزایی پێهەڵێ دەچێ و، بەو یاساو بنچینە ڕێک وپێکانە ئاشنا دەبێ، کە گەردوونیان لەسەر بەڕێوە دەچێ، دەشزانم هەندێک کەس کە ئەم قسەیە دەبیستن و، واقیعی ژیانی مسوڵمانان دەبینن، تووشی دڕدۆنگیی و سەرسوڕمان دەبن، بەڵام بۆ ڕەواندنەوەی ئەو دڕدۆنگیی و گومانە دەڵێم:

**أ/** ئیسلام بەرامبەر بە واقیعی ئێستای مسوڵمانان، بەرپرسیار نیە؛ چونکە (۱۰/۱)ی ژیانیشیان بەپێی یاساکانی وی بەڕێوە ناچێ.

**ب/** مسوڵمانان لەسەردەمێکدا کە بەپێی بەرنامەی خوا دەژیان، لە بواری زانست و پیشەسازیی و بەرەوپێش بردنی ژیاندا، سەرقافڵەی جیهان بوون، ئەوە ئێوەو ئەوەش مێژوو سەرنج بدەن!!

**دووەم:** لە سۆنگەی ئەوەوە کە مرۆڤی بڕوادار، بڕوای وایە خوای بەخشندە خاوەنی ئەوپەڕی زانیاریی و دەستەڵات و کاربەجێییە، قەناعەتی بەوە هەیە کە دەنکە لم و پەڕە مریشکیش، بێحیکمەت و هۆ نەخوڵقێنراون و، هەرچی لەم بوونەوەرەدا هەیە بەپێی چەند یاسایەکی یەکجار وردو ڕێک وپێک و سەرسامکەر بەڕێوەدەچێ، ئنجا بێگومان خاوەنی قەناعەت و تێڕوانینێکی ئاوا، بە درشت بینیی و سەرکێڵیی بەسەر هیچ شتێکدا ڕانابرێ و، هەر شتێکی بکەوێتە بەر نیگای، تێی ڕادەمێنێ و، هەوڵ دەدات زانیاریی و کاربەجێی و دەستەڵات و توانای خوای بەرزو بێهاوتای، تێدا بەدی بکات، بابایەکی ئاواش، هەرگیز لە باغی ڕازاوەو گەشاوەی بوونەوەرێکدا، کە چاوەڕێی هەموو جۆرە گوڵێکی زانیاریی و وردەکاریی لێدەکات، دەست بەتاڵ و بێبەرهەم نابێ و، شتێک بە شتیک هەر دەکات؛ چونکە وەک گوتراوە: (مَن جدَّ وَجَدَ).

**سێیەم:** ئینسانی بڕوادار، چونکە خوای میهرەبانی لە هەموو شتێک خۆشتر دەوێ، زۆر سروشتییە کە ئەو بوونەوەرەش کە ئاوێنەی تێدا درەوشانەوەی سیفەتە بەرزەکانیەتی، وەک برادەرو دۆستێکی نیزیکی خۆی لەقەڵەمی بدات، وەک بەندە لە چوارینەیەکدا لەوبارەوە گوتوومە:

سروشت ئاوێنەی تەجەللای خوایە
چاک سەرنجی دە بزانە چی تیایە

له‌ڕێـــی كرده‌وه كردگار ده‌ناسرێ

سروشت كرێكه كرده‌ی (الله)یه

به‌ڵـێ، شـتێكی زۆر سروشـتیی و ئاسـاییه، كـه مرۆڤ هه‌ركاتێـك كه‌ســـێكی زۆر خۆشویسـت، هه‌مـوو ئـه‌و شتانه‌شـی خـۆش بوێـن، كـه په‌یوه‌ندییـــان به‌وییـــه‌وه هه‌یه[1]، ئنجا گومانیشی تێدا نیه كه ئینسانێك به‌چاوی خۆشه‌ویستیی و دۆستایه‌تییه‌وه لـه بوونـه‌وه‌ره‌وه ڕابمێنێ، ئاشـنابوون و شـاره‌زابوونی ده‌رباره‌ی یاسـاو ڕازو نهێنییه‌كانـی بوونـه‌وه‌ر، زۆر ده‌بێتـه شتێكی سێنایی و بگره بابایه‌كی وا ئه‌وپه‌ڕی به‌ختیاریی و چێژ وه‌رگرتنـی خۆی، لـه دۆزینـه‌وه‌و ناسـینی یاسـاو ده‌سـتووره‌كانی بوونـه‌وه‌ردا ده‌بینـێ.

ئه‌وه هه‌مووی له‌لایه‌كه‌وه، له‌لایه‌كی دیكه‌شـه‌وه مرۆڤێكی بڕوادارو مسـوڵمان، بـه حوكمـی به‌رنامـه‌و ڕێبازه‌كـه‌ی، وه‌ك نوێـژو ڕۆژوو له‌سـه‌ری پێویسـته كـه بـه شێوه‌یه‌كی لام سـه‌رلایی بـه‌لای هیـچ شتێكدا ڕانه‌برێ و، هه‌رچـی دیتـی دیقه‌تـی لێبگـرێ و، بـه وردی سـه‌رنجی بـدات، بۆ نموونـه خـوا فه‌رموویه‌تـی:

﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ ﴾ (الأعراف-١٨٥).

ئایـا سـه‌رنجمان نه‌داوه‌تـه مولكـی ئاسـمانه‌كان و زه‌وی و هه‌رچـی خـوا دروسـتی كـردوه؟!

دیسان فه‌رموویه‌تی: ﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ ﴾ (ق-٦).

---

(١) وه‌ك شاعیر له‌وباره‌وه گوتویه‌تی:

أَمُرُّ على الديار ديـار ليلى    أُقَبِّلُ ذَاالجـدار وذَاالجـدارا
وما حب الديار شَغَفْنَ قلبي    ولكن حبُّ من سكن الديارا

واتـه: بـه‌لای خانووه‌كاندا ڕه‌ت ده‌بم، ئـه‌و خانووانـه‌ی له‌یلایـان تێدا بـوو، ئـه‌م دیـوارو ئـه‌و دیـوار مـاچ ده‌كـه‌م، خۆ وه‌نه‌بێ خۆشه‌ویستیی خانـووه‌كان دڵـی پـڕ كردبـم - كـه دارو دیواره‌كانیـان مـاچ بكـه‌م - بـه‌ڵكو خۆشه‌ویسـتیی ئـه‌و كه‌سـه‌ی كـه لـه خانووه‌كانـدا نیشـته‌جێ بـووه.

ئایا تەماشای ئاسمانیان نەکردوە لە سەروویانەوە، چۆن دروستمان کردوەو ڕازاندوومانەتەوەو، هیچ کەلێن و کونی تێدا نین؟!

دیسان خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿ وَفِي ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِيٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ (الذاريات٢٠-٢١)

واتە: هەروەها لەزەویدا نیشانەی زۆر هەن بۆ بڕوا پتەوان و، لە لەخودی خۆشتاندا، ئایا نابینن؟!

نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو خوا فەرمان بە مرۆڤ دەکات، کە تەنانەت ئەو خواردن و خواردنەوەیەش کە دەیخوات، بەبێئاگایی بەسەریدا ڕانەبرێ و، بە چاوێکی وردبینانە سەرنجی بدات:

﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ ﴾ (عبس-٢٤)، با مرۆڤ سەرنجی خواردنەکەی بدات[1].

بەڵێ، بێگومان مرۆڤێک خاوەنی بڕوایەکی وا بەهێزو بەرنامەیەکی وا بەپێز بێ، حەتمەن پشکێکی زۆری لە پەی پێبردن و دۆزینەوەی یاساو نهێنییەکانی بوونەوەردا دەبێ.

خوێنەری بەڕێز!

ئێستا -دوای ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیە- جێی خۆیەتی: پڕ بەدڵ بەزەییمان بەو کەسانەدا بێتەوە، کە بڕوایان بە ئەفسانەی (دژایەتیی نێوان ئایین و زانیاریی) هەیەو، پێیان وایە: بڕوا بەخوا بوون، نەک هەر پاڵنەری مرۆڤ نیە بەرەو وەدەست هێنانی زانیاریی و شارەزایی دەربارەی سروشت و بوونەوەر، بەڵکو مرۆڤ هەتا خواناستر بێ پتر دژی زانیارییەو، هەتا زانیارتر بێ، لە خوا دوورترە!!

---

(١) لە پەراوێزی ئەڵقەی دووەمی (ئیسلام و ڕێچکان)دا، شتێکمان سەبارەت بە گرنگییدانی ئیسلام بە بیرکردنەوەو زانیار بوون نووسیوە، بڕوانە: چاپی سێیەم، ٢٠٠٦.

بەڵێ بەڕاستیی ئەو جۆرە کەسانە، شایستەی دڵ پێسووتانن؛ چونکە:

ئایا ئەو بیروبڕوایەی کە پێت دەڵێ: (گەردوون بەدیهێنەرو پەروەردگارێکی زاناو تواناو میهرەبان و کاربەجێی هەیەو، هەموو وردو درشتێکی ئەم گەردوونەی بە پێی نەخشەو سیستمێکی زۆر ڕێک وپێک و زانیارییانە خوڵقاندوە)؛ دژی زانیارییەو وا لە مرۆڤ دەکات کە گوێ بە زانیاریی نەداو بەدوای دۆزینەوەی یاساکانی سروشتدا نەگەڕێ؟! یان ئەو بیرەی کە پێت دەڵێ: (گەردوون بێخاوەن و سەرپەرشتەو، هیچ کەس نەخشەو بەرنامەی بۆ دانەناوەو، ئەو وردەکاریی و ڕێک وپێکییەش کە تێیدا دەبینرێ، هەمووی پەرێزی ماددەی کەڕوکوێرو ڕێکەوت و مێکەوتانە!!)؟!!

بێگومان بڵێین یان نەڵێین، بیری دووەمیان -کە بیری ماددەپەرستیی و بێبڕواییە- ئینسان وا لێ دەکات؛ کە حەوجێ بەوە ناکات خۆی ماندوو بکات و، بە دوای دۆزینەوەی یاساکانی گەردووندا وێڵ بێ، چونکە هەمووی هەر بێسەروبەرەیی و شێواوییە، بێجگە لە چەند حاڵەتێکی کەم، کە پەرێزو شوێنەواری ماددەی کەڕو کوێرو ڕێکەوتی بێفەڕو خێرن!!

بە کورتی:

بڕوابوون بەوەی کە گەردوون یاسادارو ڕێکوپێکەو بەپێی زانیاریی و نەخشەیەکی ورد بەڕێوە دەچێ، مرۆڤ وا لێدەکات کە بە چاوێکی سەرنجدەرانەو وردبینانە سەیری بوونەوەر بکات، تاکو ئەو ڕێک وپێکیی و نەخشەیەی کە بڕوای پێی هەیە بیدۆزێتەوە، بەڵام بە بەراوەژووەوە: بڕوا بوون بەوەی کە بوونەوەر بەدیهێنەرو نەخشەدانەرو پەروەردگارێکی زاناو کاربەجێی نیەو، بە شێوەیەکی هەڕەمەکیی و کوێرانەو بێیاسا دروست بووەو بەڕێوە دەچێ، مرۆڤ وا لێدەکات کە بەچاوی گرنگی پێنەدانەوە، سەیری بکات و ئەرکی تێفکرین و وردبوونەوە وەبەر خۆی نەدات، ئاخر ماقووڵ نیە، مرۆڤ بڕوای بە شتێک نەبێ و، بەدوایدا بگەڕێ و، هەوڵی پەیپێبردنی بدات!!

ئێستا ڕەنگە لێرەدا هەندێک کەس بڵێن: باشە ئەگەر ڕاستە عەقیدەی بڕواداریی و خواناسیی پاڵ بە ئینسانەوە دەنێ، کە لە خەڵکی دیکە پتر سەرنجی بوونەوەر بدات و، هەوڵی ناسینی یاساکانی بدات، بۆچی دەبینین زۆربەی زۆری ئەو زاناو شارەزایانەی کە لە بواری زانیارییە سروشتییەکاندا کارامەن، بێبڕواو خوانەناسن؟!

لە وەڵامی ئەوانەدا دەڵێین:

مەسەلەی بێبڕوایی[1] و خوانەناسیی زانایانی سروشت، ئەفسانەیەکی یەکجار زەق و بێ بنچینەیەو، لە دنیای واقیعدا تاقە ڕەگێکی نیە لەسەری ڕاوەستێ، ئنجا لێرەدا بەس بە کردنە نموونەی قسەی یەکێک لەو زانایانەی، کە بەناوبانگترین زانای سروشتن و بڕوادارن، واز لەم مەسەلەیە دێنین:

(ئاینشتاین) بەناوبانگترین زانای سەدەی بیست و خاوەنی بیردۆزەی ڕێژەیی (النظرية النسبية) دەڵێ:

(لەنێو زاناو بیرتیژانی دنیادا، کەست دەست ناکەوێ کە لە ئەنجامدا خاوەنی بڕوایەکی ئایینی نەبێ، بڕوا بە سیستم و بەرنامەیەکی ڕێک وپێک و ورد، کە لە زانیارییەکی بێسنوورەوە سەرچاوەی گرتووە، هەر ئەو بڕوایەشە کە تواناو وزە بەوانە دەبەخشێ کە هەوڵ و تێکۆشانی بێوچان دەدەن، بۆ ناسینی بوونەوەرو، ناچاریان دەکات کە هەمیشە لەپێناو دۆزینەوەی یاساو دەستوورەکانی ڕواڵەت و دیاردە ڕێک وپێکەکانی ئەم جیهانەدا، بیربکەنەوە)[2].

---

(١) مەبەست لە بێبڕوایی لێرەدا (الحاد)ە نەک (کفر).

(٢) (جهانی کە من میبنم) نووسینی ئاینشتاین.

خوێنەری سەنگین و بەڕێز!

ئێستا پاش ئەوەی:

**لە بەشی یەکەمدا:** عەقیدەی بڕواداریی و خواناسیی، وەک ڕاستییەکی درەوشاوەی خوازراوی فیطرەتی ساغ و عەقڵی ڕاستی ئینسان، سەلمێنراو خرایەڕوو و، بەرپەرچی هەموو قسەو قاڵ و بیردۆزەو میردۆزەکانی پێڕی دژ بە خوایان درایەوە.

**لە بەشی دووەمیشدا:** ئایینی خوا پێناسە کراو ڕوون کرایەوە، کە چیەو، چۆنەو نیشانەو دروشمەکانی چین؟ و چۆنیەتی پەیدابوونی خرایە ڕوو و، حیکمەتی نێررانی و ئامانجەکانی درەوشێنرانەوەو، سەرجەم ئەو بیروبۆچوون و بیردۆزانە کە نەیارو ناحەزانی خواو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئایینی خوا، دەربارەی چییەتی ئایین و، بەرنامەی خواو چۆنیەتی سەرهەڵدانی و، هۆو حیکمەتی نێررانی (بە بۆچوونی وان: داهێنران و پەیداکرانی) خرانەڕوو، وەک بڵقی سەر ئاو، تەقێنران و پووچێنرانەوە.

**لە بەشی سێیەمیشدا:** پێناسەی ئیمان کراو، چەندان بابەت و مەسەلەی پەیوەست بە ئیمان و عەقیدەوە توێژرانەوەو، چەندان تەم ومژی گومان و تۆمەتی بێبناغەی دەوروبەری ڕەوێنرانەوەو، سەرەنجام گرنگیی و کاریگەریی ئیمان لە بوارەکانی: دەروونیی و خووڕەوشت و کۆمەڵێیەتیی و سیاسیی و عەقڵیی و زانستییەوە، خرایە ڕوو و، ئاماژەش کرا بۆ پووچیی و بێکاکڵیی، قسەوقاڵی فامکاڵێنی نەیارو ناحەزانی ئیمان و عەقیدە!

بەڵێ ئێستا:

زۆر بە ڕاشکاوانە و بێ منەتانە دەتوانین بڵێین:

بەڵێ ڕاستە:

ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو، ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوەو دەپووکێنەوەو، وەک بەفری بەرخۆر، زوو دەتوێنەوە.

سبحانك اللّهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلاّ أنت، أستغفرك وأتوب إليك..

# بەرهەمەکانی دانەر

## أ - کتێبە کوردییەکان :

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | بەرگی دەیەم سوورەتی: (هود) | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ١٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك / ٢٠١٩ | |
| ١٤ | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٥ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی | | |
| ١٦ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٧ | پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٨ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ١٩ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش |
| ٢٠ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٢١ | ناوە هەرە جوانەکانی خوا سبحان وتعالی | چاپی یەکەم ٢٠١٣ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ٢٢ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |

| ژ | كتێبه‌كان | به‌روار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ٢٣ | به‌رگی دووه‌م: خوا به‌یه‌كگرتن له‌ به‌دیهێنه‌رایه‌تیی و په‌روه‌ردگارێتییدا | | |
| ٢٤ | به‌رگی سێیه‌م: خوا به‌یه‌كگرتن له‌ ناو و سیفه‌ت و له‌په‌رستراوێتییدا | | |
| ٢٥ | به‌رگی: چواره‌م: ئیمان به‌: فریشته‌كانی خوا، كتێبه‌كانی خوا، پێغه‌مبه‌رانی خوا | | |
| ٢٦ | به‌رگی پێنجه‌م: ئیمان به‌: ڕۆژی دوایی و قه‌زاو قه‌ده‌ر | | |
| ٢٧ | به‌رگی شه‌شه‌م: تایبه‌تمه‌ندیی و دیدوبۆچوونه‌كانی په‌یڕه‌وانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٢٨ | ڕێبــازی پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم كامه‌یه‌ ؟! | چاپی یه‌ك/١٩٨٩ | دواتر خرایه‌ نێو كتێبی (مسـوڵمانی كامڵ: به‌شی یه‌كه‌م: بیروباوه‌ڕی مسـوڵـمان) |
| ٢٩ | مسـوڵمانی كـامڵ : به‌شی یه‌كـه‌م : بیـروباوه‌ڕی مسـوڵـمان | چاپی یه‌ك/١٩٩٧ | دواتر خرایه‌ نێو كتێبی (ئیمان و عه‌قیده‌ی ئیسـلامیی له‌به‌ر ڕۆشنایی قورئان و سـوننه‌تدا) |
| ٣٠ | ته‌وژمی ئیسلامیی و عه‌لمانیی و خاڵه‌ هاوبه‌ش و جیاوازه‌كانیان | چاپی یه‌ك/٢٠٠٨<br>چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربه‌ی به‌ (٢٤) ئاڵقــه‌ له‌ هه‌فته‌نـامه‌ی (هـاووڵاتیی)و، ئه‌وه‌ی دیكه‌ش به‌ (٩) ئاڵقه‌ له‌ هه‌فته‌نامه‌ی (ئاوێنه‌)دا بڵاوكراوه‌ته‌وه‌ |
| ٣١ | ڕوونكردنه‌وه‌ی بنه‌ما شه‌رعییه‌كان و هێڵه‌ گشتییه‌كانی كۆمه‌ڵی ئیسـلامیی | چاپی یه‌ك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣٢ | ته‌رجه‌مه‌ی كوردیی عه‌قیده‌ی طــه‌حاویی | چاپی یه‌ك/٢٠١٤ | |
| ٣٣ | ڕوونكردنه‌وه‌ی عه‌قیده‌ی طه‌حــاویی | چاپی یه‌ك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٤ | سیكۆلاریزم و دیموكڕاسیی له‌ئه‌زموونی كوردستاندا (دیبه‌یتی ساڵ) | چاپی یه‌ك/٢٠١٦ | |

| ژ | کتێبه‌کان | به‌روار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | مه‌وسووعه‌ی: بیرکردنه‌وه‌ی ئیسلامی له‌نێوان وه‌حیی و واقیع دا | | |
| ٣٥ | کتێبی یه‌که‌م: پێناسه‌و چییه‌ت و سه‌رگوزشته‌و سه‌رچاوه‌کان و گرنگیی: بیرکردنه‌وه‌ی ئیسلامیی | چاپی یه‌ك / ٢٠١٨ | |
| ٣٦ | کتێبی دووه‌م: هێڵه گشتییه‌کانی ڕێبازی جه‌ماوه‌ری مسوڵمانان | چاپی یه‌ك / ٢٠١٨ | |
| ٣٧ | کتێبی سێیه‌م: ته‌وژمه فیکرییه سه‌ره‌کییه‌کانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یه‌ك / ٢٠١٨ | |
| ٣٨ | کتێبی چواره‌م: پایه‌کانی بیرکردنه‌وه‌ی ئیسلامی | چاپی یه‌ك / ٢٠١٨ | |
| ٣٩ | کتێبی پێنجه‌م: چه‌ند پرسێکی فیکریی هه‌نووکه‌یی جۆراوجۆر | چاپی یه‌ك / ٢٠١٩ | |
| | فیقهی ئیسلامیی | | |
| | مه‌وسووعه‌ی: خواپه‌رستیی ئیسلامیی (٤ به‌رگ) | چاپی یه‌ك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٤٠ | به‌رگی یه‌که‌م: خواپه‌رستیی به‌گشتیی، ورده بابه‌ته خیلافییه‌کان، پاك و خاوێنیی | | |
| ٤١ | به‌رگی دووه‌م: نوێژ به‌رپاکردن یه‌که‌مین دروشمی خواپه‌رستیی | | |
| ٤٢ | به‌رگی سێیه‌م: زه‌کات و ماڵ به‌خشین | | |
| ٤٣ | به‌رگی چواره‌م: ڕۆژو گرتن، حه‌ج و عومره‌کردن، زیکری خواکردن | | |
| ٤٤ | بنچینه گرنگه‌کانی هه‌ڵسه‌که‌وتی شه‌رعییانه‌و ژیرانه له‌گه‌ڵ ورده بابه‌ته خیلافییه‌کاندا | چاپی یه‌ك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عه‌ره‌بیش وه‌رگێڕراوه |
| ٤٥ | جه‌ژن و یادو بۆنه‌کان و هه‌ڵسه‌نگاندنێك | چاپی یه‌ك/٢٠١٣ | |
| ٤٦ | چه‌ند بابه‌تێکی هونه‌ریی له‌به‌ر ڕۆشنایی قورئان و سوننه‌تدا | چاپی یه‌ك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش ته‌رجه‌مه کراوه |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٤٧ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | **تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار** | | |
| ٤٨ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤٩ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |
| ٥٠ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٥١ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانە وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخان و وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٥٢ | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٥٣ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٤ | گیانی ژیان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٥ | مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قوڕئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **بانگەوازو کاری ئیسلامیی** | | |
| ٥٦ | کۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٧ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨ چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٥٨ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٩ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |

| ژ | كتێبه‌كان | به‌روار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ٦٠ | بزووتنه‌وه‌ی ئیسـلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یه‌ك / ١٩٩٤ | |
| ٦١ | چه‌ند ڕێڕوونییه‌ك بۆ ئیســـلامییه‌كانی كوردستان | چاپی یه‌ك / ١٩٩٧ | |
| ٦٢ | بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامیی و ئاسۆیه‌كی گه‌ش و ڕوون، بنه‌ما شه‌رعی یه‌كان و بنچینه ئه‌خلاقی یه‌كان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٦٣ | ئیســـلام و كێشــه هه‌نووكه‌یی یه‌كـان | چاپی یه‌ك / ١٩٩٨ | |
| ٦٤ | زانایانی ئیســـلام كێن و چۆنن ؟! | چاپی یه‌ك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وه‌رگێڕراوه‌ته سـه‌ر زمانی عـه‌ڕه‌بی |
| ٦٥ | كۆمه‌ڵی ئیســلامیی: ئامانج و هه‌ڵوێســته‌كانی | چاپی یه‌ك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٦ | چۆن هه‌ڵسـوكه‌وت له‌گه‌ڵ خه‌ڵكی دا بكـه‌ین؟! | چاپی یه‌ك / ٢٠٠٢ | وه‌رگێڕراوه‌ته سـه‌ر زمانی عـه‌ڕه‌بی |
| ٦٧ | چۆن له جیهاد بگه‌ین؟ | چاپی یه‌ك / ١٩٩٨ | |
| ٦٨ | جیهاد له ڕێی خواداو چه‌ند سـه‌رنج و ئاگادارییه‌ك | چاپی یه‌ك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٩ | بۆئه‌وه‌ی له‌سـه‌ر جیهادكردنمان قه‌رزدار نه‌بینه‌وه! | چاپی یه‌ك / ٢٠٠٢ | |
| ٧٠ | جیهـاد له ڕێی خوادا چی یه‌و بۆچی ده‌كرێ و چۆن ده‌كرێ ؟ | چاپی یه‌ك / ٢٠٠٢ | |
| ٧١ | چه‌ند ڕێـڕوونییـه‌ك بۆ خوشـك و برایانمان له هه‌نـده‌ران | چاپی یه‌ك/ ٢٠٠٢ | |
| ٧٢ | ئیسـلام و مسـوڵمانه‌تیی و كاری ئیسـلامیی، له‌به‌ر ڕۆشنایی قورئان و سـوننه‌تدا | چاپی یه‌ك/٢٠٠٦ | |
| ٧٣ | هاوپه‌یمانێتی له‌به‌ر ڕۆشنایی قورئان و سـوننه‌تدا | چاپی یه‌ك / ٢٠٠٩ | |

| ژ | کتێبه‌کان | به‌روار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ٧٤ | به‌شدارییکردن له‌ هه‌ڵبژاردن و په‌رله‌ماندا، هه‌ڵسـه‌نگاندنێکی شه‌رعییانه‌و ژیرانه | چاپی یه‌ك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یه‌که‌م به‌ دوو ئاڵقه‌ی جیاوازو به‌ دوو ناوونیشانی جیاواز کراوه‌، به‌م شێوه‌یه‌:<br>ئاڵقه‌ی یه‌که‌م: به‌ڵگه‌کانی ئه‌وانه‌ی به‌شداریکردن له‌ هه‌ڵبژاردن و په‌رله‌ماندا به‌شه‌رعیی نازانن و هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌یان.<br>ئاڵقه‌ی دووه‌م : به‌ڵـگه‌کانی ڕه‌وایی به‌شداریکردن له‌ هه‌ڵبژاردن و په‌رله‌ماندا |
| ٧٥ | هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی بیـروڕاو ڕه‌فتاره‌ په‌ڕگیـرانه‌کانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یه‌ك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وه‌رگێڕاوه‌ته‌ سه‌ر زمانی فارسیی |
| ٧٦ | با لادان و تاوانی په‌ڕگیران، به‌رانبه‌ر به‌ ئیسـلام نه‌مانخاته‌ دوودڵـیی و گومان | چاپـی یه‌ك/٢٠١٥ | وه‌رگێڕاوه‌ته‌ سه‌ر زمانی فارسیی |
| ٧٧ | په‌ڕگیـریی: پێناسـه‌ی، نیشانه‌کانی په‌ڕگیـران، هۆکاره‌کانی په‌ڕگیریی، شـوێنه‌وارو ده‌رهاویشته‌کانی، چـاره‌سـه‌ری | چـاپی یه‌ك/ ٢٠١٥ | وه‌رگێڕاوه‌ته‌ سه‌ر زمانی فارسیی |
| ٧٨ | بنه‌ما شه‌رعییه‌کان و هێڵه‌ گشتییه‌کانی کۆمه‌ڵی ئیسـلامیی | | |
| ٧٩ | چاوپێداگێڕانه‌وه‌یه‌کی کاری ئیسلامیی | چاپی یه‌که‌م ٢٠١٩ | |
| | **زنجیره‌ی بنه‌مـا شه‌رعییه‌کانی کۆمه‌ڵی ئیسـلامیی** | | |
| ٨٠ | ئاڵقه‌ی یه‌که‌م: به‌ڵگه‌ شه‌رعییه‌کانی بنیاتنانی کۆمه‌ڵی ئیسـلامیی | چاپی یه‌ك / ٢٠٠١ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ٨١ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوكمی لادانی خەلیفەو كاربەدەستانی مسوڵمان لەكاتی لاریی و ستەمكارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٨٢ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەكەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| | وتاری كۆنگرەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان | | |
| ٨٣ | كارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری كۆنگرەی یەكەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٨٤ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیكریی، سیاسیی كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان (وتاری كۆنگرەی دووەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٨٥ | چاوپێداگێڕانەوەیەكی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەكییمان (وتاری كۆنگرەی سێیەمی كۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | نەتەوایەتیی و مەسەلەی كورد | | |
| ٨٦ | كوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٨٧ | حوكمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٨٨ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ |
| ٨٩ | چارەسەری كێشەی كورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | سیاسەت و حوكمڕانیی | | |
| ٩٠ | چەند بابەتێكی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵـەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٩١ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٩٢ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٩٣ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێکردن<br>دادوەریی | | |
| ٩٤ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٩٥ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/ ٢٠١٧ | |
| ٩٦ | قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٩٧ | گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەتدا. | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٩٨ | ئافرەتی مسـوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٩٩ | مەوسـووعەی : ئـافرەت و خێزان لە سـایەی شــەریعـەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | **مـێـــژوو** | | |
| ١٠٠ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ١٠١ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ١٠٢ | بەرکوڵێکی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگەکانی ژیانم | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| ١٠٣ | سـنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسـین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ١٠٤ | ئەشـکەنجـەو زیندان، پێشـمەرگەیەك بیسـت و دوو مانگ لە زینـدانی داگیرکـەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسـیشی کراوەو چـاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگـلیزیش وەرگێڕراوەو چـاوەڕێی چاپە |
| ١٠٥ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك/ ٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان** | | |
| ١٠٦ | گەنجەکانـمان لە نێوان ڕەسـەنایەتیی و لاســایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٠٧ | با وریا بیـن ! داڕووخـانی ڕەوشــت کۆمەڵگاکــەمان بەرەو هەڵدێر دەبـات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٠٨ | بەدوورخســتنەوەی ئافرەت لە ئیســلام چ زیانێـك دەکـەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٩ | چۆنیەتی بوونە پێشـەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١٠ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١١ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١١٢ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سـەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١٣ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسـند سـەنگی مەحەکی مسـوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٤ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١١٥ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٦ | واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٧ | سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ١١٨ | کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٩ | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٢٠ | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٢١ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢٢ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٢٣ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢٤ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢٥ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٢٦ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| | ب- کتێبە عەرەبییەکان | | |
| ١٢٧ | موسوعة : الإســلام كما يتجلّى فى كتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | كە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: |
| ١٢٥ | الكتاب الأول: الإسـلام: معرفة صحيحة بالخـالق عز وجل والخلـق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٢٦ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمـان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٧ | الكتاب الثـالث: الإيمان بالله تبارك وتعالـى: الخالق الرب الـمالك الإله ذي الأسـماء الحسـنى والصفات العـلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٨ | الكتاب الرابــع: الإيمان بالـملائكة و بالـجـن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٩ | الكتاب الخامس: الإيمان بكـتب الله الحكـيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣٠ | الكتاب الســادس: الإيمان برسـل الله تعالـى وأنبيـائه الكــرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣١ | الكتاب الســابـع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سـيـرته وبراهين نبوّتــه ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٣٢ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٣٣ | الكتاب التاسـع: إهتداء الإنســان بهـدى الله، أو الإلتزام الفردي بشــريعة الله | | |
| ١٣٤ | الكتاب العاشـر: إلتزام الـمجتمع بشريعة الله تعالـى | | |
| ١٣٥ | الكتاب الحـادي عشـر: تطبيق الـمجتمع للشـريعة و معــالم الدولة فـي الإســلام | | |
| ١٣٦ | الكتاب الثاني عشــر: الإســلام: نظــرة سـديدة تجـاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |
| ١٣٧ | نقض فـكــرة التطــرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٣٨ | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنــاة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٩ | لقاء خاص (مقابلــة مع قنــاة العــالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٤٠ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى /٢٠١٦ | |

| ژ | كتێبه‌كان | به‌روار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ١٤١ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الأولى/٢٠١٢ | |
| ١٤٢ | أمير وراء القضبان | ط الأولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٤٣ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٤٤ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الأولى/ ٢٠١١ | |
| ١٤٥ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الأولى/ ٢٠٠٥ | ط الثانية / ٢٠١٨ |
| ١٤٦ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٤٧ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٤٨ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٤٩ | العلمانية والديمقراطية في تجربة كوردستان | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٥٠ | مختصر نشاطات وأحداث حياتي / ١٩٦١ - ٢٠١٧م | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٥١ | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| ١٥٢ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | | |
| | **ئه‌و كـتـێبانـه‌ی لـه‌ژێـر چاپــن** | | |
| ١٥٣ | ته‌فســـیری قورئانی به‌رزو به‌پێز: (الرعد تـــا ص) | | |
| ١٥٤ | زنجیره‌ی: مسوڵمانینه! با باشتر تێبگه‌ین و پێبگه‌ین | | |
| ١٥٥ | ڕه‌وشت و ئه‌ده‌به‌ كۆمه‌ڵایه‌تییه‌كان | | |

## کورتەیەك لە مێژووی ژیانی

## مامۆستا عەلی باپیر



• ناو: عــەلی بــاپیر وەتمان.

لەدایکبووی: ساڵی (١٩٦١ز)دا لەقەزای پشدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.

• زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیە و سلێمانیی) و لە لای زانایانی کوردستانی عێراق و «دواتریش کوردستانی ئێران» بەدەستهێناون، لەساڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەپیٚزی لەبەر کردوە.

• لەساڵی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەر بۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتوە و ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووە، کۆلیجی شەریعەت.

• لەساڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق و لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو، لە مزگەوتی (نۆڕسیی) لە شاری ڕانیە دامەزراوەو، بەردەوام بووە لەسەر دەرس گوتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی و...هتد.

• یەکەمین بەرهەمی لەساڵی: (١٩٨٣)زدا نووسیوە بەناوی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) پاشان کتێب و بەرهەمەکانی بەردەوام بوون کە ئێستا ژمارەیان لەسەد (١٠٠) تێپەڕیوە، بە مەوسووعەو کتێب و نامیلکەو بەزمانی کوردیی و

عه‌ڕه‌بیی و، هه‌ندێك له‌ كتێبه‌كانیشی بۆ زمانه‌كانی: فارسیی و، توركیی و، ئینگلیزییش وه‌رگێڕراون.

• له‌ ساڵی (١٩٨٧ز)دا پاش ساڵانێك له‌ خه‌باتی ئاشكراو نهێنیی په‌یوه‌ست له‌گه‌ڵ {بزووتنه‌وه‌ی په‌یوه‌ندیی ئیسلامیی}دا، كه‌ له‌كۆتایی حه‌فتایه‌كانی سه‌ده‌ی پێشوودا ڕێكخستنه‌ نهێنییه‌كانی دامه‌زران، چۆته‌ چیا و ده‌ستی به‌خه‌باتی چه‌كداریی كردوه‌ له‌ چوارچێوه‌ی بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامییدا، كه‌ له‌چه‌ند ناوچه‌یه‌كی كوردستاندا بنكه‌و باره‌گای سه‌ربازیی هه‌بوو دژی ڕژێمی به‌عس و، هێزی حه‌مزه‌ی له‌ بناری چیای قه‌ندیل دامه‌زراند.

• له‌ ساڵی (١٩٨٨ز)دا بووه‌ به‌ ئه‌ندامی مه‌كته‌بی سیاسیی بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامیی.

• له‌ ساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵی هه‌بووه‌ له‌ ڕاپـــه‌ڕینی ئازاری (١٩٩١ز) داو وریاكردنه‌وه‌ی خه‌ڵكی كوردستان، له‌ مه‌به‌ست و ئامانجه‌كانی ڕاپه‌ڕینی جه‌ماوه‌ریی و ناساندنی بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامییدا.

• تاكو ساڵی (٢٠٠١ز) له‌نێو بزووتنه‌وه‌دا درێژه‌ی به‌خه‌باتی خۆی داوه‌، له‌هه‌مان ساڵدا له‌گه‌ڵ زۆربه‌ی هه‌ره‌ زۆری هێزو مه‌ڵبه‌نده‌كانی بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامیی له‌به‌ر چه‌ند هۆكارێكی مه‌نهه‌جیی (كۆمه‌ڵی ئیسلامیی كوردستان) ڕاگه‌یانراو به‌ئه‌میری كۆمه‌ڵی ئیسلامیی هه‌ڵبژێردرا.

• له‌ (٢٠٠٣/٧/١٠ز) له‌سنووری سلێمانیی له‌لایه‌ن هێزه‌كانی ئه‌مه‌ریكاوه‌ به‌تۆمه‌تی ناڕه‌وا ده‌ستگیركراو، بۆ ماوه‌ی (٢٢) مانگ له‌زینداندا مایه‌وه‌، هه‌ر له‌زینداندا مه‌وسووعه‌ی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)ی له‌ دوازده‌ كتێب و زیاتر له‌ چوار هه‌زار (٤٠٠٠) لاپه‌ڕه‌دا نووسیی و، له‌ (٢٠٠٥/٤/٢٨ز) دا له‌زیندان ڕزگاری بوو.

• تا ئێستا زیاتر له‌ (١٠٠) كتێب و نامیلكه‌ی نووسیوه‌ له‌بواره‌كانی: (فیكری ئیسلامیی و عه‌قیده‌ و فیقهـ و حوكم و سیاسه‌ت و ته‌زكیه‌ی نه‌فس و ئه‌خلاق و، به‌رپه‌رچدانه‌وه‌ی بیرو ڕێچكه‌ نامۆیه‌كان و...هتددا.

